یوست هیڵتەرمان



# کاریکی ژەهراوی

## ئەمەریکا و عێراق و گازبارانی هەڵەبجە

لە ئینگلیزییەوە: محەمەد حەمەساڵح تۆفیق



زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە (١٠٢٣)
سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

www.sardem.org

■ کارێکی ژەهراوی
ئەمەریکا و عێراق و گازبارانی هەڵەبجە

نووسینی: یوست هیڵتەرمان

لە ئینگلیزییەوە: محەمەد حەمەساڵح تۆفیق

بابەت: مێژوویی

دیزاینی ناوەوە: شەماڵ وەلی

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ١٠٠٠٠ دینار

چاپی: دووەم، چاپخانەی سەردەم ساڵی ٢٠٢١ کوردستان- سلێمانی

یوست هیلتەرمان

# کارێکی ژەهراوی

## ئەمەریکا و عێراق و گازبارانی هەڵەبجە

لە ئینگلیزییەوە
محەمەد حەمەساڵح تۆفیق

سلێمانی - ٢٠٢١



**هەڵەبجە، مارتی ١٩٨٨**

قوربانییانی هێرشی کیمیایی، نەسرین ئەحمەد عەبدوڵڵا و دوو منداڵ (بە مۆڵەتدانی وێنەگر ئەحمەدی ناتیقی و کەسوکاری ڕزگاربووی شەهید نەسرین ئەم وێنەیە بڵاو کراوەتەوە).

# پێرست

## لیستی نەخشەکان




نەخشەی ژمارە (١): ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست




نەخشەی ژمارە (٢): سنووری ئێران ــ عێراق




نەخشــەی ژمــارە (٣): دابەشــبوونی دیمــۆگرافیی کــورد لە ڕۆژهەڵاتــی ناوەڕاستدا، ١٩٩٦. لە کتێبی (ئێران، عێراق و میراتی جەنگ) وەرگیـراوە، کە لە لایەن لۆرانس ج. پێتەر و گرەی ج. سـیکەوە نووسـراوە، نیویـۆرک: پاڵگرەیڤ ماکمیلان، ٢٠٠٤، ل٧٢.




MAP 4. Halabja district

نەخشەی ژمارە (٤): ناوچەی هەڵەبجە




نەخشەی ژمارە (٥): ناوچەکانی ئۆپەراسیۆنی ئەنفال (مایکڵ میلەر)

## کورتکراوەکان

- BWC ڕێککەوتننامەی چەکی بایۆلۆجیی ساڵی ١٩٧٤
- CIA دەزگای موخابەراتی ئەمەریکا (سی ئای ئەی)
- CW چەکی کیمیایی
- CWC ڕێککەوتننامەی چەکی کیمیایی ساڵی ١٩٩٣
- DIA دەزگای هەواڵگریی بەرگری (ئەمەریکا)
- FBIS خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی دەرەوە، خزمەتگوزارییەکی وەرگێڕانە بۆ سی ئای ئەی CIA
- FOIA یاسای ئازادیی زانیاری
- HRW هیومان ڕایتس ووچ
- IAEA دەزگای وزەی ئەتۆمیی نێودەوڵەتی
- PUK یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان (ی ن ک)
- ICP پارتی کۆمۆنیستی عێراق
- ICRC کۆمیتەی نێودەوڵەتیی خاچی سوور
- IRNA ئاژانسی هەواڵی کۆماری ئیسلامیی ئێران
- IUMK بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان
- KCP پارتی کۆمۆنیستی کوردستان
- KDP پارتی دیموکراتی کوردستان (پ د ک)
- KDP_I حیزبی دیموکراتی کوردستان ـ ئێران (حدکا)
- KPDP پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان
- KSP حیزبی سۆشیالیستی کوردستان (حسک)
- MID بەڕێوەبەرێتیی هەواڵگریی سەربازی عێراقی (ئیستیخبارات)
- MSF پزیشکانی بێسنوور
- NPT پەیماننامەی تەشەنەنەکردنی چەکی ئەتۆمی
- NSA دەزگای ئاسایشی نەتەوەیی (ئەمەریکا)
- NSC ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی (ئەمەریکا)
- PKK پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە)

## کارێکی ژەهراوی

لە مارتی ١٩٨٨ و لە دەمی جەنگی ئێران ـ عێراقدا، لە هێرشێکی کیمیاییدا بۆ سەر هەڵەبجە، کە شارۆچکەیەکی دوورەدەستی کوردستانی عێراقە، هەزاران کەس کوژران. لە گەرماوگەرمی ئەو ترس و تۆقین و شڵەژانەی بە دوایدا هات و کەوا کێ ئەم هێرش و پەلامارەی ئەنجام داوە، هەر لایە ئەوی تری تاوانبار دەکرد لە بەردەوامبوونی کوشتاری جەنگدا، بەڵام هەر کە تەمومژەکە ڕەوییەوە، بەرپرسیارێتیی ڕژێمەکەی سەدام حسێن ئاشکرابوو، لەگەڵ پشتیوانیی بێدەنگی هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکان بۆ عێراق. ئەم کتێبە، کە لە لایەن چاودێرێکی بەئەزموونی مافەکانی مرۆڤەوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە ئەنجام گەیشتووە، چیرۆکی گازبارانی هەڵەبجە دەگێڕێتەوە و ئەوە دەخاتە ڕوو کە چۆن عێراق توانیویەتی پیسترین چەکی کیمیایی پەرە پێ بدات و سەربازەکانی ئێران و گوندە کوردەکانی پێ بکاتە ئامانج و ئەمەریکاش چاوپۆشیی لێ بکات. ئەمڕۆش لە کاتێکدا کە عێراق لە بەر یەک هەڵدەوەشێت و تا دێت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زیاتر نوقمی پشێوی دەبێت، ئەو سیاسەتانە سەرلەنوێ بەرۆکی ئەمەریکا و ڕۆژئاوا دەگرنەوە.

یوسـت ڕ. هیلّتەرمـان تـوێژەر و ئاگـادارێکی ئەزمـوونی ڕۆژهەلاتـی ناوەڕاسـتە و لە کاتێکدا کە خەریکـی شـیکاریی ئەم کتێبە بوو، وەک بەڕێوەبەری بەشـی چەکداریی هیومـان ڕایـتس وۆچ کـاری دەکـرد، ئێسـتاش جێگـری بەڕێـوەبەری پڕۆگرامـی ڕۆژهەلاتـی ناوەڕاسـت و بـاکووری ئەفریقـایە لە گرووپـی قەیـرانە نێودەوڵەتییەکانـدا. کتێبـی (لە پشـت ئینتیفـازەوە: بزووتنەوەکـانی کرێکـاران و ژنـان لە هەرێـمە داگیرکراوەکـانی فەڵەسـتیندا)، سـالّی ١٩٩١، یەکـێکە لە بلاوکراوەکانی دانەر.

بە ڕێزەوە ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم بە: (ف)، (ع)، (ی)، (ت)، (و)، (ی)، کە دەربـــازبووی کوشـــتاری ئەنفـــالن و ئەوانەش کە ڕزگاریان نەبوو. هەروەها پێشکەشی دەکەم بە هەمـوو قوربانییـانی جەنگی کیمیـایی عێـراق لە هەڵەبـجە و بەرەکانی جەنگ و شوێنەکانی تر.

یوست هیلتەرمان

## پێشەکیی وەرگێڕ بۆ چاپی دووەم

نێوان ئەم چاپی دووەمە و چاپی یەکەمی وەرگێڕانە کوردییەکە زیاد لە دوازدە ساڵ و نیوە و ماوەیەکی واش بەشی ئەوە دەکات کە جۆرە هەڵسەنگاندنێک بکرێت بۆ ئەم بەرهەمە شاکارەی کەسێکی پسپۆڕی بیانی لە ئاستی یوست هیلتەرماندا، کە لانیکەم لە ساڵی ۱۹۹۱ەوە شارەزای دەرد و مەینەتییەکانی کوردە و پێش نووسینی ئەم کتێبەش لەسەر تاوانی گازبارانی هەڵەبجە لەگەڵ تیمێکی کارامەی ڕێکخراوی هیومان ڕایتس ووچ - میدڵ ئیست ووچدا ڕۆڵی سەرپەرشتی بینیوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی ورد لەسەر ئەنفال و ماوەیەکی زۆریان لە کوردستانی دوای ڕاپەڕیندا بەسەر بردووە بۆ کۆکردنەوە و تاوتوێکردنی وردەکاری لەسەر تاوانی ئەنفال و ئەنجام لە ساڵی ۱۹۹۳دا ڕاپۆرتە کتێبێکی ئاستبەرزی لێ هاتە بەرهەم بە ناوی "جینۆساید لە عێراقدا... پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد"، کە پاش چەند ساڵێک کرایە کوردی و تا ڕادەیەک پێشوازییەکی باشی لێ کرا و تا ئێستا سێ جار چاپ کراوەتەوە و بابەتیترین و زانستیترین سەرچاوەیە لەسەر ئەو تاوانە. نووسەر لەگەڵ تیمی ئاماژەپێکراودا، لەو دەمەوە زانیاریی لەسەر گازبارانی هەڵەبجەش کۆ دەکردەوە و دواتر چواردە ساڵی تری خستە سەر و تەرخانی کرد بۆ ئەو تاوانە سامناکەی لە هەڵەبجەدا

ئەنجام درا و کتێبی ناوازەی "کارێکی ژەهراوی... ئەمەریکا و عێراق و گازبارانی هەڵەبجە"ی لێ بەرهەم هات، کە پایزی ساڵی ٢٠٠٧ زانکۆی ناوداری کامبریج چاپ و بڵاوی کردەوە. هیڵتەرمان لەپێناوی بەئەنجامگەیاندنی کارە زانستییەکەیدا و بەدەستهێنانی زانیاری لەو کەسانەوە کە لە نزیکەوە مامەڵەیان لەگەڵ تاوانەکەدا کردووە، چ وەک قوربانیی دەربازبوو یان وەک چاودێر یاخود بە هەر شێوەیەک پشکێکیان هەبووە تێیدا و ئەم گەلێکیانی وەک شایەتحاڵ دواندووە و دواتر بەراوردی کردووە لەگەڵ میدیا و ناوەندەکانی بڕیاربەدەستی ئەو سەردەمەدا. لەم پێناوەشدا گەلێ شار و وڵات گەڕاوە کە پەیوەندییان بە تاوانەکە و شانۆی بەرپابوونی بووە و سەرنجی چەند سەنتەرێکی توێژینەوەی جیهانیی بۆ مەسەلەکە ڕاکێشاوە بە ئاراستەی هاوکاریکردن و لەئەستۆگرتنی تێچووی گەشت و کارەکانی تری پەیوەندیدار بە لێکۆڵینەکەیەوە.

نووسەر لە بەشێکی پێشەکییەکەی خۆیدا کە بۆ چاپی یەکەمی کوردییەکەی نووسیوە و لە چەند بۆنەیەکیشدا بۆ وەرگێڕی باس کردووە کەوا چۆن تووشی جۆرە نائومێدی و دڵساردییەک بووە لەوەی لە ئاستی ئەمەریکا و ئەورووپادا پێشوازییەکی ئەوتۆ نەکراوە لە کتێبی "جینۆساید لە عێراقدا و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد"، کە لە ساڵی ١٩٩٣دا جووتە ڕێکخراوی دەستەخوشکی هیومان ڕایتس وۆچ - میدڵ ئیست وۆچ (لەو دەمەدا ناوەکە بەم شێوەیە بوو) بڵاوی کردووەتەوە و هەرچەندە کارێکی زانستی و بابەتی بوو لەسەر جینۆسایدی کورد، بەڵام نەگەیشتووەتە ئاستی بایەخدانی جیهانی ڕۆژئاوا بە جینۆسایدەکانی تری

چەشنی هۆلۆکۆست و ئەوانی تر. من پێم وایە هۆکار زۆرن بـۆ ئەوە و لە نێویانـدا کتێبێکـی وا دەبـوو دەزگـایەکی بڵاوکەرەوەی ناوداری چەشنی ئەمەزۆن و جۆنز هـۆپکینز و... تاد، ئەرکی دابەشکردن و فرۆشتنی لە ئەستۆ بگرتایە، بەڵام لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا کارێک لەسەر جینۆساید و قڕکردنـی گەلێکـی بێـدەرەتانی وەک کـورد، لە ئاسـت و بـازنەیەکی تەسـک و دیـاریکراودا نەبێـت کـێ لای لـێ دەکـاتەوە؟ بـێجگە لەوەش ڕێکخـراوی نـاوبراو ئەم کتێـبە دانسقەیەی لە ئاستێکی زۆر نزم و نەشیاودا بڵاو کردەوە و خەڵکی کورد، بە خۆیشمەوە، لە گەلێ کتێبخانەی ناوداری ئەورووپـا و ئەمەریکـادا بـۆی دەگەڕان و هـیچ سـۆراخێکی نەبوو. ڕاستە ئەو ڕێکخراوە و بە تایبەتی بەشی میدڵ ئیست وۆچیان لە سەروەختێکی سەرەتای ساڵانی نەوەدەکاندا، ئەو کارە باش و دانسقەیەیان ئەنجام دا و دواتر وەک بڵێی لێی پاشگەز بوونەوە و هەر خۆیان بایەخێکی ئەوتۆیان نەدایە. تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی کە من لە ئەمەریکا بە چەندین نـامە و پەیوەنـدیی تەلەفـۆنی داوای ڕوخسـەتی یاسـایی و مەعـنەویم لـێ کـردن کەوا وەرگێـڕانیم بـۆ کـوردی تەواو کردووە و ڕێگەم بدەن لە دەزگایەکی کوردی لە ئەورووپا بە چـاپی بگەیەنـم، کەچـی لەجیـاتیی ئەوەی دەستخۆشـی و ستایشـی ئەم ئەرکەم بکەن، ڕێگرییـان لـێ کـردم. پـێم وایە هەندێک کەسی شۆڤێنیی عەرەب و مەیلداری بەعسی عێراق، کە لەو ڕێکخـراوەدا وا دیـار بـوو دەستڕۆیشـتوو بـوون، دەستیان لەو کـارەدا هەبـوو، هەرچەنـدە دۆسـتێکی کـوردی ئاگـاداریش لە ئەمەریکـا شـتێکی سەیروسـەمەرەی پـێ وتـم کەوا یەک دوو کوردی دۆسـت و ئاشـنای ئەو ڕێکخـراوەش

بەو نیـازەی خۆیـان بـیکەنە کـوردی و بـڵاوی بـکەنەوە، ئەوانـیش دەسـتیان لەو مەسـەلەیەدا هەبـووە. بە هەرحـاڵ، ئەمەش جۆرێک بوو لە دەردەکورد کە وڵاتانی ڕۆژئاوا بە زەقی هەستی پێ دەکرێت. هەڵبەت من هەر کۆڵم نەدا و ئامۆژگاریی پیاوێکی عەرەبی ئوردنیم گرتە گوێ، بە ناوی هـانی مەجـالی، کە لەو ڕێکخـراوەدا کاربەدەسـت بـوو و هەرچەنـدە نەمدەناسـی و هەر پەیوەنـدیی تەلەفۆنیمـان لە نێواندا هەبوو بۆ مەسەلەی وەرگرتنی مافی کۆپیڕایتی چاپە کوردییەکەی. ئەم پیاوە ڕێکوپەوان وتی لێرە ئەو مافە بە زۆر کەس نادەن، بەڵام کاتێ بەرهەمی ئێمە بێ مۆڵەت چاپ و بڵاو دەکەنەوە، ئەو کاتە ئێمەش هەقمان نییە بەسەرەوە و بێدەنگیی لێ دەکەین و کاری ڕاست بێت، منیش هەر وام کرد و تا ئێستا سێ جاریش چاپ کراوەتەوە لە کوردستان. بێگومـان وەک نووسـەر باسـی دەکـرد، چاپە ئینگلیـزییەکەی کتێبی "کارێکی ژەهراوی" لەوی ئەنفال باشتر نەبوو، چونکە بـۆ ئەمـیش لە وڵاتـانی ڕۆژئـاوا و ئەمەریکـا هـیچ دەگدانەوەیەکی نەبوو، ئەگەرچی کەسێکی شارەزا و بەئاگای هۆڵەنـدی - ئەمەریکیـی لە خۆیـان وەک دکتـۆر یوسـت هیڵتەرمان نووسیویەتی و کنە و لێکۆڵینەوەی زۆر بابەتی و وردی تێـدا کـردووە، لەسـەر کـوێیش؟ لەسـەر تـاوانێکی سامناکی وەک ژەهربارانکردنی هەڵەبجە کە لە سەرانسەری دنیادا دەنگی دایەوە و ویژدانی مرۆڤایەتیی ڕاتەکاند.

لێـرەدا دەردەکەوێـت کە ئەم دنیـایە چەنـد دنیـای بەرژەوەنـدییە و لە ئاسـتی پەیوەنـدییە نێودەوڵەتییەکـان و بڕیاربەدەسـتانی وڵاتـان و بە تـایبەتی خـاوەن کارگەکـانی چەکی جۆراوجۆر و لە نێویشیاندا چەکی کۆکوژ و کۆمپانیا

زەبەلاحەکانیـــان، چەنـــد چـــاوچنۆک و ویڵـــن بە دوای ساغکرنەوەی کـالا سـامناک و مرۆڤکوژەکانیـانەوە و لە ڕاستییەکی زۆر تاڵدا ماف و ژیانی مرۆڤ هیچ نرخێکی نییە لایـان و ئەوەش کە پڕۆپاگەنـدەی میـدیای بـۆ دەکەن، تەنها درۆ و چاوبەســتییە و هیچـــی تـــر. ئەوجـــا لەم کەش و پەیوەنـدییە ئـاڵۆز و سـامناکەدا، کتێبێـک لەسـەر کوشـتنی شـارێک بە گـازی کیمیـایی دەربچێـت و دڕنـدەیەکی وەک ڕژێمی بەعسی عێراق ئەنجامی دابێت، چ بایەخێکی هەیە بۆ ئەوان، ئەگەر بەراوردی بکەیـت بەو هەمـــوو چەکوچـــۆڵە ئاسایی و قەدەغەکراوە نێودەڵەتییەوە کە پێیـان دەفرۆشـت؟ ئـا لێرەوەیە کە هەر چی نـرخ و بەهـای بـاڵای مرۆڤـایەتییە بایەخێکی لای ئەوان نامێنیت، چجای کتێبێک لەسـەر ئـازار و ئەشکەنجەی مرۆڤگەلێک دەرچوویێت کە نە نەوت و کـانزای هەبێت بۆیـان دابین بکـات و نە بـازاڕێکیش شـک ببـات بـۆ ساغکردنەوە کالای چەک و بازرگانییان. تۆ بڕوانە، کـاتێ کە عێـراق لە جەنگـدا بـوو دژ بە ئێـران، هەر چییەکـی کـرد لە بەکارهێنـــانی چەکـــی قەدەغەکـــراوی نێـــودەوڵەتی و بە تایبەتییش گازە ژەهـراوییە جۆراوجۆرەکـان دژ بە لەشـکر و خەڵکی سـڤیلی ئەو وڵاتە لە لایەک و لە سـەرێکی تریشـەوە دژ بە کـوردی سـڤیلی گـوایە وڵاتەکەی خـۆی، لە قۆنـاغە جۆراوجۆرەکانی جینۆسایدی کورددا و کوشـتنی بەکۆمەڵی خەڵکـی مەدەنیـی کـورد بە فەیلـی و بـارزانی و کوشـتنی سیسـتماتیک لە ئەنفـال و هەڵەبـجەدا، بە ئاگـاداریی دەزگـا هەواڵگرییەکـانی تەواوی زلهێزەکـانی دنیـا، بە دەزگـــای موخـابەراتی مەرکەزیـی ئەمەریکاشـەوە، وەک زەبەلاحـترین زلهێزی ئەمڕۆی دنیـا، کەچی لە کردار و گوفتـاری میدیایی

پڕ لە تەفرە و چاوبەستی زیاتر هیچ کاردانەوەیەکیان نەبوو و بگـرە بە ئاشـکرا و بە نهێنـی هاوکـاریی جۆراوجـۆری ڕژێمـی عێراقیشـیان دەکـرد و بە قێزەونتـرین شـێوەش پەردەپۆشی تاوانەکانیان دەکرد. بەڵام لە پاش کۆتایی جەنگ لەگەڵ ئێراندا و کاتێ کە سەدام حسێنی سەرۆکی ڕژێم و دیکتـاتۆری ملهـوڕی عێـراق لە بـازنەی بەرژەوەنـدییە بنەڕەتییەکانی ئەوان ترازا و کوەیتی داگیر کرد و بوو بە مـایەی هەڕەشـە بـۆ سـەر سـعودیە و میرنشـین و شێخنشینەکانی کەنداو و نەوتی شادەماری بەرژەوەندییان کەوتە مەترسـییەوە، هەمـوو پێوەرەکانیـان بەرانـبەر بەم ڕژێمە هەڵگێڕایەوە و بایان دایەوە سەر پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژ بە کورد و تاوانی ئەنفال و هەڵەبجە و کۆمەڵکوژییەکانی تری کوردیان بە زەقی خستەوە بەر باس و پڕۆپاگەندەی میدیای جیهانی و لەژێر پەردەی خاوەنداریێتیی عەمباری چەکی کیمیایی و کۆکـوژی تـردا داروپەردووی ئەم وڵاتەیـان داتەپانـد و گۆڕینی ڕژێمیان کردە مژدە بۆ خەڵکی ستەمدیدەی دەستی ئەو ڕژێمە قێزەونە، کەچی سیستەمێکی لەو خراپتریان لە شوێنی دامەزراند، بە ڕادەیەک کە خەڵکی وڵاتەکە ڕەحمەت بۆ کفندز بنێرن.

باشە وا وتمان جیهانی ئەمڕۆ جیهانی بەرژەوەندییە و کە مافت پێشێل کرا و بوویت بە یەکێک لەو میللەتانەی سەر زەوی کە تاوانی جینۆسایدی لە بەرانبەردا بەرپا کراوە، خۆ دەبێـت هـیچ نەبێـت وەک مـیللەت، نەک ئەم چەشـنە حـوکمڕانەی کە سـواری سـەرت بـووە و دەردی پەنـدە کـوردییەکە دەڵێـت، پەڕۆیەک لەوان دادڕێـت و چـاو لە

هەنـدێک کـردار و ڕەفتاریـان بکەیـت. تـۆ بـڕوانە جـوو و ئەرمەن و ڕوانـدا و کـوێ و کـوێ، کە چـۆن بەردەوام و سـەرومڕ هەر چی ئـامڕاز و هۆکـار هەیە بە کاریـان هێنـاوە بـۆ ناسـاندنی ئەو دەرد و ئـازارەی نەوەکـانی پـێش خۆیـان چەشتوویانە بە جیهـانی دەرەوەی خۆیـان و بۆ پێشخسـتنی ڕەوتـی ژیانیـان پەنـد و ئەزموونیـان لـێ وەرگرتـووە و هەندێکیان دەوڵەتیشیان لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراندووە و دۆسـتی زۆریـان بـۆ خۆیـان پەیـدا کـردووە و کەسـایەتیی کـاریگەر و پەرلەمـان و دامەزراوەی دەستڕۆیشـتووی گەلـێ وڵاتـی زلهێز و کاریگەریـان ناچـار کـردووە، مـل بە ڕەوایـی کێشـەکەیان بدەن و بگرە وەک خاوەنمـاڵ کاریشـی بـۆ بـکەن و بەمەش سـەرباری ئەوەی کە کردوویـانە، ئاینـدەی نەوەکانی پاشەڕۆژیشیان مسۆگەر کردووە لەوەی دووبـارە هەمـان دەردیـان تـووش نەبێـتەوە. کەچـی لای کـوردی بە هەزار ڕەنـگ مارانگەسـتە، زۆربەی ئەوەی میللەتـانی تـر کردوویـانە و بەردەوامـن لەسـەری، لای ئەم بـوونی نیـیە. تەنـانەت کارێکیشـی نەکـردووە کە نەوەکـانی ئاشـنای مەرگەسـاتەکانی بـن، لە ڕووی تـا ڕادەیەک مێژوویـی و زانستییەوە، نەک ڕاگەیاندنی دروشمبازی پفهەڵدراو، ئەوەی لە هەنـدێک بـۆنەی بێگیـان و بێنـاوەڕۆکی ئەو یـادانەدا پەیڕەوی دەکرێت. ئێستا لای گەنجی کورد کێ یادی ئەنفال و هەڵەبـجەی بیـر مـاوە، بەو سـامناکییەی کە مێژوویەکـی زۆریشـی بەسـەردا تێنەپەڕیـوە؟ مەسـەلەکە هێنـد کـاڵوکرچ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت کەوا مایەی شـەرمێکی گەورەمـانە. بـا زۆر دوور نەڕۆیـن و هەر وەک نمـوونەیەکی زەق و بەرچـاو باسـی بکەیـن، وەک ئامـاژەیەک بـۆ بێبـاکی و

کەمتەرخەمیی خەڵکی ئێمە، سەرەتای ساڵی ٢٠٠٨ ئەم کتێبەی کە ئێستا چاپی دووەمی لە بەردەستتاندایە، "کارێکی ژەهراوی... ئەمەریکا و عێراق و گازبارانی هەڵەبجە"، ئێمە لە پاش چەند مانگێکی کەم لە بڵاوکردنەوەی چاپە ئینگلیزییەکەی لە زانکۆی کامبریجەوە، بە پەرۆشەوە کردمانە کوردی و لە بەهاری ساڵی ٢٠٠٨دا دەزگای ئاوێنە چاپ و بڵاویان کردەوە و تەنانەت لە خەیاڵی خۆیاندا بە تەما بوون چەندین جار چاپی بکەنەوە و هەزاران دانەی لێ بفرۆشرێت و لە بەرگی ناوەوەیدا نووسیبوویان کەوا داهاتی قازانجی ئەم کتێبە تەرخانە بۆ ئاوەدانکردنەوە و بووژاندنەوەی ژێرخانی داڕووخاوی هەڵەبجە. پاشان بە ئامادەبوونی نووسەر و وەرگێڕ کۆڕێکی گەورەمان بۆ کرد و ئەو دەستەبژێرە ڕۆشنبیرەی خەڵکی دڵگەرم و کیمیاییزەدەی هەڵەبجە، ژمارەیەکیان لێ کڕی و من و هێڵتەرمانی نووسەری کتێبەکە ئیمزامان بۆ کردن. دواتر چەند کۆڕێکی تریشی لە هەڵەبجە و شوێنانی تر بۆ کرا و ئێمە پێمان وابوو دەبێت بە خێرایی چاپی دووەمیشی بکەینەوە، چونکە ئەم تیراژی دوو هەزار دانەیە، کە لە کتێبی کوردیی لای خۆماندا بەرزترین ژمارەیە و هەڵبەت برادەرانی دەزگای بڵاوکردنەوەی ئاوێنەش کیسەیان بۆ هەڵدووریبوو، گوایە بە داهاتەکەی لایەک لە هەڵەبجەی پێ ئاوەدان دەکەنەوە، کەچی وا دەرنەچوو و کتێبەکە ژمارەیەکی کەمی لێ ساغب ووەوە (بەڵام دەبێت ئەو ڕاستییەش بگوترێت کەوا برادەرانی ئاوێنە ئەزموونی ساغکردنەوە و هونەری بازارکردنی کتێبیان نەبوو، بۆیە وای لێ هات)، بە گشتی خەڵکی لای خۆشمان خوێندنەوەیان

نەکـردووەتە پیشــە و پێداویسـتیی ڕۆحـی و بـێجگە لەوەش هۆکاری تریش ئەوەندە زۆرن لە ژماردن نایەن، دەنا دەبـوو هەمـوو مـاڵێکی کـورد ئەم کتێبە و کتێبەکەی "جینۆسـاید لە عێراقدا"یان لە ماڵدا بوایە و ناوبەناو بە ئەندامانی خێزانیـان بخوێنـدایەتەوە، بە تـایبەتی نەوەی گەنجیـان، بـۆ ئەوەی لە سـەرچاوەی ڕاسـت و دروسـتەوە زانیـاریی مەرگەسـاتی میللەتەکەیـان دەست بکەوتـایە، نەک بەم شێوە کرچوکـاڵەی ئێسـتا هەیە لە نـاو کـۆمەڵی کـورددا و حکـومەتیش پـلان و بەرنـامەی زانسـتیی نیـیە بـۆ مـامەڵەکردن لەگەڵ ئەم مەسـەلەیەدا. هەر بـۆ پاڵپشـتیی ئەم بێئاگـاییەی زۆربەی گەنجان و نەوەی دوای جینۆسایدەکانمان، نموونەیەکتـان بۆ دەهێـنمەوە. دوو سـێ سـاڵێک لەمەوپـێش ڕێکخراوێکـی ناحکومیی هەڵەبجە کە ئەندامەکانی خۆبەخشانە کار لەسـەر بەرکەوتـوانی قوربـانیی چەکـی کیمیـایی دەکەن، دەستپێشخەرییەکی باشیان کرد بۆ ڕێزلێنان لەو کەسانەی بـابەت و بەرهەمیـان هەبـووە بـۆ مەرگەسـاتی هەڵەبـجە و کاریان ڕاست بێت، منیشیان بانگ کرد و داوایان لێ کردم دانەیەک لە کتێبـی "کـارێکی ژەهـراوی" لەگەڵ خـۆم بـبەم، چـونکە نییـانە. منـیش، کەوا کـاتی خـۆی پەنجـا دانەم لە دەزگای ئاوێنەوە درابوویە و پەنجـای تریشـم کڕییەوە، هەر بۆ ئەوەی بیبەخشـمە برادەر و دۆسـت و بیخـوێننەوە، تـاقە دوو دانەی ئەرشـیڤەکەم مـابووەوە و دانەیەکـم بـۆ بـردن. برادەرانـی ڕێکخـراوەکە بۆنەکەیـان لە هـۆڵی مۆنـۆمێنتی هەڵەبـجە سـاز کردبـوو و کـوڕێکی گەنـج یەک یەک بـانگی دەکردینە سەر سەکۆ (ستەیج) بۆ ڕێزلێنانمان و بۆ هەندێک زۆر ناشیانە دەیگوت ئەم شیعرێکی هەیە و ئەو چیرۆکێک

و ئەمیان کتێبێک، بێ ئەوەی بچێتە ناوەڕۆکی ئەو بەرهەمە و کاریگەریی لەسەر خەڵک و جینۆسایدی هەڵەبجە، کە پێنج هەزار کەسی لە چەند سەعاتێکدا لێ خنکا و هەناسەیان بڕا.
بە هەرحاڵ، کاتێ نۆرە هاتە سەر من، کوڕەی گەنجی پێشکەشکار تەنها گوتی مامۆستاش بابەتێکی هەیە بۆ هەڵەبجە و هیچی تر. ئاخر کاکی برا چ بابەتێک؟ شیعر، گۆرانی، لاواندنەوە، چی؟ منیش، کە بە تەمای ئەوە بووم کورتەیەک لەو کتێبە دانسقەیە بۆ ئامادەبوان باس بکرێت، بە تایبەتی بۆ ئەو زاتانەی کە ڕیزی پێشەوەیان بۆ تەرخان کردبوون و دڵنیا بووم مەگەر بە دەگمەن، ئەگینا کەسیان تەنانەت ناوی کتێبەکەشیان نەبیستبوو، بە خەمێکی قووڵەوە بیرم لەو هەموو ڕەنجەی نووسەر دەکردەوە کە ساڵانێکی دوورودرێژ کێشابووی بۆ بەرهەمهێنانی ئاوها کارێکی ورد و زانستی و شەونوخونیی خۆیشم بۆ ئەوەی تا بتوانم بە ئەمانەت و بە زمانێکی کوردیی ڕەوانەوە بگاتە خوێنەر و کەچی کاکی پێشکەشکاریش بڵێ مامۆستاش بابەتێکی هەیە بۆ کیمیابارانی هەڵەبجە و نەیشڵێت چییە و چی نییە و بابەتەکەش کتێبێکی قەبەی نزیکەی ٤٥٠ لاپەڕە بێت بە فۆنتی ورد!

ئەوجا ڕەنگە بپرسن کە دەزانیت حاڵی کورد و خوێنەری کورد ئاوهایە، کەواتە ئەی چاپی دووەمت لە چی؟ زۆر ڕاستە و ڕەنگە ئەم جارەش هەر بە دەردی جاری پێشوو بچێت و لە وڵاتێکدا کە پلان بۆ هیچ شتیک نەبوو، ئەوە تیۆریی قەزا و کوێرەکە سەرپشکە و ئێستا کتێبەکە لە بازاڕدا نەماوە و چەند دۆستێکم زۆر مەبەستیانە و دەڵێن سپۆنسەری بۆ پەیدا دەکەین و کەسانێک هەن لە ئێستادا

سۆراخی دەکەن و خۆ دە هەزار دانەی لێ چاپ ناکەین، ئەوپەڕەکەی پێنجسەد یان هەزار بێت. هەروەها دەبێت پێ لەو ڕاستییەش بنێین کە سەری دنیا بە پووش نەگیراوە و تۆبلێی ئەوەندە خوێنەرمان نەبێت لەم سەردەمەدا بە دوای کارێکی ئاوها دانسقە و بابەتیدا بگەڕێن، ئەگەر چاپێکی پوخت بکرێت. بێگومان بۆ ئەم چاپەیان وەک برادەرانی ئاوێنە ناکەین کە بۆ چاپی یەکەم کردیان و لەسەری نانووسین "داهات و قازانجی ئەم کتێبە بۆ ئاوەدانکردنەوەی هەڵەبجەیە"!

محەمەد حەمەساڵح تۆفیق
کانوونی یەکەمی ٢٠٢٠

## پێشەکیی نووسەر بۆ چاپی یەکەمی وەرگێڕانە کوردییەکە

من ئەم کتێبەم بە دڵسۆزییەکی زۆرەوە نووسی، لەبەر ئەوەی کتێبێکی پێشتر کەوا بەشێکی باشی لێکۆڵینەوەم بۆ کردبوو، بە ناوی (تاوانی جینۆسایدی عێراق: پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد)، کە لە لایەن چاودێریی مافی مرۆڤەوە (هیومان ڕایتس ووچ) بڵاو کرایەوە، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئەورووپا بایەخێکی کەمی پێ درا، کاتێک کە لە ساڵی ١٩٩٣دا بڵاو بووەوە. من نەمتوانی لەوە تێبگەم بۆچی کتێبێک کە تاوانی جینۆسایدی بە دۆکیومێنت کردبێت، نەیتوانی هەستی خەڵک بورووژێنێت، ئەمە لە کاتێکدا کەوا گرنگییەکی زۆر درابوو بە جینۆسایدەکانی پێشتر، بە تایبەتی هۆلۆکۆست کە لەناوبردنی بەکۆمەڵی جوولەکانی ئەورووپا بوو. ئاخۆ جیهان لەم ئەزموونە هیچ فێر نەبووە؟ ئەوجا هەر لەو سۆنگەیەوە بوو کەوا کەوتمە گەڕانی وردتر بە دوای ئەو ڕووداوانەدا، کە هاوکات بوون لەگەڵ هێرش و پەلاماری ئەنفال و پێش ئەوە، بە تایبەتی ئەو ڕۆڵەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ولاتانی تر گێڕایان بۆ پشتگیریی عێراق لە سەردەمی جەنگی ئێران ـــ عێراقدا. لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێت تاقە جەنگ بووبێت لە سەردەمی جەنگی ساردەوە، کە چوار ئەندامی لە پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی

ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکێتیی سۆڤییێتیشەوە، لە هەمان لادا کۆ کردبێتەوە (هەموان لەگەڵ عێراقدا بوون دژ بە ئێران) و پێنجەمیشیان کە چین بوو، بە بێلایەنی مایەوە.

· ئەوەی کە من بینیم شتێکی دڵخۆشکەر نەبوو، بەڵام زۆر شتی ڕوون کردەوە و بۆم دەرکەوت کەوا جەنگەکان نەک هەر دەبنە مایەی بەرپابوونی تاوانگەلی گەورە، بەڵکو دەشبنە هۆی درۆی زل زل بۆ پەردەپۆشکردنی تاوانەکان و بێدەنگیی تری ئەوانەش کە پشتگیریی ولاتێک دەکەن لە شەڕدا و تا چەند بتوانن، توانای ئەو ولاتە زیاتر بکەن بە خوایشتی خۆی ڕەفتار بکات، بێ هیچ سزایەک و کوشتاری سامناک بەرپا بکات، بە تاوانی جینۆسایدیشەوە و پاشان وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرباز بێت. کاتێ کەوا کورتەیەکی ئەوەم بۆ دەرکەوت کە لە ماوەی جەنگی ئێران ـــ عێراقدا چی ڕووی داوە، بڕیارم دا بە وردی لێی بکۆڵمەوە، بۆ ئەوەی بتوانم لە تێڕوانینی ئەو ئەکتەرە جیاوازانەوە کە بەشداریی شەڕ و ململانێکەیان کردووە، چیرۆکەکە بگێڕمەوە و چارەسەری هەندێک لەو مشتومڕانە بکەم کە تا ئێستاش ساغ نەبوونەتەوە.

بێگومان ئەو تاوانەی کە من بایەخم پێ دەدا، پەلاماری ئەنفال بوو، کە بووە هۆی مەرگی دەیان هەزار کەسی بێتاوان. ئێمە پێشتر لەو کتێبەدا، کە لە لایەن هیومان ڕایتس وۆچەوە بڵاو کرایەوە، تیشکمان خستبووە سەر تاوانەکە، بۆیە ئەم جارە ویستم سەرنج بخەمە سەر تاوانێکی تری ترسناک، تاوانێک کە بووە هۆی ئەوەی پەلاماری ئەنفال سەرکەوتن بە دەستب هێنێت و ئەو تاوانەش بەکارهێنانی

چەکی کیمیایی بوو. پێش ئەوەی بچمە ناو ئەم باسەوە، پێویست بوو توێژینەوەکەم فراوان بکەم و لە هەڵەبجە و ساڵی ١٩٨٨ەوە بچمە دواوە بۆ سەرەتای ساڵانی هەشتاکان، کاتێک کە ڕژێمەکەی سەدام دەستی کرد بە تاقیکردنەوەی توخمە کیمیاییە خامەکان، دژ بە هێزەکانی ئێران لە بەرەکانی جەنگدا.

ئەوەی کە من بۆم دەرکەوت، پەرەسەندنێکی مەترسیدار بوو لە سێ بواردا، کە بریتی بوون لە جۆری ئەو گازانەی بە کار هاتن (لە گازی فرمێسکڕێژەوە بۆ گازی خەردەل و پاشان دەمارەگازی جۆراوجۆر)، ئەو ئامراز و هۆکارانەی ئەم گازانەیان پێ ڕێژرا (لە سەرەتاوە بە هۆی هاوەن و تۆپەوە و پاشان بە فڕۆکە) و ئامانجەکانیان (لە هێزەکانی ئێرانەوە بۆ هاوولاتییە کوردە مەدەنییەکان لە هەردوو ئێران و عێراقدا). هەروەها ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە گەیشتنە هەر قۆناغێکی نوێ بە هۆی خۆکەڕکردن و بێدەنگیلێکردنەوە بووە لە هەنگاوەکانی پێشتر. ئەوەی وا تینی بۆ هێنام بگەمە ئەنجام، ئەوەیە کە پێویست بوو ئیدارەی ڕیگان هەنگاوی پێشوەختی بنایە بۆ جڵەوکردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە، چونکە لە پێگەیەکدا بوو دەیتوانی بیکات و بەمەش لەوانەبوو سەدام حسێن هەرگیز لە توانایدا نەبوایە گازی ژەهراوی دژ بە خەڵکی مەدەنی بە کار بهێنایە و هەرگیز تاوانی هەڵەبجەش ڕووی نەدایە. بە هەرحاڵ، کە هەڵەبجەش ڕووی دا، ئەگەر ئیدارەی ڕیگان دەسبەجێ کاری بکردایە بۆ ئیدانەکردنی، لەوانەبوو ڕێگریی لە دیکتاتۆری عێراق بکردایە کەوا لە یەکەم ڕۆژی هەر قۆناغێکی ئەنفالدا گازی ژەهراویی بە کار نەهێنایە و بەوپێیە

نەیدەتوانی دەیان هەزار گوندنشینی تۆقیو و ترسلێنیشتوو لە دێهات دەرپەڕێنێت و دواتر بیانکوژێت.

ئامانجی سەرەکیم لە نووسینی ئەم کتێبەدا، باسکردنی ئەوە بوو کە ڕووی دا، بۆ خوێنەرە ڕۆژئاواییەکان و چیرۆکەکە پشت بە گێڕانەوەی ئەوانە دەبەستێت کە لە ڕووداوەکەدا بەشدار بوون: وەک قوربانییانی چەکی کیمیایی، ئەو پزیشکانەی کە چارەسەریان دەکردن، ئەو ئەفسەرانەی سوپا کە زانیارییان هەبوو لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و کەسانی سەر بە هەواڵگری کە چاودێریی جەنگەکەیان دەکرد. هەروەها ئەو دیپلۆماتانەی کە وشەی زیرەکانەیان بە کار دەهێنا بۆ بەرگریکردن لە پێگە و هەڵوێستی وڵاتەکانیان. بەڵام من ئامانجێکی لاوەکیی گرنگی تریشم هەبوو لە نووسینی ئەم کتێبەدا و ئێستا خۆشحاڵم کە ئەم وەرگێڕانە یارمەتیی تێگەیشتنی مەسەلەکە دەدا و بۆ خوێنەرانی کورد و (لە سەرێکی ترەوە بۆ ئێرانییەکانیشی) ڕوون دەکاتەوە کە چۆن ئەم ڕووداوانە بەرپا بوون و چۆن و بە پشتبەستن بە چ زانیارییەک سیاسەتدارێژانی ڕۆژئاوا گەیشتنە بڕیاری خۆیان و چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دەرەنجامەکانی کرد، ویستراو بووبێت یان نا.

هیوادارم لە ڕێگەی ئەم کتێبەوە تێگەیشتنێکی باشتر بۆ کورد برەخسێت کە چۆن سیاسەتی وڵاتە بەهێزەکان کار لە ژیانیان دەکات و ئاوێتەی دەبێت و دەتوانن چی بکەن بۆ دانانی کاریگەری لەسەر ئەو سیاسەتە بۆ ڕێگرتن لە دووبارەبوونەوەی تاوانی گەورەی وەک هەڵەبجە و ئەنفال. هەروەها دەمەوێت یەک دوو قسە بکەم لەسەر مەسەلەیەک کە بایەخی زۆر گەورەی هەیە بەلامەوە، ئەویش ئەوەیە کە

چۆن کوردە سەرنجدەرەکان لێم تێدەگەن، ئەوانەی کە دوو کارەکەی منیان خوێندووەتەوە: ئەوەی لەسەر ئەنفال، کە هیومان ڕایتس ووچ بڵاوی کردەوە و ئەم کتێبەش کە ئێستا لە بەردەستتدایە، لە لایەک و نووسینەکانم بۆ گرووپی قەیرانە نێودەوڵەتییەکان لەسەر مەسەلەی قورس و ئاڵۆزی کەرکووک لە لایەکی ترەوە. هەندێک جار پەیوەندیی تەلەفۆنی یان نامەم لە ڕۆژنامەنووسە کوردەکانەوە پێ دەگات و دەڵێن کەوا سەریان سووڕماوە و تێناگەن کە هەمان ئەو کەسەی یارمەتیدەر بوو لە ناساندنی تاوان و ستەمکارییەکانی ساڵانی هەشتاکاندا بە جیهان، بتوانێت هەڵوێستێکی وا لەسەر کەرکووک وەربگرێت کە ئەوان بە دژەکورد لێی تێدەگەن.

ڕێکخراوەکەم (واتە گرووپی قەیرانە نێودەوڵەتییەکان، و) بە وردی چاودێریی کێشەی کەرکووکی کردووە و بە پشتبەستن بەو چاوپێکەوتنانەی لەگەڵ نوێنەران و کەسانی پێکهاتەکانی کەرکووکدا ئەنجام دراون لە ماوەی چەند ساڵێکدا، گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە باشترین ڕێگە بۆ چارەسەری دۆخی ئەم شارە و پارێزگاکە، ڕیفراندۆم نییە، وەک حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆی دەچێت و گرەوی لەسەر دەکات، بەڵکو لە ڕێگەی پرۆسەیەکی گشتگیر و کۆدەنگی هەموو کۆمیونیتی و پێکهاتەکانەوە دەبێت کە بوار برەخسێنێت کەرکووک بە هەرێمێکی تێکەڵ بمێنێتەوە و هەموو لا هاوبەش بن لە دەسەڵات و سەرچاوەکانیدا، بەلای کەمەوە بۆ ماوەیەکی کاتیی درێژکراوە.

لێکدانەوەی ئەمە، وەک هەڵوێستێکی دژەکورد هەڵەیەکی گەورەیە. ئەو خاڵەی کە من و حکومەتی هەرێمی کوردستان

لەسەری کۆک نین، ئەو پرسیارەیە کە ئاخۆ چی لە بەرژەوەندیی دریژخایەنی کوردە. ئێمە هەموو دەزانین ئێوەی کورد کوردستانێکی سەربەخۆتان دەوێت، ئەمە بەلای منیشەوە هیوایەکی ڕەوا و بەجێیە، بەڵام من باوەڕم وایە ئەمە ئامانجێکی واقیعی نییە لە بارودۆخی ئێستای ناوچەکە و نێودەوڵەتیدا و تەنانەت سەرکردایەتیی کورد لەم ڕووەوە لەگەڵ ئەم ڕایەدان. هەروەها لەوەشدا لەگەڵ منن کە باشترین ڕێگە، قۆستنەوەی ئەم دەرفەتەی مێژووە کەوا کورد ئێستا لە پێگەیەکی باشتردایە بۆ بەرەوپێشەوەچوون، وەک لە ماوەیەکی دووردرێژی لەمەوبەر. بۆیە دەبێت هەر شتێک لە توانایاندا هەیە بیکەن بۆ بەهێزکردنی ئەگەری جیابوونەوەیان لە عێراق لە پاشەڕۆژدا.

بەڵام ئێستا ئێمە گەیشتووینەتە ئەو خاڵەی کە لەسەری جیاوازین. هاوڕێیەکم پێی گوتم جارێکیان لە مەسعود بارزانیی پرسیوە ئاخۆ بە ڕای ئەو گرنگترین شت چییە بۆ کورد، کاک مەسعود لە وەڵامدا گوتوویەتی "ئاسایشمان". کاک مەسعود نەیگوتووە "سەربەخۆیی" یان "دەسەڵاتی زیاتر بۆ هەرێمی فیدراڵ" یاخود "زەوی و خاکی زیاتر کە کەرکووکیش بگرێتەوە"، چونکە ئەو لەوە گەیشتووە کە ئەمانە تەنها هۆکارن بۆ گەیشتنە ئەو تاقە ئامانجەی کە ئاسایشە بۆ کورد، تاوەکو ستەمکارییەکانی ڕابردوو هەرگیز دووبارە نەبنەوە.

لێرەدایە کەوا سەرکردایەتیی کورد و من لەسەر هۆکار جیاوازین، نەک ئامانج، ڕاستییەکەشی ئەوەیە کە لەم کاتەدا پشتگیرییەکی بەرفراوانی نێودەوڵەتی نییە بۆ سەربەخۆیی کورد، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بۆچوونی بەهێز و بەربڵاو

هەیە بۆ ڕەتکردنەوەی. ڕەنگە زۆرێک لە کوردەکان درک بەمە نەکەن، چونکە دەرفەتی ئەوەیان نەبووە قسە لەگەڵ عێراقییەکانی تر، یان تورکەکان، یاخود سوورییەکان، یان ئێرانییەکان یاخود ئەمەریکییەکان بکەن و لەبری ئەوە حەز دەکەن گوێ لەو کەمە خەڵکە بگرن، بە ئەمەریکییەکانیشەوە، کە ئەوە دەڵێنەوە کەوا گەلێک لە کوردەکان پێیان خۆشە گوێیان لێ بێت، بۆ نموونە، ئەوەی کە پشتگیریی سەربەخۆیی کورد دەکەن، بە هەر نرخێک بێت. ئەمە زۆر مەترسیدارە و پێویستە میدیای کوردی ڕووپەری ڕۆژنامە و کەناڵەکانی لەسەر گفتوگۆی ڕاشکاوانە بخاتە سەرپشت، بۆ ئەو کەسانەی ڕاوبۆچوونی جیاوازیان لەسەر مەسەلەکە هەیە.

بە بڕوای من سەرکردایەتیی کورد بە هەڵە ئەم بارودۆخە باشەی ئێستا لێک دەدەنەوە و زۆر توندن و دوور دەڕۆن. ئێمە بمانەوێت و نەمانەوێت کوردستان هەر بە خاکێکی داخراو دەمێنێتەوە و چواردەوری وشکاییە و بە تەواوی پشت بە دراوسێکانی دەبەستێت و ئەمەش سنوورێکی سەختە لە بەردەم خولیا و ئاواتەکانی کورددا. بۆ نموونە، مەسەلەی کەرکووک یەکێکە لەم گرفتانە و فشارهێنان و پێداگرتنی توند، پەیوەندیی کورد لەگەڵ هەموو لایەک دەخاتە مەترسییەوە، لە کەرکووک، لە ناوچەکە و لە کۆمەڵی بەرفراوانی نێودەوڵەتییشدا. ئەمەش لەوانەیە کورد بخاتە دۆخێکەوە کە تیایدا ئەکتەرێکی دڵڕەق و توندوتیژ جارێکی تر بگەڕێت بە دوای دووبارەکردنەوەی ستەمکاری و تاوانەکانی ڕابردوودا، کە تیایدا کەس بە هانای کوردەوە نەیەت، چونکە ئەو کاتە پێی دەڵێن: ئێوە زۆر پێتان داگرت و

له ڕادەبەدەر ڕۆیشـــــتن. ئەم ســـــیناریۆیە ئەوەیە کە بە تەواوەتـی دەمانەوێـت ڕێـگەی لـێ بگـرین و ئەمەش ئەرکـی سـەرکردایەتیی کـوردە کە باشـترین ڕێگەچـارە بدۆزێتەوە و مامەڵەی لەتەکدا بکات و ئەگەر بە شێوەیەکی واقیعی خۆیان بنـوێنن بـۆ بەئەنجامگەیانـدنی ئـاواتە ڕەواکانیـان، ئەو کـاتە دەبینن کەوا زۆر کەس و زۆر حکومەت پشتگیرییان دەکەن.

مــن ئەم کتێــبە پێشــکەش دەکەم بە یــادی هەمــوو ئەو کەســانەی لە هەڵەبــجە و ئەنفالــدا گیانیــان لە دەســت دا و هەمــوو قوربانییــانی دیــکەی دەســتی ڕژێــمە تاوانکــار و بەدەکەی سەدام حسێن، بۆ ئەوەی هەرگیز چیرۆکەکانیان لە بیـــر نەچێـــتەوە و ببێـــتە ڕێنیشـــاندەرێکی بەهێـــزی سەرکردایەتیی کورد بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی ژیرانە و واقیعییـــانە لەپێنـــاوی بەدیهێنـــانی ئەوەی کەوا کـــورد بە بایەخدارترین شتی دەزانێت بـۆ هەمـوان، کە ئەویش ئـارامی و ئاسایشیانە وەک میللەتێک.

یوست هیلتەرمان
١٤ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٧

## گەشت بۆ هەڵەبجە

لە ١٦ی مارتی ١٩٨٨دا تۆ لە کوێ بوویت؟ ئەی باشە من لە کوێ بووم؟ بێگومان کاتێک کە ویژدان پێویستی بە یادەوەری دەبێت، ئەم لە ئاستیدا شکست دێنێت.

١٦ی مارت چوارشەممەیەک بوو کە دەبوو ڕۆژێکی کاری ئاسایی بوایە بۆ زۆربەی خەڵک و سەرنجێکی ئەوتۆی ڕانەکێشایە، ئەو دەمە من لە هاتوچۆی نێوان فەلەستین و کالیفۆرنیادا بووم و لە تەواوکردنی تێزی دکتۆراکەمدا بووم لەسەر بزووتنەوەکانی کرێکاران و ژنان و خەباتیان لەژێر داگیرکردنی سەربازیی سەختی ئیسرائیلدا. نازانم ئەو ڕۆژە لە واشنتۆن دی سی بووم یان لە کوێ؟ بە هەرحاڵ با ئەوێ بێت.

من دەبوو ڕۆژنامەکانی ئەو چەند ڕۆژە بخوێنمەوە، بەڵام شتێکی ئەوتۆ تۆمار نەکرابوو. مەسەلەکەش لانیکەم هەفتەیەکی پێ چوو، پێش ئەوەی هەواڵەکان بڵاو ببنەوە، بەڵام پاشان کارێکی زەحمەت بوو سەردێڕی هەواڵەکان فەرامۆش بکرێت، چەشنی "هێرشی گازی ژەهراوی سەدان کەس دەکوژێت" (*ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست*)، "ئێران، عێراق تاوانبار دەکات بە هێرشی گاز و زیانی تۆقێنەری" (*ڕۆژنامەی ئینتەرناشنال هیراڵد تریبیۆن*)، "قوربانییانی گاز بە ترس و سامی مەرگەوە ڕەق بوون" (*گۆڤاری تایمزی*

*لەنـدەنی*)، "شـارێکی کوردنشـین بە چەکـی کیمیـایی لە نـاو دەبرێت" (*Midi Libre*)، "چەکە چەپەڵەکانی سەدام حسێن" ( *Le Nouvel Observateur*)، "کۆتـایی دنیـا و کاولکـاریی تەواوی جەنگی کیمیـایی" (*Quotidien de paris*)، "ئەمە هیرۆشـیمایەکی کـوردە" (*Wiener Zeitung*)، "جەنگی کیمیـایی لە کوردسـتانی عێراقـدا" (*El pais*)، "جینۆسـایدی خەڵکی کـورد" (*Le Unita*). ژمارەیەکی *ڕۆژنـامەی نیویۆرک تـایمز*، جاڕ لەوە دەدات کە عێـراق دژ بەوە وەسـتاوەتەوە کە "بە تەواوەتـی تاوانبـار دەکرێـت، چـونکە پەنـای بـردووەتە بەر چەکـی کیمیـایی... ڕاسـتییەک بە هەمـوو مانـا و پێوەرێـک بە تـاوانی جەنـگ لەقەڵەم دەدرێت"[1].

لەم سەروبەندەدا ناوێک هـاتە ئاراوە، ئەویـش "هەڵەبـجە" بـوو، کە شـوێنێکە کەس نەیبیسـتبوو، بەڵام وا بـاس دەکـرا گونـدێکە لە هەرێمـی کوردەکـانی عێراقدا. ڕاسـتییەکەی ئێـرە شـارۆچکەیەکی گەورە بـوو و بە کـۆمەڵگەی نیشـتەجێی دانیشـتوانی گونـدە وێرانکراوەکـان دەور درابـوو. ئەو دەمە تەلەڤیزیـۆن کەوتە پیشـاندانی دیمەنـی ترسـناک لە شـوێنی کارەسـاتەکەوە: لاشـەی ژن و منـداڵ لە پشـتی ئۆتـۆمبیلێکی بارهەڵگری پیکـابەوە بەسـەر یەکدا کەوتبوون، هەر وا تەرم بـوو لە دۆڵ و شـیوی نێـو چیاکانـدا پەرتـوبڵاو کەوتبـوو، پیـاوێکی مـردوو لەپەوڕوو کەوتبـووە سـەر زەوی و بـۆ دواجـار کـوڕە کۆرپەیەکی خـۆی لە ئـامێز گرتبوو. هەنـدێک لەم وێـنە و دیمەنـانە دواتـر دەبـنە هێمـا و سـیمبۆل لە کوردسـتاندا، بەڵام لە شـوێنانی تـر زوو لە بیـر چـوونەوە. جیهـان، بـابی یـاری خـۆی، سـرێبرێنیکای خـۆی، تیمیسـواری خـۆی، هیرۆشـیما و ناگـازاکیی خـۆی، لەنـدەن، درێسـدن،

بەرلینی خۆی هەبوو، وا هەڵەبجەی خۆیشی هاتە پاڵ، بەڵام ئێستا کێ لە بیری ماوە؟

لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٢دا، وەک ڕاوێژکارێکی هیومان ڕایتس ووٚچ لە نیویۆرک، سەردانی کوردستانی عێراقم کرد و ئەرکەکەم ئەوە بوو جێگەی هاوکارێکم بگرمەوە، کەوا سێ مانگی لەوێ بەسەر بردبوو، بۆ ئەوەی لە هەرێمەکەدا بگەڕێم بۆ دەستنیشانکردن و چاوپێکەوتنی ڕزگاربوانی ئەو ڕووداوە سامناکانەی کەوا ساڵی ١٩٨٨ بەسەریاندا هات و ئا لەو کاتەدا و بۆ یەکەم جار ناوی هەڵەبجە بە تەواوی ویژدانی داگیر کردم و ئیتر هەرگیز لێم جیا نەبووەوە. هاوشان لەگەڵ ئەوەشدا وشەیەکی تر لام چەسپ بوو، وشەیەک بۆ ئەوەی هەموو کوردێک هەست بە تۆقین و تێکشکان بکات: ئەویش "ئەنفال" بوو، کە ئۆپەراسیۆنێکی دژەیاخیبوون بوو لە دوادوایی ڕۆژانی جەنگی ئێران ـ عێراقدا لە لایەن سەدام حسێنەوە ساز کرا، بۆ چارەسەری بنەبڕی کێشەی کوردی لەمەڕ خۆی. پەلاماری ئەنفال بوو بە هۆی کوشتنی سیستماتیکیی دەیان هەزار خەڵکی سڤیلی کورد، کە یەکەم جار بە گازی ژەهراوی لە گوندەکانیان دەرپەڕێندران و پاشان کۆزەی سەنتەرە کاتییەکان کران و لەوێش بەپێی تەمەن و ڕەگەزی نێرومێ جیا کرانەوە و لە بیابانەکانی ڕۆژئاوای عێراق و دوور لە کوردستان، ڕاپێچی مەرگ کران.

بەپێی ئەزموون و شایەتیی خەڵکانی گرفتار و شایەتحاڵ و ئەو دۆکیۆمێنتانەی لە لایەن کوردەکانەوە دەستیان بەسەردا گیرا، لە ڕاپەڕینەکەی پاش جەنگی کەنداو لە مارتی ١٩٩١دا، هیومان ڕایتس ووٚچ لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژی

لەسـەر پەلامـاری ئەنفـال ئامـادە کـرد و بە ڕاپۆرتێـک، بـۆ یەکەم جـار لە سـاڵی ١٩٩٣دا، بـڵاو کرایەوە و بە ڕادەیەکـی بەرفـراوان پشـتگوێ خـرا. هەروەهـا ڕێکخـراوەکە هەوڵـی بزوانـدنی حکومەتەکـانی دا بـۆ بەرزکـردنەوەی کێشـەیەکی جینۆساید دژ بە عێراق لە دادگای دادی نێودەوڵەتیی لاهایدا، بەڵام بە بایەخەوە گوێی لێ نەگیرا. تەنها ئەوانەی لە سـاڵی ٢٠٠٣دا جێـی ڕژێمیـان گـرتەوە، خواسـتی ئەوەیـان هێنـایە ئاراوە بۆ سەرلەنوێ کردنەوەی دۆسێی هەڵەبـجە و ئەنفـال، شانبەشـانی گەلێکی تر لەو تاوانـانەی کە سـەدام حسـێن و هاوکارانی بەرپایان کرد لە ماوەی سی ساڵی تاکڕەوییاندا.

جیهـانی ڕۆژئـاوا ئـارەزووی سـزادانی سـەرکردایەتیی عێراقیان نەدەکرد، لە مـاوەی دەیەی نەوەدەکانی ئـابلووقەی ئابووریـدا، کـاتێ کە سـەدام حسـێن بە دوای داگیرکردنـی کوەیتـدا، دۆسـتایەتیی لەگەڵ ئەمەریکـادا پچـڕی و ئەوپەڕی بێهیـوایی هێنـایە ئـاراوە. دوای تۆمـارکردنی ئەم هەمـوو درندەییە، من لەگەڵ ئەو ڕزگـاربوانەدا دانیشـتم، کە تەواوی خێزانەکانیان لە دەست دابوو و بریتـی بوون لە شـەش پیـاو و کوڕێک کە بە شێوەیەکی سەرسامکەر و موعجیزەئاسـا لە کوشـتارەکە دەربـاز بووبـوون (یەکێکیـان دواتـر لە شـەڕی نـاوخۆی کوردەکانـدا گیـانی لە دەسـت دابـوو) و ئەم ڕووداوانەیان زۆر بە وردی دەگێڕایەوە. من تـا ئێسـتا لەوە تێناگەم بۆچی کەسێک نەبوو ئەکتیڤانە لەگەڵ ئەم ڕووداوانە مامەڵە بکات؟ تـۆبڵێی مەرگی نزیکەی هەشـتا هەزار کەسـی بێتـاوان و بـێجگە لە چەنـد هەزار کەسـێکیش لە پەلامـارێکی کیمیاییدا، بۆ سەر ناوچەیەکی پڕ لە خەڵکی مەدەنـی، هەر وا

بچێته پەراوێزی مێژووەوە؟ باشە بۆچی کەس سەرنجێکی نەدایە؟

بەم جۆرە و هەشت ساڵ لە پاش یەکەم پەردەهەڵماڵینم لەسەر تراجیدیای کورد، جارێکی تر کەوتمەوە کار بۆ تیشک خستنەسەری زیاتری ئەم کێشانە و تاوتوێکردنی ئەو بارودۆخەی هەڵەبجە و ئەنفالی بەرپا کرد و وەستان لە ئاست بەشێک لەو هەڵاوبگر و مشتومڕانەدا کە ڕاستەوخۆ لە دوای دەرکەوتنی یەکەم دیمەنەکان لەسەر شاشەی تەلەڤیزیۆن، بوون بە گێژەنگ و پێش ئەوەی جیهان ڕوو وەربگێڕێتە سەر مەسەلەکانی تر. باشە بە ڕاستی دەبوو هەر بە تەنها لۆمەی عێراق بکرێت یان دەستێکی نهێنیی ئێرانیشی لە پشتەوە بوو؟ ئاخۆ حکومەتەکانی ڕۆژئاوا، کە بەلای عێراقیاندا دادەتاشی لە جەنگی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێراندا، ئاگاداری ئەوە بوون کە عێراق گازی ژەهراویی بە کار هێناوە، نەک تەنها لە هەڵەبجەدا، بەڵکو بە درێژایی هەشت ساڵی شەڕ و پێکدادان؟ باشە هەر ئیدارەی ڕیگان نەبوو، بە شێوەیەکی تایبەتی، کە نەک هەر چاوپۆشیی لە ڕەفتاری عێراق دەکرد، بەڵکو چالاکانە هانیشی دەدا؟ ئەی لە ڕاستیدا تا چەند بەکارهێنانی گاز لە لایەن عێراقەوە بایەخدار بوو لە مەیدانی شەڕدا و دژ بە کورد؟ ئایا بێجگە لە هەڵەبجە، سکاڵایەکی ئەوتۆ هەن کەوا ڕژێمی خومەینی پەنای بردبێتە بەر چەکی کیمیایی و بەڵگە هەیە بۆ ئەوە؟ لێرەدا پرسیاری گەورە و بنەڕەتیی من ئەوەیە کەوا کێ زانیی، چۆن و چی و کەی، بەپێی ئەم زانیارییە کاریان کردووە و ئایا ئەگەری کردەوەیەکی تری ئەڵتەرناتیڤ

لەئـارادا نەبـووە؟ لە هەنـدێک سـەرەوە سـاغبوونەوەی ئەم پرسە کلیلی مەسەلەکەیە.

سـاڵی ٢٠٠٠ لەسـەر ئەرکی ئینسـتیتیوتی کۆمەڵی کراوە (Open Society) سەردانی ئێران، کوەیت، ئوردن و ئیسرائیلم کرد، وەک یەکەم هەوڵ بۆ بەدۆکیومێنتکردنی ئەم سەردەمە تەڵـخە لە مێـژووی نـاوچەکەدا و تێیـدا قسـەم لەگەڵ ئەفسەرانی سوپا و هەواڵگریدا کرد، کە زانیاریی تایبەتیان لا بـوو. دوو سـاڵ دواتـر و بە هاوکـاریی دەزگـای جـۆن د. و کاترین ت. ماکئارسەر، جارێکی تر سـەردانی ئێرانم کردەوە و چـاوم بە هەنـدێک لە ڕزگـاربوانی چەکـی کیمیـایی کەوت، لەوانەی کە هێشـتا لە نەخۆشـخانەکانی تارانـدا کەوتبـوون، یان لە مـاڵەوە گرفتـاری کاریگەریی دواتری گـازی خەردەل بووبـوون، پـاش پتـر لە دە سـاڵی بەرکەوتنـی ئەو گـازە. لە ئێـرانەوە پەڕیـمەوە بـۆ کوردسـتانی عێـراق بە مەبەسـتی دۆزیـنەوەی شـایەتحاڵی زیـاتر، بە تـایبەتی هەنـدێک لەو فەرمانـدە کـوردانەی لە ئۆپەراسـیۆنی دەرپەڕانـدنی عێراقییەکـان، لە هەڵەبجەدا، بەشـدارییان کردبوو لە ڕۆژانـی پـێش هێرشـە کیمیـاییەکەدا. ئەم گەشـتە بـوو بە یەکەم هەنگاوی گەڵاڵەکردن و سەروبەرگرتنی ئەوەی کە ڕووی دا و دەسـپێکی پشـکنین و لێکـۆڵینەوەیەک بـوو بـۆ شـانۆی تاوانەکە.

**تاران، مایسی ٢٠٠٢**

لە ماوەی سێ هەفتەی مانەوەمدا لێرە، کۆمەڵگەیەکم دۆزییەوە کە تا ئێستا تەنها خۆیان ئاشنای یەکترن لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی بیانیدا. ئەمانە کۆمەڵێک دکتۆری ئێرانین کەوا کار و پیشەکەیان تەرخان کردووە بۆ مامەڵەکردن و لێکۆڵینەوە لەسەر کاریگەریی درێژخایەنی گازی ژەهراوی لەسەر فیسیۆلۆجیای مرۆڤ. ئەم دکتۆرانە لە ڕێگەی چارەسەرکردنی قوربانییانی هێرشەکانی گازی خەردەلەوە، تا ئەمڕۆ لەسەر ئاستێکی زۆر گەورە هاوکاریی زانستی پزیشکی دەکەن. زۆر بە داخەوە ئەمان تەنها بۆ ژمارەیەکی کەمی خەڵکی پرۆفیشناڵ لێکۆڵینەوەکانیان لە گۆڤارە زانستییەکاندا بڵاو دەکەنەوە، هەروەها هەرچەندە بۆ گشت مەبەستە پراکتیکییەکان تا ئەمڕۆ، تاقە یەک تاقیگە هەیە بۆ قوربانییە ئێرانی و کوردەکانی هێرشی گازی ژەهراوی، بۆ توێژینەوەی شەڕ و کوشتاری کیمیایی، تەنها ژمارەیەکی کەمی دکتۆر لە ئێران و کوردستانی عێراقدا هەڵبژێردراون بۆ ئەم بوارەی کارکردن.

من هەندێک لەم کەسانەم لە نەخۆشخانەی سۆسەنی تاران بینی، بە هۆی دکتۆر حەمید سوهراپپوورەوە، کە پسپۆڕی نەخۆشییەکانی سییە و لە ساڵانی ١٩٧٠کاندا لە نەخۆشخانەی جەبەل سینا (Mount Sinai) لە شاری

نیویۆرک و نەخۆشخانەی میتۆدیست لە بروکلین کۆرسی ڕاهێنانی بینیوە. ئەم پیاوە زۆر میهرەبان و بەڕێزە و ناوبانگێکی بەرزی هەیە لە پیشەکەیدا و هاوکات لەگەڵ هەلایسانی شۆڕشدا گەڕایەوە بۆ ئێران و لە لایەن ئەو قوتابییانەوە، کە سەفارەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان گرتبوو، هەڵبژێردرابوو بۆ چاودێری و چارەسەری پزیشکیی بارمتەکان لە ساڵی ١٩٧٩دا. دواتر بوو بە پزیشکی فەرمیی تیپی فووتبۆڵی نیشتمانی و بە شانازییەوە دەستی بۆ وێنەیەکی خۆی و یاریزانی پاڵەوانی ئەفسانەیی، عەلی دایی، ڕادەکێشا لە کلینیکەکەی خۆی لە گەڕەکێکی پۆشتەوپەرداخی تاراندا.

لە پاش دەستپێکردنی جەنگ لەگەڵ عێراق، لە ئەیلوولی ١٩٨٠دا، داواکارییەکی زۆر پەیدا بوو لەسەر پسپۆڕییەکەی ئەو وەک (فوق التخصص)ێکی نەخۆشییەکانی سی. هەر لە سەرەتایەکی زووی جەنگەوە بانگهێشت کرا بۆ چارەسەری ژمارەیەک بریندار کە پێشتر برینی لەو جۆرەی نەدیبوو، بەم جۆرە باسی دەکات: "بە تەواوی لە بیرم نایەت کەی بوو، بەڵام دەزانم وەرزەکەی هاوین بوو، ئەمانە خەڵکی حاجی ئۆمەرانی عێراق بوون (شارۆچکەیەکە ڕێک لەودیوی سنوورەوە بەرانبەر بە پیرانشار) و لەو کوردانە بوون کە شەڕیان لەگەڵ حکومەتەکەی خۆیاندا دەکرد. ئێمە نەماندەزانی ئەمە چ دەردێکە تووشی بوون و ماددەی کیمیایی کاری تێکردبوون، بەڵام کام جۆر و کام ماددە؟ لەبەر ئەوە هەوڵمان دا زانیاری لە دەرەوە بە دەست بێنین. پاشان سەربازەکانی خۆمانمان بینی بە هەمان نیشانەوە و بەمەدا بۆمان دەرکەوت مەسەلە چییە."

ئەو کوردە عێراقییانەی دکتۆر سوهرابپوور بینیبوونی، زۆر پێدەچێت یەکەمین بەڵگەی تۆمارکراوی قوربانییانی گازی خەردەل بووبن لە کاتی جەنگدا. عێراق لەو دەمەدا پەنای بردە بەر گاز بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشێکی ئێرانی لە تەمووز ـ ئابی ١٩٨٣دا، کە یاخیبوانی هاوپەیمان لە پارتی دیموکراتی کوردستان (پ د ک)، بوون بە پێشەنگی هێزەکانی ئێران بۆ سەر خاکی دوژمن. گازی خەردەل چەکێکی نوێی سامناک بوو، کە بەکارهێنانی لە مەیدانەکانی جەنگی جیهانیی یەکەمدا بەو خەستییە، نەزانراوبوو بۆ زۆربەی زۆری بەسەربازگیراوە گەنجە ئێرانییەکان، کە زۆرێکیان هەر نەخوێندەوار بوون. ئەمە دامودەزگای پزیشکیی ئێرانی خستە پەلەقاژەیەکی خێرا بۆ بەدەستهێنانی زانیارییەکی وا کە بتوانن پشکنینی گونجاو ئەنجام بدەن و چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزنەوە.

ئەو گازەی کە لە "حاجی ئۆمەران" بە کار هاتبوو، هەر زوو دۆزییانەوە خەردەلی سولفەر بوو ( chloroethyl sulphide 2)، کە بە شێوەیەکی ئەدەبی بەم جۆرە وەسف دەکرێت: "شلەیەکی چەورە و بۆنێکی وەک سیری لێ دێت و لەسەرخۆ دەبێت بە هەڵم و بەر هەر شوێنێک کەوت، بۆ ماوەی چەند سەعات یان بگرە چەند ڕۆژێکیش هەر مەترسیدارە، هەڵمەکەشی بە زوویی بڵاو دەبێتەوە و کارەساتی لێ دەکەوێتەوە. کاریگەریی سووتانی بۆ ماوەی چەند سەعاتێک پاش بەرکەوتن ئاسایی و ئاشکرا نییە و دوای ئەوە زۆر بە سەختی دەبێتە هۆی کوێربوون، بڵقکردن و زیانگەیاندن بە سییەکان و شێواندنی ڕوخسار." ئەمە لە قوربانییە ئێرانییەکاندا تێبینی دەکرا[٢]. هەروەها بە

شـێوەیەکی عـادەتی و لەسـەرخۆ دەبێتە هـۆی مـردن و تەنـانەت سـالانێک دوای بەرکەوتنـی ڕاسـتەوخۆ و لەو مـاوەیەدا، بێبـڕانەوە قوربـانی بەدەم ئـازارەوە دەناڵێنێت و تووشـی نەخۆشـییەکانی کۆئەنـدامی هەناسـە یـان شـێرپەنجە دەبێت. تـاقە خۆپاراستنێکی کـاریگەر، دەستەجلێکی کیمیـاییە کە جەسـتەی پـێ دادەپۆشـرێت، شـێوازەکانی چارەسـەر: شۆردنی لەش، شتنی چـاو بە ئـاوی ئاسـایی و مـامەڵەکردنی تلۆق یان بلقەکان وەک چۆن لە حـاڵەتی سـووتانی ئاسـاییدا دەکرێت. گازی خەردەل، لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا، بـوو بە هۆی بەرکەوتنی نزیکەی یەک ملیۆن و سێسـەد هەزار کەس و نەوەد هەزاریـان مـردن. هێرشـی حـاجی ئۆمەران لە پـاش زیـاد لە شەسـت سـاڵ، یەکەم ڕووداوی تۆمـارکراو بـوو لە جەنگی گەورەوە، کە چەکی کیمیایی لە مەیدانی جەنگدا تێدا بە کار هێنرا لە نێوان دوو هێزی قەبە و زەبەلاحدا.

پـاش ئەوەی دکتـۆر سـوهرابپوور مـاوەیەک لەسـەر کاریگەریی درێژخایەنی گازی خەردەل و کاری خۆی لەگەڵ قوربانییانی جەنگی کیمیـایی دوا، ئامـادەیی پیشـان دا بەسـەر ئەو نەخۆشـانەی خۆیـدا بمگێڕێـت کە لە نەخۆشـخانەی سۆسـەندا کەوتبـوون، لەو بەشـەدا کە بـۆ بریندارانی گـازی خەردەل تەرخـان کرابـوو. تـا ئەو ڕۆژە، کە زیـاد لە چـواردە سـاڵ تێپەڕیبوو بەسـەر کۆتـایی جەنگدا، هێشـتا قوربانییـانی گـازی خەردەل لە مەڵبەنـدە پزیشـکییەکانی سەرانسـەری وڵاتـدا، هەر بە دوای هاوکـاری و چارەسـەردا وێڵـن، سـالانە ژمارەیەکیان لێ دەمرێت لە ئەنجامی کاریگەریی ئەو گـازە و ئاڵۆزبوونی بـاری تەندروستییان. بـۆ نموونە، چەنـد ڕۆژێـک دواتر و کاتێک لە بـارەی چەکی کیمیـاییەوە گفتوگۆم لەگەڵ

دکتۆر جەعفەر ئەسلانیدا دەکرد لە نەخۆشخانەی سەربازیی بەقیەتولّلا لە تاران، پیاوێکی لەڕ و لاواز، بەدەم کۆکەوە هاتە ژوورەوە و خیزەی سەرسنگی دەهات. دکتۆر ئەسلانی، کە پسپۆڕی نەخۆشییەکانی سی بوو، پشکنینێکی پەلەی بۆ کرد و پاشان گوتی: "ئەمە یەکەم سەردانی ئەم نەخۆشەیە و دەڵێت لە فاو بریندار بووە و دیارە بڕێکی کەم گازی خەردەلی بەرکەوتووە و وا ئەمڕۆ تەندروستیی ئاڵۆز بووە (فاو ڕووبەرێکی بەرتەسکی زەوییە لە باشووری بەسرە و ساڵی ١٩٨٦ بە هێرشێکی کوتوپڕ لە لایەن ئێرانییەکانەوە داگیر کرا). ئێمە لەم حاڵەتانەدا نەخۆشەکان بۆ ماوەی دوو تا سێ هەفتە چارەسەر دەکەین و پاشان وەک نەخۆشی دەرەوە چاودێرییان دەکەین. ڕەنگە ئەو لە فاودا هەستی بەوە نەکردبێت کە بەرکەوتووە و بریندار بووە و لەوانەیە لە پاش هێرشەکە گازەکەی هەڵمژیبێت و پێدەچێت لە هەوادا بووبێت یان بە دار و درەختەوە و بە هۆی گەرما و شێوە کاریگەریی مابێتەوە."

هەندێک لە خراپترین حاڵەتەکانی گازی خەردەل دێنە نەخۆشخانەی سۆسەن کە دەزگای جەنگاوەرانی دێرین و جانبازان بونیاد (دەزگای کەمئەندامانی جەنگ)، بەڕێوەی دەبێت و داتایەکیان لە لایە کەوا لە ئێستادا سێ هەزار نەخۆشی بەرکەوتووی گازی خەردەلی تۆمارکراوی نەخۆشخانەی تێدایە. داتاکە نەخۆشەکانی بەپێی سەختیی حاڵەت و نیشانەیان پۆلێن کردووە و چارەسەر و دەرمانی بۆ نزیکەی هەزار و دووسەد خراپترین حاڵەتی دابین کردووە کە بە شێوەیەکی نموونەیی تووشی دڵەڕاوکە و نەخۆشیی درێژخایەن بوون، یان گرفتارن و دەناڵێنن بە

دەست کێشەی دڵ و هەناسە و هەوکردن و نەزۆکی و سووتانەوەی بیلبیلەی چاوەوە، هەروەها وەرەمی جۆراوجۆر لە چەشنی لیمفۆما، ئەنیمیا و لۆکیمیا.

لە نهۆمی شەشەمی نەخۆشخانەی سۆسەن، سێ ژنی کوردم بینی خەڵکی شارۆچکەی سەردەشتی سنووری عێراق بوون: خونچە حوسەینی (٥١ ساڵ)، شەوینی کچی (٢٠ ساڵ) و دەستەخوشکێکی بە ناوی پەروینی کەریمی واحید (٣٦ ساڵ)، بە شێوەیەکی تایبەتی پێدەچوو پەروین کێشەی لە هەناسەداندا هەبێت و خۆی بە لادا دەخست بۆ حەوانەوە و بۆ ئەوەی چاوی لەو کەسەوە بێت کە سەردانی دەکات، بەڵام هەر کە ئێمە دانیشتین بۆ چاوپێکەوتن، ئەو دەنگی دانووسا و بە ئەسپایی دەردەهات. ئەو بەسەرهاتەی ئەم ژنانە دەیانگێڕایەوە، لە گەلێکی تری ئەو چاوپێکەوتنانەی لەگەڵ ئەو دکتۆرانەی لە مەسەلەی چارەسەرکردندا بوون، جێگیر بووە. بە هەرحاڵ، گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە، بە شێوەیەکی سروشتی، کەمتر ترسناکترە وەک ئەوەی لە ڕاستیدا ڕووی داوە و هیچ کات ئەوە بەو جۆرە نەدراوە بە گوێی جیهاندا.

ژنەکان دەگێڕنەوە کەوا بەپێی ڕۆژژمێری ئێرانی، 7ی مانگی تیری ساڵی ١٣٦٦ بوو، یان ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٨٧، بەرەی جەنگ زۆر دوور نەبوو و سەردەشت، کە شارۆچکەیەکی کوردنشینە، نزیکەی ١٥ کیلۆمەتر (10 میل) لە سنوورەوە دوور بوو، ڕاهاتبوو بە بۆردمانی بەردەوامی فڕۆکەی عێراقی. بەکارهێنانی گاز بە شێوەیەکی سەرەکی هەر لە بەرەی باشووردا بوو و خەڵکی ئێرەی لەسەر ڕاهاتبوو، یان هەر هیچ نەبێت ئەم ژنانە. کاتێک هێزەکانی

ئێران لەو نزیکانە مۆڵیان خوارد و لەناکاو ماسکی گازیان پۆشـی، لەو کـاتەدا کە پەلامـاری کیمیـایی دران، گەلـێ لە دانیشـتوانی ئەو شـارۆچکەیە، تەنـانەت نەیانـدەزانی ئەو کەرەسـتە و تفـاقە بـۆچی باشـە. خـونچەی حوسـەینی دەگێـڕێتەوە: "کاتێـک سـەربازەکان کەوتـنە ڕاکـردن بە شـەقامەکاندا و هاواریـان دەکـرد (هێرشـی کیمیـاییە!) ئـێمە نەماندەزانی مەبەستیان چیە و چی دەڵێن."

بۆردمـانەکە، کە لە دەوروبەری سـەعات چـواری پاشنیوەڕۆدا بوو، خونچەی لە بەردەرگای ماڵی خۆیان لە باشـووری شـاردا بووراندەوە. ئەو لە سـەرەتای کەوتنەخـوارەوەی بۆمبەکانـدا، درکـی بەوە کـرد کەوا کوڕەکەی لە دەرەوەیە. "کەوتمە ڕاکردن و گەڕان بە دوایدا لە نزیک سینەماکە، بەڵام لەناکاو هەستم بە گەرمییەک کرد لە لاقەکانمدا و وام زانی ئەمە لە ئەنجامی ڕاکردنەکەمەوەیە، کاتێک تەماشـای قاچەکانم کرد وەک ئەوە وا بـوو کەسێک ئـاوی کوڵاتوویـان بەسـەردا بکـات." خـونچە کـوڕەکەی دۆزیـیەوە و پاشـان گەڕانەوە مـاڵەوە، بـۆ ئەوەی شـەوینی کچە پێنج ساڵانەکەشی بخاتە تەک خۆی و پێکەوە ڕۆیشتن بـۆ پـارکی لالە و لەوێ پیـاوان گریـان لە تـایەی ئۆتۆمبیـل بەردەدا، بـۆ ئەوەی ئـاگر بـکەنەوە، وەک خۆپاراسـتنێکی سـەرەتایی لە گـازە کیمیـاییەکە. بەپێـی ئەڵسـتێر هەی، کە پسـپۆڕێکی چەکـی کیمیـاییە لە زانکـۆی لیـدز (لە ڕێـگەی پەیوەنـدیی ئـیمەیڵەوە، سـاڵی ٢٠٠٢)، "گەرمیـی ئـاگر وشـکاییەک لای سـەرەوە دروسـت دەکـات و دەبێـتە هـۆی ئەوەی هەڵم یان گازەکە بەرزتر بێتەوە لە هەوادا و ڕەنگە گەرمییش هەندێک لە ماددە کیمیاییەکان تێک بشکێنێت".

خونچە حوسەینی لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "سەربازەکان بەو ناوەدا دەڕۆیشتن و بە بڵندگۆ هاواریان دەکرد و دەیانگوت با خەڵکەکە بەرەو باکوور بڕۆن، بەڵام ئێمە ئۆتۆمبیلمان نەبوو، لەبەر ئەوە ماینەوە." ئەو شەوە خونچە چوو بۆ هۆڵی وەرزشی شار، کەوا کرابووە کلینیکێکی مەیدانی بۆ چارەسەر. ماوەیەک دواتر بردیان بۆ تەبرێز و دواجاریش بۆ چارەسەرکردن بەرەو تارانیان برد. ئەو بەردەوام بە دەست ناڕێکیی تەندروستییەوە گرفتارە و ناوبەناو دەچێتە نەخۆشخانە بۆ پشکنین و وەرگرتنی دەرمانی بەهێزکردن، بەڵام پێدەچوو کورەکەی و شەوینی کچی، کاریگەریی گازەکەیان زۆر بەسەرەوە نەبووبێت.

پەروین کەریمی واحید، تەنها دوو ڕۆژ پێش هێرشەکە لە تارانەوە بۆ سەردانی کەسوکار هاتبوو. ئەوان بە ماڵ و خێزانەوە چەند ساڵێک لەوەوپێش چووبوونە تاران. پەروین دەگێڕێتەوە: "لەو کاتەدا کە بۆمبباران دەستی پێ کرد، من خەریکی خۆشۆردن بووم و بۆمبێک بەر ماڵەکەمان کەوت، خێرا لە حەمام دەرچووم و سەرنجم دا تۆز و پۆدرەی سپی لە هەموو شوێنێک بڵاو بووەتەوە. پارچەیەک لە بۆمبەکە کەوتبووە سەر مێزی تەلەڤیزیۆنەکە. ئێمە هەموو دەستمان کردە پێکەنین، بە خۆشی و ئاسوودەیی، یەکەم جار لەبەر ئەوەی بۆمبێک کەوتبووە ماڵمانەوە و ئێمەش هەموو ساغ و سەلامەت بووین. بەڵام پاشان ئاردە سپییەکە بە هەموو لایەکدا بڵاو بووەوە و کاتێک من کەمێک چوومە ئەولاوە، سووتاوی و تلۆق بە جەستەمەوە دەرکەوت و دەستم کرد بە هێڵنجدان و ڕشانەوە."

پاشــان لەســەری دەڕوات و دەڵێـت "هەر چۆنێـک بـوو خۆمـان گەیانـدە ئۆتۆمبیلەکەمـان و یەکســەر ڕوومـان کـردە مهاباد"، کە پایتەختی کورتخایەنی داواکارییەکی سەربەخۆیی کورد بوو، لە پاش جەنگی جیهانیی دووەم. لێرە دکتۆرەکان شۆردبوویان و تیماریان کردبوو، بەڵام پەروین بۆ ماوەیەک بینـایی لە دەسـت دابـوو و بێهـۆش کەوتبـوو. ئەمـڕۆ پـاش پـازدە ســاڵ، پەرویــن هەر گرفتــاری کێشــەی ســەختی کۆئەنـدامی هەناسـەیە. دکتـۆر سـوهرابپوور پێی گـوتم کەوا ئەم ژنە دەبێـت بەردەوام هــاتوچۆی نەخۆشــخانە بکـات و ئایندەی تەندروستیی ڕوو لە باشە نییە.

### هەڵەبجە، مایسی ٢٠٠٢

لە هەفتەی سێیەمی مایسدا، بە فڕۆکە لە تارانەوە گەیشتمە شاری کوردنشینی کرماشان و لەوێوە بە دوو سەعات بەرەو ڕۆژئاوا گەیشتمە شارۆچکەی قەسری شیرین لەسەر سنوور. ئیشارەتەکانی سەر ڕێگە، ئامۆژگاریی گەشتیارانی دەکرد کە ماوەی چەند کیلۆمەتری ماوە بۆ کەربەلا و نەجەف، کە دوو شاری پیرۆزی موسڵمانی شیعەن، کە ژیانی سیاسیی ئێرانیان داگیر کردووە و (زۆرینە پێک دێنن لە هەر دوو ئێران و عێراقدا). ئەو دەشتە سەوزانەی بە ئاوی باراناو پاراو دەبوون و بە گوڵاڵەسوورە شەپۆلیان دەدا و لە پشتیانەوە گرد و چیا بەرزەکان یادەوەریی گەشتەکانی پێشتریان بۆ کوردستان، کە چەندین جار بە ڕێگەی تورکیادا بۆی دەهاتم، لا دەورووژاندم.

پەڕینەوە لە سنوور کارێکی ئاسان بوو: ناوم بە برووسکە لە تارانەوە نێردرابوو، لێرەش لەسەر پارچە کاغەزێک نووسرابوو. من لێرە خێرا کاغەزێکم ئیمزا کرد، پارچەیەکی ناومالّم پێ بوو کە تاقە شت بوو گومرگ بکرێت. پاسەوانە ئێرانییەکانی سنوور، سەرقاڵی هەندێک ئیجرائات بوون لەگەڵ ژمارەیەک کورددا، کە ئەو ڕۆژە لە سنوور دەپەڕینەوە و بە ئاشکرا دیار بوو یەکتریان خۆش

ناوێت. پرۆفیسۆرێکی زانکۆی سلێمانی، بە نیازی گەڕانەوە بــۆ ئەڵمانیــا لەگەڵ خێزانەکەیــدا بە گەشــتێک دەهــاتە ئەمبەرەوە. بەڵام بێجگە لەوە، خاڵی سنوور چۆڵ بوو.

گەشتەکەم بۆ سلێمانی دوو سەعاتی تری برد و ڕێک لە کـاتی نیـوەڕۆدا گەیشـتم. لە چێشـتخانە پلەبـاڵاکەی هۆتێـل ئاشـتی مینویـان بـۆ هێنـام و لە بەشـی سـتێکدا نووسـرابوو "تۆرنادۆ لەگەڵ قارچک" و "گۆشت یان ماسیی بێ ئێسقان"، بە باشم زانـی خـواردنێکی کوردی هەڵبژێرم کە قۆزی بـوو (مــاینچەی بەرخ لەگەڵ شــلەی تەمــاتە)، کەچــی هــاوڕێ کوردەکەم تۆرنادۆی خـوارد و هەر سکاڵای بوو لە تفتـی و بێتامییەکەی.

مـن هەفـتەیەکم لە سـلێمانی بەسـەر بـرد، کە شـارێکە دانیشــتوانی حەوتســەد هەزار کەس دەبێــت، ڕووبەڕووی زنجیرەشاخێکە کە دەکەوێتە سەر سنووری ئێران و نزیکەی 25 میـل بە هێڵێکـی ڕاستەوڕاسـت لێوەی دوورە. ئێـرە هەر چەنــدە نەکەوتبــووە نــاوچەی دژەفــڕینەوە، کە ویــلایەتە یەکگرتووەکــان بەســەر عێراقیــدا ســەپاندبوو و دەکەوتە بـازنەی دەستوەشـاندنی سـوپای عێـراقەوە، بەڵام لە کۆتـایی جەنگی کەنداوەوە بە حەوزێکـی ئـارام مـایەوە، ئەو حـاڵەتەی لــێ بەدەرە کە کاتێــک هێزەکــانی (پ د ک) بە پشــتیوانیی هێزەکانی عێراق ساڵی ١٩٩٦، توانییـان بـۆ مـاوەیەکی کورت جەنگــاوەرانی یەکێتیــی نیشــتمانیی کوردســتان (ی ن ک) وەدەرنــێن. مــن لێــرە کۆبــوونەوە و چــاوپێکەوتنم لەگەڵ زۆرێــک لە بەشــدارانی ئۆپەراسـیۆنی هەڵەبـجە، لە پــێش هێرشە کیمیاییەکەدا، ئەنجام دا.

بەڵام ئامانجی سەرەکیی من هەڵەبجە بوو، بەپەرۆش بووم بۆ بینینی شارۆچکەکە و هەڵکشان بە گرد و چیاکانی پشتیدا بۆ تێگەیشتن لەوەی چۆن گرتن/ڕزگارکردنی هەڵەبجە جێبەجێ کرا و ئاشکرا بوو، بەشداربوان کێ بوون، بنکە و بارەگایان لە کوێدا بوو، لە دەمی هێرشە سەربازییەکەدا پەلاماری کیمیاییەکە بەر کوێ کەوت، چ جۆرە گازێک بە کار هات و لە کام ڕێگە و شوێنەوە دانیشتوانی دەربازبوو هەڵاتن.

سەرلەبەیانیی ڕۆژی شەممەیەک، چوار کەس بەرەو هەڵەبجە بەڕێ کەوتین، من و نەعمانی شۆفێر و محەمەدی وەرگێڕم و مام هادی، کە پێشمەرگەیەکی خانەنشین بوو، لە ڕووی سۆز و خۆشەویستییەوە لای هاوڕێکانی لە ناو یەکێتیی نیشتمانیدا بەوە ناسراوە کە (یەکەم پارتیزان بووە) لە ناوچەی هەڵەبجەدا. ئەم پیاوە کاکەیی بوو، کە تایەفەیەکی ساینکریتیستیی (باتینیی) شیعەن و بە ئەهلی هەقیش دەناسرێن. کاکەییەکان لە سێ گوندی ناوچەی هەڵەبجەدا نیشتەجێن، لە ناو شاخە بەرزەکانی نزیک سنووری ئێراندا، بەڵام لەم ماوەیەدا لە لایەن میلیشیاکانی ئەنسارولئیسلامەوە لە ماڵەکانیان دەرکران (ئەم تاقمە لە بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان جیا بوونەتەوە و بنکەیان لە هەڵەبجەیە)، (بەپێی قسەی دۆستەکانم لە هەڵەبجە، مام هادی کوردێکی هەورامییە نەک کاکەیی، بەڵام زۆر تێکەڵی خەڵکی هاوار بووە و ئەمە تەنها بۆ ڕاستکردنەوەیە کە لە شوێنی تری ئەم کتێبەدا کردوومە، و). بێجگە لە دەرکردنی ئەو دێهاتییانەی پێچەوانەی قەناعەتی ئایینیی ئەمانن و سەپاندنی حوکمێکی تاڵیبانئاسا. ئەم میلیشیایانە بەوەش گوناهبار

دەکرێن کە هەوڵێکی سەرنەکەوتوویان داوە بۆ کوشتنی بەرهەم ساڵحی سەرۆکوەزیرانی (ی ن ک) لە سلێمانی، کە خانەخوێیەکی دەستودڵ فراوانم بوو لەم سەردانەدا.

ئێمە لە کاتێکدا بەرەو هەڵەبجە بەڕێوە بووین، لە ماوەی ئەو دوو سەعاتەی ڕێگەدا، بە ناوچەیەکی پڕ لە قاز و قەلەباچکە و تا چاو بڕ بکات مەزرای گوڵەبەڕۆژەدا، باسی ئەم بابەتانەمان دەکرد و بە ژمارەیەک گوندی بچووکدا تێپەڕین کە خانووەکانیان نزم و هاکەزایی بوون و خەڵکەکانیان بە جلوبەرگی نەریتییانەوە خەریکی کاروباری کشتوکاڵ و ڕانەمەڕەکانیان بوون. لە شوێنێکدا پۆلەقازێک لەسەر ڕێگەکە هەڵنیشتبوون، کە ئێمە بە لایاندا تێپەڕین، هەموو وەک یەک سەریان ڕاست کردەوە و بێجگە لەوە هەر خۆشیان تێک نەدا.

هەڵەبجە خۆی لە حەوزێکدایە لە بەردەم چەند ڕیزە چیایەکی تاوەرئاسادا لە باشوور و ڕۆژهەڵاتەوە (کە ئەودیویان ئێرانە). هەروەها لە باکوور و ڕۆژئاوایەوە، بە دەریاچەی دەستکردی سیروان لە دوای ناوچەکانی کوردستان دابڕاوە، کە لە زێکانی سیروان و زەڵم و تانجەرۆوە ئاوی تێدەڕژێت و لە بەنداوی دەربەندیخانەوە ئاوەکەی دەچێتە ڕووباری دیالە و پاشان دەڕژێتە ڕووباری گەورەی دیجلەوە کە بۆ کەنداوی فارس بەرەوخوار دەبێتەوە. ئێرە ئەو ناوچەیە بوو کە بە دەریاچەکە و ڕیزەچیا دەورە درابوو و هێزەکانی ئێران لە مارتی ١٩٨٨دا داگیریان کرد و هێزەکانی عێراقیان لەم دەریاچەیەوە ڕاو نا (کە زۆریان خنکان) یان بەسەر پردەکەی زەڵمدا بۆ

خۆڕێکخستنەوە لە شارۆچکەی بچووکی سەیدسادقدا، کە ڕێگەی سێیەم بوو لە گەڕانەوەدا بەرەو سلێمانی.

هەڵەبجە، کە لە پاش جەنگی ئێران ـ عێراق تەختی زەوی کرا، بە شێوەیەکی بەرفراوان لە دەیەی ڕابردوودا بینا کرایەوە. مزگەوتێکی نوێ و درەوشاوە، چەند مانگێکی ماوە بۆ تەواوبوون. لە دەروازەی شاردا پەیکەری پیاوێکم بینی بە دەمدا کەوتبوو و باوەشی بە منداڵە کۆرپەکەیدا کردبوو لە حاڵەتی مەرگدا، کە لە پەلاماری کیمیاییدا، بە گاز خنکان. هەڵەبجەییەکان پێیان گوتم کە ناوی عومەری حەمەساڵحە و نانەوا بووە (هەروەها ناو و چیرۆکی تریان بۆ گێڕامەوە). ئەم پیاوە بەپێی کولتوور و نەریت بەختی نەبووە و یەک لە دوای یەک شەش کچی بووە، بەڵام دواتر و پاش ماوەیەکی زۆر، خوا کوڕێکی پێ بەخشیوە و ئەمە ئەو کوڕە بوو کە لە حاڵەتی مەرگدا، لە باوەشیدا بووە (ئەم قوربانییە زیاتر بە عومەری خاوەر دەناسرێت و بووە بە هێما و سیمبۆڵی کیمیابارانی هەڵەبجە، و).

حەمەی حەمەسەعید، کە فەرماندەیەکی (ی ن ک) بوو لە ناوچەکەدا، ئامادەیی خۆی دەربڕی بمباتە سەر شاخ بۆ بینینی هەڵەبجە لە بەرزاییەوە (هەروەها پێگەکانی ئەنسارولئیسلام لە سەرووترەوە). ئەم پیاوە لە ناوەڕاستی تەمەندا بوو، سمێڵێکی سەرنجڕاکێشی هێشتبووەوە. ئەم فەرماندەیە ڕۆژگارێک گەریلایەکی جەربەزە بووە، بەڵام ئێستا هەنگاوەکانی داویەتی کورتی و خاو بوونەتەوە، بە هۆی پەیداکردنی ورگ و دە ساڵی ئاشتی و پشوودانەوە. ئێمە بە ڕێگەیەکی خۆڵدا بە شاخی شنرویدا هەڵدەکشاین. ڕەشاشێک لەسەر ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگر دابەسترابوو،

ژمارەیەک پێشمەرگەی لەسەر بوون (کە دەقاودەق مانای ئەوانەی بەرەوڕووی مەرگ دەوەستنەوە، دەگەیەنێت). ڕێنماکەم باسی ئەوەی دەکرد کەوا "لێرە لە گوندی عەبابەیلێ، سەربازگەیەکی عێراق هەبوو، لە خواریشەوە لە دەڵەمەڕ، بنکەیەکی گەورەی تۆپخانەی تێدا بوو. لەولاشەوە بەرەو ڕۆژئاوا شاخی بالامبۆیە کە ئێرانییەکان سەربازگەیەکی تری عێراقییان لێ ڕاماڵیبوو".

لەسەر لووتکەی شاخەکە دیمەنێکی پانۆراماتاسای هەڵەبجەمان لە بەرچاو بوو، لەگەڵ دەریاچەی سیروان و ئەو دۆڵەی بەرەو سلێمانی درێژ دەبووەوە. بنکە و پێگەکانی ئەنساروئیسلام لای ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەوتن، لە بەرزاییەکانی سنووری ئێرانەوە. بەپێی قسەی حەمەی حەمەسەعید و مام هادی، کە هەردووکیان لە هێرشەکەدا بەشدار بوون، ڕەتڵێکی هێزەکانی ئێران لە شنرویێوە دایان بەسەر ناوچەی هەڵەبجەدا، لە نیوەشەوی ١٢ یان ١٣ی مارتدا (ئەوان زۆر ورد نەبوون لە دیاریکردنی مێژووی ڕووداوەکاندا) و بە یارمەتیی ئاگری تۆپخانە لە بنکەکانی ناو ئێرانەوە و پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش ڕابەرییان دەکردن. حیزبە کوردییەکانی تر و بگرە یەکەیەکی عەرەبی شیعەی عێراقی لە فەیلەقی بەدریش، کە باڵێکی سەربازیی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی عێراقە کە بنکەی لە تاران بوو، هاوڕێیەتیی هێرشی هێزەکانی ئێرانیان کرد لە خاڵەکانی تری سنوورەوە و پێگە و سەنگەرەکانی سوپای عێراقیان یەک لە دوای یەک گرت و هەموو لە هەڵەبجە و خورماڵدا یەکیان گرت.

له هه‌ڵه‌بـجه خۆیـدا، خه‌ڵکـی شـار ڕاپه‌ڕینێکیـان له دژی به‌ڕێـوه‌به‌ریتیی عێراقیـی بێزلێکـراو به‌رپـا کـرد و گه‌مـارۆی بـنکه و باره‌گاکـانی پۆلیســی نهێنــی (ئه‌مــن)، هه‌واڵگریــی سه‌ربازی (ئیسـتیخبارات)، پۆلیسـی ئاسـایی و جه‌نگـاوه‌رانی کـوردی ســه‌ر به ڕژێـم، که لای خـۆیه‌وه نـاوی فورســان (سـواره)ی لـێ نـابوون، به‌ڵام له‌ســه‌ر زمـانی خه‌ڵکـی ناویـان جـاش بـوو (واته به‌چکه‌ی که‌ر) و ژمـاره‌یه‌کی زۆریـان هه‌ر ئه‌مبه‌روئه‌وبه‌ریـان ده‌کـرد و هه‌واداریـی خۆیـان به ئاسـانی ده‌گۆڕی (خه‌ڵکی هه‌ڵه‌بجه ده‌رفه‌تێکی باشیان بۆ هه‌ڵکه‌وت، زه‌بر و ده‌سه‌ڵاتی ڕژێم کۆتـایی پـێ بێنن، چـونکه هێزه‌کـانی سه‌دام خه‌ڵکیـان ڕه‌شـبگیر ده‌کرد و گه‌ڕه‌کـی کـانی ئاشـقانی ئه‌و شـاره‌یان ڕووخاند، دوابه‌دوای خۆپیشـاندان و پرۆتێسـتی ساڵێک له‌وه‌وپێش). له ١٥ی مارتـدا پێشـمه‌رگه هـاتنه ناویـان و به وره و گیانی سه‌رکه‌وتنه‌وه که‌وتنه گه‌ڕان به ناوشاردا، به یــاوه‌ریی که‌ســانێکی ســه‌ر به ئیتلاعــاتی ئێرانــی. هێــزه ســه‌ره‌کییه‌کانی ئێـران له‌و ســه‌نگه‌ر و بنکـانه‌دا خۆیـان قـایم کـرد که پێشـتر دوژمـنه عێراقییه‌کانیـانی تێدا بـوو له گونـدی ده‌ڵه‌مه‌ڕی ســـــه‌رووی هه‌ڵه‌بـــــجه‌دا و له هه‌مــــان کاتیشــــدا به‌شێکی تریان به شاردا تێپه‌ڕین به‌ره‌و ده‌ریـاچه‌که و پردی زه‌ڵم بۆ له‌ناوبردنی ئه‌و سه‌ربازانه‌ی که‌وا له سوپای عێراق مابوونه‌وه.

ئه‌گه‌رچــی هێرشــه‌که بــوو به هــۆی به‌زینــی هێزه‌کــانی عێـراق، به‌ڵام به‌ڵـگه‌ش بـوو بـۆ ئه‌وه‌ی که عێراقییه‌کـان به گشــــتی نائامـــــاده نه‌بــــوون. ئه‌وان به چـــاوی خۆیـــان خۆته‌یارکردنی هێزه‌کانی ئێرانیان ده‌بینی له‌سه‌ر سنوور بۆ مـاوه‌ی چه‌نـدین ڕۆژ و تانـک و زرێپۆشـیان بـۆ پاڵپشــتی

دەنارد، لە ڕۆژانی پێش هێرشەکەدا. هەندێک لە فەرماندە کوردەکان، پاش ئەوەی لە سروشتی مەسەلەکە گەیشتن، هەستیان کرد کەوا بوونەتە تەڵەوە. ناوچەکە خۆپارێز بوو، دەریاچەکەش بەربەستێکی سروشتیی دروست دەکرد بۆ پێشڕەویی زیاتری هێزەکانی ئێران بۆ سەر سلێمانی یان بەنداوی ستراتیجیی دەربەندیخان یاخود بەرەو ئەو ڕێگە ستراتیجییەی سلێمانیی بە دەربەندیخانەوە دەبەست، کە بە تونێلێکدا تێدەپەڕێت کاتێک دەگاتە بەنداوەکە. لە ١٦ی مارتدا و یەک ڕۆژ دوای ئەوەی کوردەکان هەڵەبجەیان ڕزگار کرد، عێراقییەکان تۆڵەیان کردەوە و باری جوگرافیی ناوچەکەیان بۆ سوودی خۆیان بە کار هێنا.

پێشمەرگە ناوچە شاخاوییەکانی باکووری ڕۆژئاوای هەڵەبجە و باشووری سلێمانییان گرتە دەست، کە پێی دەگوترێت قەرەداغ و دەگێڕنەوە کەوا بە چاوی خۆیان فڕۆکەی بۆمبهاوێژی سۆخۆیان دەبینی لە ڕۆژئاواوە دەهات و بە ڕاسەردا دەفڕی، پێم وایە لە بنکەیەکی هێزی ئاسمانیی نزیک کەرکووکەوە بەرەو هەڵەبجە، کە هێڵە کۆنتۆرییەکانی لە دوورەوە بریسکەیان دەهات. ئەو فڕۆکانەی لە بۆردومانندا هەڵمەتیان دەبرد، گەواڵەدووکەڵی ڕەشیان لە دوای خۆیانەوە بە جێ دەهێشت و پاشان بەسەر قەرەداغدا دەگەڕانەوە. فایەق گوڵپی، کە دکتۆرێکی پێشمەرگە بوو، ئەو دواینیوەڕۆیە و ڕۆژانی دواتر چاودێریی ئەو فڕۆکانەی دەکرد کە بۆردمانیان دەکرد، بەڵام وەک دەڵێت یەکەم جار نەیدەزانی چ جۆرە بۆمبێکیان پێیە، تەنها ئەو کاتەی ڕادیۆکانی پێشمەرگە بە خشەخش و قرچەقرچ کەوتنە پەخشکردنی ئەو هەواڵانەی لە لایەن فەرماندە مەیدانییەکانی

شـــــوێنی ڕووداوەکەوە دەدرکێنـــــدران، ئەو دەمە ئەو و هاوەڵەکانی تێگەیشتن چی ڕووی داوە. خودی دکتۆر گـوڵپی خۆی خەڵکی هەڵەبجەیە و دواتر لە ئیجازەیەکدا پاش ئەنفال ئەوجا بۆی دەرکەوت کە دایکی و برایەکی و برازایەکی و سێ خزمی بە کیمیایی مردوون و تەرمەکانیان نەدۆزرایەوە و گریمـانەی ئەوە هەیە کە لە یەکێـک لەو چەنـدین گـۆڕە بەکـۆمەڵانەدا بـن (هەروەهـا خۆیشـی بەردەوام بەر گـازی عێراقـــی دەکەوت و لەگەڵ هاوڕێکانیـــدا بەم گونـــد و بەو گونددا هەڵدەهاتن).

کاتێ کە لە شنرویێ هاتینە خوارەوە، حەمەی حەمەسەعید بە ڕێگەیەکی خۆڵدا ئۆتـۆمبیلەکەی لێدەخوڕی، لە عەبابەیلێوە بە لاپاڵەکـانی سـەروو هەڵەبـجەدا بەرەو گونـدەکانی جەلـیلە و عەنەب کە پێشتر تێیدا بایەخ بە چاندنی گەنم و بەروبوومی تـر دەدرا. کاتێک لەوێ دەرچووین، یەکێک لە هاوەڵەکانم دەسکێک فەریکەنۆکی هێنا و بە خۆشییەوە کەوتینە جوینی. جەلیلە بڕکە مـاڵێکی لە خشـتی قـوڕ دروسـتکراوە و کەوتـووەتە ئـامێزی شــــاخەوە و لە دوورەوە بەســـــەر بەردی ڕووتەنەوە چـــــاو دەکرێـت، بەڵام تـۆقەڵە دارێـک سـێبەری بـۆ کـردووە لە نێـو کانیاوێـک و گۆمـاوی زەوی‌وزارێکی بەپیتـدا. لە پـاش جەنگـی کەنداو دەبوو دێهاتییەکان گوند و ماڵەکانیان ئاوەدان بکەنەوە، چونکە ڕژێم زۆربەی گوندەکانی کوردی تەختی زەوی کردبوو لە هەڵمەتـی دژەیـاخیبوونی سـاڵانی هەشـتاکاندا. گونـدەکانی چەشـنی جەلـیلە و عەنەب، پڕ لە کانیـاوی بچـووکن و بـۆ ئەم کانیـاوانە بـوو کە ژمـارەیەکی زۆر لە هەڵەبجەییەکـان پەنایـان بردبوو. چارەنووسـی ئەوان دەبـوو لەو ڕۆژەدا وا بێت، کە بـا بەرەو بـــاکووری ڕۆژهەڵات هەڵـــی کردبـــوو، ڕاســـت بەرەو عەنەب. ژەهـرەکە بە درێژایـی جـادە قیـرەکەدا، کە لە هەڵەبـجە

دەردەچوو، هەر دەهات و بە مل ئەو سەرچاوە ئاوانەدا دەهات کە خەڵکەکە لایان دابوو لەسەری بۆ ئەوەی خۆیان بشۆن و تۆزە سپییەکە لە دەمولێو و ڕوومەت و جلوبەرگیان بکەنەوە و تینوێتییان بشکێنن. کەچی کەسی نەبوارد و کەس نەژیا: نە بنیادەم و نە ئاژەڵ.

ئەمڕۆ مۆنۆمێنتێکی نوێ ڕاست بووەتەوە بۆ یادکردنەوەی قوربانییانی پەلامارەکە. لەولاشەوە لووتت بەو کۆمەڵە خۆڵانەدا دەتەقێت کە لە قەراغ ڕێگەکەوە بەرز بوونەتەوە و ئەو شوێنانە دەستنیشان دەکەن کە خەڵکی تێدا کەوتبوون و چەند ڕۆژێک پاش ئەو ڕووداوە لەباسکردن نەهاتوانە، خەڵکە قوربانییەکە بە هاوکاریی هێزەکانی ئێران و پێشمەرگەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی، هەر لە شوێنی خۆیاندا بە کۆمەڵ ناشتیانن. یەکەم جار هاوەڵەکانم دەبوو ئەم کۆمەڵە خۆڵانەیان دیاری بکردایە لە دێهاتی دەوروبەردا، بەڵام من خێرا درکم پێ کرد و هەستم کرد کە لەم گردۆڵکە خۆڵانەوە، ئەو فەریکە نۆکە خۆشانە دەرچوون، کەوا ئێمە لێمان خوارد.

ئەمڕۆ ژیان گەڕاوەتەوە دۆخی ئاسایی خۆی، بەڵام گۆڕە کاتییە نیشاننەکراوەکان، تێکەڵی ژیانی گوند و کشتوکاڵ بوون. لە کاتێکدا کە لەسەرخۆ دەگەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە، هیچ شتێک ئەو ترس و سامەی نەدەگەیاند، کە لێرە ڕوویان دا. جووتیاران زەوییان دەکێڵا، ژنان جل و قاپوقاچاخیان بۆ کانی دەبرد بیانشۆن، منداڵان یارییان دەکرد و قاز و بەچکەکانیان خاوەخاو، لە بەردەمی ئێمەوە لە ڕێگەکە دەپەڕینەوە.

**عەممان، ئەیلوولی ۲۰۰٦**

دواتـر ویـلایەتە یەکگرتووەکـان، پەلامـاری عێراقـی دا و ڕژێمی سەدام حسێنی لا برد. لەو ساتەوە ئیتر مـن دەتـوانم بە ڕێکی سـەردانی ئەم وڵاتە بکەم، بۆ ڕاییکردنـی کـارەکەم وەک بەڕێـــوەبەری هەرێمـــایەتیی گرووپـــی قەیـــرانە نێودەوڵەتییەکـــان، کە ڕێکخراوێکـــی ڕێگـــرە لە نـــاکۆکی و ململانێکـان. لەمیـانەی ئەم گەشـتانەدا گەلێـک ئەفسەـر و سـەربازی جـارانی سـوپای عێـراقم بینـی کە وا لە توانایانـدا بـوو وردەکـاریی ڕۆژ بە ڕۆژی ئۆپەراسـیۆنی بەکارهێنـانی چەکی کیمیایی عێراقم بدەنێ، کە بۆ قوربانییان ئاسان نەبوو بیزانن و بەو چەشنە وێنەی تەواوی بارودۆخەکەیان دامێ.

ئـا لێـرەدا چیـرۆکەکەی مـن تەواو دەبێـت و چیرۆکـی خەڵکـانی تـر دەسـت پـێ دەکـات، ئەو چیرۆکـانەی لە لایەن ڕزگـاربووە کوردەکـان، ئەنجامــدەرانی عێراقــی، دەســتە پزیشـکییەکانی ئێرانــی، شـیکارانی هەواڵگریـی ئەمەریکـی و ئیسـرائیلی و گەلێکی تـر، کە بە ڕاوبۆچـوون بەشـدار بـوون، بـاس دەکـرێن. هەروەهـا ئەو چیرۆکـانەی کە سـەرلەنوێ ئامـادە دەکـرێنەوە، بـا بە شـێوەیەکی پچرپچـڕیش بێـت، لە بەڵگەنـامە بێشـومارەکانی هەواڵگریـدا، بە ئەمەریکـی و عێـراقییەوە. هەر چەنـدە ئەم چیرۆکەیـان لە شـوێنانی تـر گێـڕراونەتەوە و لێـرەدا دووبـارە نـابنەوە (بـێجگە لە

کورتەیەکی کۆتایی کتێبەکە[٣]. ئەم کتێبە بە هۆی پێنج پیاوی جێ سەرنج و مێرمندالێکەوە (کە ئێستا گەورە بووە) هاتووەتە ئاراوە، کە بە دلگەرمی و پەرۆشەوە بەسەرهاتی تالی خۆیان دەگێڕایەوە. ئەمانە ئەو ڕزگاربوانەی ئەنفال بوون، کەوا بە بوێرییەکی بێوێنەوە توانییان لە چالەکانی مەرگ ڕزگار ببن و لەوەدا بەخت یاوەریان بوو. من ئەم کتێبە بە خۆشەویستی و سەرسامی و پێزانینەوە، پێشکەش بەوان و بە خێزانەکانیان دەکەم و بە هیوام کارەکە زیاتر خزمەتی زیندووڕاگرتنی یادی هەموو ئەوانە بکات کە لە هێرشی گازی ژەهراویدا لە ناو چوون، یان لە ڕووبەڕووبوونەوەی گوللەی ئەنفالدا بێگیان کران.

## سوپاس و پێزانین

بــۆ بەئەنجامگەیانــدنی ئەم کتێــبە، دنیــایەک هەوڵ و خۆشەویســتی بــۆ کــارەکە، هەشــت ســاڵ بیرکــردنەوە و کردوکۆش و شەش ساڵی تریش بۆ بەرهەمهێنانی تەرخان کــراوە، کە توانیــومە تەنهــا بە هــۆی پاڵپشــتیی دەســتە و تاقمێکی گەورەی کاراکتەرەوە تەواوی بکەم، لەوانە: خێزان و بنەماڵەکان، دۆستان، ئەو کەسانەی لەم ڕێگەیەوە بوون بە دۆست، کەسانێک بێ گوێدانە ئەوەی من کێم و کێ نیم و بەوپەڕی دڵفراوانییەوە، کات و حیکمەتی خۆیان لەگەڵ بەش کــردم و بە شــێوەی جۆراوجــۆر تــین و تاقەتیــان پــێ دەبەخشیم.

پاڵنەری بنەڕەتیی ئەم کارەم، ئەو ڕێکخراوە بوو کە من تا ساڵی ٢٠٠٠، یەکێک بووم لە ستافەکەی، ئەویش هیومان ڕایتس ووۆچ و کێن ڕۆسی بەڕێوەبەری بوو. هەڵبەت منیش وەک هەر کارمەندێکی ڕێکخراوەکە، مافی مۆڵەتپێدانی سێ مانگم هەبوو لە پاش حەوت ساڵ کارکردن و کێن هانی دام دەست بکەم بە لێکۆڵینەوە بۆ ئەم کتێبە، کە بەند بوو بە لێکۆڵینەوەی مافی مرۆڤ لە کوردستانی عێراق لە لایەن من و دوو هاوکــاری تــرەوە لە ســاڵانی ١٩٩٢ ــــ ١٩٩٤دا. هەر کێنــیش بــوو بە زوویــی وریــای کــردمەوە خــۆ لەو تەڵەیە بپارێزم کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان پێی دەگوترێت "چۆن

بچمە سەر کاری خەڵکی" وەک ئاماژەکردنێک بۆ یاریی فووتبۆڵی ئەمەریکی: "یارییەکەی لە یەکشەممەدایە و دووشەممە باس لەوە دەکرێت کێ دەیباتەوە"، هیوادارم سەرکەوتنم بە دەست هێنابێت.

نەرمینواندنی هیومان ڕایتس ووچ (HRW) و کۆمەکی زەمالەی پرۆژەیەکی تاکەکەسی لە لایەن ئینستیتیوتی کۆمەڵی کراوە (Open Society) کە ساڵی ١٩٩٩ دابین کرا، یارمەتییان دام بۆ تەرخانکردنی سێ مانگی تری زیادە بۆ ئەم پرۆژەیە، بە گەشتی ئێران و کوەیت و ئوردن و ئیسرائیلیش. هاوکارانم ستیڤ گووز و لیزا میزۆڵ، ئەرکی دەوامنەکردنی منیان لە ئەستۆ گرتبوو، چونکە بێجگە لە کاری ئاسایی گرانی خۆشیان، ڕاییکردنی کارەکەی منیشیان لەسەرشان بوو. من زۆر منەتباریانم و بۆ هاوبەشانی پێشتریشم لە پرۆژەی ئەنفالدا: جۆرج بلاک، مەولان ئیبراهیم، شۆڕش حاجی، پەیمان محەمەد، جێمێرا ڕۆن و ئەندرو وایتلی. جۆرج ئەوەی پیشان دام کە چۆن ڕاپۆرتی مافی مرۆڤ دەکرێت ببێتە پارچە نووسینێکی کاری جوان وەک لە نارەزایینامەیەکی بێتامی پێشێلکردن و کتێبەکەی "تاوانی جینۆسایدی عێراق" (کە لە سەرەوە باس کراوە)، زۆر بە داخەوە خەڵکێکی زۆر کەم خوێندوویەتیەوە. شۆڕش و پەیمان شایانی ناوهێنان و پێزانینی تایبەتین، وەک سەرچاوەیەکی بەردەوامی هاندان و کارکردن و زانیاریی فراوان لە سەرانسەری ئەم پرۆژەیەدا.

دوو ساڵ دواتر و لە ٢٠٠٢دا دەزگای (جۆن د. و کاترین ت. ماکئارسەر) کۆمەکێکی توێژینەوە و نووسینیان بۆ دابینکردم بۆ تەواوکردنی پرۆژەکە. ئەمە مانگێکی

تـویژینەوەی گـرتەوە لە ئێـران و کوردسـتانی عێراقـدا. بـۆ کارمەندێکی وەک مـن، کەوا کـاری پڕ یـان فولْتـایمم هەیە و هیچ زانکۆیەک یان دەستەیەک پسپۆڕی پێکەوە کـارکردووم لەپشـتەوە نییە، بـۆیە یـارمەتیی دەزگـا و دامەزراوەی وەک ئینسـتیتیوتی کـۆمەڵی کـراوە و مـاک ئارسـەر مەسـەلەیەکی سـەرەکی بـوو لە ڕەخسـاندنی کـات و دەرفەتـی تـویژینەوە و نووسینمدا.

لە نـۆڤەمبەری ٢٠٠٣دا، کـۆمەکێکی دەزگـای ڕۆکفـلەر، دەرفەتـی بـۆ ڕەخسـاندم کە مانگێـک بەسـەربەرم لە نیشتەجێیەکی سەر بەو دەزگایە لە ئیتاڵیا بە ناوی سەنتەری تـویژینەوە و کۆنفرانسـی بـالاجیۆ، بـۆ نووسـین لە کەشـێکی ئارامدا و لەگەڵ دەستەیەک لێکۆڵەری هاوکارم و ژمـارەیەک نووسـەر و مـوزیکژەن و هونەرمەنـددا. مـن بە تـایبەتی سوپاسـگوزاری خـاتوو گیاننـا سـالیی بەڕێـوەبەری سـەنتەرەکەم، بـۆ یارمەتیـدان و دەمـودووی خۆشـی. ڕاسـپاردەکانی شـاوول بەخـش، کـێن ڕۆس، گـاری سـیک و مـاکس ڤاندەر شـتۆیل بە نووسـین کـاریگەر و سـوودبەخش بـوون لە قەناعەتپێهێنـانی ئەو دەزگایـانە بـۆ پشـتگیریکردنی کارەکەم.

لە قۆناغەکـانی لێکـۆڵینەوەکە و لە کاتێکـدا کە مـن بە پارتتـایم وانەم لە سـەنتەری لێکـۆڵینەوەی هـاوچەرخی عەرەبیی سـەر بە زانکـۆی جۆرجتـاون دەگـوتەوە، کۆمەڵێک لە قوتـابییە دەرچووەکـان یارمەتییـان دام وەک کـۆرس و بە شـوێن سـەرچاوەی سـەرەتاییدا دەگەڕان، کە زۆریـان بە عەرەبـی بـوون و کورتەنووسـینێکیان لەسـەر جەنـگ ئامـادە کرد، لەوانە: کریستی ئادەمز، جولیان غێراردی، ڕانیا غـومە،

ڕیمە ئەلموللە، محاسن نەسرەدین، ڕێژین سەهاکیان، شیرین سەیکەلی و کەیتلین ولیامز. من سوپاسیان دەکەم بۆ ئەو کارە گەورەوگرانەی کردیان و حەز دەکەم بە تایبەتی ڕانیا جیا بکەمەوە، وەک یاریدەدەری لێکۆڵەر بەو ئاستە نایابە و زیاد لەوەی لێی چاوەڕوان دەکرا، ئەنجامی دا و نەک هەر دەستبەکاری تـوێژینەوەی جیددی بوو (ماوەیەکی دوورودرێژ دوای ئەوە لێکـۆڵینەوە سەربەخۆکەی لەگەڵ مندا کۆتایی پێ هات)، بەڵام پرۆژەی بۆ خۆی گەڵاڵە کردبوو و هاوکاریی ئەوەی دەکرد کەوا کتێبەکە لۆجیکی گێڕانەوە لە خۆ بگرێت. ئەوانی تر کە بە سەرچاوە یارمەتییان دا: نیاز خالید لە ئەمستردام (کورد)، غێدە جەڕار لە عەممان (عەرەب)، ڕۆلین هیلتەرمانی خوشکەزام کە بۆ ماوەی چەندین سەعات چاوپێکەوتنەکانی چاپ کرد، کە ئەرکێکی لابەلایە و کەس پێی نازانێت.

ولیەم م. ئارکین، گۆردن بارک و مایکل ئایزنشتات بە سوپاسەوە هەلیان بۆ ڕەخساندم تاوتوێی فایلەکانیان بکەم و لە هەمان کاتدا جۆیس بێتل لە ئەرشیڤی ئاسایشی نەتەوەیی لە زانکۆی جۆرج واشنتۆن و کەندال نزان لە ئینستیتیوتی کورد لە پاریس بە خۆشحاڵییەوە دەرگایان لەسەر بەڵگەنامە و دۆکیومێنتەکانیان خستە سەر پشت. لە لایەکی تریشەوە شەفیق غەربە و گیاندۆمینیکۆ پیکۆ و کازم سەججادپوور هاوکاریی بەدەستهێنانی ڤیزەیان کرد بۆ کوەیت و ئێران. من زۆر منەتباری دکتۆر سەججادپوورم کە توانیی کۆسپ و تەگەرەی بیرۆکراتیی ئێرانییەکانم بۆ چارەسەر بکات، کاتێک کە من بێ ئاگادارکردنەوە، زیاد لەو ماوەیە مامەوە کە لە ڤیزەکەمدا ڕێگەی پێ درابوو.

هەروەهـا عەبـدولڕەزاق ئەلسـەعدی (بەغـدا)، مـحەمەد سلێڤانی (سـلێمانی و هەڵەبـجە)، نەغـمە سـوهرابی (تـاران) وەک ڕێنمـــا و وەرگێـــڕ کاریـــان لەگەڵ کـــردووم و لەخۆبوردوانە بە دەممەوە دەهـاتن و هەندێک جار تووشـی بارودۆخی ناخۆشیش دەبوون. گەلێک هـاوڕێ و دۆسـت و خەڵکی بەئاگا، زۆر بە دڵفراوانـی لەگەڵـم بـوون و بێزارییـان قبووڵ دەکردم، لەوانە: شۆڕش حـاجی و پەیمـان مـحەمەد لە لەندەن، غانم نەجـار لە شاری کوەیت، سیامەک نەمـازی لە تـاران، لیلیـان پێـتەرز لە عەممـان، ڕوود پێـتەرز و مـارلی وێرگانــگ لە ئەمســتردام، ســوزان ڕۆکوێـڵ لە ڕامەڵــڵا و بەرهەم ساڵح لە سلێمانی.

جەمـال عەزیـز ئەمـین (سـلێمانی)، حەمید بۆزئەرسـەلان (پـاریس)، ســوزان میســەلاس (نیویـۆرک)، دەلفـین مینـۆیی (گەڕۆک)، جیم مویر (تـاران)، سـوزان ئۆسنۆس (نیویۆرک)، جـۆن پـاکەر (لاهـای)، فـاتی زیـایی (نیویـۆرک)، بە درێژایـی مـــاوەکە هاوکارییـــان کـــردووم. بە تـــایبەتی جەمـــال خـانەخوێیەکی زۆر بـاش بـوو لە هەمـوو سـەردانێکمدا بـۆ ســـلێمانی و گەلـــێ ئێوارەمـــان لەســـەر خـــوانی ڕازاوە و پێکەئارەقی نایاب بەسەر دەبرد، ئەگەر بە گەشـتی بنکەکەی ئەمنی جـارانی عێراق نەیبردمـایە لە نـاوجەرگەی شـاردا، کە خودی خۆی لەوێ بە سەختی ئەشکەنجە درابوو بە گومـانی خەباتی ژێرزەمینی.

پـاش ئەوەی لە سـاڵی ٢٠٠٢دا، لە هیومـان ڕایـتس وۆچ گواستمەوە بۆ گرووپی قەیرانە نێودەوڵەتییەکان، ڕۆب ماری و گارێـت ئیڤـانس نەرمـی و پشـتگیرییەکی باشـیان نوانـد و بواریان دام چەندین کورتەمۆڵەت وەربگرم، بۆ تەواوکردنـی

کتێبەکە، لە کاتێکدا کە لەوێش نەبووم. لیزا حەججار ڕەشنووسی یەکەمی دەستنووسەکەی خوێندەوە و بە شێوەیەکی دیبلۆماسی پێشنیاری کرد کەوا بە قووڵی پێیدا بچمەوە. منیش هەر وام کرد و سوپاسی دەکەم، هەر چۆنێک بوو کتێبێکی تۆکمەتری لێ دەرچوو کە خەڵک بیخوێنێتەوە. پاشان ژنەکەم و ڕەخنەگری توند پاتریشیا گۆسمان دوو ڕەشنووسی نوێیان لە سەرەتاوە تا کۆتایی خوێندەوە و ڕوویان وەرگێڕام لەو باسانەی کە تێیاندا شێتانە لە خەت لام دابوو، هەروەها ڕازاندنەوەی ناپێویست لە زمانەوانییدا و تووڕدانی هەموو ناکۆکییەکان و زۆر لە بیرۆکە ئایەخەکان بەدەم باوە، کە بە هەر جۆرێک بووە خزابوونە ناو تێکستەکەوە. بە هەمان شێوەش سوپاسگوزاری ماریگۆڵد ئۆکلاندی موحەڕیرم لە دەزگای چاپەمەنیی زانکۆی کامبریج، بۆ لەئەستۆگرتنی ئەم پڕۆژەیە و چاودێریکردنی، سوپاسیشم بۆ ئەو دوو خوێنەرە نادیارەم کە سەرنج و تێبینییە پڕ لە پەسن و تاریفەکانیان هێز و گوڕیان دامێ، کاتێک کە من بە نزیکەیی نائومێد بووبووم لە بارەی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەوە و پێزانینم بۆ ستافەکانی تری کامبریج و ئەو تەکنیککارانەی کەوا دەستنووسەکەیان گۆڕییە کتێبێکی شێوە قەشەنگ. سوپاسی عیسام ئەلخەفاجی دەکەم بۆ جوانکاری لە تایتڵەکانی کتێبەکەدا. پاشانیش خێزانەکەم: ژنەکەم و منداڵەکانم ئەرنت، فۆیبە، ئایدان. من زۆر لەوە زیاتر قەرزارباریانم کە لێرەدا چەند دێڕێکیان بۆ بنووسم. دوورکەوتنەوەی بەردەوامم لێیان و تاسەکردنیان و پێم خۆشە بڵێم کە ئێمە ئێستا ئەوەمان تێپەڕاند و قەرزاریانم کە ئەمەم هێنایە ئاراوە.

"من له هیچ شتێک ناترسم، خوا و گازی ژەهراوی نەبێت."

**ئەفسەرێکی عێراقی**

**بەغدا، ٢٠٠٣**

## شایەتحاڵی هێرشێکی گاز

له مارتی ١٩٨٨دا، ئەحمەد ناتیقی، وێنەگری سەرەکی بوو له ئاژانسی هەواڵی کۆماری ئیسلامیی ئێراندا IRNA و جەنگی سەختی هەشت ساڵەی نێوان ئێران و عێراق بەرەو کۆتایی خۆی بەکێش دەکرد و ڕاستییەکی سەلمێنراو بوو بۆ هەردوو لا. هێزەکانی ئێران به یارمەتیی گەریلا کوردەکان، بەشێکی گەورەی خاکی کوردستانی عێراقیان ڕزگار کردبوو، یان داگیر کردبوو و بەرگریی عێراقیان له هەڵەبجەدا ڕاماڵی و تێکیان شکاند. ناتیقی له ١٥ی مارتدا گەیشته سنوور، ڕێک دوابەدوای گەڕانەوەی هەندێک هاوەڵی له شارۆچکەکه و گێڕانەوەی ئەو چیرۆکانەی که چۆن دانیشتوانی پێشوازیی گەرمیان لێ کردوون و گەرماوه تورکییەکانی چەند خۆش بوون، ناتیقی له پەرۆشی ئەوەدا، که خۆی له نزیکەوه ئاگادار بێت، بۆ بەیانیی زووی ڕۆژی ئاینده، کەوته تەک ئۆتۆمبیل و ماتۆڕی سەربازان. ئۆتۆمبیله بارهەڵگرەکانی پڕ بوون له دیلی جەنگی عێراق، ڕووەو ئەوبەر ملیان نابوو بەرەو ئۆردووگاکانی دیلی جەنگ له ناو ئێراندا.

سەعات لە دەوروبەری یازدەی بەیانیدا بوو، ناتیقی، لەگەڵ سێ هاوکاریدا لەسەر لوتکەی شاخێک وەستابوو، وێنەی کاڵیدۆسکۆپی دۆڵەکەی خوارەوەی دەکێشا، کە خۆر پەڵەپەڵەی کردبووەوە، پاشان بە ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگر بەرەوخوار بووەوە، کە خواردن و ئازووقەی دەبرد بۆ ئەو هێزانەی ئێران کە هێڵێکی سنوورییان کێشابوو بە لێواری دەریاچەی سیروان و ڕووباری زەڵمدا. ئەمان لە قەراغ هەڵەبجە دابەزین، کەوتنە نانی وشک جوین و بەدەم ڕێیشەوە وێنەگرتن. لەناکاو فڕۆکەکانی عێراق بە ڕاسەرەوە دەرکەوتن و ڕیزێک بۆمبیان بەردایەوە. ناتقیی جەنگاوەری چوار ساڵ قاڵبووی جەنگ و چەندین شەڕی بینیبوو، دەیگوت ئەمە نەیشڵەژاندم و بە کورتی گوتی: "لە بەرەدا ئەمە شتێکی ئاساییە." کات چێشتەنگاو بوو، شەقامەکانی هەڵەبجە تا ڕادەیەک چۆڵ بوون و "چەند وێنەیەکی دایەنگەیەکی چۆڵمان گرت و پاشان بڕیارمان دا بە پێیان بچینە ناو شارەوە. فرەی پێ نەچوو فڕۆکەیەکی ترم چاو لێ بوو بۆمببارانی دەکرد و بۆمب و دووکەڵەکەیم وێنە گرت کە لێی بە جێ دەما. هەموو شت ئاسایی بوو. دەرگای ماڵێکم کردەوە و تەماشام کرد ژنێک لە حەوشەکەدا مریشک سوور دەکاتەوە و بە ڕقێکەوە ئاوڕی لێ دامەوە. گەیشتینە دووڕییانێک و هاوەڵەکەم لەناکاو گوتی: "ئا سەیری ئەو لایە بکە، ئەو کچە هێشتا زیندووە!"

ناتیقی لە ئۆفیسەکەی تارانیدا، ئەو وێنانەی دەرهێنا کە گرتبوونی، یەکەمیان هیی کچە کوردێک بوو بە دەمدا کەوتبوو، ئەوجا دانەیەکی تری هەمان کچ و ئەمەیان وای دەردەخست کە بە حاڵ و نەحاڵ گیانی تێدا ماوە و خۆی بە

دیـواری مـاڵێکەوە گرتـووە کە نـاتیقی و هـاوڕێکەی لێـرەدا هەڵیان گرتبوو. لەولایەوە کوڕێک کەوتبوو، پێدەچێت برای بووبێت. ناتیقی دەیگوت کەوا کوڕەکەی لە ناو خانووەکەدا دۆزیـوەتەوە، کاتێـک بەرەو ئەو جـێگەیە چـووە کە کـچەکە پێشتر تێیدا ڕاکشـابوو، ئەوجا هێنـابوویە دەرەوە بـۆ سـەر شەقامەکە و سەرنجی دابوو کەوا تۆزێکی سپی لە دەرەوە، چەشـنی پـۆدرەی دەموچـاوی منـداڵان زەویـی داپۆشـیوە. ناتیقی دەگێڕێتەوە کەوا "من وام زانی بۆمبێک بەر کارگەی تەباشـیر کەوتـووە" و تەنـانەت ویستووشـیەتی دەموچاویـان پـاک بکـاتەوە لەو کاتـانەدا کە بۆمبەکـانیش دەکەوتـن. "ئەمە هێنـد ئاسـایی بـوو کەوا مـن سـەرنجی تـایبەتیم نەدایە و بەردەوام بووین لەسەر گەڕانی خۆمـان تـا ئەم پیاوەم بینی (لێرەدا وێنەی پیـاوێکی پیشـان دام، کە ئێسـتا بەناوبـانگە و هەمـوو کەسـێک دەزانێـت کێـیە، بە دەمـدا لەسـەر زەوی ڕاکشـاوە و منـداڵێکی شـیرەخۆرەی لە باوەشـدایە)." "مـن وێـنەم گـرتن و لەو سـاتەوەختەدا بـڕادەرێکم، کە چووبـوو ئۆتۆمبیلێـک پەیـدا بکـات بـۆ دەرکردنـی منـداڵان، بە بـارهەڵگرێکی سـەربازییەوە گەڕایەوە و ماسـکی گـازی لە سەر کردبوو، من تەنها لەو کاتەدا هەستم کرد چی ڕووی داوە."

ناتیقی هەرگیز ماسکەکەی خۆی بە کار نەهێنا، تەنـانەت کاتێک بە لای ترسناکترین و سامناکترین دیمەنەکانی مەرگی کتـوپڕ و خامۆشـدا تێـدەپەڕی، "پیکابێـک دە دوازدە تەرمـی تێـدا بـوو، شـۆفێرەکەی بە ئاسـتەم هەناسـەی دەدا"، لەبەر ئەوەی وەک خۆی دەیگوت، ماسکپۆشین لەگەڵ کارەکەیدا ڕێـک نەدەکەوت. ئەو شـەوە درەنگانێـک، پـاش ئەوەی

هەلیکۆپتەرێکی سەربازیی ئێرانی خۆی و هاوڕێکانی و ژمارەیەک لە دەربازبووە کوردەکانی بردبووە بنکەکانی ئێران لەودیوی سنوورەوە، دەبوو لە کلینیکێکی گەڕۆکدا چارەسەری کوێربوونی کاتی بکات. لە ڕۆژانی داهاتوودا کاتێک کە بۆ دووەم و سێیەم جار سەردانی هەڵەبجەی کردووە و لە پشتی پیکابێکدا گەشتی بە ناوچەکەدا دەکرد، پاشماوەی گاز و هەڵمی کیمیاییەکە کاری تێکرد و ناچاری کرد بگەڕێتەوە بۆ تاران.

ژمارەی تەواوی کوژراوانی هێرشی گازی هەڵەبجە نازانرێت، بەڵام مەزەندە دەکرێت بگاتە چەند هەزارێک، چونکە لە کۆی نزیکەی ٧٠ ــ ٨٠ هەزار لە دانیشتوانی ناوچەیەک و بەو خەستییەی بۆردمانەکە ڕووی دا، ڕەنگە ئەمە ژمارەیەکی کەم بێت. زۆربەی دانیشتوانی شار، بەوە گیانی خۆیان پاراست کە بۆمباران دەستی پێ کرد، ئەمان خێرا چوونە ماڵەکانی خۆیانەوە و دەرگا و پەنجەرەیان داخست. ئەوانەی کە لای باشوور و ڕۆژئاواوە بوون، سوودیان لەو بایە بینی کە گازە ژەهراوییەکەی بۆ ڕۆژهەڵات و بەرەو سنوور برد و لەوێ بوو بە هۆی بەرکەوتن و کارەساتێکی گەورە. هەروەها گەلێکی تر بەوە ڕزگاریان بوو، چونکە هێزەکانی ئێران سەدان برینداریان گواستەوە بۆ کلینیکە کاتییەکانی سەر سنوور و لەوێ پەرستار دەیانشۆردن و ئەترۆپینیان بۆ بە کار دەهێنان، کە دەرمانێکی دژی دەمارەگازە. ماوەی چەندین ڕۆژ، ناوچەکانی سنوور، جمەیان دەهات لە ئاوارەی تۆقیو و تووشهاتووی شۆک و حەپەسان کە بە چیاکاندا هەڵکشابوون و بە دوای پەناگەی ئارام و سەلامەتیدا

دەگەڕان لە ئێراندا، کە هاوپەیمانێکی شل و توندی کوردەکانی عێراقە لە باشترین حاڵەتدا.

چیرۆکەکەی ئەحمەد ناتیقی، شایەتحاڵێکی لەئەژمارنەهاتوو پشتیوانیی لێ دەکەن، لەوانە: کوردە دەربازبووەکان، دەستە و تاقمە پزیشکییە ئێرانییەکان، پێشەنگە ئێرانییەکانی پێشتر سەردانی هەڵەبجەیان کردبوو، لە کاتی هێرشەکە و دوای ئەوەش، فەرماندەکانی پێشمەرگەی کورد و تەنانەت ئەفسەرێکی پلەبەرزی عێراقییش وەک دەڵێت لە ژووری ئۆپەراسیۆنی هێزی ئاسمانی بووە لە کۆشکی کۆماریی بەغدا، کاتێک کە فەرمان دەرکراوە بۆ بۆردمانی کیمیایی هەڵەبجە. بە شێوەیەکی گشتی، زیاتر بەڵگەی بەکارهێنانی عێراق بۆ گازی ژەهراوی لە سەردەمی جەنگدا، لە هەشت ڕاپۆرتی پسپۆڕیی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، ددانپێدانانی کاربەدەستانی پایەبەرزی عێراقی، ئەفسەر و فڕۆکەوانانی سەربازی، چەندین تەن بەڵگەنامەی پۆلیسی نهێنیی عێراق، کە لە لایەن یاخیبووە کوردەکانەوە ساڵی ١٩٩١ دەستی بەسەردا گیرا و بۆ سەلامەتیی پاراستنی برا بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان، گێڕانەوەی شایەتحاڵە دەربازبووە کورد و ئێرانییەکان، نموونەی خۆڵ[٢]، سەدان لە بەڵگەنامەکانی هەواڵگریی ئەمەریکا و بەڵگەنامەی حکومیی تر کە لەژێر یاسای ئازادیی زانیاریدا[٣] (FOIA - Freedom of Information Act) و چەندین چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەفسەرانی هەواڵگریی ئەمەریکی و ئیسرائیلیدا، بە دەست هاتوون.

بەڵام مەسەلەی خەتابارییی پەلاماری هەڵەبجە تا ئێستاش هەر مشتومڕی لەسەرە. ئەمەش تا ڕادەیەک لەو

سـۆنگەیەوەیە کە هێزەکـانی ئێـران کـۆنترۆڵی ناوچەکەیـان کردبـوو و نەیاندەهێشـت کەس پێـی بگـات، کە ڕێگەیـان بە ڕۆژنـامەوانی وەک ئەحـمەد نـاتیقی دابـوو بە شـێوەیەکی سـەرەکی ڕاپـۆرتی سـەرەتایی خۆیـان ئامـادە بکەن، پاشـان خێرا هێزی سـەربازیی ئێران بە هەلیکۆپتەر ئەو پەیامنێرە بیانییانەی کە لە تاران بوون، گواستەوە بۆ شـوێنی ڕووداو و ڕاپۆرت و وێنەکانیان بە سـەرانسـەری دنیادا بڵاو بووەوە، بەڵام هەرگیز هیچ لێکۆڵەرێکی سەربەخۆ نەیتوانی بە ئازادی سەردانی ناوچەکە بکات، لانیکەم تا دوادوایی سـاڵی ١٩٩١، کە لەو دەمەشـدا جەنگی ئێران - عێراق، کۆتـایی هـاتبوو و هەڵەبجەش بیر چووبووەوە.

پەرۆشـی و تینـوێتیی ئێـران بـۆ کودەتـایەکی خێـرای پرۆپاگەنـدە، زیـانی بە ڕاسـتی و متمـانەی بەسـەرهاتی هەڵەبجە گەیاند، بە تـایبەتی پاش ئەوەی دۆسـتەکانی عێراق لە واشـنتۆن، چـوونە کـارەکەوە. لە کاتێکـدا کەوا کـۆمەڵی نێـودەوڵەتی بە زوویـی و ڕۆژانـی پـاش ڕووداوەکە، کە عێراقیـان بەو کـارە گوناهبـار کـرد، کەچـی لە مـاوەی هەفتەیەکـدا وەزارەتـی دەرەوەی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان کەوتە بـرەودان بەو دەنگوباسـەی کەوا ئێرانیش ڕۆڵێکـی لە پەلاماری گازدا بینیوە و تەنانەت ڕەنگە بەرپرسیاریش بێت لە بەشێکی گەورەی قوربانییانی گازە کیمیاییەکە.

سـەرچاوەگەلێکی ناونەبراویش لە پینتاگۆندا، پشـتگیرییان لەم مەسـەلەیە دەکـرد، کەوا دەمـودەس هێنایـانە ئـاراوە و کردیـانە هۆکـاری سـووککردنی بڕیـارێکی ئەنجـوومەنی ئاسایشـی نەتەوە یەکگرتووەکـان کە دەبـوو عێراقـی تاوانبـار بکـردایە. لە پـاش چـاوەڕوانیی نـزیکەی دوو مانـگ، دواجـار

ئەنجـــوومەن نـــارەزایی تونـــدی دەربـــڕی لە بەکارهێنـــانی بەردەوامـــی چەکـــی کیمیـــایی "لە ململانێـــی نێـــوان کۆمـــاری ئیسـلامیی ئێـران و عێراقـدا" (بـا ئەوەی دەسنیشـانی لایەنـی تاوانبـار بکـات) و داوای لە هەمـوو لا کـرد "لەمەودوا واز لە بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی بێـنن" و وای دەردەبـڕی کەوا ئێران هاوبەشە لەو بەرپرسیارێتییەدا.

نوشوستیهێنان لە گوناهبارکردنی توندی ڕژێمـی عێراقدا، بەوەی کە دەبـــوو بە تـــاوانی جەنـــگ و تـــاوان لە دژی مرۆڤـایەتی لەقەڵەم بـدرایە، ئەنجـامی ترسـناکی هەبـوو بـۆ سـەر دانیشـتوانی دێهاتی کوردسـتانی عێراق، کە لە ناویانـدا یاخیبوونێکی سەخت لە ساڵەکانی جەنگدا بەرپابوو. بێ هـیچ ڕێگـرییەک هێزەکـانی ڕژێـم کەوتـنە بەکارهێنـانی گـازی ژەهراوی بە شێوەیەکی چەندبارە لە دێهاتدا، لەمیانەی چەند ڕۆژ و هەفتەی دوای ئەوەدا، وەک هەوڵێک بـۆ دەرپەڕانـدنی کوردەکـان لە گونـدەکانیان. بە وردی ئەوەی کە لە واشـنتۆن و نیویـۆرک ڕووی دا لە مـاوەی دوو مـانگی دوای پەلامـاری هەڵەبجەدا، دەهێنێت لە نزیکەوە لێی بڕوانیت.

### تەمموزی جەنگ

لە گەرماوگەرمی دوای پەلامارەکەی هەڵەبجەدا، واتەواتی ناتەواو و ڕاپۆرتی بێسەروبەر دەگەیشتنە پەیامنێرانی نیشتەجێی تاران و ئۆفیسەکانی پاریس، لەندەن، واشنتۆن و ڕیۆدیجانیرۆ؛ ڕاپۆرتگەلی پێشڕەویی ئێرانییەکان لە باکووری عێراقدا، هێرشێکی کیمیایی بۆ سەر شارۆچکەیەکی کوردنشین و سەدان حاڵەتی تووشبوون و بەرکەوتن، ئەگەری ڕۆڵبینینی کورد لە شەڕی نزیک بەنداوێکی ستراتیجی و ئیدیعای ئەوەی کە ئێرانیش ڕەنگە کیمیایی بە کار هێنابێت. بە شێوەیەکی سەرەکی جیهان پشتی بە سەرچاوەکانی حکومەتی ئێران بەستبوو بۆ هەواڵ. سەرکردەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، جەلال تاڵەبانی، کەوتە گەشت بە ئەورووپادا و هەر زوو بوو بە سەرچاوەی دووەم و باس و بۆچوونی جۆراوجۆری وەردەگرت لەوەی کە ڕووی دابوو، بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی لە هەڤاڵەکانیەوە لە شاخەکانی کوردستانەوە پێی دەگەیشت.

لە ١٦ی مارتدا و چەند سەعاتێک دوای لێدانی کیمیایی، سەرۆکی ئامێری پرۆپاگەندەی جەنگی ئێرانی، کەمال خەڕازی (دواتر وەزیری کاروباری دەرەوە)، عێراقی خەتابار کرد لە ئەنجامدانی هێرشێکی کیمیایی بۆ سەر شارۆچکەی هەڵەبجە، نزیک لە ناوچەی ئۆپەراسیۆنی

ئێرانییەکـان کە نـاوی هێرشـی والفجـر/١٠ بـوو، خەڕازی ئیـدیعای ئەوەی دەکـرد کەوا ئێـران هێرشـەکەی لە ڕۆژی سێشـەممە، ١٥ی مـارت دەسـت پـێ کـرد و تـۆڵەکردنەوەی عێـراق دەکرێـت بە تێکشـکان و بەزینـی هێزەکـانی لێـک بدرێتەوە[٤].

والفجـر/١٠ دوا ئەڵقەی زنجیرەکـانی والفجـر بـوو، کە لە سەردەمێکی زووی جەنگەوە دەستی پێ کردبوو، مەبەست هەر چییـەک بووبێـت، والفجـر/١٠ لە دیـدی شـیکاری سەربازیی ڕۆژنـامەی نیویۆرک تـایمزەوە ئەنجـامگیریی بۆ نەکرابـوو لەمەڕ "هێرشـی زسـتانی پڕ مەترسی"ی ئێرانـی[٥]. باشە ئەمە، وەک شیکارێکی تر بۆی دەچێت، بەشێک نییە لە چاوبەسـتیی بەڕێوەچـوونی جەنـگ، دوور لە بەرە سەرەکییەکانی شـەڕ و بەرەو پێکدادانی بچووکتر، چەشنی هێرشـکردنە سـەر کەنـداو و شـارەکانی دوژمـن، بـۆ بەدەسـتهێنانی سـوودی دیبلۆماسـی و سیاسـی لەبـری زەوتکردنی خاک[٦]؟

بە هەرحـاڵ، ئامانجەکـانی والفجـر/١٠، یـان دەسـکەوتە ڕاسـتەقینەکانی هەر چییـەک بووبێـت، ئەوەی کە ئاشـکرایە ئەوەیە کەوا ئێران هێزەکـانی عێراقـی لە نـاو خـاکی عێـراق خۆیدا لە هێرشێکدا تێک شکاند و ئەمە، پێش هەموو شـتێک، مۆرکی خۆی نـا بە ڕووداوەکـانی هەڵەبجە و خـۆڕانەگرتنی پرۆتێسـتی کوردەکـانەوە. تاڵەبـانی لە چاوپێکەوتنێکـدا لە فەڕەنسـا، وای لەقەڵەم دا کەوا زیـاد لە دوو هەزار کـورد لە هەڵەبـجەدا کـوژراون بە هـۆی هێرشـێکی کیمیـایی لە لایەن هێـزی ئاسـمانی عێـراقەوە، لە ناوچەیەکـدا وەک ئەو

گوتوویەتی، کەوا "لە لایەن گەریلا کوردەکانەوە بە یارمەتیی ئێران گیراوە"[٧].

عێـراق لە بەرانــبەردا وای دەربــڕی کە بە پــێچەوانەی ئیدیعاکانی ئێرانەوە، هیچ شـەڕ و پێکدادانێک لە هەڵەبجە و خورماڵـــدا بەرپـــا نەبـــووە، چـــونکە "ئەم ناوچـــانە یەکە سـەربازییەکانی ئـێمەی تێدا نەمـابوو و هێزەکانمـان لەوێ نەبوون". لەبری ئەوە ڕژێم جاڕی ئەوەی دەدا کە ئیدیعاکانی ئێران "هەوڵدانێکە بۆ داپۆشینی تـاوانی قێزەونـی وێرانکردنـی شـاری هەڵەبـجە و گوندەکانی دەورووپشتی، کەوا هێزەکـانی داگیـر و وێرانیـان کـردووە"[٨]. ددانپێدانانی عێراق بەوەی کە هێزەکـانی لە ١٦ و ١٧ی مارتـدا لەو ناوچـانە نەبـوون، زۆر گرنگ بوو، وەک لەمەودوا دەیبینین.

لە ١٧ی مارتـــدا، نـــوێنەری ئێـــران لە نیویـــۆرک، نەتەوە یەکگرتووەکانی ئاگادار کردەوە کە "ژمـارەیەکی زۆر خەڵکـی مەدەنیـی کـوژراو و برینـدار هەیە"، لە هێرشـێکی کیمیـایی عێراقـدا لەمیـانەی ئۆپەراسـیۆنی والفجـر/١٠ی ئێرانــدا و دوابەدوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم "عێراق چەکی کیمیـایی بە ڕادەیەکـــی زۆر گەورە بە کـــار هێنـــاوە" لە گۆڕەپـــانی ئۆپەراسـیۆنی والفجـر/١٠دا و "بە هەمـان شـێوەش لە دژی ناوچەکانی کوردی عێراق". بۆ ڕۆژی دواتـر وای بـاس کـرد کە ژمـارەی کـوژراوانی دانیشـتووی هەڵەبـجە و خورمـاڵ و دوجەیلە و گوندەکانی دەورووپشـتیان، نـزیکەی چـوار هەزار کەسە[٩].

لە ٢١ی مارتــدا، ئاژانســی هەواڵــی کۆمــاری ئیســلامیی ئێران IRNA ڕای گەیاند کە سـەرجەم پێنج هەزار کورد لە هەڵەبـجە و دەورووپشـتی کـوژراون، لەگەڵ تروسـکەهەواڵی

تردا کەوا عێراق گازی خەردەل و سیانید و دەماری بە کار هێناوە[١٠]. ئاماژەکردن بە سیانید، تا ڕادەیەک بایەخدار بوو، کە ئەمەشیان دواتر ڕوون دەبێتەوە.

لێرەدا پێنج لە قوربانییان گەیشتنە نەخۆشخانەکانی تاران، لەوێش پەیامنێرانی ڕۆژئاوایی سەردانیان کردن و لە ڕێگەی دکتۆر حەمید سوهرابپوورەوە زانییان کەوا سەدان کەسی بریندار لە هەڵەبجەوە گەیشتوون، "کەوا گەورەترین کۆمەڵە خەڵکی مەدەنی بوون تا ئەو دەمە کە بە کیمیایی بریندار بووبێتن". کوردەکان بە پەیامنێرانیان ڕاگەیاند کەوا بیستوچوار سەعات پێش هێرشەکە، یاخیبووە کوردەکان هاتوونەتە ناو هەڵەبجەوە و گرتوویانە. بەپێی "گلۆب ئەند مەیل Globe and Mail چەند یەکەیەکی پاسدارانی شۆڕشی ئێرانی، بە ئاشکرا شەڕیان لەگەڵ سوپای عێراقدا دەکرد لە دەرەوەی شار کاتێک کە یاخیبووە کوردەکان هەڵەبجەیان گرت و پێدەچێت بە پلانێکی هاوبەش بووبێت".
ئێران دەڵێت لە کاتی بۆردمانە یەک لە دوای یەکەکەی هەڵەبجەدا، هیچ هێزێکی لەوێ نەبووە، کە ئەگەر ڕاست بێت وا دەگەیەنێت کە عێراق هێرشێکی کیمیایی ئەنجام داوە دژ بە شارێک کەوا پڕ بووە لە هاووڵاتییانی خۆی. بۆ ئەوەی ترس و بیمەکە بەهێزتر بکات، ئێران یەکەم وێنەی ڤیدیۆیی پەلامارەکەی بڵاو کردەوە سەبارەت بە قوربانییە مەدەنییەکان و هەر دەستبەجێ ملیۆنان کەس لە سەرانسەری دنیادا بینییان و بە پەلە نوێنەری ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکان بانگ کرا بۆ لێکۆڵینەوە[١٢]. هەر لەو سەروبەندەدا، وەزارەتی ئیتلاعاتی ئێرانی، سەرومڕ کاری

دەکرد بۆ دابینکردنی پێداویستیی ڕۆژنامەنووسان بۆ سەردانی هەڵەبجە.

لە ٢٠ی مارتدا هەلیکۆپتەر یەکەمین گرووپی گواستەوە بۆ شارۆچکەی لێقەوماو، کە زۆر بە نزمی دەفڕین بۆ خۆدەربازکردن لە فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق کە بە ڕاسەرەوە دەسووڕانەوە. فرەی نەبرد چیرۆک و بەسەرهاتەکان دەرکەوتن. دێڤید هێرستی ڕۆژنامەی گاردیان وێنەیەکی گرافیکی تایبەتی کێشابوو، بەم شێوەیە: "نە برین دیارە نە خوێن و هیچ ئاسەوارێکی تەقینەوەش بە تەرمەکانەوە نییە، پێستی لاشەکان بە شێوەیەکی سەیر و سەرسامکەر ڕەنگی گۆڕابوو، چاویان بە کراوەیی مابووەوە و دەرپۆقیبوو، لینجاوێکی مەیلەوبۆر لە دەمیان هاتبووە دەرەوە و پەنجەکانیان بە شێوەیەکی نامۆ و ترسناک لوولیان خواردبوو. پێدەچوو مەرگ لە ناخافڵی و ناکاودا بەرۆکی گرتبێتن." هێرست لە زاری دکتۆرێکی ئێرانییەوە، کە ناوی عەباس فروتانە، دەڵێت کەوا کوردەکان بووبوونە قوربانیی گازی سیانید: "هەر بۆمبێک سەد لیتری تێدا بوو و لە ڕۆژێکی ساردا هەڵمەکەی بە خێرایی لە پێنجسەد مەتردا بڵاوە دەکات. لەبەر ئەوە خەڵکەکە هیچ دەرفەتێکیان بۆ نەمایەوە."(١٢)

هەراوهوریای میدیا، بە پشتگیریی ئامڕازی پڕۆپاگەندەی ئێرانی، هەڕەشەی شڵەژاندن و پەکخستنی بەڕێوەبەرێتیی ڕیگانیان کرد، کە پشتیوانیی بەهێزی بۆ کۆششی عێراق لە جەنگدا ــ پاش ئابڕووچوونەکەی ئێران ــ کۆنترای ساڵی ١٩٨٦ ئاشکرا بووبوو، هەروەها هۆکاری سەپاندنی قەدەغەکردنی نێودەوڵەتیی چەک بوو لەسەر ئێران لە

ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکاندا. زیاد لەوەش شیکار و لێکۆڵەرەوانی هەواڵگری وایان مەزەندە دەکرد کەوا پێشڕەویی هێزەکانی ئێران لە ناو خاکی عێراقدا، ڕەنگە هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ ڕژێمی بەغدای هاوپەیمانی واشنتۆن پێک بێنێت. ڕاپۆرتگەلی نوێ، کە ناخۆش بوون بۆ ئەوانەی لە داڕووخانی سەربازیی عێراق دەترسان، وایان لێک دەدایەوە کە ئێرانییەکان نزیک بوونەتەوە لە وێستگەی هایدرۆکارەبایی ستراتیجیی بەنداوی دەربەندیخان یان دەریاچەی سیروان، کەوا کارەبای ناوچەیەکی فراوانی تا سنووری بەغدا دابین دەکات، لە کاتێکدا خودی بەنداوەکە خۆی کۆنترۆڵی ئاوی زێی دیالە دەکات، کە لقێکی دیجلەیە. هەر گرتنێکی بەنداوەکە لە لایەن ئێرانەوە، بەپێی بۆچوون، کارەساتێکی سەختی بۆ ڕژێمی عێراق دروست دەکرد و ڕەنگە هەڕەشەی ئەوەشی بهێنایەتە پێشەوە کە داگیرکەران وێستگەی کارەباکەیان بتەقاندایەتەوە و لەگەڵ هەڵتەکاندنی بەنداوەکەدا، بەغدا بەر لافاو بکەوتایە[١٤].

هەر لەو سەروبەندەدا، ڕاپۆرتگەلێکی نوێ خۆیان خزاندە نێو مشتومڕی ڕووداوەکانی هەڵەبجەوە، تەنانەت لە کاتێکیشدا کە ئەم ڕووداوانە هێشتا هەر ئاشکرا و بڵاو بوون، وەک ڕاپۆرتەکانی جموجووڵی هێزەکانی ئێران، بەرگریی توندی عێراق و لێدانی زیاتری کیمیایی. باشە ئەم ڕاپۆرتانە چۆنچۆنی ئامادە کراون؟ ئەو ڕۆژنامەنووسانەی بە فڕۆکە هێنرانە هەڵەبجەوە و بە پەلەپڕووزێ و لەژێر چاودێریی پاسەوانانی تووڕە و دەمارگرژدا بەملا و بەولایاندا دەبردن، لە ژێر بۆردمان و تۆپبارانی بەردەوامدا، کاتیان زۆر کەم هەبووە بۆ لێکۆڵینەوەیەکی شێنەیی. کێ لە

کوێ بوو، چی بکرێت و بۆ کێ؟ لە نێو تەمومژی جەنگدا، ئەم پرسیارانە تا ڕادەیەک لە مەحاڵەوە نزیکن. لەم بێنەوبەرە و تێکەڵی‌وپێکەڵییەدا، ڕۆژی ٢٣ی مارت چارڵس ڕێدمانی وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە، عێراقی گوناهبار کرد (بە "پێشبێلکردنی پرۆتۆکۆڵی جنێڤی ساڵی ١٩٢٥ بە شێوەیەکی تایبەتی و مەترسیدار") و بە هەمان نەفەس پێیەوە دیار بوو کە دەیویست عێراق لە بەرپرسیاریی پەلاماری گاز ببوێرێت و دەیگوت: "بەڵگەی ئەوە لەئارادایە کەوا ڕەنگە ئێرانیش لە شەڕەکەدا تۆپبارانی کیمیایی کردبێت."[١٥] لەوە بەولاوەتریش (هەر خێرا چەند کاربەدەستێکی ئەمەریکیی ناونەبراو وایان لەقەڵەم دا) کە ئێرانییەکان "لە بواری زۆر سنووورداردا" و لە دوو ساڵ لەوەوپێشەوە تۆپی کیمیاییان بە کار هێناوە[١٦].

ڕژێمی عێراق، کە بە عادەتی خۆی خێرا بەرپەرچی تاوانبارکردنی ئێرانییەکانی دەدایەوە، بەڵام بە شێوەیەکی سەیر و نامۆ لە گەرماوگەرمی دوای هەڵەبجەدا بێدەنگ بوو، وا ئێستا هاتووەتە دەنگ. عەبدولئەمیر ئەنباریی نوێنەری عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان، لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەختی ڕەخنەگرتندا لە بەرنامەی "نایتلاین"ی تەلەڤیزیۆنی ABC، دەستی گرتبوو بەو پەتی خۆڕزگارکردنەوە کە لە سەرەتای ئەو ڕۆژەدا بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان هەڵیدابوو و دەیگوت: "چاکە، با بیرتان بێنمەوە کەوا مستەر ڕێدمان باسی لە هەندێک بەڵگە و هەندێک ئەگەر کردووە ـ کە ڕاستییەکەی لە ئەگەر زیاترن ـ کەوا ئێران تۆپی کیمیایی بە کار هێناوە دژ بە ناوچەکانی خاکی عێراق." ئەوجا بەردەوام بوو لەسەر جەختکردن

لەوەی کە تاوانبارکردنی مەسەلەی هەڵەبجە تەنها لە لایەن ئێران و جەلال تاڵەبانییەوەیە "کە هاوکاریی ئێران دەکات".

لەم خاڵەدا، خانەخوێیەکەی نایتلاین، تید کۆپێل، سەرێکی بۆ لەقاند کەوا "تەمومژێک هەیە لەم مەسەلە تایبەتییەدا". بەڵام ئەوەشی وت ئەگەر بالۆیز ڕاست بێت لە بۆچوونیدا کە ئەگەر ئێران، نەک عێراق، خەتابار بێت لە هەڵەبجەدا، ئەوا لە دواییدا بە دڵنیاییەوە حکومەتی عێراق قازانج لە لێکۆڵینەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات. لێرەدا ئەنباری کەمێک پاشگەز بووەوە و لە جیاتییدا وای دەربڕی کە ڕازینەبوونی ئێران بە کۆتاییهێنانی جەنگ، ڕەوایی دەداتە هەر درندەیەک کە لەوانەیە عێراق ئەنجامی بدات. لێرەدا دیپلۆماتی عێراقی بە توندی هاوار دەکات: "ئێمە لای خۆمانەوە ڕاشکاوانە دەڵێین ئامادەین بۆ پێشوازیی هەر تیمێک، هەر چارەسەرێک کە چاوبەستی نەکات لە ئەنجوومەنی ئاسایش و... سەرنجی جیهان چەواشە نەکات لە هۆکاری ئاپ و ئاشکرای دەسدرێژیی ئێران و جەنگ. ئێمە دەمانەوێت لەگەڵ هەموو لا هاوکاری بکەین سەبارەت بە مەسەلەی کیمیایی و دیلی جەنگ و کەشتیی نەوتبەر و شتی تر، بۆ ئەوەی کۆتاییەکی ئاشتییانە بە جەنگ بهێنرێت و لایەنی تاوانبار سزا بدرێت."(١٧)

بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان، بە وردی ئیدانەکردنی لە ڕووی دەربڕینەوە تاوتوێ دەکرد و تۆوی گومانی لە مێشکی ئەوانەدا چاند کە دەیانخواست ئێران دەستی هەبێت لە کارە چەپەڵەکاندا. میدیا یارمەتیدەر بوو لە بڵاوبوونەوەی ڕێسەکەی واشنتۆندا، بە نووسراوێک لە لایەن کاربەدەستێکی ناوبراوەوە، کاتێک دەڵێت "ئەوان زانیارییەکی

هەواڵگریی باشیان دەست کەوتووە و ئاماژە بەوە دەکات کەوا ئێران گازی سیانیدی لە دژی هێزەکانی عێراق بە کار هێناوە بە هۆی بۆردمانی تۆپخانەوە، لە هەمان کاتی پەلاماری گازی عێراقدا، وەک بەشێک لە هێرشەکەی لە ناوچەی هەڵەبجەدا[١٨].

بە قورسایی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە پشتی ئەم کارەوە، مەسەلەکە زوو تەشەنەی کرد و بوو بە لێکدانەوەیەکی سەنگینی ڕووداوەکان لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوادا لەسەر جەنگ و بە هۆی نائامادەیی لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ، کە ئەنجامگیریی پێچەوانە بەرهەم بێنێت و چوارچێوەیەک بۆ سیاسەتی ئەو مشتومڕە دابنێت.

## ململانێ و دەمەقاڵێ لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا

نەتەوە یەکگرتووەکان بە دوودڵی مایەوە و خافێر پێریز دیکۆیلاری سکرتێری گشتی، کە پێشتر فەرمانی چەندین لێکۆڵینەوەی دەرکردبوو، بۆ داواکاریی ئێران سەبارەت بەوەی هێزەکانی ڕووبەڕووی پەلاماری کیمیایی عێراق بوونەتەوە، هەستی کرد کە بەڵگەی تەواوی بە دەستەوەیە بۆ ڕۆڵی عێراق لە هەڵەبجەدا تا بتوانێت ڕژێمی سەدام حسێنی پێ گوناهبار بکات. ئیشارەتدان بە "بەڵگەی جیددی و بەرچاو" لە بەردەستدان کەوا هێزەکانی عێراق "دیسانەوە" گازی ژەهراوییان بە کار هێناوە و "ژمارەیەکی زۆر خەڵکی بەرکەوتووە، بە خەڵکی مەدەنییشەوە". لە ٢٥ی مارتدا، لە کاتێکدا گفتوگۆ لەسەر ئابلووقەدانی ئێران بەردەوام بوو لە ئەنجوومەنی ئاسایشدا و وتەبێژەکە، هەڵوێستی سکرتێری گشتیی دووپات دەکردەوە: "بە ڕێزی تەواوەتی و بێ دوودڵی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی گوناهبار دەکات لە هەر کات و شوێنێکدا بە کار بێت."[(١٩)]

ڕاگەیاندنەکەی پێریز دیکۆیلار، وەڵامدانەوەیەکی پڕ نارەزایی عێراقی ورووژاند. تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوە، نامەیەکی نووسی بۆ دەربڕینی "نائومێدی و نارەزایی توند لەسەر سروشتی ناهاوسەنگ و لایەنگریی ڕاگەیاندنەکە" و سەرزەنشتی نەتەوە یەکگرتووەکانی کرد

سەبارەت بە فەرامۆشکردنی درندەیی ئێرانییەکان، کە لە هەمووی بەرچاوتر مامەڵەی ئێران بوو لەگەڵ دیلەکانی جەنگ و تۆپباران کردنی شار و شارۆچکەکانی عێراقدا. هەروەها بێجگە لە ڕەتکردنەوەی تۆمەتی هەڵەبجەش، بە توندی دابەزییە سەر ئێرانییەکان: "بەدەر لە ئارەزووی ئێمە بۆ جەختکردن لەسەر ڕاستییەکان و لە وەڵامی ئەو کەمپینەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە، ئێمە دووبارەی دەکەینەوە کەوا ئێران چەندین جار چەکی کیمیایی لە بەرەکانی شەڕدا بە کار هێناوە و دیسان هەمان چەکیشی لە ناو شارەکاندا بە کار هێناوە." پاشان هێرشیشی کردە سەر سکرتێری گشتی: "ئێمە وەڵامێکی خێرامان لە تۆوە پێ گەیشت کە ئەم کارە بەربەری و دەسدرێژیکارییە بخرێتە ڕوو، بە هەمان کاردانەوە و دڵگەرمیی وەڵامدانەوەی ڕژێمێکی بەربەری کە ئەمەش کەمتەرخەمی و بێباکیی ئەو ڕێکخراوە دەگەیەنێت کە تۆ سکرتێری گشتییەکەیت." عەزیز بە جۆرێکی چاوبەستئاسا ئیشارەتی بۆ مافی عێراق کرد لە بەکارهێنانی چەکی کیمیاییدا بەوەی کەوا: "گەلی ئێمە بڕیاری داوە هەموو هێز و توانای خۆی دژ بە داگیرکەرانی دەسدرێژیکار بە کار بێنێت."[٢٠]

وەک هاوسەنگیپێدانێک بۆ عێراق، پێرێز دیکۆیلار بڕیاری دا تیمێکی لێکۆڵینەوەش بنێرێت بۆ ئێران. بە پێچەوانەی بۆنەکانی ترەوە، ئەم تیمە پێک هاتبوو لە تەنها دکتۆرێکی پسپۆڕ لە برینی کیمیایی و بۆ وەرسکردنی ئێران، نەک شارەزایی هەبێت لە چەکی کیمیایی و توانای هەبێت لێکۆڵینەوە لە بەربڵاویی زەخیرە و تەقەمەنی بکات لەگەڵ دەسنیشانکردنی ئەو گازانەی بە کار هاتوون. بێجگە لەوەش

دکتـــۆرەکە و ئەفســـەرێکی سیاســـیی یـــاوەری لە نەتەوە یەکگرتووەکان، نەیانتوانی سەردانی هەڵەبجە خۆی بکەن و کێشەکە لەوەدا بوو کە هەڵەبجە شارۆچکەیەکی عێراق بوو. ڕێزگرتنـی نەتەوە یەکگرتووەکـان لە بنەمـای سـەربەخۆیی دەوڵەت، وای پێویســـت دەکـــرد کەوا کاربەدەســـتانی ئەو ڕێکخراوە، تەنها بە ڕەزامەندیی حکومەتی عێراق بێنە نـاو خاکی ئەو وڵاتەوە. ئەمەش ڕوون و ئاشکرا بوو کە تاوەکو هەڵەبجە لەژێر کۆنترۆڵی ئێرانییەکاندا بێت ـ کە ئەمەش تا ئاگربەســتی تەمــووزی خایانـد ـــ ئەوە عێراقییەکـان ئەو ڕێگەپێدانەیان مەیسەر نەدەکرد.

لەو ســەروبەندەدا، عێـراق هێرشـــی پـێچەوانەی خـۆی دەست پـێ کـرد لەژێـر پەردەی هەڕەشــە و گوڕەشــەیەکی بێئامـــان و تۆمەتبـــارکردنی نوێــدا، بە ئامـــاژەکردن بـــۆ "قسەکەرێکی ڕێگەپێدراوی عێراقی"، لە کۆتایی مانگی مارتدا، ئاژانسی هەواڵی فەرمیی ئوردنی ڕاپۆرتی ئەوە دەدات کەوا "لە وەڵامدانەوەی هێرشـی ئێرانیدا بە چەکـی کیمیـایی دژ بە شـاری هەڵەبـجەی سـەر سـنوور و کـاولکردنی... پێدەچێت عێراق شـارە سـەرەکییەکانی ئێـران بکـاتە ئامـانجی چەکـی کیمیـایی"[٢٢]. بەم جـۆرە، لە چاوبەسـتییەکی سەرسـامکەردا، عێراقییەکـان بەرپرسـیارێتیی هەڵەبجەیـان خسـتە ئەسـتۆی ئێـران و پاشـــان ئەمەیـان وەک بەهـــانە بە کـــار هێنـا بـــۆ ئەنجامـــدانی ســـیناریۆیەکی زۆر ترســـناک و دڕنـــدانە، کە بریتی بوو لە پەلاماری کیمیایی بۆ سەر شارەکانی ئێران بۆ تۆڵەکردنەوە لەو دڕندەییەی، گوایە ئێرانییەکـان دەرهەق بە هەڵەبـجە بەرپایـان کـرد. تـۆبڵێی ئەمە دوا هەوڵـدانی سـەدام

حسـێن نەبووبێـت بـۆ ئەوەی ئێرانییەکـان ناچـار بکـات ئاگربەست قبووڵ بکەن؟

بە دوای ئەوەدا خەتابارکردنی ئێران دەستی پێ کرد و لە شـێوەی برینـدار و بەرکەوتـووی کیمیاییـدا هـات، ئەو سەربازانەی ئیدیعایان دەکرد، لە داگیرکردنی ئەم دواییەی ئێراندا بۆ کوردستانی عێراق، بریندار بوون. لە ٤ی نیساندا تـاریق عەزیـزی وەزیـری دەرەوە نەتەوە یەکگرتووەکـانی ئاگادار کردەوە سەبارەت بە هێرشە کیمیاییەکانی ئێران بە هۆی فڕۆکە و تۆپخانەوە دژ بە هێزەکانی عێراق "لە ٣٠ ـ ٣١ی مارتـدا بـۆ سـەر کەرتـی هەڵەبـجە" و داوای لە شـارەزایانی نەتەوە یەکگرتووەکـان کـرد ٨٨ سـەربازی عێراقی بریندار تەماشا بکەن[٢٢]. ئەم ئیدیعا تازەیە بەپێی بنەمـای ئەو داواکـارییەی ٢٣ی مـارتی وەزارەتـی دەرەوەی ئەمەریکا هات بۆ پشتگیریکردنی بیرۆکەی ڕۆڵێکی ئێرانی لە گازبـارانکردنی هەڵەبـجەدا و ئەگەری تێکەڵکردنـی ڕووداوەکانی ١٦ی مارت لەگەڵ ٣٠ ـ ٣١ی مارتدا لە زەینی سیاسەتمەدار و بڕیاربەدەستانی ڕۆژئاوادا.

تەنـانەت ئەگەر ئەمەش مەبەسـت نەبووبێـت، هەر ئەو کـاریگەرییەی هەیە و تەماشـا دەکەیـت عێـراق ئامـاژە بەوە دەکات کە "بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن ئێرانەوە دژ بە مەدەنییە عێراقییەکـان، لە کەرتـی هەڵەبـجە و ناوچەکـانی تـری بـاکووردا" و "بۆمبـارانی کیمیـایی ئێـران لە نـاوچەی هەڵەبـجەدا"، بێدەستنیشـانکردنی مێـژووی ئەو بە نـاو پەلامـارانە[٢٤]. دوو سـاڵ دوای ئەوە و لە پێـداچوونەوەی مشتومڕی گازبارانی هەڵەبـجەدا، پاتریک تـایلەر لە واشـنتۆن پۆستدا دەنووسێت: "عێراق جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە

لەو دەمەدا ئێرانیش چەکی کیمیایی لە شەڕی هەڵەبجەدا بە کار هێناوە."[٢٥] بە هەرحاڵ، عێراق هەرگیز ئیدیعای وای نەکردووە، نە لە بەهاری ١٩٨٨دا و نە لە هیچ کاتێکی دوای ئەوەشدا. ئەگەر ئەمە تەنها هەواڵێک بووبێت بۆ چەواشەکردن ئەوە کاری خۆی کردووە، نەتەوە یەکگرتووەکان دەسبەجێ بەدەم داواکاریی عێراقەوە هات بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەک، بۆ ڕقهەڵساندنی ئێران، چونکە ئێرانییەکان بەردەوام لە ساڵی ١٩٨٣وە تکاکاری لێکۆڵینەوە بوون، کەچی ساڵی لە جارێک زیاتر بۆیان دەستەبەر نەدەبوو و ئەمانەش بە عادەت بە ماوەیەکی دووروودرێژی دوای هێرشەکان دەهاتن بۆ تاوتوێکردنی ئەوەی کێ خەتابارە یان خەتابار نییە. لە حاڵەتی هەڵەبجەدا، ماوەی دە ڕۆژی برد تا نەتەوە یەکگرتووەکان وەلامی دایەوە. بێجگە لەوەش ئێران سکالای ئەوەی دەکرد کەوا نەتەوە یەکگرتووەکان ملی بە داوایەکی عێراقی داوە بۆ تەماشاکردنی قوربانییانی جەنگی کیمیایی عێراق لە نەخۆشخانەکانی بەغدا، نەک لەو ناوچانەی کە نزیک بوون لەو بە ناو هێرشانەدا و تەنانەت لە حاڵەتێکدا ئەگەر "بە سەربەخۆ و بێلایەنانە تاوتوێ بکرێت و بەپێی هەلومەرجی تایبەتی، ئەو سەربازە عێراقییانەی لە حاڵەتی پێشتردا چەکی کیمیایی کاری تێکردبوون، کە ڕژێمی عێراق خۆی بە کاری هێناوە". بەمپێیە ئێران سوورە لەسەر ئەوەی کەوا سەردانێکی سادە و هاکەزایی بۆ سەربازە عێراقییەکان لە نەخۆشخانەکانی بەغدا، شتێکی ئەوتۆی لێ سەوز نابێت سەبارەت "بەم کارە نامرۆڤانەیە"[٢٦].

نەتەوە یەکگرتووەکـان وەک پەرۆشـییەک بـۆ ئەوەی لە دۆخێکی سیاسـیی هەسـتیاردا چاپووکـانە دەرکەوێت، خێـرا خـۆی هاوێشـتە ئەو دەرفەتەوە کە عێـراق داوای دەکـرد و بریتـــی بـــوو لە لێکـــۆڵینەوەیەکی نوێـــدا، کەوا ڕەنـــگە هەلومەرجێـک برەخسـێنێت بـۆ ڕەوانـدنەوەی سـکاڵا و نـاڕەزاییەکە. بێجگە لەوەش بـۆ عێـراق دەبـووە دواخسـتنی بڕیـاری ئەنجـوومەنی ئاسـایش و بەمپێـیە دڕدۆنگـی و نـاڕەزایی ئێـران خـۆی ڕاناگرێـت. هەر کە تـیمەکە لە تـاران گەڕایەوە، دەسبەجێ نێردرا بۆ پایتەختی عێراق و لەوێ لە ٨ تـا ١١ی نیسـان بریـنداران و بەرکەوتـوانی تەماشـا کـرد و ئەنجـامی پشـکنینەکەی دوو هەفـتەی دەخایانـد تـا بـڵاو کرایەوە.

لە ٢٥ی نیساندا ڕاپۆرتەکە خرایە بەردەمی ئەنجوومەنی ئاسـایش، کە تێیدا سکرتێری گشـتی "هەسـتی قووڵی خـۆی دەربـڕی بـۆ ئەو مەترسـییەی کە بەردەوام بـوون لە بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی" لە جەنگـی ئێـران ـ عێراقـدا دروسـتی کـردووە بەو "زیـادکردنە بەرچـاوەی لە ژمـارەی بەرکەوتـوانی مەدەنیـدا". پزیشـکە شـارەزاکە، گەیشـتە ئەو ئامـانجەی کەوا هێزەکـانی ئێـران و مەدەنییەکـان بە هـۆی گـازی خەردەل و دەمـارەوە بریـندار بـوون و بە شـێوەیەکی سـەرەکییش گـازی خەردەل و بەرکەوتـوانی ئەم گـازە سکاڵای ئەوەیان کردووە کە لە ناوچەی هەڵەبجەدا و لە ٣٠ و ٣١ی مارتدا، بەدەم ئازاری برینەکانیانەوە تلاونەتەوە[٢٧].

پاشـان دوو هەفـتەی تریشـی پـێ چـوو پـێش ئەوەی ئەنجوومەنی ئاسـایش بە شێوەیەکی کۆتـایی بڕیـاری خـۆی بدات و کردیە نزیکەی دوو مانگ دوای هێرشی هەڵەبـجە. لە

٩ی مایسدا ئەنجوومەنی ئاسایش بە کۆی دەنگ، بڕیارێکی دەرکرد و جەختی لەسەر چڕکردنەوەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کرد لە جەنگدا و "بە توندی ئیدانەی بەردەوامیی بەکارهێنانی چەکی کیمایی کرد لە شەڕ و پێکدادانی نێوان کۆماری ئیسلامیی ئێران و عێراقدا و داوای لە هەردوو لا کرد، لە داهاتوودا واز لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بێنن".

ئەم ڕاگەیاندنە هێند لاواز و هێند درەنگ بوو، کەوا کاریگەرییەکەی دابەزییە ئاستی سفر، چونکە سێ هەفتە دوای ئەوە کە عێراق چەکی کیمیایی بە کار هێنا لە هێرشێکی سەرەکیدا بۆ سەر هێزەکانی ئێران لە فاو و تەنانەت گوندەکانی کوردستانیشی گازباران کردبوو، وەک بەشێک لە پەلاماری ئەنفال (لە ڕووی بەراوردەوە، پاش هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر و لە سۆنگەی ئەو ڕووداوانەوە کە شۆک و تراوماکەیان بۆ ئەمەریکییەکان، هاوتای ئەوەی کورد بوو بۆ هەڵەبجە، ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەفغانستانی داگیر کرد)، هەروەها دوایین شەڕەکانی ئێران و عێراق لەم ململانێ بێمانایەدا و پاشان ڕێککەوتنیان لەسەر ئاگربەست و هەر لایەک بچێتەوە سنووری پێش دەستپێکردنی جەنگ و ئەوەی لە هەڵەبجەدا ڕووی دا، بوو بە بەشێکی ناپەیوەندیدار. ئەمە ڕۆڵی ترسناکی هێرشە کیمیاییەکەی داپۆشی بە ڕێگەپێدانی عێراق لە جەنگدا گاز بە کار بهێنێت تا کۆتایی.

## مەسەلەکە بۆ وا گرنگە

بۆچی چاو خرایە سەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە جەنگێکدا کەوا هەردوو لا دنیایەک ستەمکاری و درندەییان بەرپا کرد؟ ژمارەیەک وەلام خۆیان دەخەنە ڕوو. پێش هەموو شتێک، بەکارهێنانی گازی ژەهراوی پاش تاقیکردنەوەی تالی چەکی کیمیایی لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا قەدەغە کرا. تا ئەمرۆش ناوی گازی خەردەل بە (یەپیرایت Yperite) دێت پاش ئەوەی بە پیسترین شێوەی لە گوندی (یەپرس Ypres)ی بەلجیکیدا بە کار هات.

سالی ١٩٢٥ جیهان "پرۆتۆکۆلی قەدەغەکردنی بەکارهێنانی گازی خنکێنەر و ژەهراوی و جۆرەکانی تری شەڕوشۆڕی بەکتیریۆلۆجی"ی مۆر کرد، کە بە پرۆتۆکۆلی جنێڤ ناوبانگی ڕۆیشتووە. دەولەتان بە ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکە جاڕی ئەوەیان دا کە "لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی ئەو چەشنە چەکانە لە جەنگدا لە لایەن ڕای گشتیی جیهانی شارستانییەوە بە تەواوی خەتابار کراوە. ئەم قەدەغەکردنە لە جیهاندا وەک بەشێک لە یاسای نێودەولەتی پەسەند دەکرێت و میللەتان لە ویژدان و کردەوەیاندا پابەندی دەبن".

لەو ڕێککەوتننامەیەوە عێراق یەکەم دەولەتە کەوا چەکی کیمیایی بە شێوەیەکی سەرەکی لە شەڕگەکاندا بە کار

هێنابێت (ئیتاڵیا بە هەندێک بەهانە گازی بە کار هێنا، کاتێک کە لە ساڵانی ١٩٣٥ ــ ١٩٣٦دا ئەسیوپیای داگیر کرد). لەسەر بنەمای ئەو ئارەزووەی عێراق بۆ پارسەنگدانەوەی چەکی کۆکوژی ئیسرائیل، پەلەی کرد لە بەرهەمهێنانی چەکی کیمیاییدا، پاش ئەوەی هێزەکانی لە ئەیلوولی ١٩٨٠دا سنووری ئێرانیان بەزاند. سەرکردایەتیی عێراق وای دەبینی کە گاز تاقە وەڵامی کاریگەرە بۆ هێرشەکانی شەپۆلەمرۆڤی ئێران، کە پۆل پۆل کۆمەڵەخەڵکی نیوەمەشقدراوی هێزەکانی پیادە ئامادە دەکران بۆ خۆبەختکردن لە پێناو ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵای خومەینیی ڕابەریاندا، کە لە شۆڕشی ئیسلامیی ساڵی ١٩٧٩دا دەسەڵاتی گرتە دەست. لە پاش چەند تاقیکردنەوەیەکی هەڕەمەکی لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکاندا، عێراق بۆ یەکەم جار لە تەمووز ـ ئابی ١٩٨٣دا گازی خەردەلی بە کار هێنا. پاشان کارەکە هێڵی بەیانیی فێربوونی خێرای بە خۆوە بینی لەمیانەی بەکارهێنانیدا لە هێرشە چەندبارەکانی ئێراندا و گەلێک توخمی کاریگەرتری لێ هاتە بەرهەم (لە گازی خەردەلەوە بۆ دەمارەگاز و پاشان بەکارهێنانی تابوون لە شوباتی ١٩٨٤دا یەکەم تۆماری بەکارهێنانی دەمارەگاز بوو لە مێژوودا کە لە مەیدانی جەنگدا بە کار هاتبێت)، هاوکات لەگەڵ بەکارهێنانی ئامرازی ئاڵۆزتر بۆ ئاڕاستەکردنی ئەم گازانە دژ بە هێزەکانی دوژمن. دواتر عێراق توخمەدەماری چەشنی تابوون یان سارینی بە درێژایی هێڵەکانی بەرە بە کار دەهێنا، لەو جۆرانەی کە کاریگەریی خێرایان هەبوو و زۆر نەدەمانەوە. ئەمە وای لە هێزەکانی ئێران دەکرد هەڵبێن و لە بەرانبەریشدا هەلی بۆ هێزە زەمینییەکانی عێراق دەڕەخساند

به سەلامەتی پێشڕەوی بکەن. لە هەمان کاتیشدا عێراق ناوچەکانی پشتی بەرەی ئێرانی دەکوتا بە توخمی جێگیری چەشنی گازی خەردەل و بەوپێیە ئەو هێزانەی ئێرانی دەخستە داوەوە کەوا لە بەرە پاشەکشەیان دەکرد. پسپۆڕێکی شیکاریی (سی ئای ئەی) دەڵێت: هێرشی گاز بۆ سەر ناوچەکانی پشتی بەرە "هێزێکی چەندبارە" بوو بۆ عێراق، چونکە هێزە پاڵپشتەکانی ئێران کەمتر ئامادە کرابوون لەو هێزانەی کە لەسەر هێڵی بەرە بوون(٢٨).

لەبەر ئەوەی ئەم چەکە کاریگەرییە سایکۆلۆجییەکەی دیار و بەرچاو بوو، دواتر عێراق بە دوو ڕێگە بە کاری دەهێنا: بە دووکەڵدانی گەریلا کوردەکانی، کەوا لە نێو چیا سەختەکانیاندا خۆیان قایم کردبوو، بە شێوەیەکی تایبەتیش بەئامانجکردنی دانیشتوانی مەدەنی لە هەر دوو ئێران (ناوچەکانی پشتی شەڕ) و عێراق (ئەو گوندانەی داڵدە و خۆراکیان بۆ یاخیبوان دابین دەکرد)، بۆ بەرپاکردنی ترسولەرز و هەڵتەکاندنی پشتگیریی میللی بۆ شەڕ و پێکدادانی نەبڕاوە. چەکی کیمیایی بە بکوژ و لەناوبەری کاریگەر لەقەڵەم نەدەدرا، تا ڕادەیەک لەبەر ئەوەی نەدەتوانرا بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاو بکرێتەوە. ئەو توخمانەی پێشتر لە لایەن عێراقەوە بە کار دەهاتن، وەک گازی خەردەل (کە دەبووە هۆی ئازاری سەخت و تلۆقکردن)، کوشندەی خێرا نەبوون، هەر چەندە خەردەل وا ناسراوە کە خراپبوونی باری تەندروستیی درێژخایەنی بە دواوە دەبێت و لە فرە حاڵەتدا کوشندەیە و ئەگەری ئەوەشی هەیە گۆڕانکاریی بۆماوەیی دروست بکات و ببێتە هۆی نەخۆشییەکانی کەمئەندامی و لاوازی. بەپێی ئامارێکی

پزیشــکیی ئێرانــی، نــزیکەی ٣٤ هەزار کەس (ســەرباز و مەدەنی) لە مـاوەی جەنگدا بەر گـازی خەردەل کەوتـوون و ئەمەش ژمـــارەیەکی ترســـناکە و گەلێکـــیش لەوانەی لە پەلامـارە کیمیاییەکـان دەربـاز بـوون، بەردەوام بە دەســت ئــازارەوە دەنــاڵێنن و بەردەوام لێیــان دەمرێــت، بە هــۆی کاریگەریی دواتری گازی خەردەلەوە[٢٩].

بە گشـتیی چەکـی کیمیـایی هۆکـارێکی هێجگـار گەورەی تــرس و تۆقانــدنە و عێــراق بەردەوام ئەو چەکەی بە کــار دەهێنا بۆ بەرپاکردنی ترسـولەرز لە ڕیزی دوژمنەکانیدا و ئەنجامەکانیشی هەستی پێ دەکرا. گازی ژەهراوی لە ماوەی چەند سەعاتێکد ئەو گوندنشینە کوردانەی لە شوێنی خۆیان دەردەپەڕاند کەوا پێشتر تۆپباران و بۆردمانی فڕۆکە، کاری تێنەدەکــردن. یــاخیبوونێکی سەرســەختانەی کوردەکــان لە سەرەتای ساڵانی هەشتادا، هەڕەشـەیەکی توندی بۆ ڕژێمـی عێراق پێک هێنـابوو. حیزبە یاخییەکانی کورد سـوودیان لە جەنگ وەرگرتبوو بۆ کۆنترۆڵکردنی نـاوچەیەکی بەرفراوانـی دێهاتی کورد و بە تایبەتی پاش داگیرکردنی چەند شـوێنێکی عێــراق لە باشــووردا بە هــۆی هێرشـــەکانی ئێــرانەوە. هەسـتکردن بە کـاریگەریی سـایکۆلۆجیی گـازی ژەهـراوی لەســـەر ســـەربازە ئێرانییەکـــان، عێـــراق ئەم چەکەی وەرچەرخاندەوە سـەر هاووڵاتییـانی کوردی خـۆی لە سـاڵی ١٩٨٧ەوە، پــاش ئەوەی ســـەدام حســـێن، عەلــی حەســـەن ئەلمەجیدی ئامۆزای کرد بە فەرمانداری باڵادەستی باکوور. لەمیـانەی چەنـد ڕۆژێکدا، ئەلمەجیـد فەرمـانی دەرکـرد کەوا چەکـی کیمیـایی لە دژی بنکە و بارەگاکـانی حیـزبە کوردییە سەرەکییەکان بە کار بێت، کە (ی ن ک) و (پ د ک) بوون و

دژی بـــنکه و بارەگاکـــانی فەرمانـــدەییە ناوچەییەکـــانی یەکێتییش. لە ناوەڕاستی نیساندا و لە هێرشێکی کیمیاییدا بۆ سەر چەند گوندێک لە نزیک بنکەیەکی (ی ن ک)ەوە، چەند سەد کەسێکی مەدەنی کوژران و بریندار بوون و هێرش و پەلامارەکـانی تـری بە دوادا هـاتن، بەڵام هێرشـی سـەرەکیی سـەرەتای تـوانەوەی سـەهۆڵ لە سـاڵی ١٩٨٨دا دەسـتی پـێ کـــرد و یەکەم جـــار بـــۆ ســـەر بـــنکە و بارەگاکـــانی سەرکردایەتیی (ی ن ک) لە دۆڵی جافەتی و پاشان هەڵەبجە و دواجـــاریش لە یەکەم ڕۆژی هەر قۆنـــاغێکی پەلامـــاری ئەنفالدا، کە شەش مانگی خایاند.

بەکارهێنـــانی عێـــراق بـــۆ چەکـــی کیمیـــایی بەو لایەدا دەشکێنێتەوە کەوا هۆکارێکی نەوعی بوو بۆ شکستپێهێنانی یـاخیبوونی کـورد، هاوکـات لەگەڵ بڕیـاری سـەرکردایەتیی ئێرانـدا، بـۆ گەڕان بە دوای ئاشـتیدا. بە تـایبەتی هەڕەشـەی عێـراق لە نیســانی ١٩٨٨ بە لێـدانی تـاران بە مووشـەکە بالسـتییە نوێیەکـانی و کڵاوەی کیمیاییـانەوە، بـووە بە هـۆی تـۆقینێکی گەورە لە نـاو خەڵکـدا و تێکشـکانێکی کوشـندەی پشتگیریی جەنگ. کاتێک کە سەرکردایەتیی عێراق بە ئاشکرا بەرەوڕووی تاوانبـارکردن بـووەوە، بەوەی کەوا هێزەکـانی چەکـی کیمیاییـان بە کـار هێنـاوە، بە تەواوی نکوولّییـان لـێ کرد. لە ترۆپکی تاوانبارکردنیدا لە مارتی ١٩٨٤دا، ڕژێـم بە کەیفخۆشـییەوە ئیشـــارەتی بە مـــافی عێـــراق دەکـــرد بـــۆ بەکارهێنـــانی "دەرمـــانی مێرووکـوژ" و "قڕکردنـــی ئەم پـۆلە مێشـوولانە" کە مانـای ئەو خۆبەخشـە ئێرانییـانەی دەگەیانـد کەوا خۆیان دەهاوێشتە سەنگەرەکانی بەرگریی عێراقەوە[٣٠].

له تەمووزی ١٩٨٨دا و نزیکەی پێنج ساڵ پاش یەکەم بەکارهێنانی عێراق و کاتێ هەموو لا زانییان عێراق چەکی کیمیایی بە کار دێنێت، تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوەی عێراق بە ئاشکرا پێی لە بەکارهێنانی گاز نا دژ بە هێزەکانی ئێران، بەڵام بەوە پاساوی دایەوە کە مافێکی ڕەوایە و لە کاردانەوەی ئەوەدایە کە ئێران پەنای بردووەتە بەر هەمان چەک و ئیدیعای ئەوەی دەکرد کەوا توخمە کیمیاییەکان "ئەوسا و ئێستاش" بە کار هاتوون لە جەنگدا و "ئەوە ئێران بوو یەکەم جار لە ململانێ و شەڕدا" بە کاری هێنا[٣١]. دوو مانگ پێشتر تاریق عەزیز ددانپێدانانێکی ماناداری ڕاگەیاند بە ئاشکراکردنی ئەوەی کەوا "عێراق دەبێت بەرپەرچی دەستدرێژیکار بداتەوە بە هەموو ڕێگەیەک و لەوانەش پەنابردنە بەر چەکی کیمیایی دژ بەوانەی هەوڵی داگیرکردنی خاکەکەی دەدەن"[٣٢]. عێراقییەکان هەرگیز پێیان لەوە نەناوە کە هاوولاتیی خۆیان گازباران کردبێت. بە هەرحاڵ، کوردەکان زۆر باش دەزانن کێ لێی دان و بۆچی؟

بەڵگەنامەکـــــــــان ئەوە دەخەنە ڕوو کە زۆربەی ئەم زانیارییانە لەو کاتەدا لای موخابەراتی ڕۆژئاوا پەنهان نەبووە. هەڵسەنگاندنەکانی دواتر (کە لە پێش جەنگی کوەیتی ١٩٩١دا ئامادە کرابوو) تێگەیشتنێکی تەواوی دەرخست لە بارەی کارەکانی عێراقەوە و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی وەک هێزێکی حیسابکردوو بۆ هاوتاکردنەوەی زەرەروزیانیان بە ژمارە. هێرشە کیمیاییەکانی عێراق تا ڕادەیەک "ئاست نزم" یان "پچڕپچڕ" بوون، وەک لە نووسینی ئەدەبیدا ئاماژەیان پێ دەکرا[٣٣]. بۆ نموونە (سی ئای ئەی) پێی وایە عێراق چەکی کیمیایی "لە ئاستێکدا بە کار هێناوە

كە لە جەنگــی جیهــانیی یەکەمەوە نەبینــراوە" و "ئەمەش پلەیەکی جیاکـار و گومانـاویی پـێ بەخشـیوە کەوا بـووەتە یەکەم وڵات لە بەکارهێنـانی گـازی دەمـار، لە شــەڕدا". لە لێکـۆڵینەوەیەکی ســاڵی ١٩٩٠دای (ســی ئـای ئەی)دا، لەوە ئاگـادار بـووە کە بەکارهێنـانی گـازی ژەهـراوی لە لایەن عێـراقەوە دژ بە ئێـران، بە ســێ قۆنـاغی پەرەســەندندا تێپەڕیــوە: لە بەرگریکردنــدا دژ بە هێرشــەکانی ئێــران لە ســاڵانی ١٩٨٣ ــ ١٩٨٦دا، دەسپێشـخەریی دژ بە ناوچەکـانی کـۆکردنەوە و ئامـادەکردنی هێزەکـانی ئێـران لە دوادوایـی ســاڵی ١٩٨٦ەوە بـۆ ســەرەتای ســاڵی ١٩٨٨، بە شـێوەیەکی هێرشـبەرانە کاتێک عێراق "بە دەمارەگـاز لێدانی خـۆی چڕ کــــردەوە وەک بەشـــــێکی تەواوکەر بـــــۆ هێرشــــــە بەردەوامەکــانی"[٣٤]. ســـەرکەوتنی عێــراق لە تێکەڵکردنــی تەواوی ئـاگری کیمیـایی بە تۆپەراسـیۆنە سـەربازییەکانی بە گشتی، وەک کـارێکی بێوێنە لەقەڵەم دەدرا لە ئـاخروئۆخریی ئەو جەنــگە مــۆدێرنەدا. هەر چەنـــدە ئەم باسوخواســـە مشـتومڕی زۆر لەسـەرە، بەڵام بەکارهێنـانی گـاز، پیسـترین تـاوانی جەنـگە کە هەر دوو لا لە جەنگدا بەرپایـان کردبێت. هەر بۆیە پێرێز دیکۆیلار، شـارەزای چەکی کیمیـایی هەشـت جار نارد بۆ کەنداو. ئەوەی پشکنەران لە ساڵی ١٩٨٧دا پێی گەیشـتن، دیکـۆیلاری بە جارێـک سـەغڵەت کـرد و جەختـی لەسـەر ئەوە کـردەوە کە پێشـێلکردنی پرۆتۆکۆلی جنێڤ "بە یەکێـک لە مەترسـیدارترین سـەرپێچی لە یاسـا و ڕێسـای نێـودەوڵەتی" دەژمێردرێـت. دیـد و بۆچـوونی شــارەزایان لێرەدا بە تەواوی دەخەینە ڕوو:

"له كاتێكدا كه ئێمه تەواو ئاگاداری ئەوەین كەوا هەموو چەكەكان كوشنده و كاولكارن، دەخوازین جەخت لەسەر ئەوە بكەینەوە كه چەكی كیمیایی نامرۆڤانەیه و جیاوازیی له كاریگەریدا نییه و پەكخستن و ئازاری درێژخایەن بەرپا دەكات. مەسەلەیەكی بایەخداره لەوه بگەین كەوا بەكاربردنی بەردەوامی چەكی كیمیایی له ناكۆكی و ململانێی ئێستادا، مەترسییان زیاد دەكات له شەڕ و ململانێی پاشەڕۆژدا. به بۆچوونی ئێمه، تەنها كۆششی هەماهەنگ لەسەر ئاستی سیاسی دەكرێت كاریگەر بێت له زەمانەتكردنی ئەوەی كەوا هەموو دەولەتانی ئیمزاكردووی پرۆتۆكۆڵی جنێڤی ساڵی ١٩٢٥ پابەند بن به بەڵێنەكانیانەوه. به پێچەوانەوه، ئەگەر پرۆتۆكۆڵەكه به شێوەیەكی چارەسەرنەكراو لاواز بووه، پاش شەست ساڵ له ڕێزگرتنی نێودەوڵەتیی گشتی، ئەوه ڕەنگه له پاشەڕۆژدا بەرەو جیهانێك بچین كەوا تارمایی هەڕەشەی چەكی بایۆلۆجییش ڕووی تێبكات."[٣٥]

زاناكان ڕاستیان كرد و عێراق پەرەی به چەكی بایۆلۆجی دا و هێشتا جەنگ كۆتایی نەهاتبوو، عێراق توانای بەرهەمهێنانی پەیدا كرد و ڕەنگه جیهان بەكارهێنانی له شەڕدا ببینێت. دەبێت چەندین فاكتەری تریش وەبیر بهێنرێتەوه، یەكەم: جەنگی ئێران ـ عێراق گازی وای هێنایه بواری كارپێكردنەوه، كه پێشتر هەرگیز له شەڕدا نەبینرابوون، لەوانه توخمی ڤی ئێكس VX كه توخمێكی دەمارەگازی زۆر كوشندەیه. دووەم: گازی ژەهراوی، هەرگیز پێشتر دژ به ناوچەكانی نیشتەجێبوون به كار نەهاتبوو و به بەزاندنی ئەم سنوورەی مۆراڵ، پەلاماری هەڵەبجه بوو به پێشینەیەكی پڕ مەترسی.

سـێیەم: قوربانییـانی گـازی خەردەل، تـا ئێسـتاش بە شێوەیەکی زۆر سامناک دەمرن، کە نۆزدە ساڵ یان زیاتر بەسەر تووشبوونیاندا تێپەڕیوە. چ جۆرە چەکێک، ئەو بۆمبە ئەتۆمییـانەی لـێ بەدەر کە بە هیرۆشـیما و ناگازاکیـدا دران، دەتوانێت هێنـد دەرد و ئـازار بەرپـا بکـات؟ بـێجگە لەوەش، بەکارهێنـانی گـازی ژەهـراوی یـان هەڕەشـەکردنی بەکارهێنانی، هێند قوربانییانی دەتۆقێنێت، بە تـایبەتی خەڵکی مەدەنیـی بـێ ئـامڕازی خۆپـارێزی، کە ناچـار دەبـن هەڵبـێن (تەنـانەت خـۆ فڕێبدەنە بەردەسـتی دوژمـن، وەک لە مـاوەی پەلامـاری ئەنفالـدا ڕووی دا)، یـان واز لە هاوکـاری و پشتگیریی جەنگ بێنن (وەک هەڕەشەی بۆمببارانی تـاران بە چەکـی کیمیـایی). ئەفسـەرێکی عێراقـی (لە چـاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) باسـی دەکات و دەڵێت: "مـن لە هـیچ ناترسـم، لە خوا و گازی ژەهراوی نەبێت، ئەمە وەکو تارمـایی و دێو وایە و نـاتوانی هـیچ بەرگرییەکـی لـێ بکەیـت." ئەم ئەفسـەرە قوربـانیی هـیچ گـازێکی ژەهـراوییش نەبـوو، بەڵکـو لە لایەن ئەنجامـدەرانی کـارەکەوە شـەڕی دەکـرد و کاریگەرییەکـانی بینیبـوو. بـێجگە لەوەش چەکـی کیمیـایی تـاقە ڕوخسـار و خاسـیەتی جەنـگە کەوا کـۆمەڵی نێـودەوڵەتی پابەنـدییەکی مـۆراڵ و ڕەنـگە یاساییشـی هەبێـت بـۆ دەسـتتێوەردان و لە هەمـان کاتیشـدا بـایەخی کـارای ئاسایشـی هەیە، بە هـۆی مەترسیی زیادبوون و پەرەسەندنی پتری چەکی کوشـندەوە. بەڵام جیهـان هیچـی نەکـرد و تەنهـا لە پـاش کۆتـایی جەنـگ کۆمەڵی نێودەوڵەتی ڕازی بوو لەسـەر سـەپاندنی بەربەسـتی فرەلایەن بۆ تەشەنەکردن و هەڵگرتن و بازرگـانی پێوەکردن و بەکارهێنانی چەکی کیمیـایی، کە لە ڕێککەوتننـامەی چەکی

کیمیایی ساڵی ١٩٩٣دا گەلاڵە کرا. ئەم کۆششە لە جەنگی ئێران ـ عێراقدا بە ڕادەیەکی ئەوتۆ ڕەچاو نەکرا. بەپێی (چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١ی) جولیان پێری ڕۆبنسن کە پسپۆڕێکی پەرەپێدانی چەکی کیمیاییە، تاقیکردنەوەی عێراق خراپە گفتوگۆوە لەبەر ئەو مەترسییە ئاشکرایەی لە بەکارهێنانی هێجگار زۆری چەکی کیمیاییەوە دێتە ئاراوە، چ لە مەیدانی شەڕدا و چ دژ بە خەڵکی مەدەنی (لێرەدا هەڵەبجە بووە بە سیمبوڵی ئەم خاڵی وەرچەرخانە) و هەر بەو هۆیەوەیە دنیا لەوە گەیشتووە کەوا عێراق هەر چەندە هەر پشتی بە یەکێتیی سۆڤیێت بەستبوو، بەلام پێویستی بە کەرەستەی کیمیایی و ئامێر و ئامڕازەکانی هەبوو لە کۆمپانیا تایبەتەکانی ڕۆژئاوا بیانکڕێت بۆ ڕەخساندنی توانای بەرهەمهێنانی نیشتمانی. عێراق لەو دەمەدا بە توندی خەتابار کرا، کاتێک کە هێشتا هەر تاقیکردنەوەی لەسەر گاز دەکرد و وای لەقەڵەم دەدا کەوا کاردانەوە نێودەوڵەتییەکان لەسەر ئەم چەکە، بایەخێکی دیبلۆماسیی گەورەی نابێت. ئەنجوومەنی ئاسایش دەبوو بە قورساییەکی ئەخلاقیی تەواو ڕەفتاری لەگەڵ یاسای نێودەوڵەتیی پشت ئەم کارە بکات.

ئەم کتێبە هەوڵ دەدات ئەوە بخاتە ڕوو کە نەبوونی ئیدانەیەکی نێودەوڵەتیی پێشوەخت و بەهێز و یەکلاکەرەوە بۆ عێراق، لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە کەشوهەوای داتاشینی ڕۆژئاوا بەلای عێراقدا و ئەمەش گەلێک دەرەنجامی دراماتیکیی لێ کەوتەوە:

- ئیشارەتی چەندبارەی بە عێراق دا کەوا ڕژێم دەتوانێت بەردەوام بێت لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی یان

تەنانەت زیادیشی بکات، کە لە پەلاماری هەڵەبجەدا گەیاندیە لوتکە. ئەو ڕووداوە، دواتر لە لایەن جۆرج دەبلیو بوشەوە بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز بڵاو کرایەوە، وەک پاساوێک بۆ جەنگی ساڵی ٢٠٠٣ دژ بە عێراق، کاتێک کە سەدام حسێنی بەوە تاوانبار کرد کە هاووڵاتییانی خۆی گازباران کردووە و ویلایەتە یەکگرتووەکانی لەو ڕۆڵە دژوارە لا دا کە لە هاندانی ئەم ملهوڕەدا دەیگێڕا[٣٦].

• ئەمە بوو بە هۆی جینۆسایدکردنی کوردی گوندنشین لەمیانەی پەلاماری ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨دا و بەکارهێنانی تەکتیکی گاز و بە هۆی کاریگەریی هەڵەبجەوە، گوندنشینە تۆقیوەکان دێهاتەکانیان چۆڵ کرد. ئەم گوندنشینانە کۆ کرانەوە و ڕاپێچی بیابانی ڕۆژئاوا کران و لەوێ بە شێوەیەکی سیستماتیک کوژران و لە گۆڕی بەکۆمەڵدا داپۆشران. لە کانوونی دووەمی ١٩٩١دا هێزەکانی هاوپەیمانان لە عەرەبستانی سعودی و هاووڵاتییانی ئیسرائیل خۆیان ئامادە کرد بۆ پەلاماردانیان لە لایەن عێراقەوە بە مووشەکی سکۆد و کڵاوەی کیمیایی. سێ مانگ دواتر، ترسی دووبارە بەکارهێنانەوەی چەکی کیمیایی، دەیان هەزار کوردی تۆقیوی بەرەو تورکیا و ئێران ڕەو پێ کرد لە کاتی پێشڕەویی هێزەکانی عێراقدا بۆ تێکشکاندنی ئەو ڕاپەڕینەی لە پاش جەنگی کەنداو بەرپا بوو. لە مارتی ٢٠٠٣دا و لە ڕۆژانی پێش هێرشکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، وەک باس دەکرێت، هەزاران کورد دیسانەوە لە ماڵەکانیان هەڵاتن و تەنها لە هێرشی کیمیایی عێراق ترسیان لێ نیشتبوو.

• هەروەها عێراقی وا لێ کرد فشار دروست بکات بۆ ئەوەی لە دژی ئێران سوود بە دەست بێنێت و پشتگیریی جەنگ تێک بشکێنێت بە تۆقاندنی مەدەنییە ئێرانییەکان و ئەو باوەڕەیان لا دروست بکات کە بەرەورووی هێرشی گاز دەبنەوە.

• گورزێکی پاڵنەری دا بە پرۆگرامی چەکی بایۆلۆجیی عێراق.

• لە هەمووی گرنگتر، بە ڕووی پرۆگرامی پەرەسەندنی چەکی کیمیایی، بایۆلۆجی و ئەتۆمیی ئێراندا وەستایەوە، کە میراتێکە ئەمرۆ بەرەورووی بووینەتەوە.

• لەوانەیە سەدام حسێنی لە خشتە بردبێت، کە دەستی دابووە کۆمەڵکوژی بێ ئەوەی کەس لێی بپرسێتەوە و باوەڕیش وابوو بە هەمان شێوە کوەیت داگیر دەکات و کەس لێی ناپرسێتەوە و بوو بە هۆی بەرپاکردنی قەیرانێکی نێودەوڵەتی.

• بوو بە هۆی داخورانی کۆسپ و تەگەرەی نێودەوڵەتی بۆ بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ و وێرانکەر، هاوشان لەگەڵ هەڵوێست و ڕاستگۆیی دامودەزگا نێودەوڵەتییەکانی چەشنی نەتەوە یەکگرتووەکان.

به کورتی، ئیدارەی ڕیگان و کلک گرێدانی سەروەختی جەنگی لەگەڵ عێراقدا و بێدەنگیی ڕاستەقینەی سەبارەت بە هەڵەبجە، بارتەقای تیشکی سەوز دەبێتەوە، کە دەگاتە ئاستی جینۆساید لە کوردستانی عێراقدا، پەرەسەندن و زیادکردنی چەکی کۆکوژ و داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە، کە ئەمەی دواییان هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ بوو بۆ گەیشتنە نەوت لە لایەن ڕۆژئاواوە. نامەیەکی وەزارەتی دەرەوە بۆ

کـۆنگرێس لە سـاڵی ١٩٨٨دا دەربـارەی بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لە لایەن عێـراقەوە، ڕاستەوڕاسـت ئاگـاداریی ئەوە دەدات "کەوا وێنەیەکـی تەڵـخ و سـامناکی ئاڕاسـتەی جەنـگ و تیرۆریزم دەکێشێت لە پاشەڕۆژدا"[٣٧]. ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕۆڵێکی تەنـانەت بچووکیشـی لە هاندانی ئەم بارەیانـدا نەبینـی. ئەگەرچـی ئەمە خزمەتـی بەرژەوەنـدییە سـتراتیجییەکانی ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـای کـرد، بەڵام ئەم پەرەسـەندنانە زیـانێکی چارەسـەرنەکراوی پێ گەیـاندن. ئەمـڕۆ جیهـان چـاوەڕوانی ئێرانێکـی خـاوەن چەکـی ئەتـۆمییە، کە هەرگیز جارێکی تر ڕێگە نـادات چنگی بەسـەردا بگیرێت و بەر چەکی زلهێز بکەوێت و شـێوازی نایاسـایی چەکی لەگەڵ تـاقی بکـرێتەوە و دنیـاش لە کـاری لەم چەشـنە چاوپۆشـی بکـات. هەروەها بەرەوڕووی عێراقێکی شپرزە و شێواو بووەتەوە، کە خـزاوەتە نێـو شـەڕی نـاوخۆوە و سـێ جەنـگ و دە سـاڵ گەمارۆی ئابووری هەڵی تەکاندووە و بێجگە لە ڕژێمی عێراق، ویـلایەتە یەکگرتووەکـان و هاوپەیمانانیشـی ئاسـتێکی گەورەی گوناهیان لە ئەستۆیە.

ئامـانجی بنچینەیـی کتێبەکە، خسـتنەڕووی ڕاسـتییەکانە وەک خۆی و تا چەند ئەو گفتوگۆیـانەی کـاتی خـۆی کراون یـان لەوانە دەدوێـت کە لای خەڵـک ئاشـکران. هەروەهـا بە نیـازە قسـەیەک لەو بـارەیەوە بکـات کە ئەڵتەرنـاتیڤێکی دڵخۆشـکەر نییە، ئەویـش بڕیـاری پشـتیوانیکردنی عێـراق و چاوداخسـتن لە ئاسـت دڕنـدەییە زۆر تایبەتیەکـانی و دەرەنجـامە هێجگـار ترسـناکەکانی، ئەو دێـوەزمەیەی تـا ئەمـڕۆش بەردەوام بە دوای ئـێمەوەیە و ئیختیـاری بێتـام دێنێـتە ئـاراوە لە جیهانێکـدا کە هەمـوو بەڵگەکـان وای دەردەخەن تا بێت زیاتر ناجێگیر و مەترسیدار دەبێت.

### سەرنجێک لە بارەی سەرچاوەکان و مێتۆدی کارەکەوە

ژمارەیەک مێژووی جەنگی عێراق ـ ئێران هەن کە بە زۆری لە سالانی ١٩٨٠کاندا نووسراون. ئەمانە بە هۆی ئەوەوە کە بە شێوەیەکی سەرەکی پشتیان بە باس و گێڕانەوەی میدیا بەستووە، پڕن لە هەڵە و هەر دوو چیرۆک و بەسەرهاتی گرنگی کوردەکان و ڕۆڵی بنەڕەتیی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە پشتگوێ دەخەن. بەپێی دۆخی تەمومژی جەنگ، سەرومڕ کارکردنی پڕۆپاگەندە، میکانیزمی کارکردنی پۆلیسی نهێنی، کەم کەس لە ئێمە دەتوانێت زانیاریی جێمتمانە و باوەڕپێکراو بە دەست بێنێت، کاتێک کە دوو کۆمەڵگەی سەرکوتکراو روو لە یەکتر وەردەگێڕن. بۆ بەدبەختی، ئەمە وا دەرناکەوێت کەوا کۆسپێک بێت لە باسکردنی ڕووداوەکاندا، وەک ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر. بۆ نموونە، هەندێک باسوخواس ئێرانییەکان و کورد وەک دوژمنێکی هاوبەشی بەغدا تێکەڵ دەکات و بەو چەشنە خەباتی سەربەخۆیی کورد وەک بەشێکی تەواوکەری مێژوو دەسڕێتەوە. ناوە کوردییەکان بەردەوام دەشێوێنرێن و شوێنەکان بە هەڵە لەسەر نەخشە دیاری دەکرێن یان دەناسرێن.

بە پێچەوانەی ئۆپەراسیۆنەکانی تری عێراقەوە، ئەنفال (کە لەو کاتەدا لە سەردێڕی هەواڵی ڕۆژنامەکانی بەغدا

جاڕی لێ دەدرا)، تا چوار ساڵ دواتریش هیچ ناوی لە نووسینی ئەدەبیدا نەدەهات. هێرشەکانی چەکی کیمیایی با هیچ بەڵگەیەک درایە پاڵ ئێران، با هیچ بەڵگە و کات و شوێن دیاریکردنێک (بە پێچەوانەی هێرشەکانی گازەوە)، چونکە هەر دوو کورد و چەکی کیمیایی بە ناپەیوەندیدار بە جەنگەوە لەقەڵەم دەدران و سەرەڕای ئەوەش کوردەکان وەک هاوپەیمانی ئێرانی خومەینی تەماشا دەکران، بۆیە کەم چاودێر و سەرنجدەر ئاگای لەم کەینوبەینە بوو، وەختێک کورد گازباران کرا. ژمارەیەک کار و کردەوە لە لایەن لێکۆڵەر و شیکاری سیاسەتی ئەمەریکییەوە پاساوی بێتام بوون بۆ ڕژێمی عێراق و لە بایەخی ستەمکاری و درندەییەکانی کەم دەکەنەوە و پێشنیاری زمانلووسانەیان بە بەڵگەی هاوچەرخی لەقەڵەم دەدا.

لەو دەمەدا کە عێراق کوەیتی داگیر کرد، مەسەلەی ئەکادیمی لە جەنگی ئێران ـ عێراقدا کاڵ بووەوە و ئەو بایەخەی نەما. ئەو مێژوانەی ئێران و عێراق کە لە ساڵی ١٩٩١ەوە بڵاو دەکرانەوە، کە هەندێک پانتاییشیان بۆ کورد تەرخان کردبوو و باسیان لە چەکی کیمیایی دەکرد، نەیانتوانیوە وردەکاری لەم مەسەلانەدا بکەن و زۆربەی شتەکانیان بە هەڵە لێک داوەتەوە. هەروەها لە مێژووی کوردیشدا کاری باش کەمە و بە لاوازی تاوتوێی ڕووداوەکانی ساڵانی هەشتاکانیان کردووە.

ئەم کتێبە بە نیاز نییە مێژوویەکی نوێ سەبارەت بە جەنگی ئێران ـ عێراق بخاتە ڕوو، یان سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کەنداودا، بەڵکو بە نیازە بۆشاییەک پڕ بکاتەوە سەبارەت بە زانیاریمان لەسەر ئەو ڕۆڵەی کە

چەکی کیمیایی و کوردەکان گێڕایان لە بارەی شوێنی ڕاستەقینەیان لەو مێژووەدا. لە کاتێکدا کە لە وەختی خۆیدا شتی زۆر دەزانرا، بەڵام زانیارییەکان پەرتوبڵاو بوون و بە زەحمەت دەست دەکەوتن و بە زۆرییش نهێنی بوون. لە پاش سالّی ١٩٩١، زۆرینەی ئەم زانیارییانە ئاشکرا بوون. بەڵگەنامەکانی پۆلیسی نهێنیی عێراق، بەڵگەنامەکانی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، کە بەپێی یاسای ئازادیی زانیاری دەست کەوتن، ئەفسەرە خانەنشینەکانی هەواڵگری، هەڵگەڕاوە عێراقییەکان، شایەتحاڵە کوردەکان (لەو دەمەوە کە هەرێمەکەیان لەژێر دەستی بەغدا دەرچووبوو)، شایەتحاڵە ئێرانییەکان و (لە پاش سالّی ٢٠٠٣شەوە) شایەتحاڵە عێراقییەکان، ئەم سەرچاوانە یارمەتیدەرن بۆ هاوسەنگراگرتن و ڕوونکردنەوەی وێنە مێژووییەکە و تیشکخستنەسەر تێوەگلانی ئەمڕۆی ئەو بڕیارانەی کە بۆ داهاتوو گەلاڵە دەکرێن.

ئەم کتێبە، بە پشتبەستن بە سەرچاوە بنەڕەتییەکان ـ کە بەڵگەنامەی حکومی و ئەزموونی شایەتحاڵەکانە ـ بە دوای ئەوەدا دەگەڕێت کەوا حکومەتەکان چییان زانیوە و چ کاردانەوەیەکیان بووە لەسەر ئەو زانیارییە و لە کەیدا. ئەمە گەلێک شتی زەحمەت دەخاتە ڕوو، چونکە زانیاریی یادەوەری و گێڕانەوەکان، ڕەنگە مۆرکی هەواداریی شەخسی پێوە بێت و کاریگەریی پێشهات و پەرەسەندنەکانی تر و ڕووداوگەلی تری لەسەر بێت، کە خۆیان بەشێک بووبێتن لێی.

بەڵگەنامە فەرمییەکان، لە کاتێکدا کە لە زۆر ڕووەوە شایەتی جێمتمانەی ڕووداوەکانی مێژوون، گەلێک کێشەی

جیا جیا دێننە پێشەوە. یەکەم: گەیشتنی هەواڵگری بۆ هەر دوو لایەنە شەڕکەرەکە لاواز بوو و ڕاستییەکەی کاریگەریی هێزی هەواڵگری لە بەری ئێراندا شتێکی ئەوتۆ نەبوو و لە بەری عێراقیشدا لە فرەلایەنییەوە داخرابوو. تویژەرێکی هەواڵگریی ویلایەتە یەکگرتووەکان (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەگێڕێتەوە کەوا: "نزیکبوونەوە لە عێراق زۆر سامناک بوو و عێراقییەکان متمانەیان پێ نەدەکردین و دەترسان قسەمان لەگەڵ بکەن و بەدەستهێنانی زانیاری وەک ددانهەڵکەندن وا بوو." دێڤید نیوتن، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە عێراق، لە ساڵانی هەشتاکاندا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "ئێمە بە مۆڵەتوەرگرتنێک بەغدامان بە جێ دەهێشت کە حەوت ڕۆژی دەبرد تا دەستمان دەکەوت، هەندێ جاریش هەر دەستمان نەدەکەوت. کاتێک دەچووینە دەرەوە گەلێ شتمان دەبینی، بەڵام تەنها دەمانتوانی لەگەڵ کەسانی حکومەتدا قسە بکەین. بۆ نموونە، لە باکوور تەنها دەمانتوانی قسە لەگەڵ سەرکردەکانی میلیشیا کوردەکانی سەر بە حکومەت بکەین و ئەمانە شتێکی کەمیان دەدرکاند و هیچ ڕەخنەیان لە ڕژێم نەدەگرت. ئەو زانیارییانەی بە دەستمان دەهێنان، بۆمان ساغ نەدەبوەوە و نزیکبوونەوە لە سەرچاوەکانی غەیرەڕژێم، زۆر سنووردار بوو."

سەرەڕای ئەمەش، دۆستایەتیی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەگەڵ عێراقدا، هۆکاری جەختنەکردن بوو لەسەر زانیارییە هەواڵگرییەکان لە بارەی تواناسازی و پێرفۆرمانسی عێراقەوە. ولیەم ئۆ. ستودمانی سەرۆکی پێشووی دەزگای ئاسایشی نەتەوەیی، باس لەوە دەکات کەوا "لە کاتی جەنگی

ئێران ـــ عێراقدا ئێمە بە چاوی هاوپەیمانێک تەماشای عێراقمان دەکرد. بەوپێیە عێراق ناوچەیەک بوو کە ئێمە زانیاریی بنەڕەتیمان لەسەر نەبوو یان لە زۆر بواری تواناسازیی عێراق نەدەکۆڵینەوە. ئێمە ئەوەمان بە چاودێری دەست دەکەوت، بەڵام کەمتر بە قووڵی زانیاریمان لەسەر ئامانجی دیاریکراو دەست دەکەوت، لەو جۆرەی کە لە حاڵەتی جەنگدا پێویستت دەبێت و بە سانایی دەڵێم ئێمە ئەوەمان نەبوو."[٣٨] ئەمەیان ڕەنگە دەگمەنیی ئەو زانیارییانە ڕوون بکاتەوە سەبارەت بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق.

دووەم: هەرچەندە یاسای ئازادیی زانیاری هێجگار سوودبەخشە بۆ تاوتوێکردنی بەڵگەنامەکانی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام بەپێی مۆرک و خاسیەتی کۆمەڵگەیەکی کراوە و دیموکراتی، دۆکیومێنتەکان بە زۆری بە شێوەی هەڵبژاردە والا دەکرێن (کە ڕەنگە ئەجێندای توێژینەوەی تایبەتی داواکاران بگەیەنێت) و لە زۆر حاڵەتدا بە وردی تەتەڵەوگێژ دەکرێت. بێجگە لەمەش، سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە لایەن وەزارەتی دەرەوە دادەڕێژرێت، بەڵکو بە ڕاوێژی کۆمەڵێک دەزگایە و کاربەدەستانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆکایەتیی دەکەن. بەڵگەنامەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، بواردراون لە بڵاوکردنەوە بەپێی یاسای ئازادیی زانیاری و زۆرێک لەو بەڵگەنامانەی لە بەردەستدان و پەیوەندییان بە جەنگی ئێران ـــ عێراقەوە هەیە، هیی وەزارەتی دەرەوەن و بەوپێیە ئەگەر لە ڕووی نرخ و بایەخەوە هەڵیانسەنگێنیت، تۆمارێکی وردی سیاسەتی ڕابردوو دەخەنە پێشچاو و دیپلۆماسیەتی ئێستا باس

دەکەن. بێجگە لەوەش، ئەو پیاوە وەک بەڵێندەرێکی پێشتری حکومەتی ئەمەریکا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) باس لەو بەڵگەنامانە دەکات کە لە لایەن بەڵێندەرانەوە ئامادە کراون (لە پاش داواکارییەکی زارەکیی یەکێک لە دەزگاکانی حکومەت) لەژێر ناوی، وەک دەڵێن کۆنتراکتێکی بەرفراواندا. و بە دەستنیشانکردنی بابەتەکانی و ئەمەش بەپێی یاسای ئازادیی زانیاری، دەست ناکەوێت، چونکە حکومەت بە فەرمی وەری نەگرتوون و ڕێکی نەخستوون، بەڵام بە شێوەیەکی نافەرمی لەو کاتەدا کاریان پێ کراوە.

ئەوەی لە بەڵگەنامەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەردەکەوێت، تەنها ئەوە دەرناخات کە حکومەت لەو کاتەدا چیی زانیوە، بەڵکو بە سەرسوورمانەوە ئەوەش دەردەخات کە چۆن هەندێک جار بە ناحاڵی مامەڵەی لەگەڵ ڕووداوەکاندا کردووە و پابەند بووە بە لێکدانەوە و زانیاریی کتێبنووسێک یان دانەرێک و لە چەندین حاڵەتدا هەر لە خۆوە دایشکاندووە بەلای فەرامۆشکردنی ڕاستییەکاندا. بۆ نموونە، یەکێک لە یاداشتەکانی وەزارەتی دەرەوە، کە شتێک لە ڕوخساری یاخیبوونی کورد لە عێراقدا دەخاتە ڕوو، باس لەوە دەکات کە هۆکاری شکستهێنانی ساڵی ١٩٧٥ی یاخیبوونی مستەفا بارزانی ئەوە بوو کەوا ڕژێمی سەدام حسێن هێند دەستبالا بووە لە شەڕ و پێکداداندا، کەوا تەنانەت یارمەتیی سەربازیی ئێرانیش نەیتوانی بەر لە بەزین و شکستی کوردەکان بگرێت[٣٩]. یاداشتەکە نەیتوانیوە تیشک بخاتە سەر ڕۆڵی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە پشتگیریی کوردەکان لە ڕێگەی شاوە، کەوا کتوپڕ پشتی بەردان و لەگەڵ سەدام حسێن ڕێک

کەوتن و ئەوانی بێ پشتیوان بە جێ هێشت و بوو بە هۆی ئەوەی بە ئاسانی تێک بشکێن.

لە کۆتاییدا ـــ کە ئەمەش بەستراوە بە سەرنجی پیشترەوە ـــ دۆکیومێنتە هەواڵگرییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە زۆر حاڵەتدا پێچەوانە بە یەکترن لە گەلێک مەسەلەی سەرەکی و هەڵسەنگاندندا (بۆ نموونە، لە بارەی ئەوەوە ئایا بەشداری بەرپرسیاری هێرشی هەڵەبجە) و ئاشکراکردنی گفتوگۆ و مشتومڕی دامودەزگای هەواڵگری، ئەوان بێ جیاوازی وەسفی "ئەم زانیارییە موخابەراتییە دوا هەڵسەنگاندنی بۆ نەکراوە" دەهێننە گۆڕێ وەک باسوخواسێکی ناتەواوی ستاندارد. بەپێی لێکۆڵەرێکی پێشووی هەواڵگری (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا)، کەوا زانیارییەکە وردە، بەڵام ڕەنگە ناتەواو بێت و پشتی بەستووە بە "هەواڵگریی مرۆیی" و لێکۆڵەرەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە "شتێکی لەو چەشنە نییە بە ناوی دوا زانیاریی هەڵسەنگێنراوەوە". بە کورتی، دەبێت مێژوونووس تەنها بایەخ بە زانیاریی گشتی نەدات لەوانەی لە بەردەستدان، بەو هەستەوە کە ئەوە ڕەنگە تەنها ڕاستییەکی بەشبەش و ناتەواو بخاتە ڕوو، واتە یەک لایەن لە مەسەلەیەک، یان ئەوەی کە حکومەت دەیەوێت تۆ بیزانیت یان هەر زانیاریی تۆی پێ گرنگ نییە. بەئومێدم ئەم کتێبە توانیبێتی بەرەنگاری ئەو ئەزموونە بێتەوە.

"پێدەچێت شتێکی بەد و خراپ لە عێراقدا بەڕێوە بچێت."

**جۆرج شوڵز**

وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان

لە کتێبی "پشێوی و خۆشیی سەرکەوتن"، ل٢٣٨

١٩٩٣

## جەنگی ئێران ـ عێراق و پێویستیی عێراق بە چەکێکی نوێ

ڕووخـانی شـا و سـەرکەوتنی ئـایەتوڵڵا ڕوحـوڵڵای خومەینی لە شۆڕشی ئێرانی ساڵی ١٩٧٩دا، گۆڕانکارییەکی دراماتیکی بەسەر بارودۆخدا هێنا لە کەنداوی فارسدا (کە لە لایەن عەرەبەوە پێـی دەگوترێـت کەنـداوی عەرەب). یەک لە کـۆڵەکە دیـار و بنەڕەتییەکـانی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان لە ناوچەکەدا هەرەسی هێنـا، کە ڕژێـم و ڕابەرێـک پارێزگاریی لە بەرژەوەنـدیی ڕۆژئـاوا دەکـرد لە یەدەگێکـی گەورە و فراوانـی نەوت کەوا نرخێکـی جێگیـری دابـین دەکـرد. بە پـێچەوانەوە کۆمـاری ئیسـلامی بـێ شـاردنەوە، هەڵوێسـتی دوژمنکارانەی خۆی لە بەرژەوەندییەکانی ڕۆژئـاوا دەربڕی و ئەم ڕاسـتییەش بە ڕوون و ئاشـکرا خـۆی لە گرتنـی باڵوێزخـانەی ئەمەریکـادا بینیـیەوە و قەیرانێکـی نـاحەزی و دوژمنکـارانەی لـێ کەوتەوە. سـاڵەکانی سـەرەتای شـۆڕش تونـدوتیژییەکی گەورەیـان بە خـۆوە بینـی و حکـومەتە لە دوای یەکەکـانی شـوێنکەوتووی خـومەینی، یاسـا و ڕێسـای

خۆیان بەسەر خەڵکی تردا دەسەپاند. دۆخی ئێران لەم قۆناغەدا بێسەروبەر و گونجاو بوو بۆ دەستتێوەردانی دەرەکی.

کاتێک هێزەکانی عێراق لە ئەیلوولی ١٩٨٠دا پەلاماری ئێرانیان دا و سنووریان بەزاند، سەدام حسێنی سەرکردەی عێراق، بەوە پاساوی دایەوە کە ئەمە کاری بەرگری لەخۆکردنە دژ بە دەستتێوەردانی بەردەوامی ئێران. بەڵام لە ڕاستیدا تێکەڵەیەکی ترس و هەل بۆ هەڵکەوتن پاڵی پێوە نا. سوپای ئێران، کە لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە مەشق و چەک و تفاقی بۆ دابین کرابوو، بە هێزێکی گەورە و سامناک مابووەوە، لە کاتێکدا ڕژێمی نوێی شۆڕش هەڕەشەیەکی ئەگەرونەگەری پێک دەهێنا. بەڵام پشێوی و ئاڵۆزی لە تاراندا دەرفەتێکی نائاسایی هێنابووە پێشەوە، بۆیە سەرکردەی عێراق ئەمەی بە هەل زانی بۆ "ڕاستکردنەوەی" سنوور، وەک خۆی ناوی لێ نابوو، لە پارێزگای خوزستانی ئێرانیدا بە درێژایی شەتتولعەرەبی ڕووبارە سنووردا (کە لە ئێران پێی دەگوترێت ڕووباری ئەروەند). بەپێی قسەی لێکۆڵەری هەواڵگریی ئیسرائیل، ئەفرایم کام (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) کەوا سەدام حسێن ویستووشیەتی سرەواندنێکی توند ئاڕاستەی هێزە چەکدارەکانی ئێران بکات، بۆ ئەوەی تا چەندین ساڵ نەکەوێتەوە سەرخۆی."

ئەوەی کە ئێرانی زۆر خەمبار و نیگەران کردبوو، ئەوە بوو کە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی پراکتیکی بێدەنگ مایەوە لە بەرانبەر ئەم دەسدرێژییەی عێراقدا و تەنها ڕێگەی بە بەیانێکی سەرۆکی

ئەنجـوومەن دا کە تکـای لە (هەر دوو لا) دەکـرد "دەسـت هەڵبگرن لە هەر چالاکییەکی چەکدارانە" و "ناکۆکیی نێوانیـان بە ڕێـگەی ئاشـتی چارەسـەر بـکەن"[1]. وەک دیپلۆمـاتێکی ئەمەریکـی پـاش مـاوەیەک سـەرنجی داوە، ئەمە "کاردانەوەیەکی ڕیزپەڕی لاوازە بۆ هەڵگیرساندنی جەنگێک کەوا بە دڵنیـاییەوە دەرەنجامی گەورەی لـێ دەکەوێتەوە"[2]. دواتـر بڕیـارێکی ئەنجـوومەنی ئاسـایش دەرکـرا و داوای کۆتایی بەکارهێنانی هێزی کرد، نەک پاشەکشـەی هێزەکانی عێراق لە نـاو خـاکی ئێران[3]. جێی سەرسـووڕمان نییە کە دواتـر و بە درێژایـی جەنـگ، مەرجـی سـەرەکیی تـاران بـۆ ئاگربەست، ئەوە بوو کە عێراق بە فەرمی پێی لێ بنێت کەوا دەسـدرێژیکار بـووە. ئەمە لە دیـدی ئێـرانەوە جەنگێکـی "داسـەپاو" بـوو و تێرمێـک بـوو ئێرانییەکـان لە گفتوگـۆی فەرمییاندا بەم جۆرە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد.

لە سـاڵەکانی سـەرەتادا ئێـران سـوودێکی تیـۆریی لە سـوپای بەهێـز و پڕ چەک و تفـاقی بینـی، بەڵام بە کۆتـایی هـاتنی کتوپڕی یـارمەتیی ویلایەتە یەککرتووەکان، فڕۆکەی جەنگـی و کەرەسـتە و تفـاقی تـر لە بەرەکـانی جەنگـدا لە دەسـت چـوون و چیتـر شـوێنیان پڕ نەدەبـووەوە و تفـاقی یەدەگـیش بەرەبەرە تەواو بـوو. لەو سـەروبەندەدا، سـەرکردایەتیی تـازەی ئێـران کەوتە پاکسـازی لە نـاو ڕیزەکانی سوپادا لەو کەس و لایەنانەی گومانی ئەوەیان لێ دەکـرا هەواداری شـا بـن و گـاردی شۆڕشـی ئیسـلامییان دامەزرانـد (پاسـدارانی ئینقیلابـی ئیسـلامی)، کە هێزێکـی ڕکـابەر بـوو بە فەرمانـدەیەکی جیـاواز و ڕاسـتەوخۆ لەژێـر ڕکێفی خومەینیدا بوو. لاوازکردنی سوپای ئێران و نەبوونی

توانای بەدەستهێنانی کەرەستە و تفاقی جەنگیی نوێ، هۆکاری سەرەکی بوون کە بۆچی لە کۆتاییدا نەیتوانی جەنگ بباتەوە.

بە پێچەوانەوە، عێراق گەلێک دۆستی هەبوو، تەنانەت بە ساردبوونەوەی دۆستایەتیی پێشتری لەگەڵ یەکێتیی سۆڤییەتیشدا، پاش ئەوەی سەدام حسێن داگیرکردنی ساڵی ١٩٧٨ی ئەفغانستانی لە لایەن سۆڤییەتەوە خەتابار کرد و کەوتە لێدانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقیش. بەگوێرەی پەیماننامەی دۆستایەتی و هاوکاریی ساڵی ١٩٧٢، عێراق بڕێکی هێجگار زۆر چەک و تفاقی سۆڤییەتی وەرگرت، بەڵام وا ئێستا ڕابەری سۆڤییەت، لیۆنید بریجنێڤ بەڵێنی بێلایەنی دەدات لەم جەنگەدا و چەکپێدانی عێراق ڕەتدەکاتەوە. بەڵام عێراق هێشتا هەر چەک و تفاقی جەنگی لە هاوپەیمانە عەرەبەکانیەوە پێ دەگەیشت، وەک عەرەبستانی سعودی، کوەیت، ئوردن کەوا کەمتر دیکتاتۆریان خۆش دەویست، بەڵام زیاتر لە فراوانخوازیی ئێران دەترسان، دەستیان کردە ئاسانکاریی بەنکی و پێداویستیی جەنگیان بۆ عێراق دابین دەکرد و بوون بە وڵاتی ترانزێت بۆ گوێزانەوەی چەک لە وڵاتانی جۆراوجۆرەوە بە ویلایەتە یەکگرتووەکانیشەوە. هەروەها هێزەکانی عێراق سوودیان لە دۆخی سایکۆلۆجی وەرگرتبوو، چونکە چووبوونە قووڵیی هەرێمی خوزستانی ئێرانەوە کە ناوچەیەکی دەوڵەمەند بوو بە نەوت و بێجگە لەوەش لە ڕووی ئەتنیکییەوە عەرەبنشین بوو. لە کاتێکدا کە ئێران نوقمی توندوتیژی و نیگەرانیی سیاسی بووبوو.

بە هەرحاڵ، لەمیانەی دوو ساڵدا پێشڕەویی عێراق شکستی خوارد و هێزەکانی بە سەختی لە لایەن

ئێرانییەکانەوە کە ڕیزی خۆیان ڕێک خستبوو، لێیان درا. بێجگە لەوەی کە دۆخە نوێیەکە جێگیر نەبووبوو، دەسدرێژییەکە خزمەتی هاندانی پشتیوانییەکی میللیی کرد بۆ خومەینی، کە توانیی بەرەنگاربوونەوەی ناوخۆ ببەزێنێت و بەشێکی زۆری نەیاران لە ناو ببات لە ڕێگەی ئیعدامکردنی بەکۆمەڵ و ئەشکەنجەدان و شتی هاوشێوە و بەمە گەنج و لاوی ئێران بجووڵێنێت بۆ شەڕکردن لە بەرەدا. هێزەکانی ئێران لە مایسی ١٩٨١ەوە دەستیان کرد بە ئەنجامدانی زنجیرەیەکی بەهێزی هێرشی پێچەوانە کە سەرکەوتنیان بەردەوام ڕوو لە زیادی بوو. بە هاتنی هاوینی ١٩٨٢، توانییان دوژمنەکەیان بکەنەوە ئەودیوی سنووردا و پاشەکشەیەکی سەرشۆڕانەی پێ بکەن و ئەمە بوو بە کارەسات بۆ عێراق و گلۆڵەی بەختی کەوتە لێژی.

هەر کە ئێران ئەم سەرکەوتنە بەرچاوەی بەدی هێنا، عێراق کەوتە هەڵپەکردن بۆ ئاشتی لە چەندین بۆنەدا لە بەهاری ١٩٨٢دا و پێدەچوو تەنانەت بە هەلومەرجی ئێرانیش ڕازی ببوایە. ڕاستییەکەی لە بەرەنگاربوونەوەیەکی بێپێشینەدا بۆ سەرکردایەتیی سەدام حسێن و ئۆرگانە بڕیاربەدەستە بالاکانی عێراق، هاتنە سەر ئەو ڕایەی کە دەبێت هێزەکانیان بکشێننەوە سەر سنووری نێودەوڵەتی و واز لە هەموو داواکارییەکی خاک و سنوور ڕاستکردنەوە بێنن.

ئێران ئەمەی بەو مەرجە قبووڵ دەکرد کە سەدام دەست لە کار بکێشێتەوە و تاقمێکی بچووکی پیاوانی ئایینی لە دەوری خومەینی ئەمەیان ڕەت کردەوە. پیاوە ئایینییەکان بڕیاری فشاریان بەم ئاڕاستەیە دا، بە هۆی زنجیرە

سەرکەوتنەکانیان و گیانی تۆڵەسەندنەوە، ڕەنگە بەدیکردنی هەل و دەرفەتێکیش بووبێت بۆ تەشەنەکردنی شۆڕش لە ناو زۆرینەی دانیشتووانی شیعەمەزهەبی عێراقدا و بەو چەشنە دەبێتە هۆی ڕووخانی ڕژێمی عێراق.

توێژەرانی ئێران تا ئێستا ئەم بڕیارە بە هەڵەیەکی تراجیدی دەبینن. بەپێی یەکێک لە توێژەرە ئێرانییەکان (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) "هەندێک لە فەرماندە ئێرانییەکان ویستیان بچنە ناو عێراقەوە بۆ ڕێگەگرتن لە تۆپبارانی شارەکانی ئێران لە لایەن عێراقەوە، بەڵام هەر زوو کەوتنە سەر کەڵکەڵەی خاک داگیرکردن، وەک کەرەستەی بارمتە و سازش و پاشان سزادانی دەستدرێژیکار. ئەگەر ئێران نەکەوتایەتە داگیرکردنی خاکی عێراق، لەوانەبوو سەدام حسێن بڕووخایە، چونکە ئەو دەمە کوەیت و عەرەبستانی سعودی ئامادەبیان دەربڕی کە زیانەکانی ئێران ببژێرن، بەڵام وا ئێستا بایان داوەتەوە بەلای پشتگیریی عێراقدا و بە هەمان شێوە ویلایەتە یەکگرتووەکان، یەکێتیی سۆڤێت، فەرەنسا و بەریتانیاش وایان کرد".

هەر وەک توێژەرە ئێرانییەکە بۆی چوو، گاری سیکیش (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئەو بڕیارە "لە هەڵسەنگاندنێکی گەوجانەوە هاتبوو کەوا دەتوانن سەدام حسێن بخەن و بەو ڕەنگە جەنگیان بۆ ماوەی شەش ساڵی تر درێژ کردەوە و هەموو درندەییە سەرەکییەکانی جەنگ ــ کە بریتی بوون لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، شەڕی شارەکان، جەنگی تەنکەرەکانی نەوت و... تاد ـ دوای ئەوە هاتنە ئاراوە".

تەنـانەت لە پـاش کـۆچی دوایـی خـومەینییش لە سـاڵی ١٩٨٩دا، مشـتومڕێکی گەرم هەبـوو لە نـاو ئێرانـدا ــ بـا ئاشـکراش نەبووبێت، بەڵام بە پێداگرییەوە لە نێـو بـازنەی خەڵکە دیار و قسەڕۆیشتووەکاندا ـ سـەبارەت بە حیکمەتی بەردەوامیـی شـەش سـاڵی بێمانـای جەنگێـک، کە هەر زوو دڵگەرمیی شۆڕشگێڕانەی ڕەوییەوە، بە دیارنەبوونی ئامانجە ڕاسـتەقینەکانی و کەڵەکەبـوونی زەرەر و زیانەکـانی ــ جەنگێـک سـەرباری ئەوەش لەجیـاتیی ئەوەی کۆتـایی بە ڕژێمی سەدام حسێن بێنێت، بوو بە هۆی بەهێزکردنی.

لە ١٣ی تەمـووزی ١٩٨٢دا، هێزەکـانی ئێـران دەسـتیان کـردە هێرشـێکی گەورە لە نـاو خـاکی عێراقدا و ئامانجیـان بەنـدەری بەسـڕە بـوو لە باشـوور، کە دووەم گەورەتـرین شاری عێراق بوو، کەوا گرتنی ڕەگی ژیانی بەغدا دەپچڕێت (بە بۆچوونی ئەوان) و کەنداوی لێ دادەبڕێت و دەبێتە هۆی ڕووخانی خێرای ڕژێـم ــ کە ئەمە ئەگەرێک بوو ئاگاییەکی دا بە وڵاتـانی عەرەب و واشـنتۆن. هێرشـەکان لە شـەش ساڵی دوای ئەوەدا بوون بە ساڵانە و بە عادەت لە دوادوایی زستان یان سەرەتای بەهـاردا، کەوا ئێرانییە غەیرەنیزامـی و مەشـقنەکردوو و وەک پێویسـت چەکپێنەبووەکـان (کە پاسـداران و خۆبەخشـانی بەسـیج بە شـێوەیەکی سـەرەکی خەڵکی دێهات بوون و زۆربێکیـان تەنهـا مێرمنداڵ بوون)، بە شـێوەی (شـەپۆلەمرۆڤ) یـان (أمـواج بشـرية بە عەرەبـی) هێرشیان دەکردە سەر هێڵەکانی بەرگریی عێراق و ئەمەش زیـانێکی سـامناکی لە ڕیـزی ئێرانییەکانـدا بەرپـا کـرد. ستراتیجیەتی ئەم کارە بەو حیسابە بوو کەوا بەرگریکارانی عێراق لە پێش ئێراندا چەک و تەقەمەنییان دێتە کزی و بەو

حیسابەش ئێران لە ڕووی دیموٚگرافییەوە باڵادەستە و بەمەیان عێراق کەسی بە دەستەوە نامێنێت فیشەکێک بتەقێنێت. ئێران بە بەرچاوەوە ژمارەیەکی بێکۆتایی گەنجی دەروونگەرمی هەبوو کە دەرزدادان و پابەندبوونیان لە ئاستی دابینکردنی خواست و تەنانەت پەرۆشییان بوو بۆ قوربانیدان بە خۆیان لە پێناوی وڵات و شۆڕشدا.

ئەگەرچی سەدام حسێن لە ساڵی ١٩٨١ەوە کەوتبووە چەسپکردنی هێزەکانی لە بەری عێراقی سەرسنووردا و سەنگەرەکانی وا توندوتۆڵ کردبوو کە لە گیران نەیەت و هێرش و پەلاماری شەپۆلەمرۆڤ، بە شێوەیەکی سەیر و سەرسامکەر ئەو سەنگەرانەیان دەگرت و لێرەدا لایەنی سایکۆلۆجی ڕۆڵی خۆی دەبینی. عەقید ڕوکن عەبدولوەهاب ئەلساعیدی کە ئەفسەرێکی عێراقە و وەک دەڵێت "ماوەیەکی زۆرم لە بەرەدا بەسەر بردووە". ئەم پیاوە (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەگێڕێتەوە:

"ئەوان بەرەوڕوومان دەهاتن و دەگەیشتنە کێڵگە مینرێژەکان. یەکەمیان هەوڵی لابردنی مینێکی دەدا و دەتەقییەوە و بۆشاییەکی بچووکی دروست دەکرد، دوای ئەو یەکێکی تر دەهات و خۆی بە کوشت دەدا و بەم ڕەنگە دەردەکەوێت کە چۆن ڕاڕەوێکیان دەکردەوە. ئێمە بە چەکی ڕیز دەسرێژمان لێ دەکردن و بە چەکی هێرشبەرانەی تر و بە هاوەن و تۆپخانە دامان دەگرتنەوە. لاشەیەکی زۆر لەسەر یەک کەڵەکە دەبوون و چەکەکانمان هێندە گەرم دەبوون کە پەکیان دەکەوت. بەڵام ئەوان هەر بە لێشاو دەهاتن، بۆیە ئێمە بە ناچاری پاشەکشەمان دەکرد و دواتر دەستمان بە تەقە دەکردەوە لێیان و ئەمە بەردەوام بوو."

لەو کاردانەوەدا عێراق تەواوی چەکە ئاساییەکانی خۆی خستە کار و کەوتە هێرشبردن بۆ سەر سەنتەرەکانی نیشتەجێی ئێران و کەشتییە بێلایەنەکان، وەک هەوڵێک بۆ تێکشکاندنی بەرەی جەنگی ئێران بە ڕووخاندنی ورەی مەدەنییەکان؛ ئەم کارە خێرا لە لایەن ئێرانییەکانەوە قۆزرایەوە و ساڵی ١٩٨٤ بوو بە هۆی بەرپابوونی یەکەم "جەنگی شارەکان".

تۆماری جەنگ شێوازێکی بەردەوامی دڕندەیی و ستەمکاریی لە هەر دوو لاوە خستبووە گەڕ. عەون ئەلخەساونە، کە ڕاوێژکاری شا حوسەینی ئوردن بوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەڵێت "عێراق وای بۆ دەچوو کە داگیرکردنەکەی ڕووخان و تێکشکانی کتوپڕی بە دوادا دێت و کاتێک ئەمە ڕووی نەدا، تا هات زیاتر دڕندە بوون و خەڵکی سڤیل کردنە ئامانج بوو بە پیشەیان و نائومێدانە و بێبەزەییانە هەڵسوکەوتیان دەکرد".

بەڵام عێراق کاردانەوەیەکی کاریگەری نەبوو بۆ هێرشەکانی شەپۆلەمرۆڤ. سەدام حسێن بۆ دەربازکردنی هێزەکانی، پەنای بردە بەر تۆپبارانی خەست کە زۆر قورس لەسەری، چونکە هێزەکانی پێویستیان بە هەزاران دەسڕێژ و پاکۆدان هەبوو بۆ بەرپاکردنی "ڕێژە کوشتارێکی" گونجاو دژ بە پۆل پۆلی ئێرانییەکان لە کاتی هێرشبردنیاندا بۆ سەر سەنگەرەکانی ئەمان، بێ سڵکردنەوە لە مردن. بۆ زاڵبوون بەسەر دڵگەرمیی سایکۆلۆجیی ئێراندا، عێراق پێویستی بە چەکێک بوو کە نەک هەر بە ئاسانی گەورەترین ژمارەی هێزەکانی دوژمن بکوژێت، بەڵکو توانای تۆقاندنێکی ئەوتۆی هەبێت کە ببێتە هۆی ئازارێکی سەخت و درێژخایەنی وا کە

ئامادەیی ئێرانییەکان بۆ خۆبەختکردن بپسێنێت؛ چەکێک کە ڕێگە بە عێراقییەکان بدات زۆرترین ژمارەی دوژمن، بە کەمترین خەرجی و مەسرەف بکوژێت و ئەو چەکەش گاز بوو. عەمید ڕوکن نەبیل خەلیل سەعید (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٤دا) دەگێڕێتەوە کەوا "ئێمە چەک و تەقەمەنییەکی بێئامانمان بە کار دەهێنا، بەڵام ئەوان هەر دەگەیشتنە سەنگەرەکانمان. ئێمە بەرەوڕووی کەمییەکی سەخت بووبوووینەوە لە چەک و تەقەمەنیدا و دەبوو لە گەڵێک شوێنەوە بمانهێنایە. دواجار عێراق بڕیاری دا تۆپخانە تاقی بکاتەوە لە ئاڕاستەکردنی گازی خەردەلدا".

عێراق لە پێش ساڵی ١٩٨٠دا دەستی دایە بەرنامەیەکی چەکی کیمیایی کە بە زۆری لە کاردانەوەی گومانی چەسپاوی ئەوەدا کەوا ئیسرائیل چەکی کۆمەڵکوژ پەرە پێ دەدات. پسپۆڕێکی وەزارەتی دەرەوە لە ساڵی ١٩٨٨دا دەڵێت "عێراق بە شێوەیەکی سەرەکی بە دوای بەدەستهێنانی توانای چەکی کیمیاییدا دەگەڕا بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەی هەستپێکراوی ئیسرائیل"[٤]. لە ساڵی ١٩٦٥دا عێراق بەڕێوەبەرێتیی سنفی کیمیایی هێزە چەکدارەکانی دامەزراند، لەسەر مۆدێلی بەرنامەی سۆڤییەتی. بۆ ساڵی دواتر بەغدا سەرپەرشتی و چاودێریی خولێکی ڕاهێنانی کرد کە بۆ ئەفسەرانی وڵاتانی عەرەبی کرا، بۆ پشتیوانیکردنی تواناسازیی بەرگریی کیمیایی دەوڵەتە عەرەبییەکان "لە بەرانبەر گومانی تواناسازیی هێرشی ئیسرائیلدا"[٥].

ئەفسەرانی هەر دوو عێراق و ئێران لە بەرنامەکانی مەشقی بەرگریی کیمیاییدا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان

بەشدارییان کردووە. عێراق، لە پاش جەنگی حوزەیرانی ١٩٦٧ و کودەتای بەعسییەکان لە ساڵی ١٩٦٨دا و بە شێوەیەکی زۆر نزیک لە بەرەی یەکێتیی سۆڤیێتدا کەوتە پەرەپێدانی بەرفراوانی چەکی کیمیایی و کڕینی کەرەستە و تفاقی پێویست بۆ ئەو مەبەستە و تەنانەت هەڵگرتنی گازی خەردەلیش، لە هاوپەیمانە سەرەکییەکەی لەگەڵ پسپۆڕیی پێویستی بەرهەمهێناندا. شارەزایان گومانی ئەوە دەکەن کە لە سەروبەندی شۆڕشی ئێراندا، عێراق توانای تەواوی هەبوو بۆ بەرهەمهێنانی گازی خەردەل. کاتێک کە پەلاماری ئێرانی دا تەواو ساز و ئامادەبوو بۆ تاقیکردنەوە و سەرکەوتنی بە دەست هێنابوو لە "چەکسازیی" گازدا، واتا پەرەپێدانی سیستەمێکی چەکسازی کە توانای وەشاندنی گازی ژەهراویی هەبێت بەسەر دوژمنەکانی ڕژێمدا. سنووردارکردنی گازی خەردەل (کە توخمێکە ماوەیەکی درێژ دەمێنێتەوە و ڕێگەی لە هێزەکانی عێراق دەگرت بگەنە ئەو ناوچانەی ئەو گازەیان بەسەردا دەباراند) و عێراق لە ساڵی ١٩٨٢دا دەستی کرد بە جۆراوجۆرکردنی ئەم چەکە و سۆراخکردنی توخمی دەمارەگاز و پێکهاتە کیمیاییەکان لە بازرگانە تایبەتەکانی ڕۆژئاوا کەوا بە چاودێری و بە شێوەیەکی ڕوونیش چاوداخستنی حکومەتەکانیان لە کارکردنیان.

پێشکەوتنی زانا عێراقییەکان لە بەرهەمهێنانی چەکی کیمیاییدا هاوکات بوو لەگەڵ کشانەوەی سوپادا لە ئێران و دەستپێکردنی هێرشەکانی شەپۆلەمرۆڤ. عێراق یەکەم جار گازی فرمێسکڕێژی ناکوشندەی بە کار هێنا وەک هەوڵێک بۆ بەرگرتن لە لێشاوی هێرشەمرۆڤ لە سەروەختێکی

تەمووزی ١٩٨٢دا و ئێرانییەکانی لە نیاز و مەبەست ئاگادار کـردەوە (زانیـاری لەسـەر هێرشـە بەراییەکـان کەم و جیاوازییـان زۆر بـوو). لە کاتێکـدا کە گـازی فرمێسـکڕێژ، هێزەکـانی دوژمـن بە شـێوەیەکی کـاتی دەوەسـتێنێت و بڵاوەیان پێ دەکات، بەڵام شتێکی ئەوتۆی پێ ناکرێت لەگەڵ کەسـانی گیانبـازدا. ئەوانە بە ئاسـانی بەرپەرچـی نەخشـە و پلانـی ئەوانیـان دایەوە، چەشـنی خۆپیشـاندەرە پیـازهەڵگرە فەڵەستینییەکان کە زوو پەییـان پێ برد و نەبوونی بریندار ڕێگەی پێ دەدان خێرا بگەڕێنەوە مەیدانی شـەڕ. لەم کاتەدا تـاقیکردنەوە بەرایـیەکەی عێـراق بە پـێچەوانەی ئەوەی لێـی چـاوەڕوان دەکـرا، سـەرکەوتوو بـوو و تـا ڕادەیەک بەو هـۆیەوە بـوو کە ئێرانییەکـان بە ئاشـکرا هەسـتیان دەکـرد گـازی کوشـندەیان کـراوە بەسـەردا. وەک بـاس دەکرێـت، فەوجێکی تەواو بە ئاشکرا لە ترسـان هەڵاتـن. ئەندرو تێرپیڵ سـەرنجی ئەوە دەدا کەوا "ئەم سـەرکەوتنە سـەرەتاییە بە هۆی بەکارهێنانی توخمێکی کیمیایی سادەوە ئەنجام درا کە بۆ کۆنترۆڵی ئاژاوە و توندوتیژی بە کار دەهات و بێگومان ئەوەی لای عێراقییەکـان دەرخسـت کە پێکهـاتەیەکی کوشندەیە لە بەرەی جەنگدا"[٦].

ئەو کاتەی کە عێراق کەوتە بەکارهێنانی گازی خەردەل، پێـدەچێت ئەنجامەکـانی زۆر بەرچـاو نەبووبێـت، بەڵام پێشـبینیی سـەرکەوتنی لـێ دەکـرا. ئەحـمەد هاشـم، کە پسپۆڕێکی سەربازی بوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) ئەوە ڕوون دەکـاتەوە کەوا "هەر چەنـدە ڕێـژەی سـەرەتایی کوشـتن زۆر بەرز نەبـوو ــ کە لە پەنجـا هەزار بریـنداری چەکـی کیمیـایی تەنهـا ١٠٪ مـردن هەبـوو ــ بەکارهێنـانی

چەکی کیمیایی تا ڕادەیەکی گەورە، خێرایی ئۆپەراسیۆنی تێک شکاند و جموجۆڵی ئێرانییەکانی کەم کردەوە و ناچاری کردن پۆشاکی کیمیایی بپۆشن لە کەشوهەوای گەرمی کەنداودا، بە ڕێژەی ٤٠%. ئەوەی کە ماوەیەکی خایاند بۆ عێراقییەکان ڕاستەوڕاست ئاویتەکردنی ئاگری کیمیایی بە تەواوی لە ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانیاندا". بە هەرحاڵ، بە تێپەڕینی کات و بەدەستهێنانی ئەزموونی زیاتر و تەکنۆلۆجیای باشتر لە لایەن عێراقییەکانەوە، چەکی کیمیایی بوو بە هێزی کاریگەر.

## یەکەمین پەلاماری تۆمارکراوی گازی خەردەل: هاوینی ۱۹۸۳

یەکێک لە قوتابییانی دکتۆر سوهرابپوور، ناوێکی بۆخۆی دروسـت کردبـوو وەک گەورەتـرین دەسـەڵاتی پزیشـکیی ددانپێدانراوی ئێران لە شەڕی کیمیاییدا. عەباس فروتان، کە فسـیۆلۆجییەک بـوو بە مەشـقکردن، وەک دەگێـڕێتەوە پەلکێشی نێو بواری تازەی چارەسەری برینداراانی کیمیایی کـرا، پـاش ئەوەی لەگەڵ دکتۆرەکـانی دیـکەی پەرۆش و کارامەدا، ساڵی ۱۹۸۳ چوون بۆ بینینی قوربانییانی حاجی ئۆمەران، کە دابەش کرابوون بەسەر ژمارەیەک مەڵبەندی پزیشکیی تاراندا. لەوێوە فروتان ڕۆیشت بۆ بەرەی شەڕ و وردەوردە پـاش هەر لێـدانێکی کیمیـایی، قوربانییـانی چارەسـەر دەکـرد و عێـراقیش بەردەوام تەکتیکـی خـۆی دەگۆڕی و گازی نوێی دەخستە کار، بەمە فروتان بوو بە نـاودارترین شـارەزا و بەڕێـوەبەری پزیشـکیی کـۆمەڵەی پزیشکانی قوربانییانی چەکی کیمیایی.

دکتـۆر فروتـان (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ۲۰۰۲دا) ئیـدیعای ئەوە دەکـات کەوا پێـدەچێت عێـراق لە سـەرەتای ساڵانی هەشتاکانەوە گازی فرمێسکی بە کار هێنابێت لەگەڵ تـوخمێکی کیمیاییـدا کە دەبێتە هـۆی هێڵنجـدان و ڕشـانەوە، زیاتر بەپێی بنەمایەکی تاقیکردنەوە کە ڕووی دا: "هێزەکانی ئێران هەندێک یەکەی سوپای عێراقیان گرتبوو کەوا ماسکی

گازی زۆر کۆنی سۆڤیێتییان پێ بوو لەگەڵ کەرەستەی دۆکیومێنتیی زۆر کۆن و ئامرازی دۆزەرەوەی زۆر کۆندا. ئەمانە لە سەنگەر و قایمکارییەکانی عێراقدا دۆزرانەوە. من هەر چەندە هیچ حاڵەتێکی پزیشکیم پێش ساڵی ١٩٨٣ نەبینی ــ کە لە بەشی ئیمێرجنسی لە تاران کارم دەکرد و هیچ بنەمایەکی داتابەیسی ناوەندیی نەبوو سەبارەت بە هێرشە کیمیاییەکانی ئەو ساڵانەی سەرەتای جەنگ، بەڵام نزیکەی بیستوپێنج پەلاماری کیمیایی لە پێش ئابی ١٩٨٣دا تۆمار کرابوو کەوا بریندار و کوژراوی لێ کەوتبووەوە (بیست کوژراو و چل بریندار) کە برینەکانیان جیاواز بوو لەوەی گولله و پارچە تۆپ[٧]. لە پێش ساڵی ١٩٨٥دا، سەرچاوە فەرمییەکانی ئێران بیستونۆ هێرشی گازی تەواو نەسەلماویان تۆمار کردبوو، کە پێش تەمووزی ١٩٨٣ روویان دابوو، بەڵام لیستەکانی دواتر ئەم ئیدیعا بەرایییانەیان فەرامۆش کرد[٨].

راپۆرتگەلی باوەڕپێکراو لەسەر پەلامارەکانی گازی خەردەل، لە لایەن عێراقەوە لە دوادوایی ساڵی ١٩٨٢دا دەرکەوتن. هەر چەندە ئەم راپۆرتانە بە باشی دوکیومێنت نەکرابوون، بەڵام ئەوە دەزانرێت کە عێراق لە دەوروبەری ئەم ماوەیەدا، کەوتە هەڵگرتن و کەڵەکەکردنی کەرەستە و زەخیرەی کیمیایی لە نزیک هێڵەکانی بەرەوە. کۆڵۆنێل مونقیز فەتحی کە لە ساڵانی سەرەتای جەنگەوە لە سوپای عێراقدا بوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) دەگێڕێتەوە کەوا لە شەڕێکدا، لە رۆژهەڵاتی بەسرەوە، لە ئۆکتۆبەردا (کە یەکەم شەڕ بوو لەو ناوچەیەدا) هێزەکانی ئەو لە نزیک هێڵەکانی بەرەوە چەکی ئارپیجییان پێ بووە، کەوا مووشەک

یان ڕۆکێتی گازی خەردەلیان پێ هاویشتووە: "فەرمانم پێ درا کەوا ڕۆکێتی ئارپیجی/٧ و گوللەهاوەنەکان بپشکنم و لە دەمەوانەی یەکێک لە ئارپیجی حەوتەکانەوە بۆنی گازێکم کرد و دواتر بە جۆرێک چاوەکانم کەوتنە فرمێسکڕشتن، کە نەمتوانی لەوێ بمێنمەوە. ئەمە گازی فرمێسک نەبوو، چونکە لەو کەسانەم پرسی کە سەرەوکاریی ئەو مەسەلەیەیان دەکرد و پێیان گوتم ئەمە گازی خەردەلە. بەڵام پێم وانییە لەو شەڕەدا بە کاریان هێنابێت." بەپێی گێڕانەوەی تێڕیل، لە دیسەمبەردا، ڕاپۆرتەکانی بەرەی شەڕ باس لەوە دەکەن کە "عێراق بڕێکی سنووردار و هاکەزایی خەردەلی گۆگردی بە کار دەهێنا بۆ بەرگرتن لە هێرش و پەلاماری شەوانە و یارمەتیدەر بێت بۆ تێکشکاندنی ڕیزەکانی شەپۆلەمرۆڤی ئێرانییەکان"[٩].

یەکەمین تۆمارکردنی هێرش و پەلامارەکانی گاز بە شێوەیەکی ورد و تۆکمە، لە تەمووز و ئابی ساڵی ١٩٨٣دا بوو، کاتێک هێزەکانی ئێران و عێراق کەوتنە شەڕێکی سەختەوە لە چیاکانی سەرووی حاجی ئۆمەرانەوە، کە شارۆچکەیەکی سەر سنوورە لە کوردستانی عێراقدا. شەڕەکە، بێجگە لە هێرشی وەلفەجر دووی (والفجر/٢) ئێرانی، بە شێوەیەکی سەرەکی مەبەستی دەرپەڕاندنی یاخیبووە کوردە ئێرانییەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان (حدکا)ی سەر بە عەبدولڕەحمان قاسملوو بوو، پاشان لەو شوێنانەدا جێگیر بوون کە یاخیبوان چۆڵیان کرد و بۆ ناو عێراق پاشەکشەیان کردبوو. لەم هێرشەدا گرووپە ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراق دایانە پاڵ هێزەکانی ئێران و بەرچاوترینیان (پ د ک)ی مەسعود بارزانی بوو، لەگەڵ

هەندێ تاقمی تازەپەیدابووی فەیلەقی بەدر و میلیشیای چەکداری سەر بە ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق، کە گرووپێکی ئۆپۆزسیۆنی شیعە بوون، ساڵی ١٩٨٢ لەسەر دەستی ئێران دروست بوون و بنکە و بارەگایان لە تاران بوو. لەملاشەوە نەک تەنها (حدکا) پاڵپشتیی هێزەکانی عێراقی دەکرد، بەڵکو ئەو کوردە عێراقییانەی ناوچەکەش کە ناحەزی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون و بە تایبەتی هێزێکی عەشیرەتی برادۆست کەوا سەرۆکەکەی، کەریم خانی برادۆستیی موستەشار بوو (بە واتە ڕاوێژکار، بەڵام بە کردار فەرماندەی کاریگەری میلیشیایەک بوو کە لە پاڵ ڕژێمی عێراقدا بوو). دواتر سەدام چەندین جار میداڵی ئازایەتیی خەڵات کرد.

پەیوەندیی توندوتۆڵی نێوان ئێران و پارتی دیموکراتی کوردستان، بە جارێ عێراقییەکانی نیگەران کردبوو. لە پاش هەرەسهێنانی شۆڕشی بارزانی لە ساڵی ١٩٧٥دا، سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستان (کە لە مستەفاوە چووبووە لای ئیدریس و مەسعودی کوڕی) بە ئاوارەیی لە ئێران دەژیا. دەستدرێژیی عێراق، هیوای بە (پ د ک) پەیدا کردەوە و لە ساڵی ١٩٨٣دا پاڵپشتییەکی چالاکانەی شەڕی هێزەکانی ئێرانی دەکرد وەک ڕێنما و شارەزایی. زانیاریی تەواوی بارزانییەکان، بە تایبەتی لەسەر ناوچەی عەشیرەتی برادۆستی کە هاوسنوور بوون لەگەڵیاندا، یارمەتییەکی گەورە بوو بۆ ئێرانییەکان، کە توانییان لە کۆتایی تەممووزدا حاجی ئۆمەران و دەوروپشتی بگرن. کۆردسمان و واگنەر ڕاپۆرتی ئەوە دەدەن کەوا ئێرانییەکان لەو کاتەدا نزیکەی دە میل هاتوونەتە ناو خاکی

عێراقەوە و "سەربازگەی حاجی ئۆمەرانی سەر بە فەیلەقی یەک، بەرزاییە سەرەکییەکان و بنکەکانی تۆپخانە لە ناوچەکەدا، نزیکەی ٤٣ گوندی کوردنشین، بنکەیەکی سەرەکیی حدکا و زۆربەی کەلوپەل و تفاقی جەنگیی حدکایان گرت"(١٠).

محەمەد عەلی حسێن کە ئەندامێکی پێشووی بەدر بوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەگێڕێتەوە کە چۆن ڕۆژێکیان ــ بە تەواوی ناچێتەوە سەر مێژووەکەی ــ فڕۆکەیەکی میگ ــ ٢١ی عێراقی هەڵیکوتاوەتە سەر تاقمە ژمارە کەمەکەی ئەم، کە بیستوشەش جەنگاوەری عێراقی بوون لای هێزەکانی ئێران لە نزیک حاجی ئۆمەران و سەعات چوار و نیوی دواینیوەڕۆ بۆمبارانیان کردوون و یەک لە بۆمبەکان ڕاستەوخۆ لە نزیکیانەوە کەوتووە و جەنگاوەرێکی کوشتووە و سیازدەی بریندار کردووە، کە حسێن خۆی یەکێک بووە لە بریندارەکان:

"ئێمە شتێکمان لە بارەی چەکی کیمیاییەوە نەدەزانی و بۆنی سیر هاتە لووتمان. لە پاش نزیکەی شەش سەعات چاوی ئەو جەنگاوەرانەمان، کە شۆڕ بووبوونەوە بۆ بنی شاخەکە، سوور هەڵگەڕا و هەوی کرد و بردنیان بۆ نەخۆشخانەی ورمێ و لەوێوە بۆ نەخۆشخانەی تورفە لە تاران. ئێمەش کە نزیکی لوتکەی شاخەکە بووین، تووشی هەندێک تەنگەنەفەسی بووین. هەندێک لە ئێرانییەکانیش بەرکەوتبوون و من دواتر لە نەخۆشخانە بینیمن. نازانم چی بەسەر برادەرەکانماندا هات لە پارتی دیموکراتی کوردستان، کە لەوبەری شاخەوە بوون. ئێمە لە پاش حەوت سەعات

پاشەکشەمان کرد و ئەگەر بمانزانیایە عێراق چەکی کیمیایی بە کار هێناوە، بێگومان خێراتر دەکشاینە دواوە."

ئەو نیشانانەی کە حسێن و کەسانی تر باسیان دەکەن، ئەوە دەگەیەنێت کە عێراق خەردەلی گۆگردی بە کار هێناوە، هەمان ئەو گازەی کەوا لە سەنگەرەکانی جەنگی جیهانیی یەکەمدا کوژراو و برینداریکی هێجگار زۆری لێ کەوتەوە. دکتۆر فروتان بینینی چل و یەک برینداری کیمیایی دێتەوە یاد لە نەخۆشخانەی تورفە و لەسەر باس و گێڕانەوەی ئەوان هێرشەکانی دوانیوەڕۆی ٨ی ئاب و بەیانیی ڕۆژی دواتری دەسنیشان کرد. نەخۆشەکان بە شێوەیەک زیان گەیشتبووە پێستیان، کە پسپۆڕ و دکتۆرەکانی سەرسام کردبوو. دکتۆر فروتان لەسەری دەڕوات و دەڵێت: "من هیچم نەدەزانی لە بارەی گازی خەردەلەوە. نەخۆشەکان دەیانگوت کەوا دووکەڵیان بینیوە و بۆنی سیریان کردووە. لە پاش سێ سەعات چاویان سوور هەڵگەڕا و کەوتنە ڕشانەوە و پێستیان هاتە خورین و ڕۆژی دواتر کەوتە تلۆقکردن. کاتێک کە پێستت دەگوشین بڵقی تر پەیدا دەبوو. هەندێک کێشەی سییەکانیان بۆ پەیدا بوو، بەڵام نەمبینی کەسیان لێ بمرێت. ئێمە دەمانزانی کە ئەم توخمە کیمیاییە بە تەواوی جێگیرە (واتە لە لەشدا دەمێنێتەوە)، چونکە لە هەندێک حاڵەتدا نیشانەکان دوای مانگێک دەردەکەوتن و نەماندەزانی چۆن ئەم نەخۆشانە چارەسەر بکەین." فروتان دواتر بە نووسین لەوە دواوە کە عێراق تێکڕا حەوت پەلاماری کیمیایی ئەنجام داوە لە ناوچەی حاجی ئۆمەران لە دەمی هێرشی وەلفەجر دوودا و خەڵکی سڤیلیش بەرکەوتوون[11]. هەروەها دەڵێت کەوا لەگەڵ هاوکارەکانیدا

تێبینییەکـی گرنگیـان کـردووە کەوا ئەو نمـوونە خـۆڵانەی نـاوچە بەرکەوتووەکـان کە بـۆنی سـیریان لـێ دەهـات و لە تـــوورەکەی پلاســـتیکدا هێنرابـــوون بـــۆ نەخۆشـــخانە، پلاســـتیکەکەیان ســـووتاندبوو. بەمەدا ســـوپا تێگەیشـــت کە نابێت ماددەی پلاستیک لە جلوبەرگی هێزەکانی کیمیاییدا بە کار بێنێت.

هەمـوو ئەوانەی لە شـەڕەکانی حـاجی ئۆمەرانـدا بەشـدار بوون، کۆک نەبوون لەسـەر ئەوەی کەوا چەکی کیمیـایی بە کـار هـاتووە. ئەفســەرێک لە میلیشـیای برادۆسـتییەکاندا، کە شانبەشـانی هێزەکـانی عێـراق لە حـاجی ئۆمەرانـدا شـەڕی کردبوو (لە چاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٠دا) سـوێندی خـوارد کەوا عێراق چەکی کیمیایی لەو شـەڕەدا بە کار نەهێنـاوە و ئیـدیعا دەکـات کە "شـتی وایـان نەکردووە، چونکە هێزەکـانی عێراق زۆر لە ئێرانەوە نزیک بوون و من خۆم لەوێ بووم". لەگەڵ ئەم نکووڵیکردنەشـدا، ئیـدیعای بەکارهێنـانی گـاز لە حـاجی ئـۆمەران لە لایەن عێـراقەوە، وەک هاوسـەنگییەک بە ڕاســت دەزانرێــت. ئەمە یەکەم نمـوونە بـوو کە دکتـۆرە ئێرانییەکان ڕاشکاوانە نیشـانەکانی گـازی ژەهراوییـان ڕوون کردەوە. لە سیاقی ئەوەی پێشـتر ڕووی دابـوو، بەکارهێنـانی عێـراق بـۆ گـاز، لەم قۆنـاغەی جەنگدا و بە تـایبەتی گـازی خەردەل، تەواو یەک دەگــــــرێتەوە لەگەڵ ســــــتراتیجی دوولایەنەی بەرەنگـــــاربوونەوەی ئێرانییەکـــــان لە ڕووی هێرشـەکانی شـەپۆلەمرۆڤ و سـزادانی گەریلاکـانی کـورد لەسـەر ئەو هاوپەیمـانییە ناپاکەیـان لەگەڵ دوژمنـدا. بـاس و گێڕانەوە پێچەوانەکان، ڕەنگە بە هـۆی سروشـتی شـاخاویی ناوچەکەوە بووبێت کە تێیدا حیزبێک یان لایەک ڕەنگە ئاگای

لەوی تر نەبووبێت، یان بەپێی تێپەڕبوونی کات لە نێوان هێرشە سەرەکییەکانی ئێراندا، کاتێ عێراقییەکان بە یارمەتیی میلیشیاکانی برادۆست بەرگرییەکی سەختیان دەکرد و تۆڵەکردنەوەی دواتری عێراقییەکان لە هێزەکانی ئێران. ئەگەری ئەوەش هەیە ئەفسەرە برادۆستییەکە ڕاستی نەکردبێت و کەمتر شتی ئاشکرا کردبێت بۆ پاراستنی باری عەشیرەتەکەی لەگەڵ (ی ن ک)ی هاوپەیمانیدا (کە یەکێتی خۆیشی قوربانیی ژمارەیەکی هێجگار زۆری هێرشی کیمیایی عێراق بوو)، بە تایبەتی پاش ئەو تەریکبوونەی ڕژێمی عێراق لە دوای جەنگی کەنداو.

ڕووداوەکانی حاجی ئۆمەران، سێ دەرەنجامی گرنگی لێ کەوتەوە. بۆ سزادانی (پ د ک) لەبەر ئاسانکاریکردنی بۆ سەرکەوتنی ئێرانییەکان لە حاجی ئۆمەراندا، ڕژێمی بەعس تەواوی نێرینەی سەر بە عەشیرەتی بارزانیی ڕاپێچ کرد، کە زۆریان لە پاش هەرەسی ساڵی ١٩٧٥ی شۆڕشی بارزانییەوە ناچاری نیشتەجێی ئۆردووگاکانی دەورووپشتی هەولێر کرابوون. لە ٣٠ی تەمووزدا لە نێوان پێنج تا هەشت هەزار پیاوی بارزانی ـ کە ژمارەی ڕاستەقینەیان بە تەواوی نازانرێت ــ گیران و ڕاپێچ کران و هەرگیز جارێکی تر نەبینرانەوە. دوو مانگ دوای ئەوە سەدام حسێن لە وتاردانێکدا بێ سێ و دوو لێکردن گوتی: "ئەوانە خیانەتیان بە نیشتمان و پەیمان کرد و ئێمە بە سزای سەختمان گەیاندن و ڕەوانەی دۆزەخمان کردن."[١٢] ئەم تۆڵەسەندنەوەیە، ئاگادارکردنەوەیەکی هاوشێوەی میتۆد و ئەنجامی شاڵاوی ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨ی تێدا بوو. کوشتاری بارزانییەکان بۆ ڕژێم ڕۆڵی ڕاهێنان و خۆئامادەکردنی بینی

و بۆ کوردیش خوێ تامکردن و چەشتنێکی بچووک بوو بۆ ئەوەی کە دواتر ڕووی دا[١٣].

هەروەها ڕووداوەکانی حاجی ئۆمەران ناکۆکیی نێوان (پ د ک)ی بارزانی و (ی ن ک)ی تاڵەبانیی قووڵتر کردەوە. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە پەیوەندیی بەتینی هەبوو لەگەڵ حدکای قاسملوودا، سارد بوو لە بەرانبەر پێشڕەویی ئێرانییەکاندا و بە تەواوی سڵبووەوە کاتێک کە هێزەکانی ئێران کەوتنە ئۆپەراسیۆن لەو بەشەی خاکی عێراقدا کەوا یەکێتی بە قەڵەمڕەوی خۆیی دادەنا. لە کاتێکدا کە ڕووداوەکانی حاجی ئۆمەران تەواو وەڕسکەر بوون، چونکە یەکێتی کە پەیوەندییەکی باشی هەبوو لەگەڵ برادۆستییەکان و هەر دوو لا حەزیان بە بارزانییەکان نەدەکرد، کەچی ئێرانییەکان ئۆپەراسیۆنێکی تریان لە نزیک پێنجوێنەوە دەست پێ کرد، کە وەک نەریت ناوچەیەکی یەکێتی بوو لە ڕۆژهەلاتی سلێمانییەوە و بە تەواوی ئۆقرەی لە بەرهەڵگرتن و تاڵەبانی بە هەموو قورساییەکەوە چووە پاڵ عێراق و ڕازی بوو بە شەڕکردن لە دژی ئێران و لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا چووە نێو دانوستانی ئۆتۆنۆمییەوە (ئەم گفتوگۆیەی سالانی ١٩٨٣ و ١٩٨٤ بە هۆی باری ئاڵۆزی کەرکووکەوە شکستی هێنا و وەک لە بەشی چوارەمدا دەبینن، یەکێتی هەر زوو چووەوە ڕیزی پاڵپشتیکردنی ئێران و پارتی، سەرباری هەموو شتێک).

دواجار حاجی ئۆمەران بوو بە خاڵی وەرچەرخان و عێراق لێرەوە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە بوو بە کیمیاییوەشێن. بەلام لەبەر ئەوەی کارەکانی عێراق بە دەگمەن ڕاپۆرتی لەسەر دەنووسرا، نەبوو بە شەپۆلی

نارەزایی. لەئارادانەبوونی پرۆتێستێکی نێودەوڵەتی وای لە ڕژێم کرد هەست بەوە بکات کە دەتوانێت گاز بە کار بێنێت و پارێزبەندییشی هەبێت، بە تایبەتی ئەگەر ئامانج کوردەکان بێت کە لە دابڕاوی و دوورەدەستییاندا کەمتر میدیا لێیان وەئاگا دێت. هەر چەندە زۆربەی هێرشە یەک لە دوای یەکەکانی گاز، بە درێژایی بەرەی باشوور هێزەکانی ئێرانی کردبووە نیشانە و ئامانج، بەڵام عێراقییەکان زانییان دواتر چۆن باری ناسک و لەسەرپلی کورد بقۆزنەوە بۆ ئەوەی گازی ژەهراوییان پێدا بکەن، کاتێک کە هەل و دەرفەتی گونجاویان بۆ هەڵبکەوێت. بە شێوەیەکی بەرفراوانتر عێراق لە ئابی ١٩٨٣ بە دواوە دەیزانی چۆن بەردەوام بێت لە تاقیکردنەوەی چەکی کیمیاییدا. بەو ڕەنگە مانگەکانی دواتر عێراق هەڵکشانێکی یەکبینەی بەرپا کرد لە بەکارهێنانی گازی خەردەلدا، بە شێوەیەکی ڕەهاتر و بەربڵاوتر و دواجاریش دەستی بۆ دەمارەگاز برد.

### یەکەم شەڕگە لە جیهاندا کە دەمارەگاز بە کار بێنێت: زستانی ١٩٨٤

لە پاش حاجی ئۆمەران، عێراق بە شێوەیەکی سەرەکی دەستی کردە بەکارهێنانی گازی خەردەل و لە هەفتەی سێیەمی ئۆکتۆبەردا، هێرشی کردە سەر هێزەکانی ئێران. لە هێرشی وەلفەجر چواریدا، ئێران دیسانەوە کەوتە ڕاوەدوونانی گەریلاکانی حدکا کە لە عێراقدا خۆیان پەنا دابوو و وا ئێستا لە ناوچەی پێنجوێندان. کۆردسمان و واگنەر مەزەندە دەکەن کەوا "ئەم جارەیان بەکارهێنانی گاز (لە لایەن عێراقەوە) کاریگەر بوو و دواتر ئێران وای لەقەڵەم دەدا کە چەندین هەزار بریندار و کوژراوی کیمیایی هەیە"[١٤]. جولیان پێری ڕۆبنسن، زۆر بە وردی ژمارەیەکی کەم لەو زیانانە تۆمار دەکات[١٥]. دکتۆر فروتان، کە لێرەوە دەست دەکات بە شوێنکەوتنی حاڵەتەکانی کیمیایی، کۆکە لەسەر ئەوەی کە هێرشەکانی پێنجوێن ئەو زیانانەی تێدا کەم بووە. ئەو دەڵێت لە حاڵەتێکدا نۆ کوردی گوندنشین "بە هۆی هەناسەتوندییەکی سەختەوە" لە ماوەی حەفتاودوو سەعاتی بەرکەوتنیاندا مردوون، لە هەمان کاتدا هەندێکی تر کە دواتر مردن، بە دەست برینی جۆرە گازێکی ترەوە دەیاننالاند.

دواجار خراپەی خراپتر ڕووی دا و لە ٢٢ی شوباتی ١٩٨٤دا هێزەکانی ئێران دوو گەورە هێرشیان ئەنجام دا لە

دوو نـاوچەی باشـوورەوە، لە ڕۆژهەڵاتـی هەر دوو شـاری عەمـارە و قـوڕنەی عێـراقەوە، کە هەر دوو دەکەوتـنە سـەر شاڕێی ستراتیجیی نێوان بەغدا و بەسرە. ئەم قۆڵە گرنگەی بـاکوور ـــ باشـــوورە هاوســـنوورە لەگەڵ زۆنگاوەکـانی حـوەیزەدا کە بەوبەری ســنووردا بەرەو شــاری ئەهـوازی ئێران دەکشـێت و یەکێکە لە گەورەترین کێڵگە نەوتییەکانی عێراق، کە تەنها بەشـێکی کەمـی لـێ دەردەهێنرێت و ڕەنگە بیست لە سەدی یەدەگی نەوتی ئەو وڵاتەی تێدا بێت. یەکەم پەلامـار کە ئێران نـاوی لـێ نـابوو ئۆپەراسـیۆنی خەیبەر لە دەیـان هەزار جەنگـاوەر پێـک دەهـات کەوا شـەپۆل شـەپۆل بەرەو شارێکە ملیان دەنا. لە پاش هەفتەیەکی شەڕی قورس وەک باس دەکرێت ئێران نزیکەی ١٢ ـ ٢٠ هەزار پیاوی دا بەدەم گوللەی شەڕکەرانی عێراقەوە و هیچی بە هیچ نەکرد. هاوزەمـــان هێـــزی دەریـــایی ئێـــران پەلامـــاری دوورگەی مەجنوونی دا کە زۆنگاو و تەپۆڵکە لمی پڕ لە کێڵگە نەوتە و لێـرە ســـەرکەوتنی باشـــی بە دەســـت هێنـا و ئێرانییەکـان هەرچەنـدە زیـانی قورسـیان لـێ کەوت، بەڵام توانییـان لەوێ خۆیان بچەسپێنن.

لێرەدا فروتـان دەڵێت: "لە سـەرەتای خەیبەردا، چاوەڕێی دژەهێرشـی تونـدی عێـراق بـووین بە چەکـی کیمیـایی. ئـێمە نەخۆشخانەیەکی ژێرزەمینیمان هەبوو لە جافێر لە دەرەوەی ئەهواز کە بۆ بەرکەوتوانی چەکی کیمیایی ئامادە کرابوو و ئەگەر ئەوە نەبـوایە، بـۆ چارەســـەری برینـدارانی ئاســـایی تەرخان دەکرا". هەروەها دەگێڕێتەوە کە یەکەم جار عێراق گـازی خەردەلـی بە شـێوەیەکی سـنووردار لە نـاو ئێرانـدا بە کـار هێنـا لە نزیـک هەر دوو شـارۆچکەی شـەتی عەلـی و

هوێزە و هەندێ بۆمبی نەتەقیو دواتر درایە دەست تیمێکی نەتەوە یەکگرتووەکـان کە سـەردانیان کردبـوو، وەک ئەو دەیگـوت "لە ٧ی ئیسـفەندی ١٣٦٢دا"، واتە لە ٢٦ی شـوباتی ١٩٨٤دا بەپێی ڕۆژژمێری خۆرئاوا، "چەند برینداریکیان هێنا کەوا نیشانەی نائاساییان پێوە بوو، وەک ڕشانەوەی بەخوڕ، سـوورب‌وونەوە و ڕێـک بـۆنی نمـوونە خۆڵەکـانی حـاجی ئۆمەرانیـان لێـوە دەهـات. بەمەدا زانیمـان ئەمـانە قوربـانیی گازن و دەسبەجێ پەرستاری بە تـایبەت ڕاهێنراومـان ناردە نـاوچەکە و یاریگـای تۆپی پێی ئەهوازمـان خسـتە خزمەتی حـاڵەتەکەوە بـۆ چارەسـەر و دەرمـانکردن. لە یەکەم دوو ڕۆژدا، فـڕۆکە زیـاد لە سـەد بـۆمبی گـازی خەردەلیـان بەردایەوە. ئێمە هەزار و سـەد حاڵەتمان چارەسـەر کرد، کە سەد و پەنجایان نیشانەی برینی سەختیان پێوە بوو".

دکتۆرەکە هێرشێکی تری گازی خەردەلی تۆمار کردبوو، ئەم جارەیـان لە دوورگەکـانی مەجنـوون لە ١٩ی ئیسـفەنددا (٩ی مارت)، کە تێیدا سێ فڕۆکە بەشـدار بوون و وەک ئەو دەیگـوت ٥٣٣ برینـدار و کـوژراوی لـێ کەوتەوە. پاشـان تۆپخانەی کیمیایی لە بەرەبەیـانی ١٤ی مارتدا ئاگری دان و زیـانێکی قورسـی پـێ گەیانـدن، کـاتێ کە دای لە هەنـدێک کەرەستە و تفاق کە ئەندازیاران بۆ سەنگەرەکانی هێڵی بەرە بە کاریان دەهێنا.

مـونقیز فەتحـی، کە ئەفسـەرێکی عێراقیـی بەشـداری شەڕەکان بوو، لە لایەن بەرەی خۆیەوە بەکارهێنانی گاز لە مەجنووندا دەسـەلمێنێت و دەڵێـت: "ئێرانییەکـان باشـووری مەجنوونیـان گـرت لەگەڵ سـێ یەکـی باکووریـدا. مـن لە باکووری مەجنوون بووم کاتێک هێزەکانمـان بە گوللەتۆپی

کیمیـــایی بۆردمـــانی باشـــووری مەجنوونیـــان دەکـــرد. کە هێرشـی گـاز دەسـتی پـێ کـرد ئێمەیـان بە هـۆی دووکەڵـی ئاگـادارییەوە وریـا کـردەوەوە کە بریتـی بـوو لە هەڵـدانی تـۆپێکی دووکەڵ سـپی و تەلەفۆنکردنێـک. فەرمانـدەکانمان زۆر گرنگییان بە ئاڕاستەی با دەدا، نەوەک بەسەر خۆمانیدا بهێنێـت، بـۆیە ئـێمەش دەسـبەجێ بـۆ مـاوەی دوو سـەعات ماسکەکانمان لە سەر دەکرد."

فروتـان بەردەوامە لەسـەر قسـەکانی و دەڵێـت: "پاشـان دۆخەکە گۆڕا و هەندێک وردەهێرشـی تـر ئەنجام درا، بەڵام دەمانزانی چۆن بە خێرایی کاری لەگەڵدا بکەین و بەوپێیە لە ٢٧ی ئیسـفەنددا (١٧ی مـارت) پەرسـتارەکان داوایـان کـرد بـڕۆنە مـاڵەوە بە بـۆنەی سـەری سـاڵی نوێـوە (٣٠ ئیسـفەند یان ٢٠ی مارت). من چاوەڕوانی هێرش و پەلامـاری زیـاترم دەکرد، بۆیە ڕێگەم نەدان و ڕێک لە سەعات ١١ی بەیانیدا، لەناکـاو ڕوانیمـــان ژمـــارەیەکی هێجگـــار زۆر بریـنـــدار لە نـاوچەی جـافێری نزیکمـانەوە هێنـران و نیشـانەکانیان بە تەواوی نـامۆ بـوو: فرمێسـکڕشـتن، هەناسـە تونـدی و بە ئازارەوە، دەرکەوتنی خێرای نیشانەکانی تر. یەکەم جار وای بـۆ چـووین ئەمە نیشـانەی تـوخمی بـایۆلۆجییە. هەروەهـا بریندارەکان چاویان تەسک و بیلبیلەیان بچووک بووبووەوە و ئەوەشمان بۆ دەرکەوت کە ئاستی کارکردنی ئەنزیمییان دابەزیبوو.

هەر دوو ئەم فـاکتەرە شـتێکی تریـان دەگەیانـد، ئەویـش تـوخمی دەمـار بـوو، بەمپێـیە بەکارهێنـانی ئەتـرۆپین کە دەرمانێکی دژی دەمارەگازە. بەڵام ئێمە تەنها ئەمپووڵی یەک ملیگرامیمـان هەبـوو، کە زەحـمەت بـوو بەشـی ئەم حاڵەتـانە

بکـات! ئـێمە بە کەرەسـتەی تـایبەتی دۆزینـەوەی خۆمـان، نەمانــدەزانی ئەمە هیــی دەمارەگــازە. دواتــر لە ڕێــگەی تـیمەکەی نەتەوە یەکگرتووەکـانەوە زانیمـان کەوا تـابوونە. بەڵام ئەو حاڵەتانەی من بینیم زۆر سـەخت نەبوو، بۆیە وام بە بیردا هـات ئەگەر دەمارەگـاز ئەمە بێت، ئەوە کێشـەیەکی گەورە نییە!"

ئەوەی دکتــۆر فروتــان بینیــی، بریتــی بــوو لە یەکەم تۆمــارکردنی قوربانییــانی دەمارەگــاز لە مێــژوودا کە لە مەیــدانی جەنگــدا تۆمــار کرابێــت. تــابوون بە GAیــش دەناسـرێت (dimethyl phosphoramido _ ethyl NN cynidate) کە ژەهرێکــی شــلی بێتــامە و تــا ڕادەیەک بۆنوبەرامی میوەی هەیە و کاردانەوەی دەمار لە لەشدا پەک دەخات و ئەم ژەهرە هێندە بەهێزە کەوا تەنانەت بەرکەوتنی کورتخـایەنیش بۆ بڕێکی کەمـی ماددەکە "نیشـانەکانی خێرا دەردەکەوێت و یەکەم جار لە چاودا دەردەکەوێت (بەردەوام بیلبیلە بچووک دەبێتەوە) و سـنگ چەشـنی هەناسەسـواری توند دەبێت"، بەگوێرەی قسـەی شـارەزایان. ژەهـرەکە ئەگەر بە هەناسـە یان لە ڕێگەی پێسـتەوە هەڵمژرێت، زنجیرەیەک کاردانەوە بەرپا دەکات: "بڕێکی زۆر توندی و گرژی، لەوانە ئـاو لە لـووت هـاتن، عەرەقکـردن، میـز و پیسـایی بە خـۆدا کـردن، ڕشـانەوە، گرژبـوون، مووچڕکەپێـداهاتن، ئیفلیجـی و لەهۆشـخۆچوون"[١٦]. ماسکی گاز پارێزگـارییەکی بـاش دابین دەکـــات. ئەم گـــازە لە ســـاڵی ١٩٣٦دا لە لایەن زاناکـــانی ئەڵمـــانەوە پەرەی پـــێ درا و بە بـــڕی زۆر گەورە بەرهەم هێنـرا، ئەوەش لە ســەروەختی جەنگــی جیهـانیی دووەمــدا، بەڵام هەرگیز بە کـار نەهـات. تـابوون ئـاوێتەیەکی ئۆرگـانییە

که پێکهاته کیمیاییەکەی فۆسفۆری تێدایه و هاوشێوەی دەرمانی مێرووکوژە. بە هۆی دەرکەوتنی خێرای نیشانەکانیەوە و کاریگەرییان، بۆیە گەلێک لە قوربانییەکانی پێش ئەوەی فریای چارەسەر بکەون، دەمرن. هەر لەبەر ئەوەشە کەوا عەباس فروتان ئاگای لە ژمارەی ڕاستەقینەی کوژراوی ئەم گازە نییە، چونکە زۆربەی برینداره‌کان نەدەگەیشتنە نەخۆشخانە ژێرزەمینییەکەی ئەم بۆ وەرگرتنی ئەترۆپین.

لۆجیکی عێراق بۆ بەکارهێنانی تابوون ئەوە بوو کە ئەمەیان بە پێچەوانەی گازی خەردەلەوە زوو دەڕەوێتەوە و بوار بە سەربازەکان دەدات بە ئاسانی بچنە ناوچەیەکەوە تێیدا بە کار هاتبێت و تەنانەت ئەگەر بە خەستییش بەرکەوتبێت. بەوپێیە دەتوانرێت لە بەرەدا بە کار بهێنرێت. بە پێچەوانەوە، عێراقییەکان بە زۆری گازی خەردەلیان لە کاتی پێشڕەویی هێزەکانی ئێراندا بە کار دەهێنا و کاتێ خۆیشیان لە پاشەکشە یان لە پشت هێڵەکانی بەرەوە بوون، بەڵام بەکارهێنانی تابوون کێشەیەکی نوێی دروست کرد و ئەگەر لە نزیک هێڵەکانی بەرەوە بە کار بهاتایە، مەترسیی ئەوە هەبوو کەوا بای توند بیهێنایەتەوە دواوە بۆ سەر هێزەکانی عێراق خۆی. هەر واش بوو و بەپێی قسەی شایەتگەلێک ئەمە ڕووی دا (بڕوانە بەشی حەوتەم).

بەپێی قسەی دکتۆر فروتان، دووەم پەلامار بە دەمارەگاز، ئەو دواینیوەڕۆیە سەعات پێنج کرا، بەڵام دوو ڕۆژی دوای ئەوە هیچ شتێک ڕووی نەدا: "ئەگەر هەر شتێک ڕووی بدایە من دەمزانی، چونکە لە نەخۆشخانەی سێنترالی تایبەت بەو کارە بووین." وا ئێستا سەری ساڵی

نوێیه (بەپێی ڕۆژژمێری ئێرانی) و هەمدیس پەرستاران داوای مۆڵەتیان کرد بڕۆنە ماڵەوە، چونکە هەموو بەرکەوتوانی تابوون چاک بووبوونەوە. بەڵام ئەم جارەش دکتۆر مۆڵەتی نەدانێ و سەرلەنوێ عێراقییەکان پەلاماریان دایەوە و ئەم جارەیان دوورگەی مەجنوونیان کردە ئامانج. فرەی پێ نەچوو (٣٧٠) برینداری تابوونیان گواستەوە بۆ نەخۆشخانە یاریگاکەی ئەهواز، "ئیمێرجنسییەکی گەورە بوو، چونکە بە پێچەوانەی گازی خەردەلەوە، نیشانەکان خێرا دەردەکەوتن. ئێمە هەندێک حاڵەتی سەخت و مەترسیدارمان هەبوو، بەڵام ئەو ژمارەیە نەبوو کە چاوەڕێمان دەکرد. لە نەورۆزدا (ڕۆژی سەری ساڵی تازە) ئێمە دڵخۆش بووین، چونکە تەنها دوو حاڵەت لە یەکەی چاودێریی ورددا مانەوە و لەمانە یەکێکیان مرد و ئەوی تریان ما، بەڵام مێشکی زیانی پێ گەیشتبوو". وەلید ساڵح، کە عێراقییەکە و لە زانکۆ زمانی ئیسپانی دەڵێتەوە، دواتر (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٥دا) چیرۆکێکی دەگێڕایەوە کەوا جارێکیان براکەی بۆی باس کردبوو. براکەی پێش ئەوەی بە نەخۆشیی شێرپەنجە بمرێت، لە جەنگدا سەرباز بووە. عێراق، وەک ئەو برایە گێڕابوویەوە، لە زۆنگاوەکاندا بە خەستی گازی بە کار هێنا و سەربازە عێراقییەکانی وەک ئەم، دەبوو بە سەر تەرمی ئێرانییەکاندا بڕۆن، چونکە هیچ بۆشاییەک لە نێوانیاندا نەمابووەوە.

بەکارهێنانی سامناک و ڕوو لە زیادبوونی گاز لە لایەن عێراقەوە، هەر بە تێبینینەکراو نەمایەوە و لەبەر هۆیەک مەکینە و ئامرازی پرۆپاگەندەی ئێرانی لێ کەوتە کار، چونکە دیپلۆماتەکانی وڵاتەکە فەرمانیان درابوویە کە ئەم

ڕووداوە ترسناکانە بخەنە بەرچاوی جیهان. ئەوانیش هەر وایان کرد و سکالای توندیان بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بەرز کردەوە و داوای لێکۆڵینەوەی سەربەخۆیان لە مەیدانی جەنگدا کرد. بەلام هەر چەندە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، کە تا ئەو دەمەش زۆر تووڕە و نیگەران بوو لە مەسەلەی گرتنی باڵوێزخانەی ئەمەریکا و درێژەکێشانی قەیرانی گیراوە بارمتەکان، بە شێوەیەکی سەرەتایی کەمەئاوڕێکی لەم ئیدیعایانە دایەوە و گرووپێکی بچووکی پسپۆڕانی شەڕی کیمیایی، شارەزایانی پەرەسەندن و تەشەنەکردنی ئەو چەکە و لێکۆڵەرەوانی هەواڵگری هاتنە سەر ئەوەی کە قەناعەت بە ئیدیعاکانی ئێران. تاوتوێکردن و هەڵسەنگاندنیان دزەی کردە ناو قسەوباس و گفتوگۆی ناوخۆیی حکومەتەکان و نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە نێودەوڵەتییەکانی وەک کۆمیتەی نێودەوڵەتیی خاچی سوور، بە پاڵپشتیی گوناهبارکردنی نوێی بەرفراوانکردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە. ئەو کاتە مەسەلەکە تەنها پەیوەندیی بە کاتەوە هەبوو، بۆ ئەوەی جیهان بەئاگا بێتەوە.

"ئێمە هەرگیز بە گوڵ پێشوازی لە دوژمن ناکەین."
جەنەراڵی عێراقی هیشام ئەلفەخری
ڕۆژنامەی لا ستامپا *La Stampa*
٥ی مارتی ١٩٨٤

"دەبێت دەستدرێژیکاران ئەوە بزانن، کە بۆ هەر مێروویەکی زیانبەخش، مێرووکوژێکمان هەیە و بەتوانایە بۆ لەناوبردنیان، ئیتر ژمارەیان هەر چەند بێت و با بزانن عێراق ئەو مێرووکوژە قڕکەرەی هەیە."
لەریلی یەکەمی ڕوکن ماهیر عەبدولڕەشید
بۆ ئاژانسەکانی هەواڵ
٢١ی شوباتی ١٩٨٤

## پەردەلادان لە ڕووی بەڕێوەبەرێتیی ڕێگان

لە شوباتی ١٩٨٤دا، کاتێک کە هێرشی خەیبەر پاش وەستانێکی کاتی دەستی پێ کردەوە و وای لەقەڵەم دایەوە کە عێراق گاز بە کار دێنێتەوە، ڕۆژنامەنووسان کەوتنە کنەکردن لە دەنگوباسەکە و وایان دانا کە ئەم هەموو دووکەڵە زۆرە بێ ئاگر نابێت و لە خۆڕایی ئێران ئاوها زلی ناکات و نایدەمێنێت. لە وەڵامی پرسیاری پەیامنێراندا، ددانپێدانانێکی شەرمنانە لە لایەن عێراقەوە دەردەکەوت. لە سەرەتای مارتدا، کە پێشڕەویی ئێرانییەکان بۆ سەر شاڕێی

بەغدا ـ بەسرە بە چاکی تێک شکا، عێراقییەکان ڕێگەی پەیامنێرانیان دا لە بەرەی شەڕ و فەرماندەکانی نزیک ببنەوە. لە 5ی مارتدا ڕۆژنامەی لا ستامپای تورینی *La Stampa* چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ جەنەڕاڵ هیشام ئەلفەخریدا بڵاو کردەوە و ددانی بەوەدا نا کە دواجار هەندێک لە هێزەکانی ئێران گەیشتوونەتە سەر شارێکە و تەرمەکانیان بە درێژایی ڕێگەکە دەبینرا و لە بەر خۆر کەوتبوون. ئەو وای مەزەندە دەکرد کە ئێرانییەکان چوار تیپیان خستووەتە ئەم شەڕەوە و هەر یەکەیان

---

(*) مەبەست لەم ئیدیۆمە کۆنترۆڵکردنی بارودۆخە لە لایەن ئەمەریکاوە چەشنی ئەو ئامرازەی کۆنترۆڵی دەنگی ڕادیۆ یان تەلەڤیزیۆنی پێ دەکرێت، وەرگێڕ.

١٢ ـ ١٥ هەزار سەرباز دەبوون و "هەر هەموویانمان لە ناو برد" و ئەمەی بە خوێنساردییەکەوە دەربڕی و ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە ئێران تەنها مێرمنداڵ و پیاوی پیر دەنێرێتە مەیدانی جەنگ. ئەو بایەخێکی وای نەدا بە هێرشە هاوتەریبەکەی سەر دوورگەی مەجنوون و دەیگوت ناوچەکە "هیچ بایەخێکی نەبوو". لەم خاڵەدا ڕۆژنامەنووسێک بەم شێوەیە دواندی:

ـ پرسیار: "ڕاستە چەکی کیمیایی بە کار هاتووە؟"

ـ وەڵام: "ئێمە ئێستا بە تەنها جەنگێک بەڕێوە دەبەین بۆ بەرگریکردن لە خاک و وڵاتمان و هەرگیز بە گوڵ پێشوازی لە دوژمن ناکەین، وەک دەیەوێت. من دڵنیات دەکەمەوە کە ئەگەر پێویست بکات هەموو چەک و تفاقێک، کە هەمانبێت بە کاری دێنین".

ـ پرسیار: "تۆ قسه له داهاتوو دەکەیت، بەڵام ئاخۆ ئێستا بە کارتان هێناوە؟"

ــ وەڵام: "مـن حەز لەم چەکـانە نـاکەم و تەنهـا دەتـوانم جەخت لەسـەر ئەوە بکەم کە فەرمـانی بەکارهێنـانی هەمـان ئەو چەکانەم داوە کە لە جەنگەکانی ڕابردوودا لێرە بە کار هاتوون". (سەرنج: ڕۆژنامەنووسەکە پێوەی دیار بوو درکی بەوە کردبێت کە ئەمە ئاماژەیە بۆ جەنگی جیهانیی یەکەم).

ـ پرسیار: "با بڵێین کە تۆ هێشتا فەرمانی بەکارهێنانیت نەداوە. بەڵام ئایـا هەمـان شـت بە سـەر فەرمانـدەکانی شوێنەکانی تری بەرەی شەڕدا جێبەجێ دەکرێت؟"

ــ وەڵام: "پێویسـتە مـن وەڵامێکـی سیاسـییانەت بـدەمەوە، چـونکە ئەمە دەگەڕێتەوە بـۆ حکـومەت بـۆ بڕیـاردان لەسـەر ئەوەی چەکـی کیمیـایی هەیە یـان نـا، بەڵام مـن دەمەوێ تـۆ تاوێـک بیـری لـێ بکەیتەوە، گریمـان وا دەرفەتێکـی تـاکتیکیی لەبـارە بـۆ چەکـی لەو چەشـنە، ئـاخۆ بـاوەڕ نـاکەی کە ئەم جەنگی زۆنگاوانە، دەرفەتێکی ئایدیاڵ بێت؟"[1]

ئەمە شێوازی بە ئاشکرا قسـەکردنی جەنەراڵ بـوو کە بە سـانایی گوزارشـتی لە بەیـانێکی پێشـتری سـەرکردایەتیی بـاڵای عێـراق دەکـرد، کە لە ٢١ی شـوباتدا هۆشـداریی دا بە ئێـران کەوا "دەسـدرێژیکاران دەبـا ئەوە بـزانن کە بـۆ هەر مێروویەکـی زیـانبەخش مێرووکوژێـک هەیە کە توانـای لەناوبردنیـانی هەیە، ژمارەیـان هەر چەنـد بێـت و عێـراقیش ئەم مێرووکـوژە لەنـاوبەرەی هەیە". ڕۆژانـی دواتـر کە ڕاپۆرتەکـان لەسـەر چەکـی کیمیـایی چەنـدبارە بـوونەوە، میدیاکان سەرسەختانە کەوتنە ڕاوەدوونانی چیرۆکەکە.

له ٣ی مارتدا، دۆن ئۆبەردۆرفەر لە ستافی نووسەرانی ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست، چیرۆکەکەی لە لاپەڕە یەکدا بڵاو کردەوە لەگەڵ دوا پەرەسەندەکانی بەرەی شەڕ، "گەورەترین هێرش لە ماوەی ٤١ مانگی جەنگدا". "لەناکاو پەلامارادانی" ئێرانی و هەڕەشەی عێراق، بە زیادکردنی هێرشی ئاسمانی، دەنووسێ "ئەمە ئاستێکی مەترسیی بۆ بۆرییە نەوتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕۆژئاوا دروست کردووە". بە سەرنجدانی داواکاریی لێکۆڵینەوەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکان (کە لە ٢٨ی ئۆکتۆبەرەوە حەوت جاری داوا کردووە)، ئەم کاربەدەستێکی ناونەبراوی وەزارەتی دەرەوە وەک نموونە دەهێنێتەوە کە "بڕوایەکی تایبەتی" داوەتە ئیدیعای ئێرانییەکان کەوا عێراق چەکی کیمیایی بە کار هێناوە. بەڵام، وەک ئۆبەردۆرفەر جەختی لەسەر دەکاتەوە کەوا "ئیدارەی ڕیگان، کە لەژێر فشارێکی قورسی عێراقدایە و بە هۆی پاڵپشتیی سیاسیی شەڕی لە دژی ئێران، شتێکی کەمی لە بارەی خەتابارکردنی گازی ژەهراوی گوتووە. سێشەممەی رابردوو (٢٨ی شوبات) لە پرسیارێکدا سەبارەت بەم ئیدیعایانە کە ئاراستەی ئالان ڕۆمبێرگی گوتەبێژی فەرمیی وەزارەتی دەرەوە کرا، گوتی کەوا ئەگەر خەتابارییەکە ڕاست بێت (ئەوە ئێمە بە کێشەی دەزانین) و کاتێک کە پرسیاری وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەی لێ کرا، گوتی (ئێمە زۆر بە داخەوەین و بەرهەڵستیی بەکارهێنانی ئەو جۆرە چەکە دەکەین)"[٢].

کاردانەوەی ساردوسڕی وەزارەتی دەرەوە، ئەم پرسیارە دێنێتە پێشەوە: ئاخۆ کاربەدەستە فەرمییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان چییان لە بارەی بەکارهێنانی گازەوە

دەزانـــی لە لایەن عێـراقەوە و کەی ئەمەیـان زانیـوە؟ لە چاوپێکەوتنێکـدا نـزیکەی شـازدە سـاڵ دوای ئەو ڕاسـتییە، فرانسـیس ڕیکیـاردۆنی بەرپرسـی کاروبـاری عێـراق لە وەزارەتـی دەرەوە لەو کـاتەدا، (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٠دا)[٣] دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێک پێش ئەوەی چیرۆکەکەی بـڵاو بکـرێتەوە تەلەفـۆنێکی لە لایەن ئـۆبەردۆرفەرەوە بـۆ کراوە. لەم خاڵەدا گوتی کەوا خـۆی و هاوکـارانی زانیـاریی هەواڵگرییـان بینیـوە لەسـەر هێرشـە کیمیاییەکـانی عێـراق و گواسـتنەوەی کەلـوپەلی کیمیـایی لە کۆمپانیاکـانی ئەڵمانیـای ڕۆژئـاواوە تـا پـێش کریسمەسـی ١٩٨٣، بەڵام بـۆ پاراسـتنی شوێن و ڕێگە تایبەتەکانی کارەکە ئەم زانیارییانەیان ئاشکرا نەکردووە:

"ئێمە تـازە بەلای عێراقدا داماندەشکاند و نەماندەویسـت ئێـــران جەنـــگەکە ببـــاتەوە، بەڵام لە هەمـــان کاتیشـــدا نەماندەویست چەکی کۆمەڵکوژ زیـاد بکـات و پەرە بسـێنێت. ئـێمە داوامـان لە عێراقییەکـان دەکـرد خـۆ لە تیرۆریسـتان ڕزگـار بـکەن و بـاری مـافی مـرۆڤ چـاک بـکەن. ئـێمە دەمانویست چەکە کیمیاییەکان بخـرێنە ئەم بـازنەیەوە، بەڵام بەهانەیەکی دەویست. ئێمە دەمـانزانی عێراقییەکـان ئەمەیـان پـێ خـۆش نیـیە. مـن بە نـزار حەمـدونی سـەرۆکی بەشـی چـاودێریی بەرژەوەنـدییەکانی عێـراقم گـوت (لە واشـنتۆن)، ئەگەر ئەم تۆمەتبـارکردنە ڕاسـت بێـت، ئەوا دەبێتە کێشـە و دەبێت بڵاو بکرێتەوە.

دواجار ئێمە لە شـوباتدا بەهانەیەکمـان دۆزییەوە، کاتێـک سـەدام حسـێن لە وتـاردانێکی مووچڕکەبەخشـدا گـوتی کەوا بـۆ هەر مێـروویەک مێرووکوژێکمـان هەیە. ئـێمە خێـرا

ئەمەمـان گەیانـدە حەمـدون و بە ئاشـکرا پێمـان گـوت ئەمە پەسـەند نیـیە ـ کە دەبـوو ویـلایەتە یەکگرتووەکـان عێـراق گوناهبـار بکـات لەسـەر بەکارهێنـانی گـازی ژەهـراوی. دوو هەفـتە دواتـر حەمـدون گەڕایەوە بـۆ لامـان و گـوتی ئەو مەسـەلەیە وا نیـیە، پاشـان ئۆبەردۆرفەر تەلەفۆنەکەی کـرد. ئەو چیرۆکەکەی لەسـەر ڕاپۆرتی هەواڵگریی بونیـاد نـابوو. بەڵام بە هۆی وتاردانەکەی سەدامەوە بوو کە ئێمە توانیمـان بـڵاوی بکەیـنەوە و بەم جـۆرە دەسـبەجێ و بە ئاشـکرا عێراقمان گوناهبار کرد. هەروەهـا ئیدانەکردنی خۆشمان بۆ ئێـران دووپـات کـردەوە، لەبەر ئەوەی بە ئاگربەسـت قایـل نابێـت. ئەمە ڕاگەیانـدنێکی تەواو زیرەکـانە بـوو بـۆ هاوسەنگڕاگرتنی دۆخەکە".

بەم جـۆرە، لە پێنجـی مارتـدا و لە یەکەم ددانپێـدانانی ئاشـکرادا کەوا عێـراق پەنـای بـردووەتە بەر گـاز، وەزارەتـی دەرەوە ئەوە ڕوون دەکـاتەوە کە: "ویـلایەتە یەکگرتووەکـان گەیشـتووەتە ئەو ئەنجـامەی کەوا بەڵگەی بەردەست ئامـاژە بەوە دەکەن کە عێـراق چەکـی کیمیـایی کوشـندەی بە کـار هێنـاوە."[٤] مەسـەلەکە لەوەدا نەمـابوو پەردەپـۆش بکرێـت و دەرەنجـامی خراپیشـی ئیـدارەی ڕێـگە تووشـی جـۆرە پەشۆکانێک کردبوو، کە بێ گوێدانە ئەوەی هەڵەی کـردووە، کەوتە داشـکاندن بە لای عێراقـدا. لە ناوەڕاسـتی مارتـدا گۆڤـاری تـایم سـەردێڕی هەواڵـی خـۆی بەم جۆرە داڕشـت "بەڵـگەی یەکـلاکەرەوە بە دەسـتەوە نیـیە" بـۆ بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی عێراق و قسـەی کاربەدەسـتێکی پایەبەرزی ئەمەریکای بە بەڵگە هێناوەتەوە کە گوتوویەتی "ئێمە بەڵگەی تەواومـان لایە". نووسـینەکە بەردەوام دەبێـت و دەڵێـت: "لە

کانوونی دووەمدا، ئیدارەی ڕیگان دڵنیا بوو لەوەی کە عێراق گازی خەردەلی بە کار هێناوە، بەڵام نەیدەزانی لەو بارەیەوە چی بکات". گۆڤارەکە وای لەقەڵەم دا کەوا بەرپرسانی ویلایەتە یەکگرتووەکان حەزیان بە بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتە نەدەکرد، "چونکە ترسی ئەوەیان هەبوو کە ئەو کاریگەرییە سنووردارەی ئەمەریکا لە عێراقدا هەیبوو، کەم بکاتەوە"(٥).

لێشاوی ڕاپۆرتدان لەسەر عێراق، مشتومڕێکی توندی ورووژاند لەسەر سیاسەتی ناوخۆ و لەسەر ئەوەی ئاخۆ گێڕانەوەی پەیوەندیی دیبلۆماسی لەگەڵ عێراقدا شیاوە لە ئێستادا. بێجگە لەوە، ئەو ساڵە ساڵی هەڵبژاردن بوو و تەنانەت ڕیگان بەهێز دەهاتە بەرچاو، بۆیە کارێکی ناژیرانە بوو بواری ئاشکرابوونی ئەگەری ئەوە بدرێت، کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستێکی بووبێت لە گازبارانکردنی هێزەکانی ئێراندا لە لایەن عێراقەوە و ڕێگە بدرێت کارەکە لە دەست دەرچێت و ببێتە مایەی ڕقئەستووریی مەلاکان.

## ئالۆزییەکی پەرەسەندوو

پشتگیریی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ عێراق لە ساڵانی هەشتاکاندا هەرگیز دڵسۆزانە نەبوو. کاربەدەستانی حکومەت لووتەلایی خۆیان لەمە دەگەیاند، هەرچەندە واشنتۆن هاوپەیمانییەکی دروست کردبوو کە لە ڕووی تاکتیکەوە بە پەسەندی دەزانی. بە شێوەیەکی فەرمی، واشنتۆن بە بێلایەن مایەوە و ئارەزووی ئەوەی دەردەبڕی کە هیچ لایەکیان نەیبەنەوە، بەڵکو هەر دوو لا یەکتر شەکەت و لاواز بکەن و هیچ لایەکیان توانای هەڕەشەکردنیان نەبێت لە بەرژەوەندییە ستراتیجیەکانی ئەمەریکا و ئیسرائیل و نرخی نەوت لە ئاستێکی گونجاودا بهێڵنەوە. ئەوەی بە شێوەیەکی ئاشکرا بەلای ڕیگانەوە خۆش نەبوو، سەرکەوتنێکی ئێران بوو و بەوپێیە هەر داشکاندنێک بەلای عێراقدا، بە تەواوی لە خزمەتی بەرەنگاربوونەوەی ئێراندا بوو لە شەڕدا.

دوژمنایەتیی بەهێزی واشنتۆن بۆ ئێران لە ڕووخانی شاوە سەرچاوە دەگرێت کە پاسەوانێکی باوەڕپێکراوی بوو لە کەنداودا و بێجگە لەوەش ئەو گرتنە پڕ لە سووکایەتیپێکردنەی باڵوێزخانەی ئەمەریکا. هەروەها قەیرانی بارمتەکان (تشرینی دووەمی ١٩٧٩ ــ کانوونی دووەمی ١٩٨١) کارێکی وای کردبوو کە هیچ بیرێک لە

نزیکبوونەوە و گێڕانەوەی پەیوەندی نەکاتەوە، تەنانەت ئەگەر چەند کاربەدەستێکی ئیدارەش بیریان لەوە کردبێتەوە پشتی کەسانی پراگماتیکی دەوری سەرۆکی پەرلەمان عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانی بگرن دژ بە ڕادیکالیزمی خومەینی.

عێراق ساڵی ١٩٦٧ پەیوەندیی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا پچڕی، لەبەر ئەوەی پشتیوانی ئیسرائیل بوون لە جەنگی حوزەیراندا. ئەوجا عێراق ڕێککەوتننامەیەکی دۆستایەتی و هاوکاریی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیێتدا ئیمزا کردبوو لە ساڵی ١٩٧٢دا و لە هەمان کاتیشدا پەیوەندیی خۆی لەگەڵ فەرەنسا پەرە پێ دەدا. عێراق بەشی چاودێریی بەرژەوەندییەکانی لە واشنتۆن هێشتەوە و بە هەمان شێوەش ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٧٢دا بڕیاری کردنەوەی بەشێکی خۆی دا بۆ چاودێریی بەرژەوەندییەکانی لە بەغدا. ڕووخانی شا و جەنگی ئێران - عێراق پاڵی بە گفتوگۆی نێوانیانەوە نا بەرەو گێڕانەوەی پەیوەندییەکان. کێ دەستپێشخەر بوو لە دانوستاندا؟ هەر بە جێی مشتومڕ ماوەتەوە. عێراق ئیدیعای ئەوە دەکات کە ویلایەتە یەکگرتووکان هەوڵی نزیکبوونەوەی داوە، کەچی ئەمەریکاش دەڵێ عێراق ئەو هەوڵەی داوە. بەڵگەنامە و ڕاگەیاندنە ڕێکنەخراوەکانی ئەکتەرە سەرەکییەکان وا دەگەیەنن کە پەیدابوونی ئەم هەستە لە هەر دوو لاوە بووە و هەر لایەکیان ئامادەییەکیان دەربڕیبێت، لاکەی تر بەدەمیەوە هاتووە.

دەسدرێژیی عێراق، کۆمەڵێک ئەگەر و نەگەری هێنایە پێشەوە بۆ گۆڕانکاریی سیاسی لە ناوچەیەکی ناجێگیردا.

ئامانج و پلانەکانی سۆڤیێت لە کەنداودا هەر بە زیندوویی مابوونەوە و داگیرکردنی بۆ ئەفغانستان وەک بیرخەرەوەیەک وا بوو کەوا هەڕەشەی یەکێتیی سۆڤیێت بەردەوامە بۆ بەرژەوەندییەکانی ڕۆژئاوا. ئێستا نە ئێرانی شۆڕشگێڕ و نە عێراقی نەتەوەپەرست کەسیان لەبار نین وەک بریکارێکی زلهێز هەڵسوکەوت بکەن. ئێران تووشی دابڕانێکی توند بووبوو. تەنانەت بەوەش قایل نەدەبوو کە لە بارەی جەنگەوە لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان گفتوگۆ بکات و بە دەزگایەکی دوژمنی دادەنا و پشتگیریی خۆی بۆ گەریلاکانی لوبنان ڕاگەیاند کە بۆردمانی هەر دوو باڵوێزخانەی ئەمەریکی و فەڕەنسییان کرد لە بەیرووت ساڵی ١٩٨٣ و بەبارمتەگرتنی ڕۆژئاواییەکان، شتێکی ئەوتۆی لە هەڵوێستی ئێران چاک نەکرد. هەروەها عێراق لە بندەستی سەدام حسێندا (کە بە فەرمی ساڵی ١٩٧٩ دەسەڵاتی خۆی سەپاند) ویستی سواری شەپۆلی ناسیۆنالیزمی عەرەبی بێت و ڕێککەوتننامەی کامپ دیڤید و پەیماننامەی ئاشتیی میسڕی لەگەڵ ئیسرائیل ڕەت کردەوە و خۆی وەک بەربەستێک دانا بۆ شیعەی ڕادیکاڵی ئێران ــ بۆ ئەوەی ببێتە یەکەم هێزی عەرەب. ئەمەریکا پێویستی بەوە بوو هەر دوو زلهێزەکە بەرژەوەندییەکانی بپارێزن، بەڵام حەزی نەدەکرد ببێتە داشی دامەی گەمەی هێزی جیۆستراتیجییان و یارییەکی وردی شەترەنجی بە دوادا هات.

یەکەم بەڵگەی توانەوەی بەستەڵەک سەردانی بەغدا بوو لە لایەن مۆریس دراپەری جێگری یاریدەدەری وەزیری دەرەوە لە نیسانی ١٩٨١دا، بۆ ئەوەی پەرەسەندنی دید و

بۆچوونی ویلایەتە یەکگرتووەکان بگەیەنێتە سەرکردایەتیی عێراق. لە کۆشکی سپیدا ڕۆناڵد ڕیگان تازە جێی جیمی کارتەری گرتبووەوە و بەڕێوەبەرێتیی نوێ لە سەرەتای ڕەنگرێژکردنی سیاسەتی خۆیدا بوو، بە تایبەتی لەو بوارەدا کە بە شکستی ناخۆشی سیاسەتی کارتەری دادەنا لە ئێران و نیکاراگوا و شوێنانی تردا. سەرەتا ئیدارەی ڕیگان هەڵوێستێکی بێلایەنانەی وەرگرت لە جەنگی ئێران ـ عێراق و هێشتا هەر نیگەرانی ئاسەواری شۆڕشی ئیسلامی بوو، لە هەمان کاتیشدا دڵگرمی بوو لە عێراق سەبارەت بە هاوپەیمانیی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیێت و بەرهەڵستیکردنی بۆ ڕێکەوتننامەی کامپ دیڤید. لە بروسکەیەکدا بۆ واشنتۆن و ماوەیەک لە پێش گەیشتنی دراپەردا، ولیەم ئیگڵتنی سەرۆکی بەشی چاودێریی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە بەغدا، سەرنجی ئەوەی داوە کە "شتی گرنگ لە سەردانەکەی دراپەردا ئەوەیە کە دۆخەکە لەبارە دوای ئەو بڕیارەمان بە نەفرۆشتنی چەک بە ئێران و زیادبوونی بازرگانی و پەیوەندیی عێراق لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئاڵوگۆڕی کارمەندانی دیپلۆماسی و بەم دواییەش چوونەپێشەوەی مەسەلەی پێدانی پێنج فڕۆکەی بۆینگ بە عێراق". هەر چەندە تا ئێستا ژمارەیەک بواری جیددیی ناوچەکە ماوە کە لەسەریان کۆک نین، بەڵام لە هەر کاتێک زیاتر بەرژەوەندیمان لەگەڵ عێراق لە نزیکبوونەوەدایە لە شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ەوە"[٦].

لە ناردنی دراپەردا بۆ بەغدا، ئەلێکساندەر هێگی وەزیری دەرەوە، سەعدون حەممادیی وەزیری دەرەوەی عێراقی ئاگادار کردەوە کە واشنتۆن دەخوازێت ئاڵوگۆڕی

بیروبۆچـــوون لەگەڵ عێراقـــدا بکـــات لە بەر رۆشـــنایی "بەرنـامەی گەشـەکردنی زیـادی ئـابووریی عێـراق و توانـای کـــاریگەریی لەســـــەر لایەنـــدارییە ســــەرەکییەکان لە ناوچەکەدا"[٧]. عێراقییەکانیش لە بەرانبەردا هەمـان نەرمییـان نوانـــد. حەممـــادی، لە کۆبوونەوەکەیـــدا لەگەڵ دراپەر بە ناخۆشـحاڵییەوە مەسـەلەی لێکتـردوورکەوتنەوەی عێـراق و یەکێتیـــی ســـۆڤێتی دەربـــڕی و داوای لە کۆمپانیاکـــانی ئەمەریکا کرد بێنە کێبڕکێی کۆنتراکتەوە.

هەر دوو لا بە ئاشکرا جیاوازیی بیروڕایـان سـەبارەت بە مەسەلەی کامپ دێڤید دەربڕی، بەڵام هانی عێراق درا کە بە ئەقڵێکی کـراوەوە بڕوانێتە مەسـەلەکە و ئەمـیش سـەری بـۆ لەقانـدن. سـەبارەت بە جەنگـی ئێـران ـــ عێـراق، دراپەر دووپاتی کردەوە کە سیاسـەتی واشـنتۆن ئەوەیە کەوا چەک و تفـاقی کوشـندە بە هـیچ لایەک نەفرۆشـێت و لە هەمـان کاتیشـدا هەوڵـی بەپەلەی کۆتـایی شـەڕ و نـاکۆکی بـدرێت. لە گەلاڵەکردنی پەیوەندییەکاندا، ئیگڵتن دەنووسـێت کەوا عێـراق "تـا ئێسـتا خـۆی ئامـادە نەکـردووە بـۆ دەسـتپێکردنەوەی پەیوەندیی تەواوی دیبلۆماسی، بەڵکو کار بۆ دیـالۆگێکی پتـر سیستماتیک و بنەڕەتی دەکات لە ئاستە باڵاکاندا". بە گشـتی ئەو، کەشـــوهەواکە بە "بـــاش" و "ڕاســـتگۆیانە" وەســـف دەکات[٨].

لەگەڵ ئەوەشـدا کە ئیسـرائیل لە حـوزەیرانی ١٩٨١دا لە کـوورەی ئەتـۆمیی ئۆسـیراکی عێراقـی دا، بەڵام تـوانەوەی بەستەڵەکی پەیوەندیی عێراق و ئەمەریکا هەر بەردەوام بوو. لە شوباتی ١٩٨٢دا، بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان عێراقی دەرکرد لە لیستی ئەو وڵاتانەی بە پشتیوانیی "تیرۆریزمـی نێودەوڵەتی"

لەقەڵەمی دەدان. بەوەش قەدەغەی هەڵگرت لەسەر قەرزی بەنکیی حکومەتی ئەمەریکی و بە هەمان شێوەش فرۆشتن و هەناردەی چەک و تەکنۆلۆجیا. لە ماوەیَ مانگێکدا، وەک باس دەکرێت واشنتۆن پشتگیریی ڕاستەوخۆی کۆششی جەنگیی بۆ عێراق دابین کرد کە پێشتر بە کەمی لای لێ دەکرایەوە. فەریق ڕوکن وەفیق سامەڕایی، بەڕێوەبەری بەشی ئێران لە بەڕێوەبەرێتیی هەواڵگریی سەربازیی عێراقدا، ساڵی ١٩٨٢، ئیدیعای ئەوە دەکات کە لە کۆتایی مانگی مارتدا و لە کاتێکدا کە عێراق "بە سەختترین سەردەمیدا تێدەپەڕی، "ئەمەریکا لە ڕێگەی وڵاتە عەرەبییەکانەوە کەوتە ناردنی زانیاریی موخابەراتی. سامەڕایی ئەولاتر دەڕوات و دەنووسێت، ئەو مانگە "من بانگهێشت کرام بۆ ماڵێکی قەشەنگ و ڕازاوەی سەر ڕۆخی دیجلە لە بەغدا، بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ سێ بەرپرسی (سی ئای ئەی)ی ئەمەریکیدا و پێیان ڕاگەیاندم کە هاتوون بۆ ئەوەی زانیاریی هەواڵگریمان بدەنێ لە بارەی ئێرانەوە و نەخشەی ورد و پلانی کەرت و ناوچەکانی ئێرانیان لەگەڵ خۆ هێنابوو، لەگەڵ وێنەی سەتەلایتیدا. لەو دەمەدا ئێمە زۆر پێویستمان بە زانیاریی لەو جۆرە هەبوو"[٩].

لە ڕوانگەی عێراقەوە، پشتگیریی ئەمەریکا زۆر کەم بوو و لە کاتێکی زۆر درەنگدا هات. بە هاتنی بەهاری ١٩٨٢ ئێران هاوسەنگیی خۆی وەرگرتەوە بۆ دووبارە گێڕانەوەی شارە داگیرکراوەکان و دەسدرێژیکارانی دەرپەڕاند و ئەمە وای لە کۆشکی سپی کرد کە بارودۆخ لە کەنداودا بە "هەڕەشەی ئێران" لێک بداتەوە. لاربوونەوەی بەختی عێراق لە جەنگدا، پشتگیریی زیاتری بۆ دەست خست لە لایەن هەر

دوو ک ڕۆژئاوا و یەکێتیی سۆڤییەتەوە. بەو هۆیەوە چەک و تەقەمەنیی بەسەردا ڕژا و عێراق زانیی کە چوار لە پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی ئەنجوومەنی ئاسایش پشتی دەگرن، لەوانە هەر دوو ئەمەریکا و یەکێتیی سۆڤییێت (بە پێچەوانەی سەردەمی جەنگی ساردەوە)، لەگەڵ چیندا کە بێلایەن مابووەوە. واشنتۆن بەو نیازە کاری دەکرد کە ئێران بداتە ناو، لەولاشەوە بە پرۆسەیەکی "بەشداری لە بونیادنانەوەدا" سەرکردایەتیی نەرمبووی عێراق بێنێتە ژێربار کە دەمێک نەبوو کۆسپی دەخستە ڕێگەی ویلایەتە یەککگرتووەکان، لە چارەسەری ناکۆکیی ئیسرائیل ــ فەلەستیندا و تەنانەت هەوڵی ئەوەش بدات بیکاتە هاوبەشێکی پرۆسەی ئاشتی. هەروەها بە تەمای زیادبوونی دەرفەتی بیزنێسیش بوون.

جێیمس پلاک، کەوا کاربەدەستێکی بالای وەزارەتی دەرەوە بووە لە سالانی ١٩٨٢ ــــ ١٩٨٥دا، (لە چاوپێکەوتنێکی سالّی ٢٠٠٠دا) دەگێڕێتەوە کە چۆن عێراقییەکان خۆیان لە بەڕێوەبەرێتیی ڕێگان نزیک کردووەتەوە، پاش ئەوەی سەدام حسێن لە وتاردانێکدا ڕایگەیاندووە کەوا عێراق پێدەچێت هەڵوێستی لە مەسەلەی ئاشتیی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بگۆڕێت و هەر کە جەنگ لەگەڵ ئێراندا کۆتایی هات، ڕیفۆرمێکی دیموکراتی دەست پێ دەکرێت: "ئەو هەرا و بەزمێکی نابووەوە و دەیزانی هەرایەکی وای بەرپا کردووە کە خۆی پێی خۆشە گوێی لێ بێت".

جۆرج شوولز کە لە سالّی ١٩٨٢دا جێی هێگی گرتەوە وەک وەزیری دەرەوە، لە ژیاننامەکەیدا سەرەتای

مامەڵەکردنی خۆی لەگەڵ جەنگی ئێران ـ عێراقدا بەم جۆرە دەگێڕێتەوە:

"ئەو کاتەی کە من دەستبەکار بووم، ئێرانییەکان هێزەکانی عێراقیان پاشەوپاش گێڕابووەوە ناو خاکی خۆیان و جەنگەکە پەرەی سەند و بوو بە کێشە و ململانێیەکی هێجگار سەخت و بەرفراوان، کە تێیدا ڕژێمی ئیسلامیی ئوسووڵیی شیعەی غەیرەعەرەبی ئایەتوڵڵا خومەینی بە توندی کەوتە کوتانی عێراق و بەوپێیە بوو بە مایەی هەڕەشە لە سامان و نەریتی ئایینی و تەنانەت پێگەی دەوڵەتە عەرەبییەکانی کەنداو. ئەمە وای کرد ئێمە حەز بە چاوەڕوانی و چاودێریی ئەم جووتە وڵاتە دیکتاتۆر و هەڕەشەکارە بکەین کە تا سەرئێسقان یەکتر بکوتن و یەکتر شەکەت بکەن. بەڵام هەڵوێستێکی لەو چەشنەی ویلایەتە یەکگرتووەکان نامرۆڤانە و نائاقڵانە بوو، کەواتە دەبوو سیاسەتی ئەمەریکا هەوڵدان بێت بۆ وەستانی جەنگ. من وام هەست دەکرد تاقە تاکتیکمان دەبێت کارکردن بێت بۆ وشککردنی سەرچاوەکانی چەک کەوا لە هەر دوو ئێران و عێراق بکات دەست هەڵبگرن لە کوشتار و وێرانکاری لەو جەنگەدا، کە وا دەهاتە بەرچاو بێکۆتایی بێت"[١٠].

بە شێوەیەکی فەرمی، مامەڵەکردن و تێوخننەکەوتنی ئەمەریکا لە جەنگی ئێران ــ عێراق لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٣دا بە نەگۆڕی مایەوە، لەو ڕۆژەوە کە هێزەکانی عێراق چوونە ناو خاکی عێراقەوە، بەپێی ئامۆژگارییەکی ڕۆژنامەوانیی وەزارەتی دەرەوە لە مانگی شوباتدا:

((• ویلایەتە یەکگرتووەکان پشتگیریی سەربەخۆیی و یەکێتیی خاکی هەر دوو ئێران و عێراق دەکات و بە هەمان شێوەش دەوڵەتانی تری ناوچەکە.

• لە سەر بنەمای ئەو سیاسەتەی لە سەرانسەری دنیادا هەمانە، بەرەنگاری هێز داگیرکردنی هەموو خاکێک دەبینەوە.

• ئێمە وای دەبینین کە بەردەوامیی جەنگ، وەک هەمیشە دووپاتی دەکەینەوە، مەترسییە لەسەر ئاشتی و ئاسایشی تەواوی وڵاتانی ناوچەی کەنداو، بەوپێیە ئێمە بە پێداگرییەوە پشتی ئاگربەستێکی بەپەلە و دانوستانی چارەسەر دەگرین.

• ئێمە پێشوازی لە کۆششی بونیادنەرانەی نێودەوڵەتی دەکەین بۆ کۆتاییهێنان بە جەنگ لەسەر بنەمای ڕێزگرتنی هەر دەوڵەتێک لە یەکێتیی خاک و ئاوی دراوسێکەی و پارێزگاریی ئازادیی وڵاتەکە لە هەر دەستتێوەردانێکی دەرەکی.

• ئێمە سیاسەتی چەسپاوی خۆمان پاراستووە بە ڕازینەبوون بە فرۆشتن یان گواستنەوەی کەلوپەلی سەربازی لە ئەمەریکا و ئەو شوێنەی دەسەڵاتی بەسەردا دەشکێت و نەهێڵین بدرێتە هەر دوو لای شەڕکەر[١١].))

سیاسەتی شوولَز ئەو ڕاستییەی شاردەوە کەوا سوپای ئێران، کە لە سەردەمی حوکمی شادا لە لایەن ئەمەریکاوە بونیاد نرا، هەر بەردەوام بوو لەسەر پشتبەستن بە چەک و تفاقی یەدەگی ئەمەریکا، بە پێچەوانەوە عێراق چەکی ئەمەریکای نەبوو و بەو جۆرە پشتی بە ئەمەریکا نەدەبەست و سەرەڕای ئەوەش ئامادە بوو چەک لە سەرچاوەکانی تر پەیدا بکات.

ئەگەر ئەمە بێلایەنییەکی درۆیینە بوو، وا ئێستا بەڵگەی لایەنگرییەکی ڕاستەقینە دەرکەوتووە، وەک شوولز ئەنجامگیرییەکی بۆ دەکات: "لە کاتێکدا کە ویلایەتە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی بنچینەیی سیاسەتی چەکنەدانی بە هەر دوو لا گرتبووە بەر، پشتگیریی ئێمە بۆ عێراق زیادی کرد لە بەرانبەر سەرکەوتنە سەربازییەکانی ئێراندا، واتە ڕێک و ڕەوان بە سانایی ویلایەتە یەکگرتووەکان چووە ناو شێوازێکی سنوورداری سیاسەتی هاوسەنگیی هێزەوە و هەر وا بە ئاسانی لێنەگەڕا لە دوورەوە تەماشای شۆڕشی خومەینی بکات، پێشڕەوی بکات و عێراق ڕابماڵێت و لەم بارودۆخەدا داتاشین بەلای عێراقدا، گەرەنتیی دا بە عێراق کە ڕێگەی ئەوە لە ئێران بگرێت دەسەلاتی بەسەر وڵاتانی کەنداوی فارسدا بشکێت"[١٢].

ئەم هەڵوێستە "ئۆپەراسیۆنی وەستاندن" لێوەی پەیدا بوو، کە دەسپێشخەرییەکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو بۆ قەناعەتکردن بە هاوپەیمان و دەوڵەتە دۆستەکانی تری کەوا چەک ڕەوانەی ئێران نەکەن. جەیمس پلاک، کە ئیدیعای ئەوە دەکات گوایە ئەو ئەم ناوەی لە ئۆپەراسیۆنەکە ناوە، دەگێڕێتەوە: "ئێمە بڕیارمان دا کە ویلایەتە یەکگرتووەکان هاوتەریبە لە بەرژەوەندیدا ـ نەک هاوشێوە ـ کاتێک کە ڕێ لە ئێران دەگرێت عێراق بۆڕ بدات. عێراق وا لەقەڵەم دەدرا کە هێڵی یەکەمە لە سەنگەری بەرگریدا دژ بە شۆڕشی ئیسلامی. بەم ڕەنگە ئێمە نەمانهێشت عێراقییەکان چەک لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بکڕن، هەر چەندە ئەوان هەوڵی ئەوەیان دەدا، بەڵام ئێمە بە وڵاتانی ئەنجوومەنی هاریکاریی کەنداومان گوت کە پشتگیری لە یارمەتیی ئەوان دەکەین بۆ

عێراق. هەروەها قەدەغەکردنی چەکیشمان بەسەر ئێراندا سەپاندبوو". دواتر فرانسیس ڕیکیاردۆنی هاوکاری پلاکی وەزارەتی دەرەوە (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۰دا) دەگێڕێتەوە: "هەڵوێستی ئێمە ئەوە بوو کە چەک و تفاقی جەنگ بە هیچ لایەکیان نەفرۆشین، بە تایبەتی ئێران، چونکە بانگەشەی ئاگربەستی ڕەت کردەوە. ئێمە گلەییمان لە فەڕەنسا دەکرد لەبەر ئەوەی مووشەکی ئێکزۆسێتی بە عێراق دەفرۆشت و عێراقیش دژ بە تانکەرە نەوتەکانی کەنداو بە کاری دەهێنا و ئێمەش زۆر شێتگیری ئەو مەسەلەیە نەبووین".

بێجگە لە زانیاریی هەواڵگری، ئەمەریکا کەوتە پێدانی یارمەتیی ئابووریی سەرەکی بۆ عێراق. ئەمە بە شێوەیەکی سەرەکی دووسەد و دە ملیۆن دۆلاری دەگرتەوە وەک قەرز بۆ کڕینی گەنم، برنج، دانەوێڵەی خواردن لە ئەمەریکا، مامەڵەکردن لەگەڵ قەرزی بەنکیی هەنارده و هاورده لەگەڵ کۆمەککردنی کڕینی بەروبوومی کشتوکاڵی لە دەستەی دابینکردنی قەرزی سەر بە وەزارەتی کشتوکاڵ. بەمپێیە عێراق بوو بە دووەم گەورەترین وڵاتی هاوردەی برنجی ئەمەریکی.

ئێستا وا کۆبوونەوە لەسەر ئاستە باڵاکاندا بووە بە پێویستی و سەعدون حەممادی لە ناوەڕاستی شوباتی ۱۹۸۳دا سەردانی جۆرج شووڵزی کرد لە واشنتۆن و پاش ماوەیەکی کورت، عیسمەت کەتانیی بەرپرسی پەیوەندییە دیبلۆماسییە هەمەلایەنەکانی عێراق، نزار حەمدوونی سەرۆکی تازە دەسنیشانکراوی بەشی چاودێریی بەرژەوەندییەکانی عێراقی لە واشنتۆن، بە کوڕی

دەستەیەکی کاربەدەستان و دەسەڵاتبەدەستانی ئەمەریکی ناساند. کەتانی دواتر (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۰دا) دەگێڕێتەوە کەوا دەسنیشانکردنی حەمدوون بە باڵوێزی دیفاکتۆی عێراق بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، سەرکەوتنی بە دەست هێنا و ساڵی ۱۹۸٤ "بە تەواوی جێی خۆی لە پایتەختدا کردەوە و کاتێک من بۆ دووەم سەردان چووم (لە نۆڤەمبەردا بۆ دەستپێکردنەوەی پەیوەندییەکان) دەمتوانی هەموو کەس ببینم"، بە خودی ڕێگان خۆیشیەوە.

ساڵی ۱۹۸۳، هەندێ ڕووداو بەردەوام بوو بۆ دواخستنی ئەو شتانەی حەتمی بوون. لە حوزەیراندا بەڵگەی کۆنتراکتێکی عێراق دەرکەوت بۆ میلیتاریزەکردنی هەلیکۆپتەرەکانی جۆری Hugh کە "بۆ مەبەستی مەدەنی" لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کڕدرابوون، بەپێی ڕاسپاردەی قەدەغەکردنی فرۆشتنی چەک و تفاقی ئەمەریکا. عێراق نکوولّی لە بەرپرسیارێتیی کرد[۱۳]، پاشان بە مەسەلەیەکی تایبەت بە خۆی لەقەڵەمی دا و زانیاریی هەواڵگریی وەرگرتبوو و بە ڕاپۆرت هاوکاری دەکرا لە لایەن میدیای ئەمەریکییەوە، کەوا ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ڕێگەی ئیسرائیلەوە چەک بە ئێران دەفرۆشێت و بڕوای نەدەکرد کەوا واشنتۆن کارێکی باشی کردووە کە قەدەغەکردنی ئازوگوێزی لەو چەشنەی لە ئەستۆی خۆی گرتووە[۱٤]. عێراق هەر ئەم گوناهبارکردنەی دووبارە دەکردەوە و ویلایەتە یەکگرتووەکانیش نکوولّی لێ دەکرد و ناوی ژمارەیەک وڵاتی دەهێنا کە هاوکاریی ئێران دەکەن، تا لە ساڵی ۱۹۸٦دا ڕاستیی مەسەلەکە دەرکەوت کەوا ئەمەریکا خۆی، لە ڕێگەی ئیسرائیلەوە، چەک بە ئێرانییەکان دەدا. لە

کۆتایی ئۆکتۆبەردا، ئەنجوومەنی ئاسایشی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، مەترسیی خۆی لە هەڵکشانی ململانێ و ناکۆکیی دەربڕی کەوا لەو دەمەدا ڕاستەوخۆ خەڵکی مەدەنییشی کردبووە ئامانج. ئەنجوومەن "هەموو جۆرە پێشێلکردنێکی یاسای نێودەوڵەتیی" گوناهبار کرد لە بڕیاری (٥٤٠)دا و هانی "دەسبەجێ وەستانی هەموو ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیی دا لە دژی ئامانجە مەدەنییەکان، بە شار و ناوچە نیشتەجێکانەوە". بەڵام تا ئەم کاتە یەک وشە لە بارەی بەکارهێنانی عێراقەوە بۆ گازی ژەهراوی باس نەکرابوو، کە سێ مانگ پێشتر دەستی پێ کردبوو.

### دۆناڵد ڕامسفیلد سەردانی بەغدا دەکات

لە مـــانگی ئۆکتـــۆبەری ١٩٨٣دا، ئێـــران لە بەرانـــبەر بەکارهێنـانی گـازی عێراقدا لە پێنجوێن پرۆپاگەندەی خۆی لـــێ خســـتە کـــار. بەڵـــگە بە دەســـتەوەیە کەوا لە کاتێکـدا کاربەدەستانی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەیانزانی کە عێراق کەوتـووەتە بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لە جەنگدا، کەچـی ئەوان ســـەرقاڵی ئەگەری گەرمبـــوونی شـــەڕەکە بـــوون لە کەنـداودا. ئێـران تێکەڵەیەکـی لە شـــەکەتکردنی ســـەربازی (هێرشـکردن بە ئاراســـتەی بەسـرە) و جەڕانـدنی ئـابووری (ڕێگرتن لە ناردنی نەوت)ی بە کار دەهێنا، بۆ ئەوەی عێراق بە چۆکدا بێنێت. لە وەڵامدا عێراق کەوتە هەڕەشـەی لێدانی دەزگـــا نەوتییەکـــانی ئێـــران و تـــانکەرە نەوتبەرەکـــانی بە مووشـــەکی ئێکزۆسـێت کە تـازە بە دەســـتی هێنـابوون، بەو نیازەی دابینکردنی نەوت لە جیهاندا پەک بخـات و ویلایەتە یەکگرتووەکـان ناچـار بکـات لە لای خـۆیەوە لە جەنـگەوە بگلێت.

پەرەســـەندنەکان، پێـــداچوونەوەی سیاســـەتی لەســـەر ئاستێکی بەرز ورووژاند. یاداشـتێکی بەڕێوەبەرێتیی ڕیگـان، وردەکـاریی گۆڕانکـارییەکی بەرەوپێشـچووی "لایەنگرییەکـی بـاش"ی بـڵاو کـردەوە. لەو دەمەوە کە هێزەکـانی ئێـران لە ساڵی ١٩٨٢دا پەڕینەوە بۆ ناو عێراق، بەڵگەنامەکە سـەرنجی

"ئەو هەنگاوانەی داوە کە ئێمە ناومانە بە ئاراستەی شەڕەکە و تا دێت بەلای عێراقدا دەیشکێنێتەوە". بۆ بەرگرتن لەوەی ئەمەریکا ڕابکێشێتە جەنگەوە، دەبێت واشنتۆن لە ئێستادا زیاتر بەلای عێراقدا دایشکێنێت. بەڵام نووسەری یاداشتەکە درکی بەوە کردووە کە گۆڕانێکی لەو چەشنە ڕەنگە ئەمەریکا ڕابکێشێتە جەنگەوە، بۆ نموونە ئەگەر ناچار بکرێت پارێزگاریی سەربازی دابین بکات بۆ هاتوچۆی پاپۆڕە تەنکەر لە کەنداودا (ئەم ترسە لە ساڵی ١٩٨٧دا بوو بە ڕاستی)[١٥].

مەسەلەی چەکی کیمیایی بە پلەی دووەم دەهات لە ئاست ئەو بایەخدانەی سەرەوەدا. لەوەش خراپتر بە کۆسپی سەر ڕێی گەرمکردنی پەیوەندییەکان لەقەڵەم دەدرا. دۆکیومێنتەکان ئەوە دەگەیەنن کەوا کاتێ ڕاپۆرتەکانی مەیدانی جەنگ زیادی دەکرد، ئیدارە بە دوای ئیحیتواکردنی هەر شەڕێکدا دەگەڕا. لە پاش درکپێکردنی دواتردا، شوولتز سەرنجی ئەوە دەدا کە "پێدەچێت شتێکی زۆر خراپ لە عێراقدا بەڕێوە بچێت. لە ئاخروئۆخریی ساڵی ١٩٨٣دا ڕاپۆرتگەلێک وا دەگەیەنن کە عێراق نائومێد بووە لە بەرگرتن لە هاتنەناوەوەی هێزەکانی ئێران، بۆیە چەکی کیمیایی لە هێڵەکانی بەرەدا بە کار هێناوە"[١٦]. ئەم پەرەسەندنە "قێزەونە" بە ئاشکرا زەنگلێدان بوو لە هەندێک ناوەنددا و بە شێوەیەکی بەرچاو لای ئەو کاربەدەستانەی بە دوای بەربەستی بڵاوبوونەوەی چەکی کۆکوژدا دەگەڕان. لە سەرەتای نۆڤەمبەردا، ئەدمیراڵی دەریایی، جۆناسان هۆ، بەڕێوەبەری بیرۆی کاروباری سیاسی ـــ سەربازی لە وەزارەتی دەرەوەدا، یاداشتێکی بۆ شوولتز ناردووە کە

شیاوی ئەوەیە بە تەواوی بیگوێزینەوە و بەم جۆرە دەست پێ دەکات:

"ئێمە بەم دواییە زانیاریی زیاترمان پێ گەیشتووە کەوا بەکارهێنانی عێراق بۆ چەکی کیمیایی دەسەلمێنێت... هەروەها دەزانین کەوا عێراق توانای بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی دەستەبەر کردووە، بە شێوەیەکی سەرەکی لە لایەن کۆمپانیاکانی ڕۆژئاواوە و ئەگەری ئەوەش هەیە یارمەتیی ماددیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی وەرگرتبێت، کە بۆ وڵاتانی دەرەوە تەرخانە. بەپێی سیاسەتی ئێمە لە هەوڵداندا بۆ وەستاندنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە هەر شوێنێک بێت، ئێمە ڕەچاوی کاریگەرترین هۆکار دەکەین بۆ وەستاندنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق، لەوانە وەک هەنگاوی یەکەم ڕاستەوخۆ مامەڵەکردن لەگەڵ عێراقدا. ئەوە ڕەنگە وەک ئەو شێوازە جێگیرەی لێ بێت کە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئەفغانستاندا پەیڕەومان کرد لە مەسەلەی زانیاریی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییدا و بۆ نموونە ئەو کۆششەی لەگەڵ لاوس، ڤێتنام و سۆڤێتدا کرا.

وەک ئاگاتان لێیە، حاڵی حازر عێراق زەرەرمەندە لە جەنگی شەکەتکردندا لەگەڵ ئێران. لە پاش کۆبوونەوەی گرووپی گەورە کاربەدەستانی نێودەوڵەتی لەسەر جەنگ، کارنامەیەکی گفتوگۆیان ناردبوو بۆ کۆشکی سپی بۆ کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، ئەو دەزگایەی ژمارەیەک پێوەری گەلاڵە کردووە بۆ ئەوەی یارمەتیی عێراقی پێ بدەین. لەسەر پێشنیاری ئێمە، مەسەلەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە دەخرێتە ئەجێندای ئەو کۆبوونەوەیەوە. ئەگەر ئەنجوومەنی

ئاسایشــی نەتەوەیـی بڕیـاری لەســەر ئەو پێـوەرانە دا، کە دەبێت لە یارمەتیدانی عێراقدا پەیڕەوییـان لێ بکرێن، ئەوە باشــترین هەلــی ئـێمە بــۆ کــارکردنە ســەر وەســتاندنی بەکارهێنــــانی چەکـــی کیمیـــایی، ڕەنـــگە لە ســــیاقی ئاگادارکردنەوەی عێراقدا بێت بۆ ئەو پێوەرانە. بە هەرحاڵ، پێویستە بە زووترین کات لە عێراق نزیک بینەوە لەپێناوی ڕاگرتنی متمانەی سیاسەتی ئەمەریکا لەسەر چەکی کیمیایی، شانبەشــانی کەمکــردنەوە یــان وەســتاندنی ئەوەی ئێســتا دەردەکەوێت کە ڕۆژانە بەکارهاتنی چەکی کیمیاییە لە لایەن عێراقەوە.ˮ[١٧]

لە ٢١ی نۆڤەمبەردا، هۆ و ڕیچارد مێرفیی هاوکاری، کە یاریدەدەری وەزیری دەرەوە بوو بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی نزیــک و ئاســیای باشــوور، ڤێرژنێکــی دەســتکاریکراوی یاداشــتەکەی هۆیـان نـارد بــۆ جێگـری وەزیـری دەرەوە، لــۆرەنس ئیگلبێــرگەر، کە تێیــدا ئاماژەیــان کردبــوو بە داواکاریی ئێران بۆ لێکۆڵینەوەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕەزامەندییەک بۆ ناردنی نوێنەرێک بۆ لای حکومەتی عێراق، نەک تەنها بۆ قەدەغەکردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە لە پاشـەڕۆژدا، بەڵکـو بـۆ ˮدوورخسـتنەوەی عێراق لە هەڵوێستێکی وا کە پێی ناخۆش بێت و ئێمە ناچار بین بە ئاشکرا لەسەر ئەم مەسەلەیە وەری بگرین.ˮ[١٨]

کـارەکە کەوتە لای فرانسـیس ڕیکیـاردۆنی کاربەدەسـتی بەرپرسی عێراق لە وەزارەتی دەرەوە، بۆ گەڵاڵەکردنی ئەم هەڵوێسـتە نـوێیە ئـاوا دەنووسـێت: ˮمەبەسـتمان نەهێشـتنی چیتــــر بەکارهێنــــانیەتی.ˮ تکاکـــــاریی ئێـــــران لە نەتەوە یەکگرتووەکـان ˮپێویســتیی تــاوتوێکردنی ئەم مەســەلەیە لە

بەغدا دێنێتە ئاراوە بە شێوەیەکی ئاشکرا و بەربڵاو". بە هەرحاڵ، دەبێت ویلایەتە یەکگرتووەکان بە وریاییەوە کار بکات و "نەبێتە گەمەی دەستی ئێران و فوو نەکات بە ئاگری پڕۆپاگەندەدا لە دژی عێراق". دەبێت بە تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوەی عێراق بگوترێت کەوا "بەردەوامیی بەکارهێنانی عێراق بۆ چەکی کیمیایی دەبێتە یاریی دەستی ئەوانەی دەخوازن گرژی لە ناوچەکەدا توندتر و زیاتر بێت، شانبەشانی کۆسپ دروستکردن لە بەردەم توانای حکومەتی ئەمەریکیدا بۆ یاریکردنی ڕۆڵێکی یارمەتیدەر". ڕیکیاردۆن گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەوا "پابەندیی تەواوی عێراق بە پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤەوە گرنگە بۆ دوورکەوتنەوە لە پەرەسەندنی مەترسیداریی جەنگ و بەردەوامیپێدانی هیوای هێنانی ئێران بۆ سەر مێزی دانوستان و لە هەمان کاتیشدا خۆدوورگرتن لە ڕەخساندنی چەکی پرۆپاگەندەیەکی کاریگەر بۆ ئێران لە دژی عێراق"[١٩].

ڕیکیاردۆن لە سەرنجێکی باکگراونددا، بۆ یاداشتەکەی ئەنجامگیریی ئەوە دەکات کە:

"تا ئێستا ئێمە کۆششی خۆمان لە دژی پرۆگرامی چەکی کیمیایی عێراق سنووردار کردووە بۆ چاودێریکردن لە نزیکەوە، لەبەر بێلایەنیی توندوتۆڵمان لە جەنگی کەنداودا و هەستەوەریی سەرچاوەکان و ئەگەری لاوازی ئەرشیفکردنی ئەنجامە خواستراوەکان. بە هەرحاڵ، ئێستا بە یارمەتیی پێویستی کۆمپانیا بیانییەکان، عێراق توانای بەکارهێنان و بڵاوکردنەوەی چەکی کیمیایی پەیدا کردووە و ئەگەری ئەوەش هەیە یەدەگێکی گەورەی ئەو چەکەی هەڵگرتبێت بۆ بەکارهێنانی زیاتر. عێراق لە نائومێدیدا و بۆ

کۆتاییهاتنی جەنگ، ڕەنگە جارێکی تریش چەکی کیمیایی کوشندە یان لاوازکەر بە کار بێنێتەوە، بە تایبەتی ئەگەر ئێران هەڕەشەی هێرشی بەرفراوان و بەزاندنی هێڵەکانی بەرەی عێراق بکات. بە هەرحاڵ، بەپێی ڕاپۆرتگەلێک لە سەرچاوە کراوەکانەوە، کە ئێستا لە بەردەستدان، ڕەنگە هەندێک هەنگاو لەئارادا بن، ئێمە و خەڵکانی تر بینێین بۆ ڕێگرتن لە بەکارهێنانی زیاتری عێراق بۆ چەکی کیمیایی قەدەغەکراو."[20]

ڕیکیاردۆن لە پەیوەندییەکی ئیمەیڵیی ساڵی ٢٠٠٢دا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە "مشتومڕمان سەبارەت بەوەی چی بە بەغدا بگوترێت لە بارەی چەکی کیمیایی و کەی ئەوە بگوترێت، بە تەواوی بەندە بە مەسەلەی پاراستنی سەرچاوەوە". ڕەنگە فاکتەری تریش لە گەمەکەدا بووبێت. لە ٢١ی نۆڤەمبەردا دیپلۆماتەکانی ئەمەریکا لە بەغدا، یاداشتێکیان دا بە وەزارەتی دەرەوە و ڕاوبۆچوونی خۆیان لەسەر شەڕی کیمیایی تێدا دەربڕیبوو. بە هەرحاڵ، بەڵگە بە دەستەوە نییە لە بارەی پەرەسەندنی بایەخدانی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە لەسەر "بەکارهێنانی تا ڕادەیەک ڕۆژانەی چەکی کیمیایی" لە لایەن عێراقەوە، هانی مامەڵەیەکی کارای ئەمەریکا بدات، بەدەر لەو یاداشتە، بۆ ئەوەی هۆشداری بداتە بەغدا کەوا بەردەوام پەنابردنە بەر گاز، وەک گەرمکردنێکی مەترسیداری جەنگ تەماشا دەکرێت. بە پێچەوانەوە، مەسەلەکە لە ڕاسپاردەی بڕیاری ئاسایشی نەتەوەیی ژمارە ١١٤ی ٢٦ی نۆڤەمبەردا دەرنەکەوت، کە بایەخی دابووە کاریگەریی بڕانی نەوتی کەنداو و بێ چەندوچوون ڕایگەیاندبوو کە سیاسەتی ئەمەریکا بریتییە لە

"لەئەستۆگرتنی هەر ئیجرائێک کە پێویست بێت" بۆ زەمانەتکردنی ڕۆیشتنی نەوت[٢١]. لە بەر ڕۆشنایی ئەوەدا، یاداشتەکە وەک ڕاپەوێک تەماشا دەکرێت بۆ کەمترین بەرگری لە شەڕێکی بیروکراتیی نێوان ئەوانەی بایەخ بە زیادکردن و پەرەپێدانی (چەکی کیمیایی) دەدەن و ئەوانی تردا، کە گرووپی بالادەستن و سەرکەوتنی ئێران لە کەنداودا بە گەورەترین مەترسی دەزانن. دواتر هەڵسەنگاندنێکی وەزارەتی دەرەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە یاداشتەکە کاری خۆی کردووە و عێراق کۆڵی دا لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، تا هێرشی ئێران لە شوباتی ١٩٨٤دا[٢٢]. بەلام ئەمە فەرامۆشکردنی ئەو ڕاستییەیە: کەوا پێویست نەبوو عێراق لەو ماوەیەدا گاز بە کار بێنێت، تەنانەت لەژێر هێرشی سەرومڕی ئێرانیشدا.

لەبەر هەمان هۆکاری جیۆستراتیجی، چەک و کەرەستەی کیمیایی نەخرایە ئەجێندای گرنگترین کۆبوونەوەی نێوان هەر دوو سەرکردەی ئەمەریکا و عێراق، دۆنالد ڕامسفیلد و سەدام حسێن، لە دیسەمبەری ١٩٨٣دا. ڕیگان ڕامسفیلدی بە نوێنەری تایبەتی دامەزراند لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا ـ شیاوی گوتنە ڕامسفیلد وەزیری بەرگری بوو لە سەردەمی ئیدارەی جیرالد فۆرددا ـ هەروەها کاربەدەستانی ئیدارە بڕیاریان دا بەرنامەی سەردانێکی بەغدای بۆ دابنێن. ئامانجی سەرەکیی ئاگادارکردنەوەی سەرکردایەتیی عێراق بوو لە ئەنجامی پێداچوونەوەی سیاسەتیاندا. خاڵەکانی باس لەسەر کێشەکانی ناوچەکە چڕ بووبووەوە، وەک (ئیسرائیل و فەلەستینییەکان، سووریا و لوبنان، ڕۆلی میسر لە ئاشتیی

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و پەیوەندیی ستراتیجیی ئەمەریکا لەگەڵ ئیسرائیلدا)، شانبەشانی پاڵپشتیکردنی عێراق لە تیرۆریزم و ئارەزووی ناردنی نەوت بە ڕێگەی بەندەری عەقەبەی ئوردنیی سەر دەریای سوور و مەسەلەی جەنگیش. ئەوان هیچ باسێکیان لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی نەکرد[٢٣].

ڕامسفیلد، کە پەیامێکی لە لایەن ڕۆناڵد ڕیگانەوە هەڵگرتبوو لەگەڵ دیارییەکدا ــ کە جووتێک ئاوزەنگیی زێڕین بوو[٢٤] (هێمایە بۆ هەنگاونانی خێرای کۆتاییپێهێنانی جەنگ، و) ـ لە ٢٠ی حوزەیراندا لەگەڵ سەدام حسێن کۆ بووەوە. بەپێی ئەو سەرنجانەی لەسەر گفتوگۆیان تۆمار کرابوو، هەر دوو ڕامسفیلد و حسێن دەستبەجێ ڕێک کەوتوون لەسەر پێویستیی گێڕانەوەی پەیوەندیی دیبلۆماسی و ڕامسفیلد لای خۆیەوە سەدامی سەرپشک کردووە لە دیاریکردنی کاتی دەستپێکردنەوەدا. سەدام ویلایەتە یەکگرتووەکانی بە کەمتەرخەم تاوانبار کردبوو لە قۆناغەکانی سەرەتای جەنگدا، بەوەی کە لێدەگەڕا "ئەم دوو لایەنە سەرکێشە یەکتر بهاڕن". ڕامسفیلد لە وەڵامدا گوتبووی کەوا ئەم ناکۆکی و ململانێیە، دەبێت "بە ڕێگەیەکی ئاشتییانە چارەسەر بکرێت، کە تێیدا ئێران پەلی بەرژەوەندی درێژ نەکات و سەروەریی عێراقی تێدا پارێزراو بێت". سەدام حسێن سکاڵای لەوە دەکرد کەوا چەکی ئەمەریکی گەیشتووەتە ئێران و ڕامسفیلد بەڵێنی دا بیوەستێنێت. سەرنج و تێبینییەکان وا دەگەیەنن کەوا چەکی کیمیایی هیچ باسێکی لێوە نەکراوە[٢٥]. بە هەرحاڵ، ڕامسفیلد لەو سەروبەندەدا کە سەدام حسێنی بینی، دوو جاریش

لەگەڵ تاریق عەزیز کۆ بووەوە، یەکەمیان بە تەنها و دووەم جـار بە ئامـادەبوونی یاریـدەدەران. لە تێبینیـی دانیشـتنی یەکەمیـدا، ڕامسـفیڵد بـاس لەوە دەکـات کە مەسـەلەی بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لە لایەن عێـراقەوە وروژانـدووە، بەڵام وەک لەم تێبینییـانەدا دەردەکەوێـت، تەنها وەک مەسەلەیەکی درەنگوەخت بیری کەوتووەتەوە. ڕامسفیلد دەڵێ کەوا ئاماژەی بەوە کردووە کە:

"... ئارەزوومانە مەسەلەی جەنگ چارەسەر بکرێت و بە شێوەیەکی ئاشتییانە کۆتایی پێ بێت و چیتر بارگرژیی زیاتر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرەو هەڵکشان نەچێت. من خواست و ئامادەیی خۆمانم دەربڕی کە کاری زیاتر بکەین (لێرەدا بڕگەکە دەستکاری کراوە). من ئەوەشم ڕوون کردەوە کە هەوڵ و کۆششی ئێمە بۆ یارمەتیدان بە چەند شتێک قۆرتی دێتە ڕێ و قورسە بۆ ئێمە باس لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بکەین، هەروەها ئەگەری زیادبوونی گرژی لە کەنداودا (وەک ئاماژەیەک بۆ هێرشەکانی عێراق بۆ سەر پاپۆڕی مەدەنی) و مەسەلەی مافی مرۆڤیش."[٢٦]

ئەمە هەموو شتێک بووە و گفتوگۆکە پەلەی لێ کراوە. ئەم سەرنجانە وا دەگەیەنن، کەوا کاتێک ڕامسفیلد دەرفەتێکی بووە بۆ باسکردنی مەسەلەی چەکی کیمیایی لەگەڵ سەرکردایەتیی عێراقدا، نەیتوانیوە پڕاوپڕ بیگەیەنێت. لەوەش خراپتر ڕەنگە زۆر باش ئاماژەی بۆ عێراقییەکان کردبێت کە ویلایەتە یەکگرتووەکان چاو دەنوقێنێت لە ئاست بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە. ڕامسفیلد، کە دواتر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئەو

سیاسەتدارێژی ئەمەریکی نەبووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە کاریگەرترین پەیامبەری ئیدارەی ڕیگان بووە لە سەردانەکەیدا بۆ بەغدا. لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢ی تەلەڤیزیۆنی CNNدا و لەو دەمەدا کە واشنتۆن خۆی ئامادە دەکرد بۆ ڕووخاندنی سەدام حسێن، ڕامسفێڵد ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە سەرکردەی عێراقی "ئاگادار کردووەتەوە" لە مەسەلەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی[٢٧]، بەڵام ئەو تۆمارەی لە بەردەستدایە و پێچەوانەکەی دەگەیەنێت.

ولیەم ئیگڵتن بە خۆشحاڵییەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە "سەردانەکەی باڵوێز ڕامسفێڵد پەیوەندییەکانی عێراق و ویلایەتە یەککگرتووەکانی بۆ ئاستێکی نوێ بەرز کردەوە". بەڵام سەرنجی ئەوە دەدات کەوا "هیچ پابەندییەکیان لە عێراقییەکان وەرنەگرتووە، کە کۆڵ لە بزاوت و جموجووڵی سەربازی بدەن، بە ئاڕاستەی گەرمکردنی شەڕەکە لە کەنداودا. سەرەڕای ئەوەش ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ ویلایەتە یەککگرتووەکان دروست کرا، ڕەنگە کاریگەرییەکی کۆسپئامێز بەرپا بکات لەسەر سەرکردایەتیی عێراق... بە هەرحاڵ، عێراقییەکان پەلاماردانی کەشتی، لە دەرەوەی سنووری خۆیان و لە نزیک بەندەری خومەینی، بە پەرەسەندن لەقەڵەم نادەن"[٢٨]. بە هەمان شێوە و بە ئاشکراش، ویلایەتە یەککگرتووەکان، پەنابردنە بەر چەکی کیمیایی عێراقیان بە هەڵکشانی جەنگ دادەنا. ڕاپۆرتێکی لەسەر بارودۆخەکە، کە لە کانوونی دووەمی ١٩٨٤دا ریچارد مێرفی بۆ ڕامسفێڵدی ئامادە کردبوو، چەندین ڕێوشوێنی لیست کردبوو سەبارەت بەوەی چۆن ئەمەریکا

دەستی کرد بە لایەنگری و داتاشین بەلای عێراقدا، چەشنی: توندکردنی ئابلووقەی چەک لەسەر ئێران، سەپاندنی کۆنترۆڵی هەناردەی "دژەتیرۆریزم" بەسەر ئەو کەلوپەل و کالایانەی بۆ ئێران دەچوون، شلکردنی کۆنترۆڵی هەناردە بۆ عێراق (بە کەرەستە و تفاقی مەرجدار و سەربازییەوە)، هاندان و پشتگیریکردنی پرۆژەی بۆریی نەوتی عەقەبە، گۆڕینی تانکیی نوێ بە تانکە کۆنە میسرییەکانی عێراق و زیادکردنی یارمەتیدان و ئاسانکاریی بەنکیی هەناردە ـــ هاوردە بۆ عێراق. لەمانەدا هەموو هیچ باسوخواسێکی مەسەلەی چەکی کیمیایی نەهاتووەتە ئاراوە[٢٩].

پەرەسەندنی خێرای پشتگیریی ویلایەتە یەکگرتووەکان وای لە سەرکردەکانی عێراق کرد، هەست بەوە بکەن کەوا تا ڕادەیەک لە مەیدانەکانی شەڕدا دەستکراوەن و قەدەغەیەکی ئەوتۆیان لەسەر نییە (باڵوێزی ئەمەریکیی تازە دامەزراو، دیڤید نیوتن دەنووسێت کەوا لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٤ەوە کەشتیی سەربازیی دژەئەمەریکا لە نمایشەکاندا نەدەبینران). لەبەر ئەوەی ڕامسفێڵد تەنها بە ڕاگوزەر باسی چەکی کیمیایی کردبوو و لەبەر ئەوەی تکای ئەوەی لێ کردن لەسەر ئاستی پەلاماردنی کەشتییە نەوتبەرەکان جەنگ گەرم نەکەن، دەبوو عێراقییەکان لەوە بگەن کە تاقیکردنەوەکانی گاز لە مەیدانەکانی جەنگدا سەرکەوتنی بە دەست هێناوە، نەک تەنها لە ڕووی سەربازییەوە، بەڵکو لە ڕووی سیاسییشەوە. بێجگە لەوەش بە دوای سەردانەکەی ڕامسفێڵددا بۆ بەغدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان دوو بلیۆن دۆلار قەرزی تەرخان کرد بۆ عێراق تاوەکو بەروبوومی کشتوکاڵیی ئەمەریکیی پێ بکڕێت. عێراق بە متمانەیەکی

نوێوە بەرەنگاری ئێرانییەکان بووەوە، کاتێک کە لە شوباتی ١٩٨٤دا هێرشی خەیبەریان دەست پێ کرد. عێراقییەکان تەنانەت سڵیان لەوە نەکردەوە کە هەڕەشەی "دەرمانی مێرووکوژ" لە ئێران بکەن، وەک ئاگادارکردنەوەیەک کە ئێگلتن لە بروسکەیەکدا بە "مووچڕکەبەخش" ئیشارەتی پێ دا[٣٠].

## تەواوکردنی کارەکە: سیاسەتی ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٨٤دا

بە هەڵاوبگریکی میدیاوە، لە سەرەتای مارتی ١٩٨٤دا، وەزارەتی دەرەوە یەکەم بەیاننامەی ئاشکرای لە ٥ی مارتدا دەرکرد، بەوپێیەی کە عێراق چەکی کیمیایی کوشندەی بە کار هێناوە، ئەمەریکا "بەکارهێنانی چەکی کیمیایی قەدەغەکراو لە هەر شوێنێک بێت" گوناهبار دەکات و داوا لە هەر دوو وڵات دەکات ڕێز لە پابەندیی خۆیان بگرن بە ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانەوە، "بە تایبەتی ئەوانەی کە چەکی کیمیایی قەدەغەکراو بە کار دەهێنن".[٣١]

عێراقیەکان کاردانەوەیەکی توندیان ڕاگەیاند لەوەی کە بە درۆودەلەسەیان لەقەڵەم دا و بانگەشەی ئەوەیان کرد کە ئەمەریکا "ساختەکارە و دوا وڵاتە کە مافی قسەکردنی هەبێت لە سەر ڕەفتارکردن لە جەنگدا" و مەسەلەی هیرۆشیما و ناگازاکییان دا بە چاویدا. هەروەها عێراق ئیشارەتی بەوە دەدا کەوا ئەمەریکا هەوڵی چاککردنەوەی پەیوەندییەکانی دەدا لەگەڵ ئێراندا[٣٢]. عیسمەت کەتانی، کە کاربەدەستێکی پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوە بوو و دواتر کرا بە نوێنەری عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەمەی خستە چوارچێوەیەکی زیاتر دیبلۆماسییانەوە. ڕاپۆرتی دیپلۆماتە ئەمەریکییەکان لە بەغدا و بروسکەکەیان، باس لەوە دەکەن "کە سەرنج دراوە، بەکارهێنانی کیمیایی لە ناو

خاکی عێراقدا بەڕێوە چووە" و تا ڕادەیەک وەک بەرگری لەخۆکردن قبووڵ کراوە و "کەتانی بەراوردی دەکات لەگەڵ بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمیدا کە بۆ کورتکردنەوەی ماوەی جەنگ لەگەڵ ژاپۆندا ئەنجام درا".[٣٣]

لە کاردانەوەی ئەمەدا، بەڕێوەبەریێتیی ڕیگان، ڕێچکەی کۆنترۆڵی ئازاردەری گرتە بەر، کە بریتی بوو لە سیاسەتێکی دووچڵ، کە دواتر کاربەدەستێکی ئەمەریکیی وەک "دانانی ڤۆلیۆم کۆنترۆڵ" وەسفی دەکرد، کە چلێکیان هەوڵدان بوو بۆ هێورکردنەوەی عێراقییەکان، بە ناردنەوەی ڕامسفێلد بۆ بەغدا لە ٢٦ی مارتدا. بەپێی کورتەیەکی سەرنجەکان، ڕامسفێلد ڕاسپێردرابوو ئەوە بە تاریق عەزیز بگەیەنێت کە بەم دواییە، لە واشنتۆن، شوولز بە عیسمەت کەتانیی گوتبوو کەوا دەق بەم جۆرەیە:

"ئیدانەکردنی چەکی کیمیایی لە لایەن ئێمەوە، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە بە توندی بەرهەڵستیی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کوشندە و لاوازکەر دەکەین، لە هەر کوێیەک ڕوو بدات و بەرژەوەندیی ئێمە لەوەدایە کە: (١) ڕێگریکردن لە هەر سەرکەوتنێکی ئێرانی. (٢) بەردەوامبوون لە چاککردنی پەیوەندیی دووقۆڵی لەگەڵ عێراق، بەپێی خواستی عێراق، بێ کەم و زیاد. ئەم پەیامە پشتگیرییە بۆ تۆ لە گفتوگۆدا".[٣٤]

پەیامەکەی ڕامسفێلد ئاراستەی فشاری لەسەر عێراقییەکان گۆڕی بە ئاماژەدان بە بنەمایەکی گشتی، "لە هەر کوێیەک ڕوو بدات"، لەجیاتیی بە وردی پێکانی مەبەستەکە ــ بەکارهێنانی "تا ڕادەیەک ڕۆژانە"ی عێراق لە دژی ئێرانییەکان. هەروەها ئەمە وای بۆ عێراقییەکان

دەگەیاند کە بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان، خۆی ئامادە کردووە بۆ چاودێریکردنی هەر دەستدرێژییەکی سنووربەزێن لەپێناوی ئیحتیواکردنی ئێراندا. دواتر ڕامسفیلد حاشای لەوە دەکرد کە بە هیچ ڕەنگێک یارمەتیی بەرنامەی چەکی کۆکوژیی عێراقی دابێت و جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە ساڵانی هەشتاکانی وەک "هاوولاتییەکی ئاسایی" گوزەراندووە و تەنها بۆ ماوەی چەند مانگێک یارمەتیی بەڕێوەبەرێتیی ڕیگانی داوە[٣٥].

سەرەڕای ئەوەش ئیدارە، ڕەخنەی ئاشکرای لە عێراق سنووردار کرد، بە تەگەرەخستنەڕێی گفتوگۆی چالاک لەسەر مەسەلەی چەکی کیمیایی لە پلاتفۆرمە نێودەوڵەتییەکانەوە. بۆ نموونە، لە ناوەڕاستی مارتدا، بەرهەڵستیی کاری دژەعێراقیی کرد لە کۆمسیۆنی مافی مرۆڤی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان لە جنێڤ، بە بیانووی ئەوەی کۆمسیۆنەکە "مینبەرێکی نەشیاوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ چەکی کیمیاییدا"[٣٦]. ئەمە بە تەواوی لە جێی خۆیدا بوو و پێشێلکردنی عێراقی بردەوە بۆ مەسەلەیەکی نێودەوڵەتی، کە پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤ بوو، کە بەپێی قەدەغەکردنی ئاشکرای بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، ڕێککەوتننامەیەکی مافی مرۆڤە، نەک پەیماننامەیەکی چەکداماڵین.

بۆ زیاتر ڕازیکردنی عێراق ــ دوابەدوای بڕیارێکی ئەنجوومەنی ئاسایش کە لە خوارەوە باسی لێوە کراوە ــ بەڕێوەبەرێتی لە ڕاسپاردەکانی بڕیارێکی نوێی ئاسایشی نەتەوەییدا (ژمارە ١٣٩ لە ٥ی نیساندا)، بە وریایی تاوانبارکردنی "ڕوون و ئاشکرای" عێراقی هاوسەنگ

کردبوو لەگەڵ بەڵێنی ئەوەی کە نەهێڵێت عێراق بکەوێت و ڕاسپاردەیەک لە بارەی "فشارخستنەسەری یەکسان، لەسەر پێویستیی بەپەلەی قەناعەتکردن بە ئێران، کە واز لە تەکتیکە توند و نامرۆڤانە بەردەوامەکانی بێنێت، کە بوون بە مۆرکی هێرشەکانی ئێستای"[٢٧]. بە واتایەکی تر، ئەمە سەرزەنشتکردنی ئێران بوو لەسەر هێرشەکانی شەپۆلەمرۆڤی و بەکارهێنانی مێرمنداڵان بۆ ڕاماڵینی مین؛ ئەمانە قسەی ڕەق بوون بە مەبەستی خاوکردنەوەی ئەو ڕەشەبا و زریانەی ڕووی کردبووە عێراق.

دووەم چڵی سیاسەتی ئەمەریکا، قەدەغەکردنی هەناردەی کەرەستەی سەرەکیی کیمیایی بوو بۆ هەر دوو ئێران و عێراق. ئەمە وای دەردەخست کە بەهێزترین پەیام بێت بۆ عێراقییەکان. لە سەرەتای مارتدا و پێش قەدەغەکردنەکە، دەسەڵاتدارانی گومرگی ویلایەتە یەککگرتووەکان ڕێگەیان بە بارێکی گەورەی فلۆریدی پۆتاسیۆم گرت لە کارگۆی هێڵی ئاسمانیی کەی ئێل ئێم KLM (هێڵێکی هۆڵەندییە، و) لە فرۆکەخانەی کەنەدیدا Kennedy. فلۆریدی پۆتاسیۆم ماددەیەکی کیمیاییە و دەچێتە پیشەسازیی دەرمانی لەناوبردنی نەخۆشیی کشتوکاڵەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا توخمێکی سەرەکییە بۆ بەرهەمهێنانی دەمارەگازی تابوون و سارین.

ئەمە بە شێوەیەکی تایبەتی وای لە بەڕێوەبەرێتی کرد تێبگات کە پێویستی بە ئابلووقەیەکی بەربلاوترە. بەمپێیە، لە کۆتایی مارتدا، وەزارەتی بازرگانی ڕاسپاردەی قەدەغەکردنی هەناردەی پێنج ماددەی کیمیایی دەرکرد بۆ ئێران و عێراق (دواتر کردی بە هەشت). وەزارەتی دەرەوە

نووسراوی بۆ کۆمپانیا ئەمەریکییەکان کرد و تێیدا هانی دان هیچ توخمێکی کیمیایی مەترسیدار نەفرۆشنە عێراق و کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ دیپلۆماتەکانی ولاتانی دۆستدا بەست، بۆ ئەوەی داوایان لێ بکات ئەوانیش کۆنترۆڵ بخەنە سەر هەناردەکانیان. دەسبەجێ بەریتانیا سەری بۆ لەقاند و بە دوایدا چەندین ولاتی ئەورووپا، ژاپۆن، ئوسترالیا و نیوزیلاند و کۆمەڵی ئەوروپییش.

لەو ماوەیەدا، ئیدانەکردنی عێراق لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە، بڕیارێکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆتوبەندی نوێ لەسەر هەناردە، گەلێک پرسیاری هێنایە پێشەوە کە ڕۆژنامەنووسان یەکبینە دەیانوروژاند: ئیدارە چیی زانیوە لە بارەی بەکارهێنانی گازی ژەهراوی لە لایەن عێراقەوە؟ عێراقییەکان ئەم ماددە کیمیاییانەیان لە کوێ دەست کەوتووە؟ ئایا لە کۆمپانیا ئەمەریکییەکانەوە بووە؟ ئەی واشنتۆن چیی کردووە بۆ ڕێگرتن لە ناردنی زیاتری باری لەم چەشنە؟ ئاخۆ ئیجرائاتی ڕێگەگرتنی لەگەڵ هاوپەیمانەکانی باس کردووە؟ ئەی بیری لەوە کردووەتەوە لێدانێکی سەربازی ئاراستەی دەزگا و دامەزراوەکانی چەکی کیمیایی بکات؟ ئاخۆ داوای لە ئیسرائیل کردووە لەجیاتییدا، هێرشێکی لەو جۆرە ئەنجام بدات؟ لە دانیشتنی ئەو پرسیار و وەڵامانەی بە دوای ڕاگەیاندنی قەدەغەکردنی هەناردەدا هات، ڕۆژنامەنووسێک پرسیاری لە وتەبێژی فەرمیی وەزارەتی دەرەوە کرد، کە بۆچی ویلایەتە یەکگرتووەکان سزای عێراق و ئێرانی پێکەوە داوە و ئایا شتێک لە گۆڕێدا هەیە کەوا ئێرانیش چەکی کیمیایی بە کار هێنابێت؟ وەڵامی جۆن هاگس: 'من

دڵنیا نیم مەسەلەیەک لەگۆڕێدا هەبێت کە ئەوان بە کاریان هێنابێت، بەڵام مەبەست ئەوەیە دڵنیا بین لەوەی کە هیچ لایەکیان بە کاری ناهێنن."

ـ پرسیار: "باشە لە ڕاستیدا ئێوە لایەک سزا نادەن لەسەر شتێک کە نەیکردووە؟"

ـ وەڵام: "جەنگێک بەردەوامە و ئێمە دەمانەوێت کۆتایی پێ بێت و ئێمە لەو جەنگەدا بێلایەنین و بەرهەڵستیی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییمان کردووە... کەواتە ئێمە وای بیر لێ دەکەینەوە لەم حاڵەتە تایبەتەدا ئەقڵ و ئاوەز وای دەخوازێت کە هەناردە لەسەر هەر دوو لا قەدەغە بکەین."

ـ ڕۆژنامەنووسێکی تر پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ بەکارهێنانی عێراق بۆ دەمارەگاز کار دەکاتە سەر پەرەسەندنی پەیوەندی لەگەڵ عێراقدا و لەوانەش خواستی ئەو بۆ کردنەوەی پەیوەندییە دیبلۆماسییەکان.

ـ وەڵام: "نەخێر، من ئاگادار نەکراوم لە هیچ گۆڕانێک لە هەڵوێستی ئێمەدا. ئێمە حەز دەکەین لە نزیکەوە دیالۆگ لەگەڵ عێراقدا بکەین."(٣٨)

لەگەڵ ئەوەشدا، سەرەتا عێراقییەکان کاردانەوەی توندیان نواند. پەلاک دەگێڕێتەوە کە "حەمدوون بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەرانە هەڵسوکەوتی کرد و دەیویست قەناعەتمان پێ بکات کەوا ئەو ماددە کیمیاییانەی هێناویانە، بە مەبەستی بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی نەبووە. ئێمەش پێمان گوت کە تاقە ئەگەری بەکارهێنانیان لە دروستکردنی چەکی کیمیاییدا بووە." هەروەها پەلاک دەڵێ گوناهبارکردنی ئاشکرا، عێراقییەکانی ئازار دا، بەڵام قەدەغەدانان لەسەر هەناردە "تووشی شۆکێکی ڕاستەقینەی

کـــردن". بەپێـــی بۆچـــوونی ئەو، لەبەر ئەوە بـــووە کە پیشەسازیی کیمیایی عێراق بە تەواوی پشتی بە کەرەستەی هاوردە بەستبوو.

لە کۆتاییدا، ئاڵۆزیی چەکی کیمیایی لە مارتی ١٩٨٤دا، لە ڕێگەی دیبلۆماسیەتێکی زیرەک و خێراوە، تەنها بوو بە نزگەرەیەک لە پرۆسەی گێڕانەوەی پەیوەندیی دیبلۆماسیدا. جیم پلاک دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەوا "ئێمە قەناعەتمان بەوە هێنابوو کە عێراق هاوبەشێکی بازرگانیی پەرەگرتووە و بەربەستێکە لە ڕێـی فراوانخوازیی ئێرانییەکاندا. بۆیە پەیوەندیی فەرمی وامان لێ دەکات زیاتر کاریگەر بین لە پێداگریماندا لە بەغدا و بە بۆچوونی من هەر واش بوو. بێجگە لەوەش لە بیرمان نەچێت، کە لە شانۆی جەنگی سارددا عێراق دایە پاڵ ئێمە (تەنانەت کاتێک کە پەیوەندییشیان لەگەڵ یەکێتیی سۆڤێت نەپچڕیبوو) و ئەمە جیاوازییەکی دروست کرد."

سەبارەت بە مەسەلەی چەکی کیمیاییش دەڵێت:

"ئێمە ڕێک کەوتبووین لەسەر ڕێککەوتن و نەماندەتوانی کۆنترۆڵی هەموو هاوردەیەک بکەین بۆ عێراق و هەڵوێستێکی وتارئامێزمان وەرگرتبوو لە دژی بەکارهێنانی ئەو چەکە لە مەیدانی جەنگدا. من دڵنیا نیم کە چیی ترمان پێ دەکرا. ڕەنگە بمانتوانیایە بەیانێکی زیاتر دەربکەین، بەڵام ئەمە کاری نەدەکردە سەر سیاسەتیان و ئەمەیان بە گرنگ دەزانی. ئەگەر ئێمە بمانویستایە بیکەینە مەرجێک بۆ گێڕانەوەی پەیوەندییەکان، ئەوە هەرگیز ئەو پەیوەندییانە نەدەگەڕانەوە."

تاریق عەزیز پشتگیریی لە ڕاستیی ئەم سەرنجانە دەکات و لە چاوپێکەوتنێکی مانگی ئابی ١٩٨٤دا هەڕەشەی ئەوەی کرد، ئەگەر ئەمەریکا بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بکاتە چەقی سیاسەتی خۆی، 'دەتوانم دڵنیاتان بکەمەوە کە قەناعەتێکی کوتوپڕ لە عێراقدا پەیدا بێت کە ئەمە ئامادەکارییە بۆ هێرشێکی ئیسرائیلی (دژ بە دەزگا و دامەزراوە پیشەسازییەکان). ئەگەر وا بێت، ئەوە کەشوهەوای بونیادنەری نێوان ئێمە و ئەمەریکا ژەهراوی دەکات'.[٣٩] سەیموور هێرش دەنووسێت کەوا پلانێکی لەم چەشنە داڕێژراوە و عێراق هۆکاری خۆی هەیە بۆ سەرنجدان و تێکشکاندنی کوورەی ئەتۆمیی ئۆسیراک (مفاعل تموز، و)، پێش سێ ساڵ، لە لایەن ئیسرائیلەوە، بەڵگەیە بۆ ئەوە[٤٠].

(بەپێی چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠)، عیسمەت کەتانی کۆکە لەسەر ئەوەی کە نزیکبوونەوەی ئەمەریکا ـ عێراق، کە 'پرۆسەیەکە پێویست بوو ڕوو بدات و لە کۆتاییدا ئەوە بە ئاسانی فۆرمەلەیەک بوو بۆ دۆخێکی دیفاکتۆ کە پەرەی سەندبوو'. بە هەرحاڵ، لەوە سەرسوورهێنتر، کەتانی ئەوەشی گوت کە هەر چەندە بیری لێ دەکاتەوە، 'چەکی کیمیایی هیچ باسێکی نەهاتووە' لەو گفتوگۆیانەدا کە وابەستەی پەیوەندییە دیبلۆماسییەکان بوون و ئەگەر باسیشی کرابێت، گومانی لەوە هەیە بووبێتە هۆی هیچ دواخستنێک.

کاربەدەستانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، دیدێکی جیاوازیان هەبوو. دێڤید نیوتن، کە نوێنەری حکومەت و دواتر باڵوێز بوو لە حوزەیرانی ١٩٨٤ تا تەمووزی ١٩٨٨،

نائومێدی و نارەزاییەکی تەواوی لە هاوکارە عێراقییەکانی دەربڕی کە بووبووە مایەی بێزاریی دنیا: "ئێمە لە ساڵێکدا چەندین جار مەسەلەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییمان لەگەڵ باس کردووە، بەڵام ئاپ و ئاشکرا هەوڵدانێکی بێسوود بوو. بەڵێ ئێمە بەرژەوەندیمان لە قەدەغەکردنی بەکارهێنان و بڵاوبوونەوەی ئەم چەشنە چەکەدایە، بەڵام ئەوسا گازڕژاندن بەسەر ئێرانییەکاندا ئەو پەیامەی نەگەیاند کە ئەمڕۆ دەیگەیەنێت. تێگەیشتنی گشتی (لە واشنتۆندا) ئەوە بوو کە عێراقییەکان بە هیچ جۆرێک ناوەستن. ئێمە دەبێت بیخەینە بەر باس، بەڵام چاوەڕێی ئەوە نین بیوەستێنین."

فرانسیس ڕیکیاردۆن، کاربەدەستی نێردراوی وەزارەتی دەرەوە بۆ عێراق (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) ڕای وایە کەوا "ئێمە کەمێک لووتی خۆمان گرت، بەڵام دواجار کەوتینە ڕەخنەگرتن لە عێراقییەکان. ئێمە هەموو کات هەوڵمان داوە و بۆ ماوەیەک بوو بە مەسەلەیەکی گەورە لە پەیوەندییەکانماندا، بەڵام بە هۆی کاری دیبلۆماسیی باشمانەوە بوو کە توانیمان لە نۆڤەمبەری ١٩٨٤دا پەیوەندییەکانمان بگەیەنینە ئاستێکی بەرز".

بەم ڕەنگە مەسەلەکە دەنگی دایەوە و دواتر جۆرج شوولز دەنووسێت کە لە ئەیلوولی ١٩٨٤دا "کاتێک کاربەدەستە عێراقییەکان لە نەتەوە یەککگرتووەکان، هەواڵیان بۆ ناردم کەوا دەخوازن پەیوەندیی دیبلۆماسیی تەواو دەست پێ بکەنەوە، لە وەڵامدا گوتم ئێمەش ڕامان لەسەر بووە کە ئەم بۆچوونە بەهەند هەڵبگرین". ئەوجا مەسەلەکەی لەگەڵ شیمۆن پیریزی سەرۆکوەزیرانی ئیسرائیل و ئیسحاق شامیری وەزیری دەرەوە لە ئۆکتۆبەردا باس کرد و هەردووکیان کۆک بوون

لەسەر ئەوەی کەوا کارەکە "بەلای ئیسرائیلەوە پەرەسەندنێکی ئیجابییە". ئیسرائیلییەکان تەواو کەوتنە مەسەلەکەوە و چیتر کۆسپ و تەگەرە دروست نەکرا و لە ٢٦ی نۆڤەمبەردا، کە دەیکردە سێ هەفتە دوای سەرکەوتنە بەناوبانگەکەی ڕیگان لە هەڵبژاردندا، تاریق عەزیز و عیسمەت کەتانی و نزار حەمدوون بانگهێشتی ئاهەنگێکی فەرمیی کۆشکی سپی کران و ڕێککەوتنەکەیان مۆر کرد. شوولتز دواتر دەنووسێت (پاش ئەوەی عێراق کوەیتی داگیر کرد و هێڵی سووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی بەزاند) "لە دیدی منەوە چ شتێکی گرنگ لەئارادا نەبوو، هەروەها لە دیدی ڕۆناڵد ڕیگانیشەوە، من بە سانایی وام بیر کردەوە کە باشتر بوو بێ پەیوەندیی دیبلۆماسی بین لەگەڵ عێراقدا"[٤١]. شوولتز ئیدیعای ئەوە دەکات کە بە تاریق عەزیزی گوتووە گوایە واشنتۆن "بەردەوام بەرهەڵستیی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کردووە و بە وردی چاودێریی عێراقمان کردووە"[٤٢]. تۆماری گشتی و ئاشکرا لەم ڕووەوە، کەمتر ڕوونە و ئەوە پیشان دەدات کە شوولتز بە عەزیزی دەگەیەنێت کەوا "دەکرێت عێراق بە تەمای ئەوە بێت ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرهەڵستیی خۆی بهێڵێتەوە بۆ هەر دوو بەکارهێنان و بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی. ئەم هەڵوێستە بە تەنها و بە شێوەیەکی تایبەت بۆ عێراق نەبوو، بەڵکو گرنگیدان بوو بەم چەشنە چەکە لە هەموو شوێنێک"[٤٣].

دواتر سەدام حسێن کە لە لایەن جۆرج دەبلیو بوشەوە "بەو پیاوە ناسرا کە میللەتەکەی خۆی گازباران کرد"، کەیفی بەوە دەهات پەیوەندییە تۆکمە و تازەکەی لەگەڵ ئەمەریکادا بە "کەشوهەوای لەباری نێوانمان" ناوزەد بکات.

## نەتەوە یەکگرتووەکان لێکۆڵینەوە دەکات

بەکارهێنانی دەمارەگاز مۆرکێکی تایبەتی دا بە هەڵکشان و گەرمبوونی جەنگ و ئەمە شانبەشانی بەکارهێنانی رۆتینیی گازی خەردەل سکالایەکی گەورەی ئێرانییەکانی لێ کەوتەوە. هەروەها ئەمانە لەگەڵ راپۆرتەکانی میدیا و پێڵێنانی گەورەبەرپرسانی ئەمەریکا، کەوا عێراق گازی ژەهراویی بە کار هێناوە، پاڵی بە لیژنەی نێودەوڵەتیی خاچی سوورەوە نا دەست لەسەر ئەم مەسەلەیە دابگرێت. ئەم رێکخراوە بێجگە لەوەی یارمەتیی مرۆڤایەتی پێشکەش دەکات، چاودێریی سکالای دەوڵەتانیش دەکات سەبارەت بە یاساکانی جەنگ. شیاوی باسە ئەم رێکخراوە، بە دەگمەن شت ئاشکرا دەکات و دیبلۆماسیەتی هێمنی پێ چاکترە، بەلام سکالاکانی ئێران هەل و دەرفەتێکی گرنگی رەخساند. پەیوەندیی خاچی سووری نێودەوڵەتی لەگەڵ رژێمی ئێران ساردیی تێکەوتبوو بە هۆی مەسەلەی دیلەکانی عێراقەوە، کەوا ئێران رێگەی بە نوێنەرانی خاچی سوور نەدەدا سەردانیان بکەن.

لێرەدا بە ئاشکرا بایەخدان و نارەزاییدەربڕینی خاچی سوور لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە، دەبوو هەڵوێست و پێگەی لەگەڵ ئێراندا باش بکات. لە ٧ی مارتدا، رێکخراوەکە، بەیانێکی ورد و پوخت

داڕێژراوی دەرکرد، کە نێردراوەکانی پێنجسەد جەنگاوەری برینداریان لە نەخۆشخانەکانی تاراندا بینیوە کەوا "وێنەیەکی کلینیکیی ئەو باسوخواسەن کە پشتگیریی بەکارهێنانی ئێستای ئەو کەرەستە جەنگییانە دەکەن لە یاسای نێودەوڵەتیدا قەدەغە کراون"[٤٤].

بەیانەکەی ڕێکخراوی خاچی سووری نێودەوڵەتی، متمانەیەکی نوێی بە سکاڵاکانی ئێران دا و ڕەوایەتییشی دا بە سووربوونی تاران لەسەر ئەوەی کە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بە شکاندنی پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤ دادەنرێت. بۆ ڕۆژی دواتر ئێران بە فەرمی داواکاریی خۆی بۆ لێکۆڵینەوەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکان نوێ کردەوە. ئەم جارەیان نەتەوە یەکگرتووەکان، بە پێچەوانەی جارانی ترەوە کە بەردەوام فەرامۆشی دەکرد، کاردانەوەیەکی ئیجابیی هەبوو. هێنانە سەرخەتی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ ئێرانییەکانی سەلماند کەوا کۆششێکی ڕاستەقینەیە، چونکە هەستیان دەکرد کە هەق لای ئەوانە و بە دژایەتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەم مەسەلەیە، لێک دەدرێتەوە. سەعید ڕەجائی خۆراسانی، نوێنەری ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکان (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەگێڕێتەوە کاتێک ویستوویەتی ئەم مەسەلەیە بەرز بکاتەوە، دەبوو جیهانێکی ناحەز و دوودڵ قەناعەت پێ بکات سەبارەت بە ڕاستی و دروستیی ئیدیعاکانی ئێران لە سەردەم و کاتێکدا کە هێزە گەورەکان بە کردەوە لە پشتی عێراق بوون و پشتیوانیکردنی ئێران لە حیزبوڵڵا و نیاز و ئارەزووی شۆڕشی ئیسلامی بۆ پەلهاوێشتن، لە ڕێگەی داگیرکردنی عێراقەوە، بەرەو وڵاتانی لاواز و فشەڵی کەنداو تووڕەی

کردبـــوون. خۆراســـانی پیـــاوێکی چیرەدرێـــژ بـــوو، لە شەســـتەکانی تەمەنـــدا و لە ســـاڵانی (١٩٨١ ــــ ١٩٨٧)دا نوێنەری هەمیشەیی ئێران بوو لە نەتەوە یەکگرتووەکان، کە ساڵانێکی بەرچاوی جەنگ بوو. خۆراسانی لە داواکردنیدا بۆ لێکـــۆڵینەوەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکـــان، ئەوە دووپـــات دەکاتەوە کە یەکەم جار دەبوو بەسەر کۆسپێکی گەورەدا زاڵ بێت، ئەویش حکومەتەکەی خۆی بوو. ڕژێم هەمیشە بەگومـــان بـــوو لە نەتەوە یەکگرتووەکـــان، بە تـــایبەتی ئەنجوومەنی ئاسایش، کە هەر پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی یـان نـاحەز بـوون بە ئێـران، یـان وەک لە حـاڵەتی چینـدا، بێلایەن یاخود کەمتەرخەم بوون. ئێران دیپلۆماتەکانی خۆی ڕاسپاردبوو بـایکۆتی دانیشـتنەکانی ئەنجـوومەنی ئاسـایش بکەن، کە لەسەر جەنگ دەیانکرد و بەو جۆرە مەیدانیان بۆ عێراقییەکان چۆڵ کردبوو، کە بە پێچەوانەی ئێرانییەکانەوە، لە ڕادەبەدەر چالاک بوون و کاربەدەستێکی مەدەنیی کارا ڕابەریی دەکردن، کە عیسمەت کەتانی بوو و یاریدەدەری سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکـان بـوو پێش ئەوەی وڵاتەکەی وەک نـوێنەری خـۆی دایمەزرێنێـت. هەروەهـا لە ســاڵی ١٩٨١دا، کەتـانی وەک ســەرۆکی کـۆمەڵەی گشـتی، لەسەر دەستی خافیێر پێرێز دیکۆیلاردا سوێندی خوارد.

خۆراســـانی دەڵـــێ کەوا هەوڵـــی داوە ســـەرپێچی لەو دوورەپەرێزییەی ئێران بکات و ڕاستەوخۆ بچێتە لای پێرێز دیکـۆیلار، چـونکە وای بـۆ چـووە کـراوە بێـت لە گفتوگۆیـدا سەبارەت بە پێشێلکاریی سەلمێنراوی یاسـاکانی جەنـگ و بە تــایبەتی بەئامـــانجکردنی مەدەنییەکـــان بە هەمـــوو جـــۆرە چەکێک، بەڵام دەبوو تاران تیشکی سەوزی بداتێ. ئەمەیان

بە بروسکەیەکی وەزارەتی دەرەوە نەیگەیشتی، بەڵکو بە وتاردانێک لە لایەن ڕابەری باڵاوە بووە: "خومەینی وتارێکی دا و تێیدا بە زمانێکی پاراو پرسیی: "کوا دەسەڵاتدارانی نێودەوڵەتی بۆ ئەوەی بزانن گەلی ئێران چ کارەساتێکیان تووش بووە؟" تا ئەو ساتە من تەخویل نەکرابووم، بەڵام دوای ئەم وتاردانە ڕێگەم پێ درا و بە ئاسانی کەوتمە بەرجەستەکردنی ئەوەی کە ئیمام گوتی. بەمپێیە ڕاستەوڕاست چووم بۆ لای سکرتێری گشتی بۆ دەربڕینی داواکارییەکەم. ئەویش زۆری پێ خۆش بوو، چونکە بۆ ڕێگەیەک دەگەڕا کەوا کۆمەڵی نێودەوڵەتی زیاتر بێتە ناویەوە. ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو بۆی و بەمە دەیتوانی ئەستۆپاکی و بێلایەنیی نەتەوە یەکگرتووەکان دابڕێژێت و هەماهەنگی و هاوکاریی لەگەڵ ئێمەدا پەرە پێ بدات و کار بکاتە سەر ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێک بۆ جەنگ. پاشان لە ماوەی چلوهەشت سەعتدا وەفدێکی نارد".

داواکارییەکەی خۆراسانی لە لایەن گیاندۆمینیکۆ پیکۆوە وەرگیرا، کە یاریدەدەری سکرتێری گشتی بوو بۆ کاروباری سیاسی، کەوا کاتی خۆی چووبووە کۆششی دانوستانەوە بۆ بەردانی بارمتە ڕۆژئاواییەکان لە لوبنان، لەگەڵ ئەوەشدا کە مەترسییەکی زۆر هەبوو لەسەر ژیانی. بەگوێرەی قسەی پیکۆ (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا)، دەبوو نەتەوە یەکگرتووەکان خۆ لە هەموو تەنگوچەڵەمەیەک هەڵقورتێنێت بۆ وەڵام و کاردانەوەی گونجاو:

"ساڵی ١٩٨٣ کەوتینە وەرگرتنی نامە و داواکاریی زارەکی لە لایەن ئێرانییەکانەوە، بیرۆکەی لێکۆڵینەوە لە

چەکی کیمیایی و تۆمەتی بەکارهێنانی زۆر تازە بوو، هەر چەندە بۆ ئەقڵی ڕۆژئاوا دەبوو لێکۆڵینەوەی لۆجیکی بکرێت، لەو کاتەدا کە ئیدیعایەکی وات پێ دەگات. بەڵام لە کاتی ئیمزاکردنی پرۆتۆکۆڵی جنێڤەوە لەسەر چەکی گاز لەساڵی ١٩٢٥دا، لێکۆڵینەوەی لەو چەشنە نەکراوە. بەم جۆرە کاتێک کە سکرتێری گشتی ساڵی ١٩٨٣ ئەم مەسەلەیەی خستە بەردەمی ئەنجوومەنی ئاسایش، بەرەوڕووی کەشوهەوایەکی ساردوسڕ بووەوە و ئەنجوومەنی ئاسایش هیچ شتێکی داوا نەکرد بۆ ئەم حاڵەتە. مەسەلەی چەکی کیمیایی لە تەڵخترین ساتەکانی جەنگی سارددا خرایە بەر باس و لێکۆڵینەوە، واتە دوای شەش مانگ حوکم وەرگرتنی یەکێتیی سۆڤییت لە لایەن ئەندرۆپۆڤەوە. لەم کاتەدا هیچ کەسێک لە واشنتۆن و مۆسکۆ، گوێی بە نەتەوە یەکگرتووەکان نەدەدا و هەر دوو لا وەک یەک حەزیان بە چارەی نەدەکرد".

خۆشبەختانە، وەک پیکۆ دەڵێت، ئیقباڵ ڕەزای هاوکاری، کە دواتر بوو بە ستافێکی سکرتاریەت (بەرپرسی ستافی کۆفی ئەنانی سکرتێری گشتی بوو تا ساڵی ٢٠٠٤)، بڕیاری پێشخستن و پاڵپێوەنانی تەواوی مەسەلەکەی دا. "ئێمە گوتمان، جار بە جەهەننەم، چیمان دەست دەکەوێت و چی لە دەست دەدەین؟" لە کۆتاییدا پێریز دیکۆیلار، بە شەکەتییەکی زۆر و مەترسیی سیاسییەوە، بڕیاری دا."

ئیقباڵ ڕەزا بوو بە دڵگەرمترین کەسی نەتەوە یەکگرتووەکان لە مەسەلەی لێکۆڵینەوە لە بارەی ئەو ستەم و پێشێلکارییانەوە کە لە جەنگی ئێران ــ عێراقدا بەرپا دەکران. "ساڵی ١٩٨٣ دەسپێشخەریی ئێمە بوو کە سکرتێری

گشتی قەناعەت پێ بکەین و لەم کارەشماندا دەبوو بەسەر کەمێک بەرگریدا زاڵ ببین، تەنانەت لە لایەن زۆرێک لە راوێژکارانیەوە"، رەزا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۰دا) جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە. ئەم ئەرکە لەو ساڵەدا یەکەمی نۆ ئەرک بوو، کە مەسەلەی ئامانجە مەدەنییەکان بەرچاو بگیرێت و چەکی کیمیایی بخرێتە لاوە، کە تا ئەو دەمەش زۆر تازە بوو. لەمیانەی ئەمەو ئەرکە یەک لە دوای یەکەکانەوە چوار لەوانەی ئەم رۆڵەی تێدا بینی وەک کاربەدەستی سیاسی، بوون بە مایەی رێز و پێزانینێکی بێپایان بۆ رەزا. بەمە ئەو دەرگای لەسەر ئۆفیسی سکرتێری گشتی والا کرد، کە دواتر بوو بە هاوسەنگیراگرتنێکی گرنگ بۆ هەڵوێستی چەسپاوی لایەنگیریی عێراق لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایشەوە.

بۆ رەزا، شکستهێنانی چەندبارەی کۆششی ئاشتی لە لایەن ئۆڵف پاڵمێی نوێنەری نەتەوە یەککگرتووەکان و ئەوانی ترەوە، ئەوەی دەگەیاند کە دەبێت نەتەوە یەککگرتووەکان لەجیاتیی "ئیجرائاتە بچووکەکان" بە تەمای دەرفەتێکی باشتر بێت بۆ سەرکەوتن و پشتیان پێ ببەستێت بۆ پێکهێنانی ئاشتییەکی سەرتاپاگیر. ئەم ئیجرائاتانە دەکرێت وا لە ئێران و عێراق بکەن ملکەچ و پابەند بن بە یاساکانی جەنگەوە، بە تایبەتی لە بواری پەلامارданی ئامانجە مەدەنییەکان (لە جەنگی شارەکاندا) و هێرشکردنە سەر کەشتیی بازرگانی و شێوازی مامەڵەکردنی دیلی جەنگ و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی. ئەم کارە بەلای ئێرانەوە پەسەند بوو، چونکە مامەڵەی لەگەڵ چەند مەسەلەیەکی فشار دەکرد و سوودی عێراق لە مەیدانی شەڕدا لە ئەگەری بەرپاکردنی رۆتینیی

تاوانەکانی جەنگەوە دەهات ــ لە هەمان کاتدا سەرنج لا دەبات لەسەر ڕەتکردنەوەی بێ چەندوچوونی دانوستانی کۆتاییهێنان بە جەنگ. لەولاشەوە عێراقییەکان بەرهەڵستییەکی سەختی هەڵوێستی ڕەزایان دەکرد. لە کاتێکدا کە عێراق بەردەوام مەسەلەی مامەڵەی ئێرانی دەورووژاند لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا، کەچی دڕدۆنگ بوو لەوەی لە ڕووی نێودەوڵەتییەوە بەربەست بخرێتە ڕێی بەکارهێنانی چەک و کەرەستەکانی خۆی لە جەنگدا و لەبری ئەوە داوای دەکرد ئێرانییەکان هێرشەکانی خۆیان ڕابگرن و بە ئاگربەست قایل بن. بە کورتی ئەمە دیبلۆماسیەتی شارە زەردەواڵە بوو، بەڵام ڕەزا هەر کوڵی لێ نەدا. ڕەزا باس لەوە دەکات کە "بەپێی پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤ لە بارەی جەنگی گازەوە، میکانیزمێک نییە بۆ لێکۆڵینەوە لە ئیدیعاکانی بەکارهێنانی و لەبەر ئەوە مشتومڕێکی تەواو هەیە لە بارەی گەڵاڵەکردنیەوە. ئێمە ئامۆژگاریی سکرتێری گشتیمان کرد بە دوای ڕێگەپێدانی ئەنجوومەنی ئاسایشدا نەگەڕێت، بەڵکو بە سانایی ئەنجوومەن لە نیاز و مەبەستەکانی ئاگادار بکاتەوە. ئەویش بۆ متمانەپێکردنی ڕازی بوو"[٤٥]. لە وەڵامی داواکاریی ئێراندا بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەک، نەتەوە یەکگرتووەکان داوای ڕێگەپێدانی سەردانی عێراقی کرد کەچی سەرزەنشت کرا. بۆیە بە هۆی ڕەتکردنەوەی عێراقەوە لێکۆڵینەوەکە سنووردار بووەوە و تەنها ئێران و لێکدانەوەی ئێرانییەکانی بۆ ڕووداوەکان گرتەوە.

پێدەچێت ئیقباڵ ڕەزا بە تەواوی خۆی ئامادە نەکردبێت بۆ ئەوەی کە لە سەردانەکەی ئێراندا بینی لە مارتی ١٩٨٤دا.

له نەخۆشـــخانەیەکی تارانـــدا، وەک دەڵێـــت، نێـــردراوەکە قوربـــانییەکی زۆر ســـەختی بریـنـــداری کیمیـــایی بینـــی. بە سـەرنجدانی وەفـدە بیـانییەکە، سـەربازە بریندارەکە تـوانیی دەستی بەرز بکاتەوە، بەڵام زۆر بە زەحمەت و ئیشـارەتێکی سـەرکەوتنی بۆ کـردن. ڕەزا دەگێڕێتەوە، کەوا پیـاوەکە دوو سـەعات دوای سـەردانەکەیان کـۆچی دوایـی کـردووە: "مـن هەرگیز ناتوانم وێنەی ئەم پیاوە لە یـاد بکەم کە دەسـتی بۆ بەرز کردینەوە."

لە ٢٦ی مارتدا، ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش کۆپییەک لە ڕاپۆرتەکەی سـکرتێری گشـتییان پێ گەیشـت، کە لەسـەر بنـــاغەی بریـنـــداران و بەرکەوتـــوانی نەخۆشـــخانەکان و پاشماوەکانی کۆکراوەی مەیدانی شـەڕ ئەوەی دەگەیاند کەوا هێزەکانی ئێران بە هۆی گازی خەردەل و تابوونەوە بریندار و بەرکەوتـوون کە لە هەوادا بـڵاو بـووەتەوە. ڕاپـۆرتەکە وا دەردەکەوێـت بۆمبەکـان بە جۆرێـک دیـزاین کـراون "کەوا کاتێک دەتەقنەوە مـاددە شـلەکەی ناویـان بەسـەر شـوێنێکی بەرفراواندا بڵاوە دەکات بە شێوەی پرژە یان هەڵم."

بە هەرحـاڵ، ڕاپـۆرتەکە هـیچ شـتێک بە دەسـتەوە نـادات لەسـەر ئەنجامدەر یـان ئەنجامـدەرانی ئەم هێرشـانە و تەنهـا باس لەوە دەات کە "چەکی کیمیایی بە کار هێنراوە" و پاشان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە:

"سـکرتێری گشـتی بـایەخێکی زۆر بەرز دەداتە تێبینیـی وردی هەمـــوو بنەمـــا و ڕێســـاکانی ئەو هەڵســـوکەوتە نێودەوڵەتییەی لە لایەن کۆمەڵگەی جیهانییەوە قبـووڵ کـراوە بە مەبەسـتی قەدەغەکـردن یـان هێـورکردنەوەی ئـازاری مـرۆڤ، جـا پەیوەنـدیی بە بەکارهێنـانی چەکـی تـایبەتییەوە

بێت، مامەڵەی دیلی جەنگ یان هەر بوارێکی تری ئۆپەراسیۆنی سەربازی بێت." پاشان لەسەری دەڕوات و دەڵێت "سکرتێری گشتی زۆر بە قووڵی قەناعەتی وایە کە ئەم حیساباتە مرۆڤایەتییانە، کاتێک بە تەواوی لێیان دڵنیا دەبین، کە کۆتایی بە ناکۆکیی تراجیدی بهێنرێت"(٤٦). بە واتایەکی تر، نەتەوە یەکگرتووەکان ددان بە قەدەغەکردنێکی ڕەهای بەکارهێنانی چەکی کیمیاییدا نانێت، هەر چەندە زمانی پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤ ڕوون و ئاشکرایە.

ڕاپۆرتەکە ڕەنگە زۆر لە بارەی ئەنجامەدەرانەوە زانیاریی بە دەست هێنابێت و پێدەچێت سکرتێری گشتی کەمتر پەرۆش بووبێت بۆ هاوسەنگکردنی ڕاگەیەنراوەکەی وەک کۆششێک بۆ ئەوەی بە بێلایەن دەربکەوێت، ئەگەر شارەزایانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕاپۆرتەکەیاندا ئەوەیان بنووسیایە کەوا ئاگاداری دیپلۆماتەکانیان کردووەتەوە لە ناو دامودەزگای نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە نیویۆرک. بۆ نموونە، ئیقباڵ ڕەزا بە نوێنەری هەمیشەیی ئەمەریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان، جین کیرکپاتریکی ڕاگەیاند کەوا ئێرانییەکان "ئەو ماسکی گازانە و کەرەستە پەیوەندیدارەکان کە دەڵێن لە عێراقییەکان گیراون، لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات دروست کراون و پیتی عەرەبییان بە سەرەوەیە"(٤٧) و ئەمانەیان پیشانی تیمەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان داوە. ئەم دۆزینەوەیە لە ڕاپۆرتەکە لا برا بەو هۆیەوە کە سەلماندنێکی قەناعەتبەخش پێک ناهێنێت و نەبوونی سەلماندنی ئاوها و نەبوونی بەڵگەی تر، ڕەنگە وا بخوێنرێتەوە و لێک بدرێتەوە کە هەوڵێک بێت بۆ شێواندنی ناوبانگی عێراق.

بەڵام هیچ گومانێک لە زەینی کەسدا نییە سەبارەت بە دەسنیشانکردنی ئەنجامدەران. عیسمەت کەتانی، کە ئێستا لە کۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ دیپلۆماتە ئەمەریکییەکاندا لە بەغدا پێ لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دەنێت لە لایەن عێراقەوە و دواتر (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) بە تەواوی کۆک بوو لەسەر ئەوەی کە ڕاپۆرتەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان مەبەستێکە و تەواو بووە: "ئێمە ڕاپۆرتەکانمان بەهەند وەردەگرت و لەسەر بنەمای زانستی بوون. ئێمە تەواو نکووڵیمان لێ دەکردن، بەڵام ڕەتکردنەوەکەمان لاواز بوو. ڕاستییەکەی ئێمە پێمان لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دەنا."

وا ئێستا ڕاپۆرتەکە دراوەتە دەست ئەنجوومەنی ئاسایش و بڵاو کراوەتەوە و دانوستان دەستی پێ کردووە بە کاردانەوەیەکی گونجاو. کیرکپاتریک بروسکەی دا بە واشنتۆن "بۆ گەیاندنی ئارەزووی حکومەتی عێراق بە (تەگەرە خستنە ڕێگەی) تاوتوێکردنی مەسەلەکە و ئەو کارانەی کە سەرجەمی مەسەلەکان پێکەوە وەردەگیرێت و شانبەشانی هەڵسوکەوتی ئاژەڵییانەی (ئاوها) ئێرانییەکان"[48]. لە واشنتۆن نزار حەمدوون داوای لە جیم پلاک کرد بەیانێکی سەرۆکایەتی دەربکرێت، سەرەڕای بڕیارێکی ئەنجوومەنی ئاسایش یان ئەگەر ئەوە سەری نەگرت بڕیارێکی کەمبایەخ کە داوا لە ئێران بکات ئاگربەست قبووڵ بکات و ئەوە کار دەکاتە سەر هەڵوێستی عێراق. بێجگە لەوەش حەمدوون زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بڕیارەکە نابێت عێراق بە ئەنجامدەر دابنێت، چونکە هیچ تیمێکی نەتەوە یەکگرتووەکانی بۆ نەهاتووە. بەگوێرەی دۆکیومێنتەکانی ئەمەریکا، پلاک ڕازی بووە، بەڵام

حەمدوونی لەوە ئاگادار کردووە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕوخسەتی ڕێگەپێدان لەسەر هەناردەی هەندێک ماددەی کیمیایی دادەنێت و داوا دەکات کە عێراق کڕینی ئەو جۆرە ماددانە بوەستێنێت. پاشان دەگاتە ئەنجام و دەڵێت: "ئێمە نامانەوێت ئەم مەسەلەیە زاڵ بێت بەسەر پەیوەندیی دوولایەنەماندا و لە خواستی ئاسایی ئێمە کەم نەکاتەوە کە بە زووترین کات جەنگ کۆتایی پێ بێت."[٤٩]

لە ٣٠ی مارتدا، سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایش بەیانێکی لاوازی بە کۆی دەنگ دەرکرد کە بە توندی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی گوناهبار دەکات، بەڵام لە ناوهێنانی عێراق خۆ دەپارێزێت وەک تۆمەتبارێک کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی هەبێت بە ڕاوەستانی "کردوکۆشی مرۆڤدۆستانە" بۆ کۆتاییهێنان بە جەنگ. بە واتایەکی تر، ڕێک ئەوە بوو کە عێراق دەیویست[٥٠]. بڕیارەکە بۆ باڵوێز خۆراسانی بێهیوایی بوو، بەڵام وەک خۆی دەڵێت، بۆ ئێران "ئەمە ئەوپەڕەکەی بوو کە توانیمان لەو کاتەدا بە دەستی بێنین".

## دەرفەتێکی لەدەستچوو

ئەو ساڵە، لە نیسانی ١٩٨٤ەوە تا هێرشەکەی ئێران لە مارتی ١٩٨٥دا، واشنتۆن هۆکارێکی ئەوتۆی نەبوو لێی ناڕازی بێت سەبارەت بە کۆسپ و تەگەرە دروستکردن لە لایەن عێراقەوە. هێزەکانی عێراق تەنها ناوبەناو گازیان بە کار دەهێنا بێ ئەوەی کار بکاتە سەر ڕەوتی سەربازی. بەم جۆرە ئەو پرسیارەی دەبێت بکرێت کە ئاخۆ لێکدانی دیبلۆماسیەت و قەدەغە خستنەسەر هەناردە کاری خۆی کرد؟ هەندێک ڕایان وایە کە بەڵێ کاری خۆی کردووە، چونکە عێراق بە شێوەیەکی کاریگەرانە ماوەی ساڵێک پەنای نەبردە بەر چەکی کیمیایی. پیکۆ باس لەوە دەکات کە لە ئەنجامی کۆششی نەتەوە یەککگرتووەکاندا "بەکارهێنانی گازی ژەهراوی وەستا، لانیکەم ئەگەر بە شێوەیەکی کاتییش بووبێت"[٥١]. بە هەمان ئاڕاستەش ڕیکیاردۆن (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە: "ئێمە پێمان گوتوون واز لەوە بێنن و پێم وایە بۆ ماوەیەک جێبەجێیان کرد". ئەندرو تێریل، کە لێکۆڵەرەوەیەکی سەربازییە، ئەویش ئەنجامگیریی ئەوە دەکات کە عێراق بە هۆی بەرەوڕووبوونەوەی شەپۆلێک ڕەخنەی چاوەڕواننەکراو لە ئەورووپا و ویلایەتە یەککگرتووەکاندا، بڕیاری دا بۆ ماوەیەک خۆی مەڵاس بدات[٥٢].

هەندێکی تر بە تەواوی ڕاستییەوە دەڵێن، کە لە کاتێکدا ئەمە پێدەچێت ڕاست بێت، عێراق لە لایەن ئێرانییەکانەوە بە

شێوەیەک لە شێوەکان ڕاهاتبوو کە هێرشێکی تری گەورە دەست پێ نەکات تا سەرەتای ساڵی ١٩٨٥. لەو خاڵەدا، عێراقییەکان جارێکی تر پەنایان بردەوە بەر گازی ژەهراوی، بە شێوەیەکی بەربڵاوتر لە جاران و بە ئاشکراش لە لایەن ئەمەریکاوە ساڵێک پێشتر هیچ ئاگادارییەکی نەدرایە و سەرکۆنەش نەکرا. دکتۆر فروتان (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) پێی وایە کە عێراق بۆ ماوەی ساڵێک گازی بە کار نەهێناوە و بە هۆی ئەوەوە بووە کە پێویستی بە کات بووە بۆ پەرەسەندن و پێشخستنی هێز و توانای ــ کە هەر واش بوو چونکە ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٨٥ ئەوەیان سەلماند. بەڵام ئیقبال ڕەزا سوور بوو لەسەر ئەوەی بڵێت "نەخێر!" کاتێک پرسیاری لێ کرا ئاخۆ عێراقییەکان ئاوڕیان لە وریاکردنەوەی واشنتۆن داوەتەوە و ئیشارەتی بە زیادکردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دا لە ماوەی ئەم ساڵانەی دوایی جەنگدا.

لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێک هەندێک لە کاربەدەستانی ئەمەریکا بە شانازییەوە ئیشارەتیان بۆ تۆماری ئیدارە دەکرد لەسەر ئەم زنجیرە ڕووداوانە[٥٣]، گوناهبارکردنی ئاشکرا دووبارە نەبووەوە و کۆتوبەندی هەناردەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە تەواوی ناکاریگەریی خۆی سەلماند. بۆ حکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بە ئاشکرا کاریگەریی کەمی هەبوو و کۆمپانیاکانی ئەو وڵاتە، کەوا کەناڵی هاوردەی سەرەکی بوون بۆ عێراق، بەردەوام بوون لە کاروباری بازرگانیی خۆیان لەگەڵ ڕژێمدا بێ دابڕان و وەستان. لەم ڕووەوە دادگاییکردنی ساڵی ٢٠٠٥ و ساغبوونەوەی تاوان بەسەر فرانس ڤان ئانراتی بازرگانی هۆڵەندیدا بە تۆمەتی

دابینکردنی کەرەستەی کیمیایی بۆ عێراق، ئەوەی دەرخست کەوا زۆرێک لە بازرگانیی ناشەرعی و قەدەغەکراو فێڵیان لە کۆنترۆڵی هەناردەی ژێر دەسەلاتی ئەورووپا کردووە لە ڕێگەی تووخننەکەوتنی بەندەرەکانی ئەورووپاوە[٥٤]. بێجگە لەوەش، خەملاندنێکی وەزارەتی دەرەوە وای بۆ دەچێت کە سروشتی دوومەبەستیی زۆر لە ماددە کیمیاییەکان دەبووە هۆی دەربازبوون لە دەست ئابلووقەیەکی کاریگەر[٥٥]. لەگەڵ ئەوەشدا بەرنامەی چەکی کیمیایی عێراق تا دەهات زیاتر پشتی بە توانای عێراق خۆی دەبەست. هەمان خەملاندن گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە تواناسازیی چەکی کیمیایی عێراق "بە شێوەیەکی بەش بەش لە ڕێگەی هاوکاریکردنی ژمارەیەک کۆمپانیای ڕۆژئاواوە پەرەی سەندووە و بە بێئاگایی ئەوان بووە لە هەندێک حاڵەتدا. بەلام بە بڕوای ئێمە ئاگایان لێ بووە". بە واتایەکی تر، ئابلووقە شتێکی ئەوتۆ نەبوو یان زۆر درەنگ بووە.

سەرەڕای ئەوەش بڕیاری بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان کە عێراق کاروباری چەکی کیمیاییەکەی بخاتە بەردەمی لیژنەی چەکداماڵینی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان هەر وا بێکاریگەری مایەوە، کە دەبوو لەسەر ئاستی جیهان قەدەغە بخرێتە سەر بەرهەمهێنان و هەڵگرتن و بازرگانی پێوەکردن و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی جێبەجێ بکرێت. ئەم کەینوبەینە زیاتر لە تواناسازیی سۆڤیێتەوە سەرچاوەی گرتبوو وەک بەکارهێنانی لە مەیدانی جەنگدا لە لایەن عێراقەوە و دانوستان لەسەری نۆ ساڵی خایاند و جەنگی ئێران ــ عێراق و داگیرکردنی کوەیت و ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیێت هەموو کەوتنە ئەو سەروبەندەوە.

تێرپیل هێشتا خاڵێکی تریش بە گرنگ دەزانێت، ئەویش ئەوەیە کە هەر چەندە عێراق جارێکی تر بەرەورووی ڕەخنە نەبووەوە لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بە هەمان توندی، بەڵام کاریگەریی دەسبەجێ ئەوە بوو کە نەیتوانی هێرشی پێچەوانە ئەنجام بدات دژ بەو هێزانەی ئێران کە تازە لە دوورگەکانی مەجنووندا سەنگەریان لێ دابوو، سەرباری ئابڕووچوون و ورەڕووخاویی هێزەکەی کە سەرکەوتنی ئێران بە دوای خۆیدا هێنای. تێرپیل هۆکاری ئەمە وا لێک دەداتەوە کە "ڕووداوەکانی دوورگەی مەجنوون درکپێکردنێکی هێنایە ئاراوە سەبارەت بە سنوورێکی (پێویستیی سەربازی) بۆ عێراق کە دەست بداتە بەکارهێنانێکی بەرفراوانی چەکی کیمیایی، بۆ نموونە، لە بارێکدا کە سەرکەوتنێکی بەرچاوی خاک داگیرکردن لە لایەن ئێرانەوە بە هێرشی ئاسایی نەگێڕدرێتەوە. ئەو سنوورە پاشان لە کاردانەوەی چاوەڕواننەکراوی ڕەخنەی ڕۆژئاوادا کەوتە بەر باسوخواس و وەک هەڕەشەیەک بوو بۆ کەناڵەکانی دابینکردنی فریاکەوتنی پێویست بۆ عێراق و توانای گشتی بۆ بەردەوامبوون لە ئیدارەدانی جەنگدا"[٥٦]. بە واتایەکی تر عێراق دەسکەوتی تەکتیکیی مەیدانی شەڕی بۆ پەیوەندییەکی ستراتیجی بە کار هێنا لەگەڵ ڕۆژئاوادا و هەڵبەت بەم کارەی باش بۆ مەسەلەکە ڕۆیشت و سوودیشی لێ بینی.

بەپێی تێڕوانینی ئێران، لە دوای ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٤ەوە شتەکان بەرەو خراپتر دەڕۆیشتن. نزیکبوونەوەی نێوان عێراق و ویلایەتە یەکگرتووەکان بوارێکی کەمی بۆ گەشبینی هێشتبووەوە. تاران ڕەخنەگرتنی ئەمەریکای لە

عێراق و قەدەغەکردنی هەناردەی ڕەت کردەوە و بە "ساختە و ڕیاکاری" و "مانۆڕی پرۆپاگەندەی" ڕووتی لەقەڵەم دەدا گوایە مەبەست تەنها پەردەپۆشکردنی ڕۆڵی واشنتۆنە لە دابینکردنی کەرەستەی کیمیایی بۆ عێراق کە دواتر دژ بە هێزەکانی ئێران بە کار هات[٥٧]. بێجگە لەوە ئێران بە تەمای سەرزەنشتی توندی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو بۆ عێراق، کەچی لەجیاتییدا کەمێک زیاتری دەست کەوت لە بەیانە کەمبایەخەکەی سەرۆکایەتی. سەعید خۆراسانی دەڵێت کەوا لەم زنجیرە ڕووداوانە ئەنجامگیریی ئەوە دەکات کە نەتەوە یەکگرتووەکان هێند کەڵکەڵەی ئاگربەستی کەوتبووە سەر، تەنانەت پێشێلکردنی توندی یاسای نێودەوڵەتییشی فەرامۆش دەکرد لەو پێناوەدا و پێدەچێت قەناعەتی بەوەش هێنابێت کە بەکارهێنانی گاز، چەند وەڕسکەریش بێت، بەڵام لەوانەیە یارمەتیدەر بێت لە کۆتاییپێهێنانی جەنگدا.

ئەگەر ئەمە کەشوهەوای بیرکردنەوە بووبێت، بە دڵنیاییەوە دەبوو دەرەنجامی تری بە دوادا بێت. هۆشداریدان لە بارەی ئەوەوە کە عێراق پەنا دەباتە بەر گازی ژەهراوی، لە کاتێکدا کە هێشتا تواناکانی سنووردار بوو و لە کاردانەوەی ڕۆژئاوا دڵنیا نەبوو کە ڕۆڵی خۆی ببینێت لەوەی کە نەهێڵێت خراپتر ڕوو بدات. بەڵام لەجیاتیی ئەوەی کەڵبەی بکێشن، سەرزەنشتکردنە لاوازەکەی ئیدارەی ڕیگان سەرنجی لەسەر گۆڕی و ڕێگەی بە عێراق دا بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بەرەو هەڵکشان ببات. دەزگای هەواڵگریی بەرگری لە ئەیلوولی ١٩٨٤دا گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کەوا عێراق بەردەوام بووە لە پەرەپێدانی توانا‌سازیی چەکی ئاسایی و کیمیایی "زەبەلاحیدا" و ئەگەری

ئەوەش هەیە "هەوڵی چەکی ئەتۆمییشی دابێت". هەروەها هیوایەکی گەش باڵی کێشابوو بەسەر سیناریۆی پاش جەنگدا و بە تۆنی "با جەنگ کۆتایی بێت"، هەڵسەنگاندنەکە پێشبینیی "لاساریی عێراق دەکات لە چارەسەرکردنی داواکاریی خاوەنداریتیی هەر دوو دوورگەی (بۆبیان و وەربە)ی سەر بە کوەیت، لەگەڵ ئەوەشدا کە کوەیت لە ماوەی ساڵانی جەنگدا پشتگیریی کردووە و ئەوە دەگەیەنێت کە پەیوەندیی بەغدا لەگەڵ وڵاتانی کەنداوی عەرەبدا بەردەوام بەرەو گرژی و ئاڵۆزی دەڕوات".[٥٨]

لە شیکارییەکی سەربەخۆدا، جولیان پێری ڕۆبنسن و جۆزێف گۆڵدبلات پێشبینیی ئەوەیان کردووە کە بەکارهێنانی بێپێشینەی عێراق بۆ تابوون لە مەیدانی شەڕدا، ئەوە دەگەیەنێت کە "پێدەچێت پاڵنەرێکی بەهێزی کارکردن بێت بۆ بەشداربوانی جەنگی کەنداو بۆ بەکارهێنانی تەنانەت کوشندەترین دەمارەگاز کە ئەگەری زیاتری کۆمەڵکوژییەکی خێرای لێ دەکەوێتەوە چەشنی توخمەکانی سارین و ڤی ئێکس VX و وەک باس دەکرێت سۆمانیش soman کە وەک یەدەگ لە ئەمەریکا و فەرەنسا و یەکێتیی سۆڤیێتدا هەڵگیراون". ئەمانە پێشبینییەکەیان بە شێوەیەکی ترسناک ورد بوو، چونکە عێراق هەر زوو دەستی کردە بەکارهێنانی زۆرینەی ئەو دەمارەگازانە.

هەر دوو لێکۆڵەر پێشبینییەکی ترسناکتریان کرد، یەکێکیان ئەوەیە کە هەستپێکردنی درەنگوەخت وەک زانینی پێشوەخت سەرسامکەرە و مایەی نیگەرانی و دڵەڕاوکێیە لە تێوەگلانی نابەجێ و نەسەلماویدا. ئەوان بە توندی ئاگادارمان دەکەنەوە کە "دژ بە خەڵکی سڤیل و بێپەنا،

فڕۆکەیەکی بە سارین بارکراو دەتوانێت بە ئەندازەی ئەو بۆمبە ئەتۆمییەی بەسەر هیرۆشیمادا بەردرایەوە، وێرانکاری بەرپا بکات"[٥٩].

ساڵی ١٩٨٤، جیهان بەرەو هەڵەبجە کەوتە ڕێ و تەواوی هێماکانی وریاکردنەوە لەوێ بوون و لە بەرچاو بوون بۆ ئەوانەی دووربینییان دەکرد.

"ئەگەر جیهان مامەڵە لەگەڵ پەیوەندیی نێوان تۆڕە تیرۆریستییەکان و دەوڵەتە تیرۆریستەکان و چەکی کۆکوژدا نەکات، ڕۆژگارێک دێت کەوا تیرۆریستان نەک زیـــاد لە (٢٤٠) کەس دەکـــوژن، وەک لە بەیروتـدا ڕووی دا، یـان زیـاد لە سـێ هەزار کەس دەکوژن وەک لە ١١ی سێبتەمبەردا ڕووی دا، بەڵکو دەیان هەزار یان زیاتر دەکوژن."

**دۆناڵد ڕامسفیڵد**
**وەزیری بەرگریی ویلایەتە یەکگرتووەکان**
**ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست**
**٢٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣**

**هێرشی بەدر (مارتی ١٩٨٥)**

عێـراق چەپـۆکێکی بەرکەوت، بەڵام سـزای تونـد نەدرا، بـۆیە کاتێـک بەرەوڕووی هێرشـێکی نـوێی ئێـران بـووەوە و هێڵەکانی بەرگری کەوتنە بەر پەلامـار، دیسـان هەڵگەڕایەوە و پەنـای بـردەوە بەر بەکارهێنـانی گـاز و بە تـایبەتیش دەمارەگاز. هێرشی مارتی ١٩٨٥، کە لە لایەن ئێرانییەکانەوە نـاوی بەدری لـێ نـرا، تـا ڕادەیەکـی زۆر کـۆپییەکی ئەوی ساڵی پێشتر بوو، کە هێزەکانی ئێران ــ پاسداران و بەسیج لەگەڵ جەنگـاوەرە عێراقییەکـانی فەیلەقـی بەدری سـەر بە

ئەنجـوومەنی بـاڵای شۆڕشـی ئیسـلامی لە عێـراق ـــ لە بێشـەڵان و زەلکاوەکـانی حـوەیزەوە بە بەلەمـی بچـووک دزەیـان دەکرد بۆ گرتنی ڕێگەی سـەرەکیی نێوان بەغدا و بەسـرە. بـۆ ئەنجامـدانی پەلامـارێکی لەناکـاو، ئێـران بـۆ شـوێنەونی کەوتە تۆپبـارانی بەسـرە و بۆردومـانی بەغـدا بە فڕۆکە و لەملاشەوە بە زوویی هێرشـە زەمینییەکەی دەست پێ کرد. هەندێک یەکەی سـەربازی گەیشـتنە شـارێکە، بەڵام هێڵی فریاخستنی پێداویستییان لاواز بوو و هەر کە گەیشتنە تەختـــایی، بـــوون بە ئامـــانجێکی ئاســـانی دەســـڕێژی عێراقییەکان.

هەروەهـا ئێرانییەکـان ویسـتیان سـەنگەرەکانی عێـراق لە مەجنوونـدا بگـرن، بەڵام ڕوانییـان دوژمنەکەیـان لە تەواوی ئامادەباشـیدایە. کاتێـک هێرشـەکە تەواو بـوو، دەرکەوت ئەمـیش وەک ئەوانـی پێشـتر بێئاکـامە و بەشـێک بـوو لە بەفیرۆدانی ژیانی هێزەکەیان و بارودۆخەکە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهـات. فەرماندەی مەفرەزەیەکی بەسیج بە نـاوی هـادی فەرەجوەنـد (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٢دا) بە سادەیی باس لە کاری ڕۆتینیی هێڵی بەرەکەی خۆی دەکات:

"سەرەتای بەهار بوو لە مەجنووندا، من کرامە بەرپرسـی ئامادەکـاری. بەیـانی زوو مەفـرەزەکەم کە (ژمارەیـان بیسـتودوو پیـاو بـوو) بە بەلەمێـک بـرد و مـاوەی (٣ ـــ ٤) کیلـۆمەتر چـووینە نـاو هێڵـی بەرەوە و دواینیـوەڕۆیەکی درەنگ گەڕاینەوە. هەندێک ڕۆژ دەبوو (١٠ ـــ ٢٠) کیلۆمەتر بچوومـایەتە دواوە بـۆ دابینکردنـی ئەو شـتانەی پێویسـتم بـوون. ئـێمە لە بەرەدا سـەلامەت بـووین، چـونکە بـنکە و سـەنگەرەکانمان زۆر لە عێراقییەکـانەوە نزیـک بـوو بە

ڕادەیەکی وا کە نەیانــدەوێرا گــاز بە کــار بێـنن لە ترسـی ئەوەی نەوەک بــا بیگێــڕێتەوە بەســەر خۆیانــدا و تەنهــا مەترسـیی چەکی ئاسـاییمان لەسـەر بـوو. بەڵام لە پشـتی بەرەوە هەموو دەم بە تۆپی کیمیایی دەیانکوتاین. کاتێکیش ئەمە ڕوویدەدا ئێمە دەهاتینە دەرەوەی سەنگەرەکانمان بۆ کەمکـردنەوەی مەترسـی، چـونکە ئەگەر وامـان نەکـردایە لە ژوورەوە دەخنکـاین و ئـێمەش کەرەسـتەی خۆپاراسـتنمان پێنەبوو، تاقە شت کە شکمان دەبرد دەستەسڕەکانمان بـوو. مـن بۆخـۆم چەنـدین جـار گـازم هەڵمژیـوە و بەختـەوەرم کە هێشتا زیندووم و نزیکەی چوارده کەس لە جەنگاوەرەکانم برینـداربوون کە برینـی چواریـان زۆر سـەخت بـوو. ئـێمە نـزیکەی مانگێـک دوای دەسـتپێکردنی هێرشـەکە پۆشـاکی خۆپاراستنمان وەرگرت".

ئەفسەرێکی عێراقی کە ناوی عەقید ڕوکن عەبدولوەهاب ئەلسـاعیدی بـوو (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٣دا) چیرۆکەکەی فەرەجوەنـدی سـەلماند و دەیگـوت کەوا "خـاڵی لاواز لە ستراتیجێتیی ئێرانییەکاندا ئەوە بوو کە نەیاندەتوانی بەردەوام بن لە پێشڕەویدا، چونکە هێزی ئاسمانیمان بە گـاز هێرشی دەکردە سـەر هێڵی فریاخسـتنی چەک و ئازووقە و هێزی یەدەگیـان. ئێمە دەبوو ناوچەکانی پشـتی بەرەیان پڕ بکەیـن لە گـاز بـۆ ئەوەی ئۆپەراسـیۆنیان پەک بخەیـن. ئێرانییەکـان لە زۆنگاوەکانـدا بە عـادەت تـاقە ڕاڕەوێکیـان دەکـردەوە و بەم جـۆرە ئەگەر ئـێمە ئەو ڕێگەیەشـمان گازباران بکردایە ئەوە دەمانوەستاندن".

هەروەهـا عەبـاس فروتـانیش لە بەرە بـوو و کاتێـک ئێرانییەکـان هێرشـەکەیان لە ١٩ی ئیسـفەندی ١٣٦٣ (١٠ی

مارتی ١٩٨٥دا) دەست پێ کرد، ئەم لەگەڵ تیمێکی سەد و بیست کەسی لە قوتابییانی پزیشکی، ساز و ئامادە بوون و هەر هەموو دەمامک یان ماسکی گاز و کەلوپەلی خۆپاراستنیان پۆشیبوو. یەکێک لەوانە کە ناوی مەحموود عەباسی بوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دێتەوە یادی کەوا هەموو کات دەستەجلی کیمیاییەکەی لە بەردا بووە، تەنانەت لە کاتی خەوتنیشدا: "دکتۆر فروتان بە توورەییەوە هاواری بەسەرماندا دەکرد ئەگەر ئەو جلەمان لە بەر نەکردایە!"

فروتان دەیگوت کەوا عێراقییەکان بە شێوەیەکی نموونەیی دوو سێ ڕۆژ چاوەڕێیان دەکرد پێش ئەوەی لە ڕێگەی بەکارهێنانی گازەوە هەڵکوتنە سەر ئێرانییەکان. یەکەم هێرشی کیمیایی لە ماوەی ئۆپەراسیۆنی بەدردا سەعات ٤ی دواینیوەڕۆی ٢٢ی ئیسفەند (١٣ی مارت) کرا و عێراقییەکان تابوونیان بە کار هێنا و قوربانی و برینداری زۆریان خست. لە ژمارەی ٢٢٣١ کەسی بەرکەوتوو سیودوویان لێ مردن، وەک فروتان باسی دەکرد[1]. فروتان تێبینیی دوو چاکسازیی بەرچاوی کردبوو لە تواناسازیی عێراقدا. یەکەمیان، عێراقییەکان بەسەر کێشەی دیاریکردنی ساتەوەختی تەقینەوەی بۆمبەکاندا زاڵ بوون و بۆمبێک بە فیوزی کاتی تەقاندنیدا وا دیزاین دەکرا نەک بەپێی کەوتنی، بەڵکو بەپێی کاتی پێشتر دیاریکراوی و بە عادەت ڕێک پێش ئەوەی بگاتە سەر زەوی بۆ زیادکردنی خەسارەت و زیانی. ئەگەر فیوزەکە عەیبدار بێت یان لە کار کەوتبێت ئەوە بۆمبەکە ناتەقێت، بەڵام هەر بە جێی مەترسی دادەنرێت. لە ماوەی ئۆپەراسیۆنی خەیبەردا، فروتان تێبینیی گەلێک لەو

بۆمبە نەتەقیوانەی کردبوو، بەڵام ئێستا بۆمبەکان "زۆر بە باشی دەتەقن". ئەمە وا دەگەیەنێت کە عێراقییەکان یان توانیویانە فیوزەکانی کات دیاریکردن چاک بکەنەوە یاخود بە شێوەیەک گۆڕیویانە بۆ ئەوەی لە بەرکەوتندا بتەقنەوە و هەندێک لەم بۆمبانە ساڵێک دواتر لە لایەن تیمێکی نەتەوە یەککگرتووەکانەوە دۆزرانەوە.

دووەم چاکسازی بریتی بوو لە بەکارهێنانی تابوون. لە کاتی خەیبەردا عێراقییەکان هێشتا نەیاندەتوانی ئەم گازە شلە بە شێوەیەکی کاریگەر بەسەر مەیدانی شەڕدا بڕێژن، بەڵام وا دەردەکەوێت ئێستا لە ڕووی جۆرەوە چاکیان کردبێت و بیڕژێننە سەر ناوچەیەکی بەربڵاوتر. سەرەڕای کوشندەیی بێئامانی تابوون، بەڵام گازی خەردەل هەر بە باشترین چەکی عێراقییەکان مایەوە بە هۆی مانەوەیەوە بۆ ماوەیەکی دوور کە هێزەکانی ئێرانی ناچار دەکرد بۆ ماوەیەکی زۆر ناوچە بەرکەوتووەکان چۆڵ بکەن، بە تایبەتی لە ناوچەکانی پشتی بەرەدا، کە زۆرینەی هێزە پاڵپشتەکان و کارمەندانی پزیشکیی چەتری پارێزگارییان بەسەرەوە نامێنێت.

بێجگە لە تابوون و گازی خەردەل، فروتان باس لە بەکارهێنانی توخمێکی کیمیایی نوێ دەکات کە بە شێوەیەکی کاتی وەک گازی سیانید پێناسەی دەکات و توخمێکی کوشندەیە. فروتان (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەگێڕێتەوە: "من هێرشێکم دێتەوە یاد کەوا قوربانییان تێیدا زۆر بە خێرایی دەمردن. ئامرازی چاودێریی ئێمە (چاودێریی توخمی کیمیایی) نەیتوانی گازەکە دەسنیشان بکات. سیانید زۆر زوو دەبێتە هەڵم و خێرا دەڕەوێتەوە،

بۆیە پێویستە خێرا لە شوێنی بەرکەوتن دوور بکەویتەوە. بە شێوەیەکی ئەڵتەرناتیڤ گازێکی زۆر چڕ ڕەنگە هەمان کاریگەریی هەبێت.*

بەکارهێنانی گازی سیانید لە لایەن عێراقەوە لە ئۆپەراسیۆنی بەدردا، یان لە هەر قۆناغێکی کاتی جەنگدا، بە نەسەلمێنراوی ماوەتەوە. بەوپێیەی سوپای ئێران سیستەمێکی بەرگریی گونجاوی نەبوو لە چەکی کیمیایی، بۆیە دەستنیشانکردن کێشەیەکی جیددی بوو بەرەوڕووی دکتۆرەکان دەبووەوە کە پێشتر ئەزموونێکی ئەوتۆیان لەسەری نەبوو، بێجگە لەوەش هەموو ساڵێک بەرەنگاری پەرەسەندنی نوێی گازی عێراق دەبوونەوە. سەرەڕای ئەوەش توخمەکانی دەمار کوشندەی خێران و ئەوانەی کە دەرزیی ئەترۆپین لە خۆ دەدەن و دەمێننەوە و بە دەگمەن نیشانەی درێژخایەنیان پێوە دەمێنێت.

گازی سیانید لە تابوون خێراتر دەکوژێت و بە زۆرییش لە ماوەی یەک دوو دەقیقەدا. لەبەر ئەوەی سیانید کار دەکاتە سەر هیمۆگلۆبین ـــ کە ئۆکسجینی ناوخوێنیان هەڵگرتووە و ـ قوربانی لە ناو لەشی خۆیدا دەخنکێت زیاتر لەوەی بە هۆی نەبوونی هەواوە بێت. فریاکەوتنێکی خێرا دەتوانێت نەخۆش ڕزگار بکات. کاردانەوەی نموونەیی بۆ دەرمان بەکارهێنان سێرەمێکی نیتریتی ئەمیلە بە هۆی هەڵمژینەوە. ئەگەر نەخۆشەکە چاک بووەوە دکتۆرەکان بڕوا بەوە دێنن کە پشکنینەکەیان ورد بووە. لە ماوەی جەنگدا دکتۆرە ئێرانییەکان بە شێوەی پچڕپچڕ ڕاپۆرتیان لە سەر بەکارهێنانی نیتریتی ئەمیل دەدا لە هەندێک حاڵەتدا کە گومانی گازی سیانیدیان لێ دەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێران

به فـــڕۆکە چەنـــدین قوربـــانیی ڕەوانەی نەخۆشـــخانەکانی ئەورووپا کرد بۆ چارەسەر و لە هەمان کاتیشدا بۆ سوودی پڕۆپاگەنـدەش. زۆربەی ئەم حاڵەتـانە پەیوەنـدییان بە گـازی خەردەلەوە هەبـــوو، بەڵام دکتـــۆرێکی خەڵکـــی ڤیەننـــا و پســـپۆڕێکی ژەهـــری بەلجیکـــی، بە نـــاوی ئـــۆبن هاینـــدریکس، باسیان لەوە کردووە کە نەخۆشـەکانیان گرفتـاری "هەنـدێک تـــوخمی کیمیـــایی بـــوون کە ســـیانیدیان تێـــدا بـــووە"[٢]. بە هەرحـاڵ، بە هـیچ جۆرێـک ڕێـی تێناچێت عێـراق قەت گـازی سیانیدی بە کـار هێنابێت، لەبەر چەنـد هـۆیەک کە لە بەشـی هەشـتەمدا بـاس کـراوە. بەوپێـیە ئەم سـەرنجە پزیشـکییانە دەکرێت بە گومانێکی تەواوەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.

لە پرۆتێسـتێکی چالاکـدا دژ بە نەتەوە یەکگرتووەکـان، لە مـــــارتی ١٩٨٥دا، کە یەکەم جـــــار بـــــوو هەڕەشـــــەی "تـــۆڵەکردنەوەی" تێـــدا بکرێـــت، ئێـــران ســـکاڵای لە تێکـــڕای ســـیودوو هێرشـــی کیمیـــایی جیاجیـــا کـــرد لە مـــاوەی ئۆپەراسیۆنی بەدردا، لە مەجنوون، کە تێیدا هەر دوو گـازی خەردەل و سـیانید بە کـار هـاتووە[٣]. لەبەر ئەوەی شـەڕ و کوشـتار کۆتـایی نەهـاتبوو لەو دەمەدا کە پێرێز دیکـۆیلار لە سـەرەتای نیسـاندا سـەردانی نـاوچەکەی کـرد، ئێـران دەکـرا ڕاستەوخۆ ناڕەزایی و بێزاریی خـۆی بگەیەنێت و بە توندی بەڵێنـــی نەتەوە یەکگرتووەکـــان بیـــری ســـکرتێری گشـــتی بێنێـتەوە بـــۆ چـــاودێریکردنی پابەنـــدبوون بە ڕێکەوتننـــامە نێودەوڵەتییەکـان و پاشـانیش داواکردنـی لێکـۆڵینەوەیەکی نوێ[٤].

سـەردانەکەی پێرێـز دیکـۆیلار قەنـاعەتی پـێ کـرد کە ئێرانییەکـان خاڵێکیـان هەیە کاتێـک کە گفتوگـۆ دەکەن پێیـان

وایە ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان دەبێ ڕەچاو بکرێن، تەنانەت بێ ڕێککەوتنیش لەسەر هیچ ئاگربەستێک. ئەو باس لەوە دەکات کە تاوەکو ناکۆکی و ململانێ دەگاتە ئەنجام "ئەو لە ڕووی یاساوە پێویستە هەوڵ بۆ کەمکردنەوەی کاریگەرییەکانی بدات، لە شوێنانی وەک هێرشکردنە سەر مەڵبەندی نیشتەجێبوون، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، مامەڵەکردن لەگەڵ دیلی جەنگدا، سەلامەتیی دەریاوانی و فڕۆکەوانیی مەدەنی"[٥]. هەر بەو گیانەوە، فەرمانی دا لێکۆڵینەوەیەکی تر ئەنجام بدرێت لەسەر ئیدیعاکانی چەکی کیمیایی. بە هەرحاڵ، ئەم جارەیان لەجیاتیی ناردنی شارەزایان بۆ ناوچەکە بەپەلە دکتۆرێکی دەرمانسازی نارد بۆ پایتەختە ئەوروپییەکان بە مەبەستی پرسیارکردن لە قوربانییە ئێرانییەکان، کە ڕژێم بەو نیازەی ناردبوون پڕۆپاگەندەی بۆ بکەن کاتێک کە دکتۆرەکان چارەسەریان دەکەن.

دکتۆرەکە لە کۆتایی مانگی نیساندا ڕاپۆرتی لێ گێڕانەوە. ئەو ئێرانییانەی لە نەخۆشخانەکان کەوتبوون، بە ئاشکرا قوربانیی چەکی کیمیایی بوون، بەپێی ئەنجامگیریی دکتۆرەکە، بە وردییش هیی گازی خەردەل بوون، بەڵام بێ بەڵگە و بنەمایەکی بەهێز پشتگیری لە قەناعەتی ئێران نەکرد کە تاوانبار ئێران بووبێت یان هیچ جۆرێکی تری گاز بێجگە لە خەردەل بە کار هاتبێت. بە کورتی ئەو بە نەرمی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە چەکی کیمیایی "لە مارتی ١٩٨٥دا لە جەنگی نێوان ئێران و عێراقدا بە کار هاتووە"[٦].

کاردانەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان وەک هەموو جارێک لاواز بوو. سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایش لە "تێبینییەکدا"

ڕای گەیاند کەوا ئەندامانی ئەنجوومەن "ترسیان لێ نیشتووە لەوەی کە چەکی کیمیایی دژ بە سەربازانی ئێران بە کار هاتووە لە ماوەی مانگی مارتی ١٩٨٥دا" و "هەر پێشێلکردنێکی یاسای مرۆڤایەتی و نێودەوڵەتیی" مەحکووم کرد و داوا لە "هەر دوو لا" دەکەن ڕەچاوی بکەن[٧]. بەم ڕەنگە عێراق تێگەیشت کەوا لە کاتێکدا ئەنجوومەن زۆر بێز لە چەکی کیمیایی دەکاتەوە، بەڵام پێدەچێت چاو لە بەکارهێنانی بپۆشێت، چونکە عێراقییەکان وای لەقەڵەم دەدەن کە بەرەوڕووی هەڕەشە و مەترسی بوونەتەوە.

بەم جۆرە بەکارهێنان بەردەوام بوو، بەڵام بە هۆی ئەوەوە کە هێرشێکی تری گەورەی ئێرانییەکان نەکرا، ڕاپۆرت و باسی بەکارهێنانی تری چەکی کیمیایی پچڕپچڕ و کەم بووەوە. ئێران عێراقی بەوە تاوانبار دەکرد کەوا لە مایس و نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٨٥دا بە تۆپی کیمیایی بۆردمانی هێزەکانی کردووە و دیسان هەمان کردەوەی لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٦دا ئەنجام داوەتەوە. بەڵام هیچ کام لەم هێرش و بۆردمانانە چ کاردانەوەیەکی نێودەوڵەتیی بەرپا نەکرد. پاشان فاوی بەسەردا هات.

### داگیرکردنی فاو (شوباتی ١٩٨٦)

شــــەڕەکەی فـــاو بـــۆ بەســـیج لە یەک کاتـــدا جێـــی خۆشـحاڵییەکی بێپایـان و تـۆقینەریش بـوو. لە مـاوەی پێنج ساڵدا یەکەم جـار بـوو ئێـران ڕووبەڕێکـی گەورەی خـاکی عێـراق زەوت بکـات، بەڵام ئەم ســەرکەوتنە زۆر قــورس لەسەری کەوت. ئەمە ئۆپەراسیۆنی وەلفەجر/٨ی ئێران بوو کە مەبەستی تێکشکاندنی لووتبەرزیی عێراق بوو، بێجگە لە بـاری ئـارامی و ئاسایشیشـی. نـیمچەدوورگەی فـاو کە دەکەوێتە باشووری بەسرەوە، تاقە دەلاقەی عێراق بوو بۆ سـەر کەنـداو و بـێجگە لەوە ئیتر تەواوی سنووری وڵاتەکە وشـکاییە. لەدەسـتچوونی فـاو خنکانـدنی هەنـاردەی نەوتـی عێراق بـوو و وای لـێ کـرد بە تەواوەتـی پشـت بەو بـۆرییە نەوتـانە ببەسـتێت کە بە سـعودیە و ئـوردن و تورکیـادا تێدەپەڕی. هەروەهـا هێزەکـانی ئێرانـی لە دەروازەی بەسـرە نزیـــک دەکـــردەوە و بە هەرەشـــەکردن لەو شـــارە، مەترسـیدارترین بەرەنگـاربوونەوەی ڕژێمـی پێـک دەهێنـا. دواجاریش هێزەکانی ئێرانی لە سنووری کوەیت و سـعودیە نزیک دەکردەوە، ئەو دوو وڵاتەی یارمەتیی دارایی کۆششـی جەنگی عێراقیان دەکرد، ڕێکوڕەوان بۆ دانانی بەربەستێک لە ڕێـگەی پێشـڕەویی هێزەکـانی ئێرانـدا بەرەو بیرەنەوتەکـانی ئەمان.

هێرشەکە لە بەرەبەیانی ١١ی شوباتی ١٩٨٦دا دەستی پێ کرد، وەختێک هێزەکانی ئێران لە ڕووباری ئەروەند پەڕینەوە بە هۆی بەلەم و بەسەر پردی کاتیدا و پاش هەندێک کۆسپ و تەگەرە لە سەرەتادا جێپێیەکی بایەخداریان دەست کەوت (تێکەڵبوونی هەر دوو ڕووباری دیجلە و فورات لە عێراق بە شەتتولعەرەب دەناسرێت، بەڵام لە ئێران ئەروەند ڕوودی پێ دەگوترێت، و).

تەقی ئاغایی خۆبەخشێکی بەسیج بوو کەوا زۆرترین بەشی جەنگی وەک پەیامنێرێکی سەربازیی نزیک بەرە بەسەر برد و (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) باس لەوە دەکات کە "من جەنگم خۆش دەویست تەنانەت پاش ئەوەش کە بە پارچەتۆپ دەستێکم پەڕی، بۆیە پێم لەسەر ئەوە داگرت کە بگەڕێمەوە بۆ مەیدانی شەڕ. لێرە ژیانێکی زۆر سەخت بوو، بەڵام من پێی ڕاهاتبووم و هەرگیز کەسیشم نەکوشت." ئەو ئەمەی دوایی بە شانازییەکی زۆرەوە گێڕایەوە. ئاغایی لە باسکردنی ئەوەی چۆن ڕووباری ئەروەندی بڕیوە، دەگێڕێتەوە:

"ڕەشەبایەکی توند هەڵی کردبوو و زۆر لە سەربازەکانمان لە دەست دابوو. هەندێک لە غەواسەکانمان تەوژمی بەهێزی ئاوەکە بردنی، بەڵام زۆرمان پەڕینەوە. ئێمە عێراقییەکانمان تووشی سەرسووڕمان کرد و ناوچەی سەرووی کارگەی خوێمان گرت کە پڕ بوو لە مینی ئەرزی. دوو ڕۆژ دوای ئەوە ــ کە مانگ تەواو پڕ بوو ــ بە تۆپی کیمیایی دایان گرتینەوە و ئێمە ڕامان کردە دواوە بۆ ڕووبارەکە، من بە هۆی دەستمەوە نەمدەتوانی ماسکەکەم لە سەر بکەم. هەر کە گەڕاینەوە دەموچاوی زۆرێک لە

پیاوان بڵقی کردبوو و خەریک بوو دەخنکان. دکتۆرەکانی نەخۆشخانە گەڕۆکەکە بە تەواوی پەشۆکابوون و کارەساتێک بوو بۆخۆی. زیاد لە نیوەی پیاوەکانمان مردن و هەر وا بە ئاسانی چارەسەر و چاودێریی پزیشکیی تەواو مەیسەر نەدەبوو. من بە چاوی خۆم جوامێریی ئەو پیاوانەم دەدی و هەندێکیان ماسکەکانیان دەدا بە هاوەڵەکانیان و پاشان دەمردن. بە ڕاستی ئەم کارە لە باوەڕی کەسدا نەبوو!"

ئەحمەد ناتیقی، سەرۆکی وێنەگرانی ئاژانسی هەواڵی ئێرانی، هەمان یادەوەریی هەبوو. ئەو لە تارانەوە زوو زوو سەردانی خێرای هێڵی بەرەی دەکرد. لە سەرەتای ئۆپەراسیۆنەکەی فاودا بە یاوەریی ڕۆژنامەنووسانی فەرەنسی لە ڕووبارەکە پەڕییەوە. هێزەکانی ئێران دوو پردیان دروست کردبوو، یەکێکیان بۆ تانک و زرێپۆش لە بۆریی ئاسنی پێکەوە لەحیمکراو پێک هاتبوو و لمی بەسەردا کرابوو، دووەمیش لە کەڵەکی تەپەدۆری بە یەکەوە بەستراو دروست کرابوو و بە ئاسن داپۆشرابوو و لە بەری ئێرانەوە دانرابوو و بە هۆی بەلەمی بچووکەوە لە ڕووبارەکەدا ڕادەکێشرا لە کاتی لەبار و گونجاودا. ڕۆژنامەنووسە فەرەنسییەکان سەریان لە کاری ئێران لەم ئۆپەراسیۆنە سەرکەوتووەدا سووڕمابوو. عێراقییەکان ڕاداری "ڕازق"یان هەبوو و وەک خۆیان دەیانگوت دەیتوانی تەنانەت جموجوڵی بچووکی هێزەکان دەربخات. ئەی باشە چۆن نەیانتوانی هێرشی ئێرانییەکان دەسنیشان بکەن؟ ناتیقی دوو هێرشی کیمیایی دێتەوە یاد، یەکێکیان لە ڕۆخی ئێرانەوە و دووەمیان لە کلینیکی مەیدانیی فاودا کە

ئـامۆزاکەی نـاتیقی تێـدا چارەسـەری برینـدارانی گـازی خەردەلی دەکرد. ناتیقی بە ژمارەی کوژراو و بریندارەکاندا گەیشـتبووە ئەو ئەنجـامەی کە بـڕ و قەبـارەی زەخیـرە کیمیاییەکە بە شێوەیەکی نائاسایی خەست بووە.

هەروەهـا دکتـۆر فروتـانیش، کە چووبـووە فـاو، هێرشـی کیمیـایی ٢٣ی بەهـمەن، یـاخود ١٢ی شـوباتی بینیبـوو و بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ لە هێرشـەکەدا بووە، کە یەکێک لە درێژترین و خەسـتترین هێـرش بـوو لە سـەرجەمی مـاوەی جەنگـدا. کەشوهەوا خۆش و فێنک بوو، وەک دەیگوت، پلەی گەرما نـزیکەی ٢٠ی سـەدی بـوو و شـنەبایەکی خۆشـی دەهـات. سـەعات دەوروبەری ٥ی ئێـوارە بـوو کە نـزیکەی سـیودوو فڕۆکە بە ڕیزبوونێکی تایبەت بە گاز بۆردمـانێکی خەسـتیان کـردین و ناوچەکەیـان تەواو گـازڕێژ کـرد. "یەکەم جـار دوو هەزار و پێنجسەد حـاڵەتی بەرکەوتنـی گازمـان هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی گـــــازی خەردەلەکە بە دارخورماکـــــانەوە نووسـابوو، زیانمـان لە مـاوەی دوو ڕۆژدا گەیشـتە هەشـت هەزار و پێنجســەد کـوژراو و برینـدار. ئـێمە نەمانـدەتوانی ناوچەکە پاک بکەینەوە و تا مـاوەی مانگێک دوای ئەوە هەر بۆنی گازی خەردەلمـان دەکـرد و بەردەوام دوعامـان دەکـرد بارانێـــک ببارێـــت، کە دواجـــار دایکـــرد و کیمیـــاییەکەی شـــۆردەوە. بەڵام لەو مـــاوەیەدا گەلـــێ حـــاڵەتی نـــوێی خەردەلمان بینی." دواتر ئێران سکاڵای ئەوەی دەکرد کە لە فـاو دوازدە هەزار بەرکەوتـووی کـوژراو و برینـداری تەنهـا چەکـی کیمیـایی هەبـووە. لەم شـەڕەدا بە تەنهـا سـەربازە ئێرانییەکـان نەبـوونە قوربـانیی هێرشـەکانی گـازی عێـراق، بەڵکو هێزەکانی عێراق خۆیشـی بوون بە قوربـانی. فروتـان

دەڵێت "ئێمە هەندێک لە دیلەکانی عێراقیشمان چارەسەر دەکرد، لەوانەی کە برینداری گازی خەردەل بوون و پێیان گوتین کە فڕۆکەوانەکانیان هێڵی بەرەیان کردووەتە ئامانج و سەنگەرەکانی عێراق و ئێرانیش زۆر لە یەکەوە نزیک بوون و هەڵبەت هێڵی بەرەش ڕاستەوڕاست نەبوو".

دەرکەوتنی کوژراو و برینداری شەڕی کیمیایی عێراق مشتومڕێکی باشی خوڵقاند. ئێران ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە ئەوانە قوربانیی "ئاگری دۆستانەن" و لە هەمان کاتیشدا عێراق کردبوویە بەڵگەی ئەوەی کە ئێرانیش گاز بە کار دێنێت. تیمێکی شارەزایانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان پاش لێکۆڵینەوە، لەگەڵ دید و بۆچوونی ئێرانییەکاندا هاوڕێ بوون. حەڤدە ساڵ دواتر ئەفسەرێک لە بەغدای دوای بەعسدا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) هەمان ڕای هەیە و دەڵێ کەوا گەلێک دۆست و برادەری هەن بە گازی عێراق بریندار بوون لە فاودا: "پێیان گوتم ئاڕاستەی با گۆڕا و بۆنی گازیان دەکرد."

لە پاش دە ڕۆژ شەڕکردن و سەرەڕای بۆردمانی کیمیایی خەست، عێراقییەکان زانییان کەوا بەشێکی نیمچەدوورگەکەیان لە دەست داوە و شەڕەکە هەزاران سەربازی لە دەست دان و کوژران و چەند جارانی ئەوەش بریندار. دکتۆرێکی نەشتەرکاری عێراقی کە چارەسەری بریندارەکانی کردووە لە بەسیە (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٦دا) باسی لەوە دەکرد کە "هەزاران و ڕەنگە دەیان هەزار برینداری بینیبێت" و بە تەنها خۆی دووسەد و پەنجا حاڵەتی سامناکی دەست و قاچ بڕینەوەی لە دوو هەفتەدا ئەنجام داوە. بەزین و تێکشکاندنەکە ڕەخنە و ناڕەزایییەکی

بینوێنەی لێ کەوتەوە دژ بە سەدام حسێن لە نێو فەرماندە سەربازییەکاندا، کە وایان هەست دەکرد بە سەقەتی ئیدارەیان دەدات، سەرباری نەبوونی ئەزموون و زانیاری لە بارەی کاروباری سەربازییەوە. ئەمە ترسی خستە دڵی سعودیە و بە تایبەتی کوەیتی دراوسێوە کە لە دووریی چل کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی سنووریەوە بە ئاشکرا گرمەی تۆپ دەهاتە گوێی. لەبەر ئەوە بە هەڵەداوان پەنایان بردە بەر ڕۆژئاوا یارمەتییان بدات لە ڕووبەڕووبوونەوەی گوژم و هێرشێکی ئێران بەرەو کێڵگەکانی نەوتیان. ئەنجامەکەشی، بڕیارێکی نوێی ئەنجوومەنی ئاسایش بوو کە داوای ئاگربەستی دەکرد. ئەمەش هەڵوێستێک بوو عێراق پشتگیریی دەکرد و ئێران ڕەتی کردەوە و پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە یەکەم جار عێراق بە دەسدرێژیکاری سەرەکی و پێشێلکاری بەردەوامی یاساکانی جەنگ ناو ببرێت. کاتێک ئەنجوومەن ئەمەی پێ نەدەکرا، ئێران بەوە تاوانباری دەکرد کە بەرپرسیارە لە بەردەوامبوونی جەنگ. بەڵام پێشوازیی لە کۆششی سکرتێری گشتیی دەکرد بۆ ڕێگرتن لە پەرەسەندنی زیاتر[٨].

لێرەدا ئاماژە بە بڕیاری پێریز دیکۆیلار دەکرێت بۆ دەستپێکردنی لێکۆڵینەوەیەکی نوێ لە بارەی سکاڵای ئێرانەوە لەمەڕ گەرمکردنی جەنگ بەوەی کەوا عێراق چەکی کیمیایی بە کار دێنێت و ئەم جارەیان ئێران ئەو ئامانجەی بەدی هێنا کە پێشتر و بۆ ماوەیەکی دووردرێژ چاوبەستیی تێدا دەکرا، ئەویش ڕاستەوخۆ دەسنیشانکردنی عێراق بوو وەک ئەنجامدەر. تیمی شارەزایان لە مانگی مارتدا چوو بۆ بەرەو لەوێ سەردانی نەخۆشخانەی

مەیدانیی فاتیمەی زەهرای کرد و چاوپێکەوتنی لەگەڵ قوربانییانی گازی ژەهراوی کرد کە لە ناویاندا دیلی عێراقیش هەبوون. لە هەمووشی گرنگتر تیمەکە چاوی کەوت بە فڕۆکەوانێکی دەستگیرکراوی عێراق کە "بە خوایشتی خۆی لەگەڵمان دوا، خۆبەخشانە و بێ هیچ زۆرلێکردنێک" و ئەوەی سەلماند کە "لە دوو ئەرکی تایبەتدا" بەشدار بووە و بۆمبی کیمیایی بە کار هێناوە[٩]. شایەتییەکەی ئەم فڕۆکەوانە گەورەترین زیانی بە ڕژێمی عێراق گەیاند.

بە هۆی شکستهێنان لە دەسنیشانکردنی عێراق وەک ئەنجامدەر لە سالانی ١٩٨٤ و ١٩٨٥دا، ئەنجوومەنی ئاسایش ئیشارەتێکی نارد بۆ عێراقییەکان کە پشتگیریی کۆششیان دەکات بۆ ئەوەی ئێران بدەنە ناو. بەلام ئێستا تیمێکی لێکۆڵینەوە لە لایەن سکرتێری گشتییەوە نێردراوە و فشاری خستووەتە سەر ئەنجوومەن، بۆیە هیچ شتێکی تری لە بەردەمدا نەماوەتەوە ئەوە نەبێت کە پێ لە ڕاستییەکان بنێت. لە ڕاگەیاندنێکی سەرۆکایەتیدا، ٢١ی مارت، ئەنجوومەن ئەوەی دەربڕی کە "لە گەلێک حاڵەتدا چەکی کیمیایی لە لایەن هێزەکانی عێراقەوە دژ بە هێزەکانی ئێران بە کار هاتووە" و "بە توندی" ئیدانەی بەردەوامبوون دەکات لە بەکارهێنانی گازدا[١٠]. "سەرنجێکی" لەم چەشنە کەمتر خۆی ڕاگرت لە بڕیارێکی ئەنجوومەنی ئاسایش کە پابەندبوونی یاسایی بەهێزتر بوو. بێجگە لەوەش ئەنجوومەن گوناهبارکردنەکەی سووک کرد بە ئاماژەکردن بۆ داگیرکردنی فاو لە لایەن ئێرانەوە، بە داواکردن "لە هەر دوو لا کە ڕێز لە یەکێتیی خاکی هەر دوو ولات بگرن".

هەروەهــا ئەنجــوومەن ئەوەشــی ڕوون کــردووەتەوە کە عێراق، بە پێچەوانەی ئێرانەوە، داواکاریی پێشتری سەبارەت بە دەسبەجێ ڕاگرتنی شەڕی قبووڵ کردووە.

بەم کارانە ئەنجوومەن ئەوەی پیشـان دا کە سـەرکەوتنی ئێـران لە فـاودا سـنووری توانـای عێراقـی بەهێـز کـرد لە پەیڕەویکردنـی شـێوازی چەک بەکارهێنانـدا. لە کاتێکـدا کە دەیتــوانی ڕاســتی بخــاتە چوارچێــوەی خــۆیەوە، بەڵام سەرزەنشـتکردنی لاوازیی ئەنجـوومەن، جەختکـردن بـوو لە زیـادبوونی مەترسـی لە سـەرکەوتنێکی ئێـران. سـەبارەت بە ئێرانیش تاوتوێکردنی تیمەکە بنەمای پەرەسـەندنی پێک هێنـا و سوپاسـی سکرتێری گشتیی کرد بۆ ڕاپۆرتە "هاوسـەنگ و ڕەواکەی"[11]. بەڵام ســەبارەت بە عێــراق، ســەرلەقاندنی ئەنجوومەن بۆ ئێران، پێشـینەیەکی ترسـناکی داڕشـت. تـاریق عەزیز، بە تاوانبارکردنی ئەنجوومەن کەوا "ئاسـتی پێویسـتی هاوسـەنگراگرتنی نیـیە" بە تونـدی دابەزیـیە سـەر "هەنـدێک لایەنـی نێـودەوڵەتی کەوا فرمێسـکی تیمسـاح هەڵـدەوەرێنن، چـونکە ڕێککەوتننـامە نێودەوڵەتییەکـان هەمـان ئەو لایەنـانەن کەوا کەلوپەل و کەرەستە دەدەنە ڕژێمی بەربەریی ئێران بۆ کـاری چەپەڵ و دەسـدرێژیکردن، لەوانە چەک و زەخیـرە و تەقەمەنی و پارچەی یەدەگ و پێداویستیی سەربازی"[12]. بـۆ تـاریق عەزیـز، بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی مەسـەلەیەکی لاوەکی بـوو، وەک چاوبەستییەک بۆ ئەرکی ئەنجـوومەن لە دۆزینـەوەی کۆتاییەکـدا بـۆ ئەم دوژمنـایەتییە. باشــە چـۆنە ئەگەر وڵاتـانی ڕۆژئــاوا خەریکــی چەکــدارکردنی ئێــران بووبێتن؟

. **تەفرەدان: مەسەلەی ئێران ـ کۆنترا**

نوێکردنەوەی پەیوەندیی دیبلۆماسیی نێوان ئەمەریکا و عێراق لە نۆڤەمبەری ١٩٨٤دا باشبوونێکی بەرچاوی بەختی عێراقی بە دوادا هات. بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان دەستبەجێ زەمانەتی دابینکردنی قەرز و هاوکاریی تری دارایی زیاد کرد. کارمەندانی سەفارەت لە بەغدا لە شازدە کەسەوە لە ساڵی ١٩٨٤دا بوون بە سیوپێنج لە ساڵی ١٩٨٨دا، لەوانە مەکتەبێکی سەرەکیی (سی ئای ئەی) لەگەڵ پاشکۆ (مولحەق)ێکی سەربازی کە ئەفسەرێکی پلە بەرزی دەزگای هەواڵگریی بەرگری و ئەفسەرێکی هێزی ئاسمانی بوون. لە لایەکی ترەوە، کاربەدەستانی عێراق بە ڕابەریی نزار حەمدوونی سەفیری چالاک و بزێو و شارستانییان لە واشنتۆن دەرگایان بۆ ئاوەلا کرا. حەمدوونی، ئەندازیاری تەلارسازی، پیاوێکی بەتوانای حیزبی بەعس بوو، لە خانەوادەیەکی ناوداری سەردەمی بنەماڵەی پاشایەتیی هاشمی و دڵسۆزی وڵاتەکەی خۆی و سەرکردەکەی بوو. لەو کاتەی ساڵی ١٩٨٣وە کە گەیشتە ئەمەریکا، شالاوێکی تۆکمەی دەست پێ کرد و بە شێوەیەکی بەرچاو سەرکەوتوو بوو لە کەمکردنەوەی ڕەخنەی ئاشکرا لەسەر عێراق تا ڕادەیەکی باش.

به هەرحـــاڵ، لەگەڵ کۆششـــی چـــاکی حەمدوونیشـــدا، ویـــلایەتە یەکگرتووەکـــان هەرگیـــز تەفـــرەی نەدەخـــوارد سـەبارەت بە سروشـتی ڕژێمـی عێـراق و تواناسـازییەکەی. کەم کەس عێراقی بە هاوپەیمان دەزانی و لەوەش کەمتر بە دۆست، بەڵام وەک قەڵایەکی قایم دژ بە شۆرشی ئیسلامیی ئێران تەماشای عێراق دەکرا و لەم ڕووەوە بە شیاو دەزانرا ویلایەتە یەککگرتووەکان یارمەتیی بدات. بەمپێیە کەسانێکی زۆر لە واشنتۆنی پایتەختی ئەمەریکا لووتیان لە ئاست ئەم ڕژێـمە بـۆگەنە دەگـرت، بەڵام لە هەمـان کاتـدا چاویـان لە ئاست خراپترین ستەمکارییەکانی دەنوقاند و هەمووشـی بە هــۆی پارێزگـــاریکردنی کەنـــداوەوە بـــوو. خەملاَنـــدن و تـــاوتوێکردنەکەی ئەیلـوولی ١٩٨٤ی دەزگـــای هەواڵگریـــی بەرگـری لەســـەر بـاری ئـابووری و ســـەربازیی عێـراق بە ئاســـانی گریمـــانەی بەردەوامیـــی عێراقـــی کـــردووە لە بەکارهێنـــانی چەکـــی کیمیاییـــدا[١٣]. لێکـــۆڵینەوەیەکی تـــری هەواڵگـــری، لە دوادوایـــی ســـاڵی ١٩٨٦دا، بە ســـاردێکەوە تێبینیـــی کـــردووە کەوا عێـراق سـارین پەرە پـێ دەدات[١٤]. بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لە ئەجێنـدادا هەر مـابووەوە، بەڵام لە کاتێکدا کە پەیوەندییەکان گەشەیان دەکرد، ئەمیانی دادەپۆشی.

بـاڵوێز دێڤید نیوتن کە ئاسـانکاری و ڕاییکردنـی بۆ زۆر مەسـەلە کـردووە بە ئاڕاسـتەی ئەم لایەنگرییەدا، دواتـر (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠١دا) ئیدیعای ئەوە دەکـات کە "لە ساڵێکدا چەندین جار" مەسـەلەی چەکی کیمیایی خستووەتە بەر بـاس و لێکـۆڵینەوە لەگەڵ هاوکـارە عێراقییەکانیـدا و کـارەکە "تەنهـا ڕووکەش نەبـووە، بەڵکـو مەبەسـتمان بـوو

بەکارهێنــان و بڵاوبــوونەوەی ئەم چەکــانە قەدەغە بکەیــن. بەڵام بە ئاشــکرا هەوڵێکــی بێهــودە بــوو و بۆچوونیــان ئەوە بــوو کە دەیــانگوت: (ئێــوە دەتانەوێــت ئــێمە جەنــگ ببەینــەوە، کەچی...)"

عێراقییەکـان هـیچ وەختێـک پێیـان لە بەکارهێنـانی چەکـی کیمیــایی نەدەنــا و لەجیــاتیی ئەوە بە چاوبەســتی و تەفــرەدانەوە باســیان لە پێویســتیی بەکارهێنــانی "هەمــوو هۆکــارێکی پێویســت" دەکــرد لە بەرانــبەر دوژمنــدا. نیــوتن دەگێڕێتەوە، تەنها یەک جار نەبێت کە تـاریق عەزیز پەردەی لەســەر ئەو کــارە لادا و لە ســەردانێکی لـیێس ئەســپیندا بـۆ بەغـدا، کە ســەرۆکی کۆمیتەی خزمەتگـوزاریی چەک بـوو لە ئەنجــوومەنی نوێنەرانــدا، عەزیــز کە "هەمیشــە پیــاوێکی لەســەرخۆ و بێــدەنگ بــوو" زۆر بە تــووڕەییەوە دەنگــی هەڵبڕی و گوتی: "بەڵێ بێگومان ئێمە چەکی کیمیایی بە کار دێنین! ئەوانە دڕندەن و ئێمەش دەبێت بەرگری لە خۆمـان بکەین و ئەگەر چەکی ئەتۆمییشمان هەبێت بە کاری دێنین!"

وەک عێراقییەکان تێگەیشتبوون، دیبلۆماسیەتی واشنتۆن هەمــووی دەمچەورکــردن بــوو، بەڵام چاوســوورکردنەوەی تێدا نەبوو. بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان تەنها بایەخی بە هەڵوێستی عێراق دەدا لە بـارەی پرۆســەی ئاشــتی و پشــتیوانیکردنی لە تیرۆریزمـی نێودەوڵەتییەوە. ئەوەی کە دەسنیشـان دەکرا لە شەڕگەکاندا جێبەجێ بکرێت، کـاریگەریی بەسـەر سیاسـەتی ویلایەتە یەکگرتووەکـانەوە نەبوو. هەڵکشـان و پەرەسـەندنی چەکـــی کیمیـــایی مەســـەلەیەکی گرنـــگ بـــوو، بەڵام ئەو کاربەدەســـتانەی ئیـــدارە کە بەدواداچوونیـــان دەکـــرد بـــۆ تەشــەنەکردن و پەرەســەندنی چەکــی کۆکــوژ، کاریگەرییــان

نەبوو لەسەر سیاسەتی عێراق، کە بە توندی لە لایەن پسپۆڕانی جیۆستراتیجەوە کۆنترۆڵ کرابوو. وتاردانێک لە حوزەیرانی ١٩٨٥دا لە لایەن یەک لەو کاربەدەستانەوە، دەربڕینی نائومێدانەی دەگەیاند:

"من دەمەوێت جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە بۆچی ئێمە پەرگیرانە هەست دەکەین کەوا کێشەکە هێندە جێی مەترسییە. ساڵی پار عێراق چەکی کیمیایی لە دژی ئێران خستە کار، ئەمساڵیش دیسان بە کاری هێنایەوە، سەرەڕای نارەزایی نێودەوڵەتی. تا ئێستا عێراق تووشی هیچ سزایەک نەبووە و ڕاستییەکەشی بەردەوام نکووڵی دەکات لەوەی کە هیچ کارێکی خراپی ئەنجام دابێت. ئێمە لامان ڕوون و ئاشکرایە کەوا ئیدانەکردن کاری خۆی ناکات و تا دێت بەکارهێنانی ئەم چەکە پەرە دەسێنێت و بەرەو تەشەنەکردن دەچێت. دینامیکیەتی کارەکە خەریکە ڕێچکەیەکی چەسپاو وەردەگرێت. پەرەپێدەران و بەکارهێنەرانی وەک عێراق لە بنچینەدا سزایەکی کەم دەدرێن لەسەر ڕەفتاری نابەرپرسیارییان، کە بە دڵنیاییەوە لەو ئاستەدا نییە خەڵکی تر بپرنگێنێتەوە لە گەڕان بە دوای بەدەستهێنانی تواناسازیی لەو جۆرە. من وای بۆ دەچم هەموو کۆکین لەسەر ئەوەی کە ئەم بارە پێویستە بگۆڕێت و ئەو گۆڕانەش خێرا بێت."(١٥)

هەڵسەنگاندنێکی (سی ئای ئەی) لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٦دا پرسیاری لە کاریگەریی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق کردووە و تیشکی خستووەتە سەر "ڕاییکردنی تەکتیکی لاواز، کەمبوونەوەی بواری پڕپێداکردن، زیادبوونی ئامادەباشیی ئێرانییەکان و ئەگەری گرفتی زەخیرە و تەقەمەنی و کەسانی جێباوەڕ و تەکنیکی دابینکردن و

دابەشکردن". بەڵام هەڵسەنگاندنەکە بەردەوام بوو "بە هۆی ئەوەوە کە خەرج و مەسرەفی سیاسیی بەردەوامیی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی هێند کەم بوو، کەوا گومانی لا دروست کردین عێراق واز لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بێنێت لە ئایندەیەکی نزیکدا"[١٦]. سەرکەوتنی ئێران لە فاودا باڵی کێشا بەسەر هەر ڕەچاوکردنێکی تەشەنەسەندندا کە لەوانەبوو ویلایەتە یەکگرتووەکان هەیبێت. دووەم کۆسپ و تەگەرەی عێراق لە تەموزدا بوو کە چاودێرانی واشنتۆنی خستە ترسولەرزێکی زۆرەوە. دوو مانگ لەوەوپێش سەدام حسێن وەک بێزارییەک لە شکۆی بریندارکراوی عێراق و بۆ ئەوەی بۆ جەنەڕاڵەکانی خۆی بنوێنێت کە لە پیشە و پسپۆڕییان تێگەیشتووە، هێزەکانی ناردە سەر شاری مەهرانی ئێران لەسەر سنوور و گرتی. هێزەکان توانییان لە هێرشێکی سەختدا سەربکەون و سەرکردەی عێراق جاڕی لەو سەرکەوتنە دا. بەڵام ئێرانییەکان زۆر بە خێرایی شارۆچکەکەیان گرتەوە و هێزەکانی عێراقیان ڕاو نا و کردیاننەوە بەمدیوی سنووردا. ئەم شکستهێنانی دووەم جارە، گرژییەکی بەرپا کردەوە لە نێوان سەدام حسێن و فەرماندە پلە باڵاکانی سوپادا، کە ترسی بەزینی تەواویان لێ نیشت، ئەگەر ئەو بەرپرسیاری دانانی ستراتیجی سەربازی بێت. ماوەیەک وا هاتە بەرچاو کە ڕژێم بەرەو هەرەسهێنان دەچێت. لە واشنتۆنیش، ڕیچارد مێرفیی یاریدەدەری وەزیری دەرەوە و یەک لە پاڵپشتانی سەرەکیی بۆچوونی جیۆستراتیجی، بە پەلە داوای کۆششێکی نوێی ویلایەتە یەکگرتووەکانی کرد کە "دەبێت پشتگیریی بەرگریی عێراق بکرێت لە ڕووی سایکۆلۆجی و سەربازییەوە و فشار

بخرێته سەر ئێران پشوویەک بە جەنگ بدات یان کۆتایی پێ بێنێت.[١٧]

دیدێکی تر هەبوو لە ئیدارەی ڕیگاندا کەوا لە مشتومڕی دارشتنی سیاسەتدا دەنگی نەدرایە و خرایە لاوە و ئەوانەی داکۆکییان لێ دەکرد، لای خۆیانەوە بە نهێنیی سیاسەتی دەرەوەیان دانا. لە نۆڤەمبەری ١٩٨٦دا ڕۆژنامەیەکی لوبنانی ڕاپۆرتێکی بڵاو کردەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان بە دوو ئاراستەی پێچەوانە کاری لەسەر جەنگی ئێران ـ عێراق کردووە: ئەویش ئەوە بووە کەوا کەناڵێکی نهێنیی پێدانی چەک بە ئێران ڕاستەوخۆ زیانی گەیاندووە بەو ئاراستەیەی بە لای عێراقدا داشکاندووە. ئەمەش بە مەسەلەی ئێران ـ کۆنترا ناسرا.

ئەوەی لە باسوخواسی ناو کۆنگرێسەوە دەرکەوتووە، ئەوە بووە کە تاقمێکی بچووک لە ناو ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا (کە ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ررۆبەرت ماکفارلێن لە ناویاندایە)، پلانێکیان ساز کردووە و بە ڕەزامەندیی ڕووکەشانەی ڕیگان، لە ماوەی زیاتر لە ساڵێکدا چەکی ئەمەریکایان لە ڕێگەی ئیسرائیلەوە ڕەوانەی ئێران کردووە، لە ڕێککەوتنێکدا بۆ بەردانی ئەو بارمتە ئەمەریکاییانەی لە لوبنان گیرابوون لە لایەن گرووپەکانی سەر بە ئێرانەوە. داهاتی فرۆشتنی ئەم چەکانە دەدرا بە کۆنتراکانی سەر بە ئەمەریکا کە شەڕی حکومەتی ساندنیستایان لە نیکاراگوا دەکرد. ئیسرائیل لە سەرەتای جەنگەوە پارمەتیی ئێرانی دەدا، بە دابینکردنی پارچە یەدەگی فڕۆکەی بۆمبهاوێژی فانتۆمی ئەمەریکییشەوە. لە هەڵسەنگاندنی ئیسرائیلدا، بە هاوکاریی کەسانێک لە دەزگای

هەواڵگریی ناوەندی ئەمەریکی CIA و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی NCS، یارمەتیدانی ئێران لەوانەبوو هاوسەنگیی بگۆڕێت بەلای میانڕەوەکانی ڕژێمدا (وەک سەرۆکی پەرلەمان عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانیی جێگری ڕابەری باڵا خومەینی و سەرکۆمار عەلی خامنەیی) و لە هەمان کاتدا هاوسەنگییەک بوو بۆ کاریگەریی سۆڤییێت. بێجگە لەوەش باشترین سیناریۆ بەلای ئیسرائیلەوە لە کەنداودا جەنگێکی بێکۆتایی بوو کەوا دوو دوژمنی شەکەت و ماندوو هیچ هەڕەشەیەکی ستراتیجی پێک نەهێنن. بە هەرحاڵ، ئەوانەی کە لە ئیدارەی ڕیگاندا بوون دەیانویست ئیحتیوای کاریگەریی سۆڤییێت بکەن و وایان لەقەڵەم دەدا کە هاوزەمان پشتگیریی ویلایەتە یەکگرتووەکان و سۆڤییێت بۆ عێراق ئاسایی نییە.

ئێران ـ کۆنترا پێچەوانەی سیاسەتی ئاشکرای ئیدارەی ڕیگان بوو سەبارەت بە دابڕکردنی ئێران (لە ڕێگەی ئۆپەراسیۆنی وەستاندن و شێوازی ترەوە) و پێشێلکردنی یاسای ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو سەبارەت بە گواستنەوەی چەک بۆ ئێران و تێکدانی دیموکراسی. سەرەڕای ئەوەش وەک یەک لە کاربەدەستانی ئیدارە هۆشداریی دا کاتێک مەسەلەکە خرابووە گەڕ، پێدانی مووشەکی تاو و وێنەکردنی نەخشەی ئۆردەری شەڕ لە سنووری ئێران ــ عێراق بایەخ بە لایەنگرییەک دەدا بە ئاڕاستەیەک کە ببێتە هۆی ئەوەی ئێرانییەکان هێرشێکی سەرکەوتوو ئەنجام بدەن دژ بە عێراقییەکان بە ئەنجامی گۆڕانکاریی توند و کوتوپڕەوە. پێدانی مووشەکی بەرگری یەکێک بوو لەو شتانە، بەڵام کاتێک زانیاریی هەواڵگری

دابین دەکەین لەسەر ئۆردەری شەڕ، ئەوە پارمەتیی دارایی دەدەیـــنە ئێرانییەکـــان بـــۆ کـــاری هێرشـــبردن"[18]. بەڵام ئەنجامـدەران کە پێدەچێت سـەرۆک پیـرۆزی کـردبێتن و لە سزادان ڕزگاریان بوو.

پەردەلادان لەســـەر مەســـەلەی ئێــران ـــ کـۆنترا بـۆ عێراقییەکـــان هەژانـــدنێکی هێجگـــار گەورە بـــوو. ئەوان هاوپەیمانییە ڕووکەشەکەیان نەک هەر درۆ و دووفاقی بوو، بەڵکو ئەمەریکا زانیاریی باشیشی دەدا بە ئێران، شانبەشانی هەر دوو سیستەمە سەرەکییەکەی چەکپێدان، کە بواری بۆ ئێران دەڕەخساند لەو شوێنانەدا شەڕی عێراقییەکان بکات کەوا نەتـوانن بەرەنگاریـــان ببـــنەوە. مووشـــەکی هـــۆکی دژەفڕۆکەی ئەمەریکا دەستباڵایی عێراقیان لە ئاسماندا کەم کردبـــووەوە، مووشـــەکی تـــاویش ســـوودێکی گەورەی بەرگریکردنـی هەبوو لە زرێپۆشـدا. ئێران ٢٠٠٨ مووشـەکی تـاو و ٢٣٥ مووشـەکی هـۆکی وەرگرتبـوو و لە دەسـپێکی گەیشـــــتنی بارەکانیـــــانەوە لە ســـــاڵی ١٩٨٥دا کەوتە بەکارهێنانیـان و دەسـبەجێ ئەنجامەکانیـان دەرکەوتـن. بەو ڕەنگە دواتر درک بەوە کرا کە شکستهێنان لە فاودا ئێشـێکی زۆری هەبـوو، نەک تەنهـا لەبەر ئەوەی لووتشـکاندنێک بـوو بۆ عێراق، بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو کە لەدەسـتدانی ئەگەری پلانێکی لە خۆ گرتبوو، لە نێوان دوژمـنەکەی عێـراق و ئەو زلهێزەدا کە وا خـۆی پیشـان دەدا دۆسـتیەتی. دیڤـید نیـوتنی باڵوێز لە بەغدا (لە چاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠١دا) لە بـارەی ئەو پەردە ئەستوورەوە دەدوێت کە لەناکاو پەیوەندییەکانی داپۆشی:

"عێراقییەکان قەت بڕوای تەواویان بە ئێمە نەبوو، بەڵام هەندێک متمانەیان بە توانای خۆیان هەبوو کە پێشبینی لە هەڵسوکەوتی ئێمە بکەن، کەچی نەیانتوانی پێشبینیی ئێران ـ کۆنترا بکەن کە سیاسەتێکی نائەقڵانە بوو، بۆیە بە ڕاستی هەژاندنی. هەروەها زیانێکی ڕاستەقینەی بەرپا کرد لە جەنگدا و ئەوانەی پەیوەندیی ئەمەریکایان بەلاوە پەسەندتر بوو و داکۆکییان لێ دەکرد کە مەترسیی ئەمیان لە یەکێتیی سۆڤیێت کەمترە و لەم ڕووەوە کەسانی وەک تاریق عەزیز و نزار حەمدوون و ئەوانی تر بە دەست لەتیف جاسمی میری ڕاستەقینە و (جێگری سەرۆکوەزیران) تەها یاسین ڕەمەزانەوە گیریان خواردبوو، کە حوکمی پێشتری خۆیان دابوو لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکان وەک هێزێکی ئیمپریالیستیی لایەنگری ئیسرائیل و وا ئێستا بە تەواوەتی سەلمێنرا. دەزگاکانی هەواڵگریی عێراق وەک یارمەتیدەرێک تەماشای ئەمەریکایان دەکرد و لە کاتێکدا بێگانەیان لە عێراقدا نەدەویست، کەچی بە نابەدڵی و لووتەلاییی دیپلۆماتەکانی ئەمەریکایان قبووڵ دەکرد. ئێستا ئەمانە هەموو ڕۆیشتن و بەسەر چوون و هەرگیز بە خەیاڵمدا نایەت کە عێراق پێگەیەکی وای هەبێت کە شانبەشانی ئێمە بوەستێتەوە، بەڵام کردیان."

## ڕێگەدانانێکی نوێ

مەســـەلەی ئێــران ـــ کــۆنترا بە تەواوی تــۆڕی ئەو پەیوەنـدییانەی تێـک شـکاند کە لایەنگریـی عێراقـی لەســەر بونیـاد نرابـوو، ئەو متمـانە فشەڵەشـی پسـاند لە نێـوان هەر دوو وڵاتــدا و زیــاتر بەوە لێــک دەدرێــتەوە کە ســەرکردە عێراقییەکـــان ڕەفتـــاری سەیروســـەمەرەیان بەرانـــبەر بە ویــلایەتە یەکگرتووەکــان دەنوانــد لە ســاڵانی (١٩٨٨ ـــ ١٩٩٠)ی دوای جەنگـــدا و ئەمە بڕیـــاری داگیرکردنـــی کوەیتیشی لێ کەوتەوە.

وا ئێســتا واشــنتۆن دەبێــت پاشــوپاش بگەڕێــتەوە بــۆ ســەلماندنی ئەوەی کە سیاســەتی خــۆی ســەبارەت بە عێراق ڕاســتە و درۆودەلەســەی تێـدا نیـیە و ئەمەش دەرەنجـامی خــۆی هەبـــوو. لە یاداشـــتێکی دیســـەمبەری ١٩٨٦دا کە ناونیشانێکی هۆشداریئامێزی هەیە، "پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکـان و عێـراق: کـۆکردنەوەی پارچەکـان"، ڕیچـارد مێرفـــی لە یەکەم ڕســـتەیدا ئاگـــاداریی ئەوە دەدات کە "پەیوەنــدیی نێــوان ویــلایەتە یەکگرتووەکــان و عێــراق لە قەیراندایە، هاوکات لەگەڵ ئەگەری دەرەنجـامی ترسـناکدا، بە هــۆی هەڵوێســـتی ئەمەریکـــاوە لە نـــاوچەی کەنـــداودا و سیاسەتی دژەتیرۆریزمی".

بۆ گێڕانەوەی متمانە، مێرفی پێشنیاری ئەوە دەکات کە "ئیشارەتێکی سیاسیی بەهێزی ویلایەتە یەکگرتووەکان بدرێتە عێراق سەبارەت بە متمانەی دواڕۆژی عێراق" لە شێوەی گەرەنتیدانی قەرزێکی بەنکیی نوێی هەناردە ــ هاوردەدا[19]. یاداشتە یەک لە دوای یەکەکەکانی لە بارەی پەیوەندییە بازرگانییەکانی عێراق لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، تیشک دەخاتە سەر ئەم بایەخپێدانە نوێیە. دواکەوتنی دەرکردنی مۆڵەتی وەزارەتی بازرگانی سەبارەت بە هەناردەی بەروبوومی ئەمەریکا بۆ عێراق بە شێوەیەکی لەناکاو، وەک باس دەکرا "دەرەنجامی خراپی هەبوو بۆ هەر دوو هەناردەکانی ئەمەریکایی و پەیوەندیی ئێمەش لەگەڵ عێراق" و پێویستی بە پێداچوونەوەیەکی پەلەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی هەبوو. لەم ڕووەوە ئیشارەتێکی بەرچاو گرنگییەکی تایبەتی هەیە و بۆ ئێستاش دەبێت پەلەی لێ بکرێت".[20]

دیڤید نیوتن دەڵێت شەش مانگی برد بۆ دووبارە دروستکردنەوەی پەیوەندی. لە ڕووی دەستووریشەوە دەزگای موخابەراتی بەرگری، جێگەی (سی ئای ئەی)ی گرتووەتەوە وەک ئەڵقەیەکی پەیوەندیی سەرەکی لەگەڵ عێراقییەکاندا. هاوتا عێراقییەکەی دەزگای هەواڵگریی بەرگری، بەڕێوەبەرێتیی هەواڵگریی سەربازی بوو، یان ئیستیخبارات. بەپێی قسەی بەرپرسە خانەنشینەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەر دوو لا پەیوەندیی کاریان دامەزراندبوو کە تا کۆتایی جەنگ درێژەی کێشا. لە لایەن عێراقەوە بەشداربووی سەرەکیی گفتوگۆ، جێگری بەڕێوەبەری ئیستیخباراتی سەربازی، فەریق ڕوکن وەفیق

سامەڕایی بوو، هیی ئەمەریکییەکانیش جێگرێکی مولحەقی سەربازی بوو.

لە ڕووی سیاسییەوە واشنتۆن دەبوو داواکاریی دوولایەنەی عێراق جێبەجێ بکات بە گێڕانەوەیەکی دەسبەجێی ئۆپەراسیۆنی وەستاندن Operation Staunch بۆ دۆخی خۆی و بڕیارێکی ئەنجوومەنی ئاسایشی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان کە داوای کۆتاییپێهێنانی جەنگ بکات. ئیدارەی ڕیگان پشتگیریی خۆی بۆ بڕیارێکی نوێی ئەنجوومەنی ئاسایش دەربڕی، کە لە تەمووزی ١٩٨٧دا دەرکرا و عێراق بە پەرۆشییەوە پێشوازیی لێ کرد. هەر چەندە ئێران ڕەتیشی کردەوە، بەلام بڕیاری (٥٩٨) بوو بە بەرنامەی کاری ئاگربەستی ئابی ١٩٨٨، کەوا کۆتایی بە جەنگ هێنا. هەروەها ئیدارە ئۆپەراسیۆنی وەستاندنی کار پێ کردووە و بگرە لەوە دوورتریش ڕۆیشت و پشتگیرییەکی ئەنجوومەنی ئاسایشی جوولاند بۆ ئابلووقەدانی دژ بە ئێران و ڕەنگە بە شێوەیەکی گرنگتریش بێت کە بەشداریی هەوالگریی لەگەل عێراقییەکان پەرە پێ دا. ئەمەی دواییان لە سەرەتای سالی ١٩٨٢وە دەستی پێ کرد، بەلام کەم کەس لە ستافی ئیدارەدا ئاگاداری بوو. ئەمە لە لایەن چەند ڕۆژنامەنووسێکەوە درکی پێ کرا و پەردەی لەسەر لا درا کە لێکۆلینەوەیان لە مەسەلەی ئێران ــ کۆنترادا دەکرد و بوو بە مایەی نارەزاییەکی توند لە لایەن ئێرانییەکانەوە. شوولز بە کورتی لە لۆجیکی ئیدارە دەدوێ، مانگێک پاش ئاشکرابوونی ئێران ــ کۆنترا:

- پێدانی بڕێکی سنووردار، بەڵام بەسوود، لە زانیاریی هەواڵگری بۆ عێراق، شتێکە من ڕەزامەندیم لەسەر دەربڕیوە و بەردەوامم لە سەری.

- سیاسەتی ئێمە لەمەڕ بێلایەنی لە جەنگدا وەک خۆی ماوەتەوە. ئێمە کۆتاییپێهاتنی جەنگمان پێ باشە، بەڵام بێ سەرکەوتن و بەزین لەگەڵ پاراستنی سەربەخۆیی و یەکێتیی خاک و وڵاتی هەر دوو عێراق و ئێران، بێ دەسکاریکردن.

- سیاسەتی ئێمە لە بارەی جەنگەوە ڕوونە و دەمانەوێت بە زووترین کات کۆتایی پێ بێت. ئەوە چەند ساڵە عێراق دەیەوێت دانوستان لەپێناوی شەڕوەستاندا و کۆتاییهاتنی ئەم جەنگە بکات. بەڵام ئێران بووە بە لایەنێکی لاسار و دەیەوێت هەر بەردەوام بێت. ئێمە بۆ ڕێگەیەک دەگەڕێین کە فشار بخەینە سەر ئێران بۆ ئەوەی چاوێک بگێڕێتەوە بە باری سەرسەختی و لاساریدا لە مەسەلەی پابەندبوون بە جەنگەوە لە ڕێگەی ئۆپەراسیۆنی وەستاندنەوە و فشاری سەربازیی بخاتە سەر ئێران. ئێمە بڕوامان وایە ئەو لێکترازانەی لە ئەنجامی جەنگی ئێران - عێراقەوە پەیدا بووە، لەوە گەورەترە کە بە پێدانی هەندێک زانیاریی هەواڵگری بە عێراق پاساوی بۆ بێنێتەوە[٢١].

هاوبەشیی لەو زانیارییە هەواڵگرییە پچڕپچڕەدا، پێدەچێت لە ساڵی ١٩٨٦ بەمڵاوە بووبێت و ئەو داتایەی دەدرا بە عێراق بە ئاڕاستەی قەناعەتپێکردنی ئێران بوو بۆ قبووڵکردنی ئاگربەست. بەگوێرەی قسەی ئەفسەرێکی هەواڵگریی ویلایەتە یەکگرتووەکان (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) ئەمە لە ڕاپۆرتی هەواڵگری و دەسنیشانکردنی

ئازوگوێزی هێڵی بەرەی شەڕ، وەک مەترسییەک بۆ هێرشی ئێران" پێک دەهات. پۆڵ وۆڵفۆویتزی جێگری یاریدەدەری وەزیری بەرگری بۆ سیاسەت دارشتن و ریچارد ئەرمیتاج یاریدەدەری وەزیری بەرگری بۆ کاروباری ئاسایشی نێودەوڵەتی، پاشان کاربەدەستێکی تریشی بۆ زیاد کرا بۆ "پشتگیریی یاریدەدەری پرۆگرامی وەزارەتی بەرگری و ڕێکخستنی کاروبار بۆ وەزیری بەرگری فرانک کارلۆسی لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا، بۆ ئاراستەکردنی ــ نەک تەخویلکردنی ـ دەزگای موخابەراتی بەرگری بۆ بواردان بە ناردنی ئەو زانیارییانە بۆ عێراق کە کۆسپ دەخەنە بەر سەرکەوتنی ئێران". (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) لێکۆڵەرەوەیەکی تری پێشووی هەواڵگری دەڵێت: "ئەوەی ئێمە داومانە بە عێراقییەکان شتێکە ناخرێتە ژێر هیچ بارێکەوە. ئێمە تەنها زانیاریمان داونەتێ بێ هیچ سەرچاوەیەک، بەڵام ئەوە ئاشکرایە کە وێنەکانی سەتەلایت لە سەتەلایتەوە دێن."

لەملاشەوە عێراق زۆر بە نهێنی کاری لەسەر دوژمنە ئێرانی و کوردەکانی بریکاری دەکرد بۆ تێسرەواندنی لێدانێکی یەکلاکەرەوە و بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی ١٩٨٧دا شەڕی گەرمتر کرد. هاوکات تواناسازیی عێراقیشی بە شێوەیەکی بەرفراوان باش کرد، پاش ئەوەی سەدام حسێن مەسەلەی ستراتیجیەتی جەنگی بەرەوڕووی فەرماندە سەربازییەکانی کردەوە، ئەگەرچی درەنگوەختیش بوو، دوابەدوای هەر دوو شکستی فاو و مەهران، بە دەسەڵاتی پەلاماردانی کیمیاییشەوە: بێجگە لەوە عێراق فەیلەقێکی نوێی سەربازی گەنجی دروست کردبوو کە تەمەنیان لە

چواردەوە بۆ سەرەوە بوو. هەواڵگریی ئەمەریکییش لەسەر پشـــتەوەی بەرەی ئێـــران کە ڕاییبـــوونی کاروبـــار تێیـــدا شـــپرزەیی و شـــیرازە تێکچـــوونی دەگەیانـــد، بە هـــۆی ئاراستەکردنی پەلاماری کیمیایی بەردەوامەوە و ئێرانییەکان بە تەواوی شـــــەکەت بووبـــــوون. ئەوان دەیـــــان هەزار "خۆبەخشیان" لە دەست دابوو (کە گەلێکیان مێرمنداڵ بوون و بە زۆری بـۆ هەڵگـرتنەوەی مـین تەرخـان کرابـوون) لە بەرانـبەر ئاگربـارانی عێراقـدا، بـێ ئەوەی هـیچ ڕووبەرێکـی بەرچاو داگیر بکەن، فاوی لێ بترازێت، گوایە بە تەمان ڕژێم بەوە بڕووخێـت. هێرشـەکانی ئێـران بـۆ سـەر بەسـڕە لە دوادوایـــــی ســـــاڵی ١٩٨٦ و ســـــەرەتای ١٩٨٧دا، کە سـەرکردەکان وەک هێرشـی زەمینیی "کۆتـایی" ئامـاژەی پـێ دەدەن و خێـرا وەک ئەوانـی تـری پـیش خـۆی، سـەرەڕای پێشـڕەویکردنی زوو کەوا کۆردسـمان و واگـنەر واتەنـی "برێکی هێجگار گەورەی ئاگری عێراق و هێزی ئاسمانی و گازی ژەهراویی" تێک شکاند[٢٢].

لەشکرکێشـیی ئێـران بـۆ سـەر بەسـڕە نـۆرەیەکی نـوێی "جەنگی شـارەکانی" بەرپا کرد، چونکە عێراق بە بۆردمـانی فـڕۆکە و مووشـەک، شـار و شـارۆچکەکانی ئێرانـی داگرتبـووەوە و سـەدان کەسـی سـڤیلی کوشـت. هەروەهـا عێراق بەردەوام بوو لە هێرشکردنە سەر کەشتییە باربەر و نەوتبەرەکـانی ئێـران. لە بەرانـبەردا ئێـران بە مووشـەکی سـکۆد بەغـدا و بەسـڕەی داگـرتەوە و دەسـتی کـردە پەلامـاردانی ئەو کەشـتییانەی لە کەنـداودا بـوون و هـیی هاوپەیمانەکـانی عێـراق بـوون، بە تـایبەتی کوەیـت کە ژمارەیەک بەرکەوتنی ئازاربەخشی بەرکەوت. ئەمە ویلایەتە

یەکگرتووەکانی هێنایە ناو جەنگەوە و لە تەمووزی ١٩٨٧دا ویلایەتە یەکگرتووەکان ئالای خۆی خستە سەر تانکەرەکانی کوەیت و هێزێکی دەریایی خستە تەکیان. لە هەمان کاتدا ئیدارەی ڕیگان دەستی کردە فشار بۆ چارەسەرێکی دیبلۆماسی لە نەتەوە یەکگرتووەکان، کۆششەکەشی لە بڕیاری ٥٩٨دا گەیشتە ترۆپک.

بە کورتی، مەسەلەی ئێران ــ کۆنترا لە شەڕێکی بیرۆکراتیی نێوان دوو تاقمەوە سەری هەڵدا و هەر لایەکیان بە زەڕەبینێکی جەنگی ساردەوە تەماشای جەنگی ئێران ــ عێراقی دەکرد و لاکەی خۆی بەهێز دەکرد بە پێدانی یارمەتیی ماددی بۆ ئەو لایەی پێی پەسەندە و سەر بە خۆیەتی. کاتێ کە کۆششی پلانگێڕانەی چەکدارکردنی ئێران هەرەسی هێنا، هەوادارانی عێراق لە ئیدارەدا بەهێز بوون. کاتێک کە داکۆکیکاران دەسەڵاتی ڕەها و ڕاستەقینەیان وەرگرت بۆ یارمەتیدانی عێراق و هەر چەندە ئەوەش کە ڕێگەی پێ دەدرا سنووردار بوو، بەڵام قەدەغەی لەسەر هەڵگیرابوو. ئەمەش سوودی ئەوەی گەیاندە عێراقییەکان کە ئەمەریکا لە جەنگەکەوە بگلێنن. بۆ گاڵتەجاڕیی دەوران، پشتگیریی ژێربەژێر لە ئێران، بە سەرەتای کۆتایی کۆششی جەنگی ئێرانییەکان لەقەڵەم دەدرا، تەنانەت کە توانییشیان ساڵ و نیوێکی تریش بەردەوام بن. لە هەمان کاتدا پشتگیریی توندی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ عێراق، بێ هیچ پرسیارکردنێک، بوو بە هۆی پێڕاکێشانی عێراق و بەو پێیەش لێبووردەیی زیاتری ئەمەریکا. ئەمەش دیسان کاریگەرییەکی پێچەوانەی هەبوو، چونکە کاتێک عێراقییەکان درکیان بەوە کرد کە لە سزا دەرباز دەبن و کەوتنە

زیـــادەڕۆیی بە گازبـــارانکردنی کـــوردە مەدەنییەکـــان، کاربەدەســـتانی ئیـدارەی ئەمەریکـی تەماشـایان کـرد کە هاوپەیمـانیی پێویستە، بەڵام یەکەم جار بە ناچاری بێدەنگ بوون و هەر کە جەنگ تەواو بوو بە توندی بە ئاڕاستەی ساردبوونەوەی پەیوەندییەکان ڕۆیشتن و عێراقیان خستە بـــارێکی دژوار و ناهاوســـەنگەوە لەگەڵ هاوپەیمـــانێتیی سەردەمی جەنگدا.

"خـالّی بنەڕەتـی (لە بـارەی سـەدام حسـێنەوە) ئەوەیە کە خـــوێنرێژێکە دەیەوێـــت هەنـــدێک لە نزیکترین کەسەکانی خـۆی بکوژێـت و ئەو کەسـەیە کە چەکـی کیمیـایی دژ بە گەلەکەی خـۆی بە کـار هێنـــا و دەســـتدرێژیی کـــردە ســـەر دەوڵەتە دراوســـێیەکانی. پێـــدەچێت ئەمە لەمـــــڕۆدا مەترسیدارترین کەس بێـت لە دنیـادا... مەسـەلەی سـەدام حسـێن ئەوەیە کە لە نـاوجەرگەی جەنگـی دژەتیرۆریزمـــــدایە و بـــــووە بە ســـــیمبۆڵی بەرەنگاربوونەوەی تەواوی بەهاکانی ڕۆژئاوا."

**ریچارد پیرل**
**سەرۆکی بۆردی سیاسەتی بەرگری PBS فرۆنتلاین**
**٨ی نۆڤەمبەری ٢٠٠١**

## هێرشی گاز بۆ سەر کوردەکانی ئێران

پاراسـتنی خەڵکـی سـڤیل بنەمـایەکی سـەرەکیی یاسـای مرۆڤدۆســـتیی نێـــودەوڵەتییە و بە یاســـاکانی جەنگـــیش دەناســـرێت و ســـەرچاوە ســـەرەکییەکانی هەر چـــوار ڕێککەوتننـامەکەی جنێڤـی سـاڵی ١٩٤٩یە. هەروەهـا ئەمە یەکێکە لەو مەسـەلە قەدەغـانەی کە پێشـێلکردنی زۆر بـاوە. جەنگی ئێران ــ عێراقیش خۆی لەمە نەبوارد و هەر دوو لا

پێشێلکاری و کاری درِندانەی وایان کردووە کە دەچێتە خانەی تاوانەکانی جەنگەوە. عێراق، هەر زوو پاش ئەوەی هێزەکانی لە ساڵی ١٩٨٢دا لە ناو خاکی ئێران دەرپەرێندرا، بە عادەت لە کاردانەوەی هێرش و فشاری سەربازیی ئێراندا، کەوتە پەلاماردانی مەدەنی و دامەزراوە مەدەنییەکان لە ئێراندا. ئێران بە پەستی و تووڕەبوونەوە کەوتە تۆڵەکردنەوە و هانی نەتەوە یەکگرتووەکانی دا بە توندی داوا لە هەر دوو لا بکات پارێزگاری لە خەڵکی مەدەنی بکەن. بە بۆنەی زیادبوونی هێرش و پەلاماری تۆڵەکاری بۆ سەر شوێنە مەدەنییەکان، نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٨٣دا تیمێکی پسپۆڕانی نارده کەنداو بۆ لێکۆڵینەوە، ئەوانیش لە گەشت و گەڕانیاندا بۆ ناوچەکانی جەنگ گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە عێراق بەردەوام بێ هیچ ڕەچاوکردنێکی ژیانی مەدەنییەکان، کاری کردووە و بۆمبی هێشوویی لە شوێنە نیشتەجێکاندا بە کار هێناوە و پەلاماری نەخۆشخانەکانی داوە و گەلێک کاری تری لەم چەشنە و پێش کشانەوەی لە ساڵی ١٩٨٢دا شار و شارۆچکەکانی ئێرانی تەخت کردووە. سەبارەت بە ئێرانیش، تیمەکە وای بۆ چوو کە ئەویش ژیانی خەڵکی مەدەنیی بە ناتەواوی ڕەچاو کردووە، کاتێک کەوا کۆمەڵگەی پیشەسازی و دامودەزگا نەوتییەکانی عێراقی دەکردە ئامانج[1].

لە کاتی جیاجیای ماوەی جەنگدا، نەتەوە یەکگرتووەکان دەیتوانی بکەوێتە نێوانەوە و ڕێککەوتننامەی دوولایەنە ساز بکات بۆ ڕاگرتنی هێرش و پەلامار بۆ سەر شوێنە نیشتەجێیەکان. ئەمە تەگەرەی دەخستە بەردەم هەر دوو لایەنی شەڕکەر، بەڵام تەنها تا ئەو کاتەی لایەکیان

پێشڕەویی سەربازیی دەکرد و هێرشی پێچەوانەی دژ بە خەڵکی مەدەنی لێ دەکەوتەوە، پاشانیش تۆڵەسەندنەوەی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا بۆ هاوسەنگکردنی کوشت و کوشتار. ئەمە لە ڕووی ئەخلاقییەوە کارێکی قێزەون و ترسنۆکانە بوو کاتێک کە خەڵکی مەدەنی دەکرانە ئامانجی سەربازی، کە بۆ تێکشکاندنی پاڵپشتیی جەنگ زیان بە خەڵک دەگەیەنرا بۆ ورە ڕووخاندنیان. لە ماوەی بەڕێوەچوونی جەنگدا، هەر دوو لا ئەم تاکتیکەیان پەرە پێ دەدا و بووبووە هۆی وێرانکارییەکی بەربڵاو و ژمارەیەکی زۆر بریندار و کوژراوی لێ دەکەوتەوە و ترسولەرزێکی زۆری خستبووە ناو خەڵکەوە، لەوانە دانیشتوانی شارە گەورەکانی وەک تاران و بەغدا.

بە هەستکردن بە تین و توانای ترس و تۆقاندن، عێراق هەر زوو بەکارهێنانی چەکی کیمیایی خۆیی لە مەیدانی شەڕەوە پەرە پێ دا بۆ هەڕەشەکردن لە خەڵکی مەدەنیی بێچەک. بە هاتنی ساڵی ١٩٨٧ ئێران جاڕی لە پەرەپێدان و چاکسازیی بەرگریی کیمیایی دا، بۆ بەرزکردنەوەی ورەی هێزەکانی و پەکخستنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق، وەک شتێکی بێنرخ و بێ کاریگەری. بۆ گاڵتەجاڕی، ئەمە لەجیاتییدا عێراقییەکانی قەناعەت پێ کرد بۆ کردنەئامانجی خەڵکی مەدەنی وەک ڕێگەیەک بۆ فشار خستنەسەرێکی نوێ بۆ سەر ئێران بە مەبەستی کۆتاییپێهێنانی شەڕ و ناکۆکی.

زۆربەی قوربانییە مەدەنییەکانی گاز کورد بوون، چ لە دیوی ئێران یان عێراق. یەکەم پەلاماری لەو چەشنەی گاز وادیارە شارەکانی باشووری ئێرانی گرتەوە، دوور لە کوردستان. لە نیسانی ساڵی ١٩٨٧دا، وەزیری دەرەوەی

ئێران، عەلی ئەكبەر ویلایەتی سكاڵای ئەوەی كرد كە عێراق "چەندبارە پەنای بردووەتە بەر چەكی كیمیایی و بە بڕی زۆر گەورە" دژ بە شوێنە نیشتەجێیەكان و خەڵكێكی مەدەنیی كوشتووە و بریندار كردووە لە عەبادان و خورەمشەهر و مەرەند و خەتاكەشی خستە ئەستۆی سەرنەكەوتنی نەتەوە یەكگرتووەكان لە پشتگوێخستنی تاوانباركردنی عێراق بە ئەنجامدانی هێرشی گاز و "وەلاخستنی هەموو بنەماكانی یاسای مرۆڤدۆستیی نێودەوڵەتی" و ئەوجا داوای لە ئەنجوومەنی ئاسایش كرد كە لە "بەرپرسیارێتیی ئەخلاقی و دەستووریی خۆی بگات لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم پەرەسەندنە چەندێتی و چۆنێتییەی بەكارهێنانی چەكی كیمیایی"[٢]. بەوپێیە ئەو سێ شارە تا ڕادەیەك تەواو چۆڵ كران و بە هەرحاڵ، زۆرینەی بەركەوتوان پێدەچێت لە هێزەكانی ئێراندا بووبێت.

بە سەرنجدانی پەرەسەندنێكی وریاكەرەوە لە بەرەی باشووردا، خافێر پێرێز دیكۆیلار هەمدیس تیمێكی تری پسپۆڕانی نارد. گەرمبوونی گوتاری ئێران لەم بارەیەوە و ڕۆژانی پێش گەیشتنی تیمەكە بۆ تاران، گەیشتە ترۆپك، بە تۆمەتباركردنی ئەوەی كەوا گازبارانكردنی مەدەنییەكان لە لایەن عێراقەوە تاوانی جەنگە[٣]. لێكۆڵینەوەكە مەترسی و دڵەڕاوكێی تیمەكەی سەلماند، هەروەها تێبینیی ئەوەشیان كردبوو كە ژمارەی بەركەوتوانی كیمیایی لە ناو هێزەكانی ئێراندا و سەختیی برینەكانیان "بە شێوەیەكی بەرچاو كەمتر بوو" لە ساڵی رابردوو (بە گریمانەی پەرەسەندن و چاكبوونی جل و پۆشاكی پارێزگاری)، لەگەڵ ئەوەشدا پسپۆڕەكان دەیانگوت كەوا ئەوان "زۆر بێزار و نیگەران

بوون لەم ژمارە زۆر گەورەیەی بریندار و کوژراوی مەدەنی"، کەوا گرفتاری هێرش و پەلاماری گازی خەردەل بوون[٤].

لە ١٤ی مایسدا، ئەنجوومەنی ئاسایش تێبینییەکی سەرۆکایەتیی تری دەرکرد لە جێی بڕیارێک، کە بە هەمان زمانی ستاندارد هەر دوو لا گوناهبار دەکات "بۆ بەکارهێنانی چەندبارەی چەکی کیمیایی و درێژەکێشانی شەڕەکە" و بە واتایەکی تر، سەرزەنشتکردنی ئێران و عێراق بە هەمان پێوەر[٥]. بۆ هەر دوو لا ئەم دەقە زیاتر لە خەڕەکەشکاوێک دەچوو. بەمەش عێراقییەکان جارێکی تر، شکستی ئەنجوومەن، زیاتر هانی دان کە سڵ نەکەنەوە لە هەر شێوە سزایەک لەسەر پێشێلکردنی ترسناکیان بۆ یاساکانی جەنگ. بەمپێیە قۆناغێکی ستەمکاری و پێشێلکردنی زیاتر هاتە پێشەوە.

لەم سەروبەندەدا عێراق دەستی دایە فراوانکردنی شەڕی کیمیایی خۆی بەرەو باکوور، بۆ هەرێمی کوردستان لە هەر دوو بەری ئێران و عێراقدا و تا ڕادەیەک ڕۆژانە تۆمەتبارکردنی ئێران بۆ عێراق دەگەیشتە نەتەوە یەکگرتووەکان، سەبارەت بە هێرشی کیمیایی عێراق بۆ سەر کوردستانی ئێران، لەوانە: هێرشێک بۆ سەر گوندێکی ناوچەی بانە لە ١٦ی نیساندا (کە باس لە برینداربوونی دە گوندنشین دەکات)، هێرشکردنە سەر گوندەکانی نزیک بانە، پێنجوێن، سەردەشت لە (٧ و ٨)ی مایسدا (کە لانیکەم نەوەدودوو بریندار تۆمار کرابوو)، لەگەڵ هێرشێک بۆ سەر شارۆچکەی سەردەشت لە ٢٨ی حوزەیراندا کە زیاد لە

سەد کەسی کوشت و دوو هەزاری بریندار کرد و زۆربەی زۆریان خەڵکی مەدەنی بوون.

ئەم هێرشەیان بە شێوەیەکی بەرچاو بایەخێکی گەورەی هەبوو. سەردەشت کە شارۆچکەیەکی کوردنشینی سەر سنوور و نزیکی بەرە بوو، بووبووە داڵدە و پەناگەی گوندنشینە ئاوارەکان و سەربازگەی هێزەکانی ئێران، کە وەک ناوچەیەکی پشتی بەرە بە کاریان دەهێنا. پێشتر سەردەشت گەلێک جار بە فڕۆکە بۆردمان کرابوو و چەند ڕۆژێک پێش هێرشە کیمیاییەکەش، هێزەکانی ئێران و عێراق کەوتبوونە شەڕەوە لە نزیک چیای مامەندە و پاشان لە هێڵەکانی بەرەدا. یەکەم جار ئێرانییەکان بە یارمەتیی پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، توانییان بەر لە هێرشێکی عێراق بگرن و بیانشکێنن، بەڵام وەک حەمەی حەمەسەعید، کە بەشداربوویەکی (ی ن ک) بوو لەو شەڕانەدا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەیگێڕێتەوە کە هێزەکانی عێراق خۆیان کۆ کردەوە و جارێکی تر هێرشیان کردەوە و کۆنترۆڵی تەواوی ناوچەکەیان کرد. ئا لەم کاتەدا بوو کە عێراق بە کیمیایی پەلاماری شارۆچکەکەی دا (بڕوانە دەسپێک). گەلێ شایەتحاڵ لە سەردەشتدا دەگێڕنەوە کە فڕۆکەکانی عێراق چەندین بۆمبی کیمیاییان خستووەتە خوارەوە و پاشان بۆ ماوەی بیست خولەک بە ئاسمانی ناوچەکەدا سووڕاونەتەوە، پێش ئەوەی لە ئاسۆدا لە چاو ون بن(٦).

ئەم پەلامارە ڕاستەوخۆیەی ئەو شارۆچکە ئاوەدانە، کەوا بە پێچەوانەی شار و شارۆچکەکانی بەرەی باشوور، کە چۆڵ کرابوون، زەرەروزیانێکی تا ڕادەیەک کەمی لێ

کەوتەوە، لەچاو ئاستی ئەو زیانەی عێراق ساڵێک دوای ئەوە بە هەڵەبجەی گەیاند. بەپێی باس و گێڕانەوەیەکی موحافزکارانە، تەنها ٣٠ کەس لە ڕۆژی هێرشەکەدا کوژراون و دوای ئەوە لە مانگی یەکەمدا شەستوشەش کەسی تریش گیانیان سپاردووە و لە ساڵێکی دوای ئەوەشدا هەشت کەس و لە سیازدە ساڵی دواتریشدا حەوت کەس ـــ واتە سەرجەم سەد و یازدە کەس (تا ساڵی ٢٠٠٢)[٧]. لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو ئەم مردنانە، وەک باس دەکرێت، بە هۆی گازی خەردەلەوە بووە، بەڵام پێدەچێت قوربانیی دەمارەگازیشیان تێدا بووبێت، وەک لە گێڕانەوەی هەندێک شایەتحاڵدا دەردەکەوێت، بەڵام ئەمانە ڕەنگە لەو هێزانەی ئێران بووبێت کە نەچوونەتە ئاماری قوربانییانی شاری سەردەشت خۆیەوە. یاقووب قودسیان، کە برینپێچێکی ئێرانییە (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا)، کاتێک کە لە نەخۆشخانەیەکی ئیمێرجنسیی سوپادا لە سەردەشت کاری کردووە، دەگێڕێتەوە کەوا کاتێک هێرشەکە دەستی پێ کردووە، ئەم دەسبەجێ چووە بۆ یەکەی چەکی کیمیایی. قودسیان دەڵێت لە چەند ڕۆژی لەوەوپێشدا، بەردەوام هێرشی گاز کراوەتە سەر شوێنەکانی چواردەوریان و بەوپێیە سوپا بە تەواوی لە ئامادەباشیدا بوو:

"یەکەم شت کە من بینیم، سەربازێک بوو بە ڕاکردن هاتە ژوورەوە و هاواری دەکرد هێرشی کیمیاییە و دوو خولەکی نەبرد، گیانی سپارد. سەربازەکە گەنجێکی تەندروستی توندوپڕ بوو، هیچ نیشانەیەکی پێوە دیار نەبوو، ئەمەش شتێکی سەرسامکەر بوو بۆ ئێمە و کەواتە ئەمە

دەبێت دەمارەگاز بێت. ئێمە نزیکەی دوو هەزار تووشبوومان لە ماوەی دوازدە سەعاتدا تیمار کرد و گەلێکیان هەر لە جێدا مردن و ڕەنگە سەد کەسێکم لەوانە بینیبێت.

ئێمە وامان لەقەڵەم دا، کە ئەمانە قوربانیی دەمارەگاز بن. ئەوانی تر بوون بە دوو گرووپەوە و ئەوانەی کە کێشەی پێستیان هەبوو، بە بریندارى گازى خەردەل دامان نان و لەبەر ئەوە حەمامێکمان پێ کردن و سایۆسولفاتمان پێ دان. دووەم گرووپ هیچ نیشانەیەکیان پێوە دیار نەبوو، بۆیە ناوبەناو گیراوەی شەکر و خوێمان دەدانێ و وای بۆ دەچووین کە تەنها تووشی هیستێریا بوون".

زۆر لە چاودێران لەو کاتەدا، هێرشەکەی سەردەشتیان بە پەرەسەندنێکی ترسناک لەقەڵەم دا. ئێرانییەکان ڕاستەوخۆ گێڕایانەوە بۆ سەرنەکەوتنی ئەنجوومەنی ئاسایش، کە کاردانەوەیەک لە دژی هێرشە کیمیاییە پێشترەکانی عێراق ئەنجام بدات. ویلایەتی وەزیری دەرەوە "بەیاننامە لاوازەکەی" ١٤ی مایسی ئەنجوومەنی بەوە ناوزەد کرد گوایە لە لایەن عێراقەوە وا لێک دراوەتەوە کە "ڕێگەپێدانێکی ڕەها بێت بۆ ئەوەی پەنا بباتە بەر چەکی کیمیایی"[١٨]. کەچی ئەدەبیاتی نووسین لە بارەی جەنگی ئێران ـ عێراقەوە، تەنها ئیشارەتی خێرای بە هێرشەکەی سەردەشت کردووە. بە تەماشاکردنی ڕەوشی تەواوی هێرشە کیمیاییەکانی عێراق، ڕەنگە ڕووداوەکە بە کارێکی ڕۆتینی هاتبێتە بەرچاو. لەگەڵ ئەوەشدا ویلایەتی وەک "تراجیدیایەک کە دەبێت لە کتێبەکانی ئینسکلۆپیدیا و مێژوودا تۆمار بکرێت، شانبەشانی هیرۆشیما و ناگازاکی،

که یەکەم شــارە بــووبێتە قوربــانیی بۆردمــانی کیمیــایی ئامــاژەی پــێ کــردووە. بەدەر لە زیــادەڕۆیی ویلایەتــی، لە شــتێکدا ڕاست بــۆی چــووە، ئەویــش ئەوەیە کە ئەمە یەکەم گازبــــارانی شــــارێکە لە مێــــژوودا. لەم ڕووەوە ئەمە نوقلآنەلێدانی هێرشەکەی ساڵی داهاتووی هەڵەبجە بوو. بە بــارێکی تــردا، بەدبەختیــی سەردەشــت بــوو کەوا نەک هەر خــرایە دوای دواوەی لیســتی هێرشــی گــازی عێــراق، بەڵکــو مێژووەکەشی لە باوەڕی نەریتیی کورددا پەردەیەکی تەڵخی پێدا درا، ئەویش بە هۆی ستەمەکەی هەڵەبــجەوە. حکومەتی ئێران هەواڵی هێرشــەکەی بــلآو نەکردەوە، بۆ ئەوەی نەبێتە مــایەی تــۆقینی خەڵــک و ورەیــان نەڕووخێــت، بەپێــی قســەی کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوە، (لە چاوپێکەوتنێکی ســاڵی ٢٠٠٢دا). بە پــێچەوانەی ئەمەشــەوە، ڕۆژنامەکــانی ئێــران هەواڵی هێرشــە کیمیاییەکانی بەرەی باشــووری جەنگیــان بە ئاســایی و دوورودرێــژ بــلآو دەکــردەوە. فــرەی پــێ نەچــوو ئەوەی لە سەردەشتدا ڕووی دا، لە بیر چــووەوە، هەڵبەت لە لایەن قوربانییەکــانەوە نــا، کەوا تــا ئەمــڕۆش ســالآنە یــادی دەکەنەوە(٩).

یەک لەو هۆکــارانەی لەبیرچــوونەوەی سەردەشــت ئەوە بــوو، کە شــارۆچکەیەکی کــوردە و دانیشــتوان گلەیــی ئەوە دەکەن کەوا ڕژێمــی ئێــران، کەمتــر بــایەخ بە کــورد دەدات و پــــاش جەنگــــیش هــــیچ ســــەرنجێکی ڕای گشــــتی بەلای هێرشــــەکەدا ڕانەکێشــــا و هــــیچ یــــارمەتییەکی قوربــــانییە ڕزگاربووەکانیشــی نەدا و هۆکــارەکەی تــریش ئەوە بــوو کە لە هەڵەبجە ڕووی دا.

**پەرەسەندنی یاخیبوون لە کوردستانی عێراقدا**

زۆربەی ئێرانییەکان زانیارییەکی کەمیان هەبوو لەسەر هێرشەکان لە کوردستانی ئێراندا (لەبەر ئەوەی لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە باسێکی ئەوتۆ نەدەکرا) مەگەر بۆ نموونە، لە لایەن ئەو سەربازانەوە باس بکرایە کە لە بەرەی شەڕ دەگەڕانەوە. بە هەرحاڵ، پێیان خۆش نەبوو ئەوە بزانرێت کە عێراق چەند بە خەستی گاز بە کار دێنێت دژ بە کوردەکانی عێراق، لانیکەم لە پێش هەڵەبجەدا. جیهان کەمێک زیاتری لەو بارەوە دەزانی، تا ڕادەیەک بە هۆی سکاڵای ئێرانییەکانەوە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم هەواڵانەش وردی و دوورودرێژیی تێدا نەبوو و زیاتر پشتی بە گێڕانەوە و باسوخواسی ئەو ئاوارە بەر ترۆما کەوتوانە دەبەست، کە دەبرانە لای کارمەند و پزیشکی نەخۆشخانەکان و ئەمانیش زۆر ئاگاداری بارودۆخی ئەودیو سنوور نەبوون. کوردستانی عێراق بە درێژایی سالانی هەشتاکان بە تەواوی بە ڕووی خەڵکی بیانیدا داخرابوو، ژمارەیەکی کەمی پەیامنێری لێ بترازێت، کە بە ڕێنمایی ڕژێم دەگەڕان و هیچ ستەم و داپڵۆسینێکی دانیشتوانیان دەرنەدەخست. تەنها دوای کشانەوەی هێزەکانی عێراق لە کوردستان، لە ئاخروئۆخریی ساڵی ١٩٩١دا و ڕێک لە پاش جەنگی کەنداو، لێکۆڵەر و پەیامنێری

سەربەخۆ توانییان بچنە ئەو هەرێمەوە و هەندێک لە سکالاکانی پێشتر دەکران، ساغ بکەنەوە. بۆ ئەم کارە دەبوو زانیاریی خۆیان لەسەر مێژووی کورد زاخاو بدەنەوە ـ ئەو مێژووەی لە لایەن ئەو ولاتانەوە کە گەلی کوردیان بەسەردا دابەش بووە، ستەمی لێ کراوە و شێوێنراوە.

بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد لە عێراقدا، لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی عێراقدا سەری هەڵدا، لەسەر کەلاوەی ئیمپراتۆریتی عوسمانی. لە پاش جەنگی جیهانیی یەکەم، هێزە سەرکەوتووەکانی بەریتانیا و فەرەنسا، بە مانۆڕ و پلانگێڕی، گەلێک دەوڵەتی نوێیان دروست کرد بە سنووری نوێوە، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا گەلانێکی بێدەوڵەتیان بەسەر ئەو سنوورە نێودەوڵەتییە تازە کێشراوانەدا دابەش کرد. لەم کەینوبەینەدا کورد، بوون بە گەورەترین میللەتی بێدەوڵەت و نیشتەجێ لەسەر خاکێکی پانوبەرین، کە بەشێکی گرنگی لە تورکیا و ئێران و سوریا و عێراق پێک هێناوە. کوردەکان، بەو هەستەوە کە فێڵیان لێ کرا و لە سەربەخۆیی بێبەری کران لە لایەن هێزەکانی پاش جەنگەوە، دەستیان دایە شەڕکردن لەپێناوی سەربەستی و ڕزگاربوون لە هەر یەکێک لەم ولاتانەدا بە درێژایی سەدەی بیستەم و لەم کارەیاندا زۆر جار شێوازی تەکتیکییان گرتووەتە بەر لەگەڵ لایەنی جۆراوجۆردا، وەک ئەو ڕژێمانەی لەژێر زەبروزەنگی داپڵۆسینیاندا دەیانناڵاند، ڕژێمگەلی دەوڵەتە دراوسێکان و بزووتنەوە کوردییەکانی پارچە هاوسنوورەکانی کوردستان کە هاوبەشن لە زمان و فەرهەنگدا، بەڵام هەر یەکەیان بۆخۆی شەڕ دەکات لەگەڵ دەسەلاتدارانی ناوەندا. لە دیدی کوردەوە، مێژووی نوێیان

بـــریتییە لە زنجیـــرەیەک بەڵـــێن و پاشـــان ناپـــاکی، ئەو ڕێککەوتننامانەی تەنها مۆر دەکران و جێبەجێ نەدەکران و ماوەی دووروودرێژی ئاشتییەکی ڕێژەیی و پاشتر شکاندنی بە یاخیبوون و کوشتار و وێرانکردنی دێهات و لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا بەزین و تێکشکانی تەواو.

یەکەم یـاخیبوونی کـورد لە سـەرەتای سـاڵانی ١٩٢٠دا بەرپـابوو بە سـەرکردایەتیی شـێخ مەحمـوود بەرزنجـی، کە خۆی ناو نـابوو "مەلیکی کوردسـتان". جووڵانەوەکەی شێخ، تەنها ئەو کاتە تێک شکا کە دەسەڵاتدارانی ماندێتی بەریتانیا فـڕۆکەی بۆمبهـاوێژی هێـزی ئاسـمانیی شـاهانەی ئەو وڵاتەیـان بە کـار هێنـا (Royal Air Force _ RAF). لە سـاڵانی چلەکانـدا سـەرکردەیەکی کوردی گەنج دەرکەوت و چوو بەگژ حکومەتی پاشایەتیدا لە بنکە و بارەگـای خـۆیەوە لە بـارزان و پاشـان لە سـلێمانییەوە. ئەم پیـاوە نـاوی مەلا مستەفای بارزانی بوو، کە دواتر بوو بە باوکی بزووتنەوەی نەتەوەیـی نـوێی کـورد لە عێراقـدا. کاتێک کە بە ناچـاری لە ساڵی ١٩٤٥دا ئـاوارەی ئێران بـوو و یـارمەتیی دامەزرانـدنی کۆمـاری مهابـادی بێبەختـی دا، سـاڵێک لەوەوپـاش، پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانی دامەزرانـد، کە فرەی نەبـرد بـوو بە دوو بـاڵی عێـراق و ئێـران. بـارزانی تەنهـا دوای ڕووخـانی پاشایەتی لە ساڵی ١٩٥٨دا توانیی بگەڕێتەوە وڵات و سـاڵی ١٩٦١ سـەرلەنوێ بـزووتنەوەی نەتەوەیـی لە کوردسـتانی عێراقدا دەست پێ کردەوە.

بزووتنەوەی بارزانی لە بۆشایی عێراقی دوای پاشایەتیدا تـوانیی گەشـە بکـات، کاتێـک کە ڕژێـمە کۆمـارییە لاواز و کورتخـایەنە یەک لە دوای یەکەکـان نەیاندەتوانی خواست و

دەسەڵاتی خۆیان بسەپێنن ـ ئەگەرچی زۆریان هەوڵ دا، بە هێرش و بۆمبباران و دواجاریش بە تەختکردنی تەواوی دێهات. ڕژێمی بەعس کە لە ساڵی ١٩٦٨دا دەسەڵاتی گرتە دەست، هێند لاواز بوو خێرا ڕێککەوتننامەیەکی ئۆتۆنۆمیی مۆر کرد، کە لەسەر کاغەز دەسەڵاتێکی گرنگ و بەرچاوی دا بە حکومەتێکی ناوچەیی بۆ کورد. خاڵی سەرەکی، وەک لە دانوستانەکانی دواتردا هاتە ئاراوە، بارودۆخی کەرکووک بوو، کە ناوچەیەکی دەوڵەمەندە بە نەوت، کە داواکاریی کورد و ڕژێمی عەرەبی عێراقی لەسەر بوو.

لە ساڵی ١٩٧٤دا مەسەلەی کەرکووک بوو بە هۆی شکستهێنانی ڕێککەوتننامەکە و بەرپابوونی شۆڕشێکی کورد، کە تەنها بەو هۆیەوە تێک شکا کە شای ئێرانی هاوپەیمانی سەرەکیی کوردەکان، ژێربەژێر لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا سازشی کرد و پشتگیریی خۆی لە کورد کشاندەوە. پاشان (پ د ک) شکا و جەنگاوەرەکانی بڵاوەیان لێ کرد و خەڵکەکەشی بۆ ئۆردووگاکانی باشووری عێراق ڕاگوێزران و سەرکردایەتییەکەشی ناچار بوو لە ئاوارەیی ئێراندا بزووتنەوەکە دروست بکاتەوە. هەر زووبەزوو بە دوای ئەم کارەساتەدا، (پ د ک) لەگەڵ ئەو کادرە گەنجانەدا تێک چوو کە جەلال تاڵەبانی سەرکردایەتیی دەکردن و بەرەنگاری سەرکردایەتیی مەلا مستەفا بووبوونەوە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیان دامەزراند. ئەم پەرەسەندنە بە تەنها ڕەنگدانەوەی نەوە و وەچە نەبوو، بەڵکو دابەشبوونێکی فەرهەنگ و زمانیش بوو. (ی ن ک) لە دامەزراندنیەوە لە سۆراندا دەستبالا بوو، کە مەڵبەندەکەی سلێمانییە و بە دیالێکتی سۆرانی دەدوێن، بەڵام پێگە و بنکەی (پ د ک) لە

ناوچەی بادینانی کرمانجی زمان مایەوە، بە تایبەتی لە دەوروپشتی گوندی بارزاندا، کە زێدی دامەزرێنەری پارتی و مەسعود بارزانیی کوڕیەتی، کە بوو بە جێنشینی. هەر لە دەسپێکەوە (پ د ک) بە شێوەیەکی بنەڕەتی وەک مەسەلەی بنەماڵە مایەوە، ئەگەرچی لە ناو سەرکردایەتیی عەشایەریشدا خەڵکی پرۆفیشناڵ و ڕووناکبیری دهۆک و هەولێری تێدایە. بە پێچەوانەوە (ی ن ک) بنەمایەکی مەدەنیی بەرفراوانتری هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتیی تاڵەبانی بە شێوەیەکی بەرفراوان بووە بەوەی کە جیاوازی و ناکۆکیی لەسەر نەبێت.

دەستدرێژیی عێراق بۆ سەر ئێران لە ساڵی ١٩٨٠دا، بەختی ئەم دوو حیزبەی بووژاندەوە. ماوەی هەشت ساڵی سەخت ڕژێمی عێراق بە تەواوی سەرقاڵی جەنگ بوو، بەڵام دەیویست بارودۆخ لە کوردستاندا بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە لە ڕێگەی کڕینی سەرۆک عەشیرەتەکانەوە کە بە "ڕاوێژکار یان موستەشار" ناویان دەبات و چەکدارکردنی ناوچە دێهاتییەکانی خستە ئەستۆیان بۆ ئەو سەربازە خێڵەکییانە کە ڕژێم ناوی فورسان (واتە سوارە)ی لێ نابوون و کوردە ناسیۆنالیستەکانیش ناوی جاشیان بەسەردا بڕیبوون (واتە بەچکەی کەر). ڕژێم تەنها توانیی کۆنترۆڵی ناوچە تەختاییەکان بکات، بەڵام زۆربەی ناوچە شاخاوییەکان لەژێر قەڵەمڕەوی پێشمەرگەدا بوو، (پێشمەرگە: بە واتای ئەوانەی بەرەوڕووی مەرگ دەبنەوە)، کە جەنگاوەرانی هەر دوو پارتە سەرەکییەکە و پەناگەی حیزبی بچووکیش بوو، وەک پارتی کۆمۆنیستی کوردستان و حیزبی سۆشیالیستی کوردستان و پارتی گەلی

دیموکراتیی کوردستان و بزووتنەوەی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان و هیی تریش.

جەنگاوەرەکان لەو ناوەدا بە ئازادییەکی زۆرەوە دەگەڕان و فشارێکی بەرچاویان دەخستە سەر هێزەکانی عێراق کە توانا و تاقەتیان دابوویە کزی. هەر چەندە (پ د ک) و (ی ن ک) یاخیبوونی خۆیان دەست پێ کردبووەوە، بەڵام بە شێوازێک هەر بەرەنگاری یەکتر بووبوونەوە کە تا ئەمڕۆش زۆر نەگۆڕاوە: هەندێک جار شەڕیان دەکرد و هەندێک جاریش دانوستان و ناوبەناویش دەچوونە هاوپەیمانییەکی تاکتیکییەوە کە بارودۆخی سیاسیی فراوانتر ئەوەی بخواستایە ـ بەڵام هەرگیز زاڵ نابن بەسەر ناکۆکیی ڕەگداکوتاو و بێمتمانەیی نێوانیاندا.

بە درێژایی سالانی هەشتاکان (پ د ک) پەیوەندییەکی گەرمی هەبوو لەگەڵ ڕژێمی ئێراندا. بارەگای سەرەکیی پارتی لە گوندی سلێڤانیی نزیک زێوە بوو، کە شارۆچکەیەکی ئێران و زۆر لە سنووری هەر دوو تورکیا و عێراقەوە دوور نەبوو. کاتێک عێراق پەلاماری ئێرانی دا، (پ د ک) بە هەلێکی لەباری زانی بۆ تۆڵەکردنەوەی شکستە پڕ سەرشۆڕییەکەی ساڵی ١٩٧٥ و کۆنترۆڵی خۆی لە ناوچەی بادیناندا توند کردەوە، ئەگەر نەڵێین هەموو کوردستانی عێراقیش. کاتێ ئێرانییەکان لە ساڵی ١٩٨٢دا عێراقییەکانیان لە خاکی خۆیان دەرکرد و فشاری ئەوەیان خستە سەر کە بیانخەنە باری بەرگرییەوە، (پ د ک) بەپەرۆش بوو بۆ یارمەتیدانیان. بەو چەشنە لە هاوینی ساڵی ١٩٨٣دا جەنگاوەرانی (پ د ک) و هێزی ئیستیتلاعیان کەوتنە تەک هێزەکانی ئێران لە هێرشکردنیاندا بۆ سەر حاجی ئۆمەران.

به دوای ئەم شەڕەدا، کە تا ڕادەیەک سەرکەوتنیان تێدا بە دەست هێنا، ئێرانییەکان چەند هەوڵێکی تریان دا بە هاوکاریی (پ د ک)، بۆ ئەوەی مەودایەکی قووڵتر بچنە ناو عێراقەوە. هەموو کات ئەم هەوڵانە پێشکەوتنی بە دەست دەهێنا تا ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٨٦دا، هێزەکانی ئێران بە تەواوی گێڕدرانە دواوە.

هێرشی حاجی ئۆمەران هەلێکی بۆ (پ د ک) ڕەخساند کە حیساباتی خۆی لەگەڵ عەشیرەتی برادۆستیدا یەکلا بکاتەوە، کە ناحەزییەکی کۆنیان لە نێواندا بوو، بە هۆی پێگەی ئەم عەشیرەتەوە لە نێوان قەڵەمڕەویی بارزانی و سنووری ئێراندا و بەمە دەیتوانی تەگەرە بخاتە ڕێی هاتوچۆی (پ د ک) بۆ بنکە و بارەگاکانی لە ئێراندا. میلیشیاکانی برادۆست بە پشتگیریی بەغدا ڕۆڵێکی بەرچاوی بەرگریکردنیان بینی لە ناوچەی عەشیرەتەکەیان. بەپێی سروشتی سیاسەتی کوردی، ئەوە بوو کە دوژمنایەتیی (پ د ک) بۆ عەشیرەتی برادۆستی و دژایەتی مێژوویی نێوان (پ د ک) و (ی ن ک)، هاوپەیمانییەکی تەکتیکیی لێ کەوتەوە یەکەم لە نێوان (ی ن ک) و برادۆستییەکاندا و دواتر لە نێوان (ی ن ک) و ڕژێمی بەغدادا.

پەیوەندیی نارێک و ناتەواوی (ی ن ک) لەگەڵ ئێرانی خومەینیدا، بوو بە هاندەری هاوپەیمانییەکی لەم چەشنە. ئێرانییەکان بەردەوام داوایان لە تاڵەبانی دەکرد دەست بداتە چەک لە دژی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا)ی عەبدولڕەحمان قاسملوو، کە حیزبێکی کوردی ــ ئێرانیی یاخی بوو و ماوەیەکی زۆر بووبووە دڕک و دەچەقییە کەلەکەی ڕژێمی خومەینی. تاڵەبانی و قاسملوو دۆستی

دێرینی یەکتر بوون و هەر دوو حیزبەکەشیان هاوبەش بوون لە ئایدیۆلۆجییەکی شارستانیی سێکولاری سۆشیالیستیدا. تاڵەبانی لە ڕووی فشاری ئێراندا وەستا و ڕێگەی بە حدکا و شەش گرووپی تری نەیاری کوردی ئێران دا بنکە و بارەگای خۆیان لە دۆڵی جافەتی دامەزرێنن، کە ناوچەیەکی قایمکاری یەکێتی بوو و دەکەوتە نێو چیا بەرزەکانی باکووری سلێمانییەوە و نازناوی (دۆڵی حیزبەکانی) پێ درابوو. ئێران لە هەوڵی بەردەوامدا بوو بۆ ناردنی هێزەکانی بەرەو باکووری عێراق بۆ ڕاوەدوونانی حدکا و یاخیبوانی تر و لە هەمان کاتدا بەو هیوایەش کە سوود لە پاژنەکەی ئەخیلی عێراقیش وەربگرێت بە بچڕینی پارچەیەک لە خاکی عێراق بە یارمەتیی (پ د ک) و خێرا (ی ن ک)ی پاڵ نا بۆ باوەشی بەغدا.

لە تەمووزی ١٩٨٣دا، کە هێشتا شەڕەکەی حاجی ئۆمەران هەر بەردەوام بوو، فەرەیدون عەبدولقادری گەورە دانوستانکاری تاڵەبانی، کەوتە گفتوگۆی نافەرمی لەگەڵ ڕژێمدا و کۆبوونەوەی لەگەڵ سێ بەرپرسی هەواڵگریی عێراقدا کرد لە بنکەیەکی حدکا لە ناوچەی ئالانی ڕۆژئاوای سەردەشت لە ناو ئێراندا و دەسبەجێ بانگهێشتی بەغدا کرا. فەرەیدون لە ماڵی قاسملوو لە بەغدا مایەوە و زنجیرەیەک گفتوگۆی لەگەڵ تاریق عەزیز و سەرکردە پایە بڵندەکانی تردا ئەنجام دا لە ئۆکتۆبەر و نۆڤەمبەردا. فەرەیدون دواتر (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەڵێت ئەوان پێیان ڕاگەیاندووە کە هەموو شتێک دەگونجێت دانوستانی لەسەر بکرێت وەک: هەڵبژاردنی پەرلەمانی لە عێراقدا، بەردانی زیندانە کوردەکان، بەرفراوانکردنی ناوچەی ئۆتۆنۆمیی

کورد و بگره دۆخی کەرکووکیش. لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٤دا جەلال تاڵەبانی و سەدام حسێن لە بەغدا چاویان بە یەکتر کەوت بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کەرکووک، کە ئەگەری ئەوە هەبوو دانوستانەکە بەو هۆیەوە شکست بێنێت. بەپێی قسەی فەرەیدون، سەدام گوتوویەتی کە خۆشحاڵە بەو پەرەسەندنەی هاتووەتە ئاراوە و خۆی وا پیشان داوە کە ئامادەیە بۆ تەنازولی گرنگ و لە بارەی کەرکووکەوە و گوتوویەتی: "من نامەوێت بڵێم کەرکووک شارێکی عەرەبە، بەڵام شارێکی کوردیش نییە و نابێت بچێتە سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمیی کوردەوە، بەڵام ناکرێت لەژێر کۆنترۆڵی ناوەندیشدا بمێنێتەوە و دەتوانین بەرێوەبەرێتییەکی هاوبەشی بۆ دابنێین." بەڵام لە هەمان کاتیشدا ڕژێم هۆشدارییەکی دەرکرد. بەپێی قسەی نەوشیروان مستەفا ئەمینی جێگری تاڵەبانی (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی١٩٩٢دا)، تاریق عەزیز بە سەرکردە کوردەکانی ڕاگەیاندووە: "ئەگەر ئێوە یارمەتیمان بدەن هەرگیز لە بیری ناکەین، بەڵام ئەگەر لە دژمان بوەستنەوە ئەوەش هەرگیز لە یاد ناکەین و پاش ئەوەی جەنگ کۆتایی دێت، تێکتان دەشکێنین و هەموو گوندەکانتان بە تەواوی خاپوور دەکەین."

ئەم گفتوگۆیانە لە کاتێکدا هاتن، کە دۆخی عێراق تەواو خراپ بوو لە جەنگدا و سەدام حسێن پێویستی بە هەموو هاوکاری و پشتیوانییەک بوو لە هەر کەسێکەوە بێت. سەرەڕای ئەوەش، دانوستان بواری بە هێزەکانی عێراق دا لە کوردستانەوە بگوێزرێنەوە بۆ بەرەی باشوور، بەڵام فرەی نەبرد و پاش ئەوەی عێراق لە ڕێگەی بەکارهێنانی خەردەل و دەمارەگازەوە لە مارتی ١٩٨٤دا توانیی

سەرکەوتوانە هێرشی خەیبەری ئێران ڕابوەستێنێت، وەفدی دانوستانی یەکێتیی تێبینیی ئەوەیان کرد کە ڕکابەرەکانیان بە شێوەیەکی تەکتیکی کارەکە دوا دەخەن و تەگەرەی بۆ دروست دەکەن. دانوستان کە ساڵێکی ڕەبەق درێژەی کێشا و وابەستەی دۆخی شەڕگەکانی عێراق بوو، یان دەچووە پێش یاخود دەوەستا، وەک فەرەیدون دەیگێڕێتەوە. دوا خولی گفتوگۆکان لە نۆڤەمبەردا بوو و پاش بیست ڕۆژ شکستی هێنا، ڕێک لەو کاتەدا کە عێراق و ویلایەتە یەکگرتووەکان پەیوەندیی دیبلۆماسییان گێڕایەوە. دواتر پەیوەندیی ئاست نزمی ئێرانیش شکستی هێنا بۆ ڕاستکردنەوەی ئاڕاستەی خواری مەسەلەکە و کاتێک میلیشیای تەحسین شاوەیسی سەر بە حکومەت، لە کانوونی دووەمی ١٩٨٥دا مامەڕیشەی کوشت، کە فەرماندەیەکی باڵای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، شەڕ لە دەستپێکردنەوەدا بوو. لە پێکدادانەکانی مانگی شوباتدا، جەنگاوەرانی (ی ن ک) هێزەکانی عێراقیان لە نزیک دۆڵی جافەتییەوە بەزاند، کەوا لەم کاتەدا بۆی گەڕابوونەوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بنکە و بارەگاکانیانی تێدا دامەزرێننەوە.

هێزەکانی عێراق، لە ترسی نزیکبوونەوەی نێوان (ی ن ک) و ئێران، زۆر بە توندی هێرشیان کردە سەر ئەو زنجیرەچیایەی لە سلێمانییەوە بەرەو سنوور درێژ بووبووەوە و تەواوی گوندەکانیان وێران کرد و خەڵکەکەشیان ڕاگواستە کۆمەڵگە (موجەممەعات)ی گەورە و ڕەق و تەقەکانی ناوچە دەشتاییەکان. لە دەرەوەی ئەم پشتێنەیە، (ی ن ک) توانیی دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت بەسەر ناوچەی بەرفراوانی دێهاتدا و عێراقییەکان تەنها

دەسەڵاتیان بەسەر شارە گەورەکاندا دەشکا، لەگەڵ ئەو ڕێگەوبانانەی بە یەکترییەوە دەبەستن. شەڕ و پێکدادانی یاخیبوون لە ئاستێکی کەمدا بەردەوام بوو، لەو جۆرەی کە عێراق نەیدەتوانی کۆتایی پێ بێنێت و پێشمەرگەش نەیدەتوانی بیباتەوە. یەکێتی نەیدەتوانی شەڕی دوو بەرە بکات، لەبەر ئەوە زۆری نەبرد کەوتە داڕشتنی باشترین پەیوەندی لەگەڵ ئێراندا. وتووێژکارانی سەرەکییان ئەفسەرانی هەواڵگری بوون لە قەرارگای ڕەمەزان (واتە فەرماندەیی ڕەمەزان)، کە هێزێکی ئاسایشی پاسدارانی بەرپرسی سەرەکیی کوردستانی عێراق و کۆنترۆڵی پەیوەندیی کوردی بە ئێرانەوە دەکرد و زانیاری لەسەر جموجووڵیان کۆ دەکردەوە و بە گشتی خستبوونیە ژێر چاودێرییەوە، کاتێک کە شەڕی کوردە نەیارەکانی ئێرانی دەکرد. شێردڵ عەبدوڵڵا حەوێزی، بەرپرسی پەیوەندیی (ی ن ک) لەگەڵ قەرارگای ڕەمەزاندا، باس لەو سوودە هاوبەشانە دەکات کە لە پەیوەندیی باشتردا دێنە ئاراوە:

"بەپێی پرۆپاگەندەی ئێران، ئێمە هێشتا هەر پەیوەندیمان بە ڕژێمی عێراقەوە مابوو. جارێکیان گرووپێکی ئێرانی هاتن بۆ زانیاری وەرگرتن لەسەر ناوچەی دۆڵی جافەتی و سەردانی ئێمەیان کرد و لەگەڵ بەڕێز تاڵەبانیدا کۆ بوونەوە. هەر ئەو ڕۆژە فڕۆکەکانی عێراق ناوچەکەیان بۆردمان کرد، بە بنکە و بارەگاکانی ئێمەشەوە و بەم ڕەنگە ئێرانییەکان لە هەڵوێستی تازەی ئێمە تێگەیشتن. هەروەها ئەوەشیان بینی کە ئێمە پێشمەرگەمان هەیە لە نزیک شارەکانەوە و دەتوانن فشار بخەنە سەر ڕژێم. پاش ئەمە پەیوەندیمان بەرەو باشتر چوو. ئێمە پێویستمان بە ئێران بوو، بە تایبەتی بۆ

بەدەستهێنانی دەرمان و چارەسەری برینداره‌کانمان، هەروەها بازاڕێکی قاچاخی گەرموگوڕ هەبوو لە ناوچەکەدا، بێجگە لەوە کوردی هەر دوو وڵات پەیوەندییان بە یەکترەوە پتەو بوو. ئەوجا بۆ ئێمە گرنگ بوو بە ئێراندا سەفەری دەرەوە بکەین و هەر لەوێشەوە ڕۆژئاواییەکان بگەنە ئێمە."

کاتێک (ی ن ک) داوای پشتگیریی سەربازیی کرد، ئێرانییەکان لە بەرانبەردا مەرجیان هەبوو، وەک فەرەیدون دەیگوت، ئەویش ئەوە بوو کە داوایان لە یەکێتی کرد ڕۆڵێکی گەورەتر بگێڕێت لە جەنگدا: "یاخیبوونی کورد بە تەنها بەس نییە و ئەوان هێرشی گەورەیان دەویست بۆ سەر هێزەکانی عێراق." ئەمە لەگەڵ نیاز و مەرامی یەکێتیدا یەکی دەگرتەوە کە لەو دەمەدا دانوستان شکستی هێنابوو، ئەمیش دەیویست لەو شوێنەوە لە ڕژێمی عێراق بدات کە ئێشی سەختی پێ دەگەیەنێت و ئەو شوێنەش کەرکووک بوو. کێڵگە نەوتییەکانی کەرکووک، بایەخێکی ستراتیجیی گەورەیان هەبوو بۆ ڕژێم لەبەر هێرشی بەردەوامی ئێران بۆ سەر دەزگا و دامەزراوە نەوتییەکانی بەسرە. پاسداران ئەم پێشنیازەی (ی ن ک)یان بە دڵ بوو، بەڵام دەیانویست لەوە دڵنیا بن تا چەند ئەمە کاری کردە دەبێت، بۆیە ژمارەیەک لە بەرپرسە باڵاکانی پاسداران و لە ناویاندا محەمەد جەعفەریی فەرماندەی قەرارگای ڕەمەزان، کەوتنە تەک گرووپێکی یەکێتی بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی زانیاری بەدەستهێنان (ئیستیتلاعی) لە کەرکووکدا. فەرەیدون لەسەر قسەکانی دەڕوات و دەڵێت: "کاتێک بە چاوی خۆیان بینییان هێزەکانی ئێمە نزیکی کەرکووکن، بەڵێنی پشتگیریی تەواویان پێ داین و پەنجا تەن چەک و تەقەمەنییان پێ

بەخشـین، لەگەڵ مەشـق و ڕاهێنـان لەسـەر بەکارهێنـانی ستریێلا کە جۆرە مووشەکێکن بەسەر شانەوە دەتەقێنرێن و بە دوای گەرمیدا دەڕۆن." (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۰ی فرۆکەوانێکـی عێراقیـدا بـاس لەوە دەکـات کەوا کوردەکـان توانیویـانە چەنـدین هێلیکـۆپتەر و فـڕۆکەی پیلاتـۆز بە مووشەکی ستریێلا و سام بخەنە خوارەوە).

لە ئۆکتۆبەری ۱۹۸٦دا، پێشمەرگە بە ئۆتۆمبیل و بەسـەر جادەی خۆڵی نێوان گوندەکاندا دەگەڕان و دۆستەکانیان لە ناو میلیشیای جاشی سەر بە ڕژێمدا یارمەتییان دەدان. شەوێکیان نزیکەی چل تەن چەک و تەقەمەنییان گواستەوە بـۆ کەرکـووک، کە بریتـی بـوون لە: مووشـەکی گـراد و کاتیۆشا و تۆپی هاوەنی ۸۰ و ۱۲۰ ملیم. شێردڵ حەوێزی کە پلەیەکـی هەبـوو لە تۆپخـانەی مەیدانـدا و لە سـاڵانی حەفتاکانـدا لە کـۆلێجی سـەربازیی عێـراق دەرچووبـوو لەم هێرشـەدا بەشـداریی کرد و دەیگوت کە دوژمنی زۆر باش دەناسی. ئەو فەرماندە عێراقییەی بەرپرس بوو لە هێزەکانی پاراسـتنی نەوتـی کەرکـووک، جەنەڕاڵ بـارق عەبـدوڵلای حـاجی حـونتە بـوو، کە وەک حەوێـزی دەیگـوت "پیـاوێکی تـۆپچیی کـارامەیە و لەگەڵ مـن کـۆلێجی سـەربازیی تەواو کـردووە". بە هەرحـاڵ، ئەو نـزیکەی دوو هەزار پێشـمەرگەیەی ئەم پەلامارەیـان جێبەجـێ کـرد، مەشـقیان لەسـەر بەکارهێنـانی ئەم چەکـانە نەکردبـوو، بەڵام نـزیکەی سـەد جەنگـاوەری پاسـداران یاوەرییـان دەکـردن، لەگەڵ ژمـارەیەک پسـپۆڕی تەقەمەنیـدا کە بە "هێـزی تەکنیکـی" (القوات الفنية) ناویان دەبردن.

هێرشەکە لە شەوی ١٢ی ئۆکتۆبەردا دەستی پێ کرد و بەپێی قسەی شێردڵ حەوێزی، لێدانێکی کوتوپڕی بوو، بۆ بەرپاکردنی هەندێک زیان، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ناردنی پەیامێک بوو بۆ بەغدا کەوا داواکاریی کورد لەسەر کەرکووکە و هاوپەیمانیشی هەیە یارمەتیی دەدەن ناوچەکە بگرێت. شێردڵ دەڵێت، کوردەکان تەنها شەش حەوت جەنگاوەریان لە دەست دا و پاسدارەکان هیچ زیانێکیان بەرنەکەوت و دەمەوبەیان ڕۆیشتن. بە خۆشیی سەرکەوتنی ئەم هێرشەوە، پاسداران چەکەکانیان لای کوردەکان بە جێ هێشت و کەوتنە مەشقپێکردنیان لەسەر بەکارهێنانی ئەو چەکانە. دواتر پرۆپاگەندەی ئێرانی کەوتە شانازی و پیاهەڵدانی هێرشەکە، وەک ئۆپەراسیۆنێکی سەرەکیی ئێران و ناوی فەتح/١ی لێ نا، کە ئامانجی "تێکشکاندنی دامودەزگا ئابووری و سەربازییەکانی کەرکووک بووە"[١٠]. ڕاستییەکەی ئۆپەراسیۆنەکە تەنها چزێک بوو و زیانێکی ئەوتۆشی لێ نەکەوتەوە. میقداد بایز کوردێک بوو لە ماڵەکەی خۆیەوە لە کەرکووک چاوی لە پەلامارەکە بووە و براکەشی کە پێشمەرگەیەکی یەکێتی بووە و وەک ڕێپیشاندەر بەشدار بووە، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٥دا) دەگێڕێتەوە کە لە چەند لاوە لە گەڕەکە کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکووکەوە، هێرش کرایە سەر پێگە سەربازییەکانی دەوروبەری گەڕەکەکەی و دەیگوت کەوا ئێرانییەکان جەنگاوەرە کوردەکانیان فێری چۆنێتیی بەکارهێنانی هاوەنەکان دەکرد.

مەودا و کاریگەریی ئەم ئۆپەراسیۆنە هەر چۆنێک کەوتبێتەوە بوو بە هۆی تووڕەبوونێکی لە ڕادەبەدەری

عێراقییەکان و هێزەکانی بەرگری لە بیرە نەوتەکانی تووشی سەرسووڕمانێکی تەواو کرد. هەروەها هۆشدارییەکی ئاشکرای دا کە هاوپەیمانییەکی نوێی کورد و ئێران دەتوانێت بەرەیەکی دووەم بکاتەوە لە جەنگێکدا کە عێراق، لە دوای شکستەکانی فاو و مەهرانییەوە، کاری ڕوو لە باشە نەبوو. بۆ ڕژێمیش، هێرشەکەی کەرکووکی نەک هەر لە خراپترین کاتدا هات، بەڵکو سرەواندنی زللەیەکی تر بوو لە شکۆمەندیی وڵات، سەرباری هەستکردن بە ناپاکییەکی قووڵ کە ڕێگەیەکی درێژی ویست بۆ ڕوونبوونەوەی ئەو پەستی و تووڕەییە بێئامانەی دواتر لە کاردانەوەی سەربازیدا دەرکەوت، کاتێ کە توانای پەیدا کرد کاردانەوەیەکی وا ئەنجام بدات.

## چەرخی دەسەڵاتی عەلی کیمیایی

پەلامـارە سـەرکەوتووەکەی کەرکـووک، ڕێزێکـی نـوێی ئێرانـی بـۆ یەکێتـی پەیدا کـرد، لەبەر توانـا و دەسـەڵاتی و ڕێککەوتننـامەیەکی هاوکـاریی درێژخایەنیـان ئیمـزا کـرد کە بوو بە مۆرکی پەیوەندیی نێوانیان تـا کۆتایی جەنگ. بەپێی قسەی نەوشیروان، ئەو ڕێککەوتنە پابەندییەکی دووسـەرەی لە خۆ گرتبوو، کە ئەگەر هەر لایەک ڕووبەڕووی هەڕەشـەی سـەربازیی مەترسـیدار بـووەوە، ئەوە لاکەی تـر دەبێـت بەرەیەکـی دووەم بکـاتەوە بـۆ سـووککردنی ئەو فشـارە ــ ئەمە ڕێککەوتننـامەیەکی بایەخـدارە و یـارمەتیی ڕوونکـردنەوەی ڕووداوەکـانی سـاڵی ١٩٨٨ی هەڵەبـجە دەدات. جەلال تاڵەبـانی و فەرەیـدون عەبـدولقادر و چەنـد کاربەدەسـتێکی تـری پـایەبەرزی (ی ن ک)، کە بانگهێشـتی تاران کرابوون، لەگەڵ سەرکردەکانی ئێراندا کۆ بوونەوە و سـەرۆکی بەدەسـەڵاتی پەرلەمـان (کە دواتـر بـوو بە سەرکۆمار) عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانییشی تێدا بوو. فەرەیدون دەگێڕێتەوە کە "لێرە بە دواوە پەیوەندیمان زۆر کۆک بوو، بەڵام کاتێک گەڕاینەوە بۆ بنکەکانمان لە دۆڵـی جـافەتی، بە یەکترمـان دەگـوت: بە ڕاسـتی کـورد بەدبەخـتە. هەمـوو دنیـا پشـتی عێـراق دەگرێـت لە دژی ئێـران، کەچـی ئێستا ئێمە بڕیارمان داوە پشتی ئێران بگرین لە دژی عێراق.

له گفتوگۆکانی تاراندا، وەفدی دانوستانی (ی ن ک)، توانییان خـــاڵێکی نەشــــیاو چارەســــەر بــــکەن کە ڕێـــگەی لە هاوپەیمـانییەکی نزیکتر گرتبوو، ئەویش دۆستایەتیی (ی ن ک) بوو لەگەڵ حیزبە کوردییە ئێرانییەکاندا. تاڵەبانی دواتر ئەوەی ڕوون کردەوە کە دوو ساڵی ویستووە تا قەناعەتی بە ئێران کردووە کەوا یەکێتی دەست بۆ حدکا و کۆمەڵە نەبات لەبری ئێران[١١]. کۆسپەکەی تریش (پ د ک) بوو کە نـاوبژیکردنی ئێـران یـارمەتیی ئەوەی دا هەر دوو حیـزب بـــاوەش بە یەکتـــردا بـــکەنەوە. لە ئاشـــتبوونەوەیەکدا بە تێکەوتنـــی ئێـــران، لە نـــۆڤەمبەری ١٩٨٦دا، کە هەر دوو لا دەبوو گیراوەکانی یەکتر بەربدەن و هەر دوو حیزب بەرەی کوردستانییان دامەزراند و ئەمە هاوپەیمانییەک بوو چەندین حیزبی بچووکیشی تێدا بەشدار بوو.

لێـــرە بە دواوە، هێزەکـــانی پێشـــمەرگە دەســـتیان بە ئۆپەراسیۆنی هاوبەش کرد و کاریگەرانە کۆنترۆڵی تەواوی ئەو هەرێمەیـان کـرد کە بەپێـی ڕێککەوتننـامە مـردووەکەی ئۆتۆنـۆمیی سـاڵی ١٩٧٤ سـنووری بـۆ دانرابـوو، بـێجگە لە شـارە گەورەکـان و ڕێگەوبـانە سـەرەکییەکان. پێشـمەرگە کەوتـــنە ئەنجامـــدانی ئۆپەراســـیۆنی نهێنیـــی چـــالاک و هێرشـکردنە سـەر شـوێنە شارسـتانییەکان و ڕێکخسـتنی نـاڕەزایی خەڵـک. هەروەهـا دەسـتیان دایە دامەزرانـدن و مەشـــقپێکردن و چەکـــدارکردنی "هێـــزی پشـــتگیری" لە گوندەکانـدا، کە یەکەی بەرگریـی میللـی بـوون و لەو پیـاوانە پێک هاتبوو کە لە ڕووی جەستەییەوە بەخۆوە بوون، لەوانە گەلێـک سـەربازی ڕاکـردوو یـان خـۆلادەر لە خزمەتـی سـەربازی (موتەخەلیـف) کە گونـدەکان داڵـدەیان دابـوون.

ئەمانە پاڵپشتیی پێشمەرگەیان دەکرد لە کاتی هێرشکردنیاندا بۆ سەر پێگەکانی سوپا و سەربازگەکان و بێزارکردنی کاروانی سەربازی و فشارهێنانێکی زۆر بۆ میلیشیاکانی جاش. موستەشارێک ڕەنگە بە بەردەوامی لە بەغدا بووبێت و بە مووچەیەکی چەور خەڵات و بەراتێکی باش کرابێت، بەڵام جەنگاوەرە نەفەرەکانی زۆر جار گومانی دڵسۆزییان لێ دەکرا و زۆرێکیان بە نهێنی یارمەتیی خزم و کەسوکاری گوندنشینیان دەدا. تەنانەت هەندێک لە موستەشارەکان ژێربەژێر لەگەڵ یاخیبوان گفتوگۆیان دەکرد بە مەبەستی ڕزگارکردنی خزمەکانیان و یارمەتیی باشیان دەدان تا بەهێز بن، کاتێک کە لەسەر ڕێگەوبانە سەرەکییەکان و دەروازەی شارەکاندا، خاڵی پشکنینیان دادەنا.

پەرەسەندنەکان ئاستی هەڕەشەی بۆ عێراقییەکان زیاتر کرد، کە نەک تەنها هەستیان دەکرد کۆنترۆڵیان بۆ کوردستان ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبێتەوە، بەڵکو درکیشیان بەوە کردبوو کەوا کوردەکان لە دێهاتی دەوروپشتەوە بەرەبەرە نزیکی کەرکووک دەبنەوە و دانیشتوانی ئەو ناوچانە بۆ مەبەستی خۆیان بە کار دێنن. ڕژێم بە باشی چاودێریی بارودۆخەکەی دەکرد و سەیری کرد 'پارێزگارێکی دەستباڵای' لە کەرکووکدا پێویستە و ئەو دەمە محەمەد حەمزە زوبێدی بوو، کە سەرپەرشتیی کۆشش و چالاکیی دژەیاخیبوونی دەکرد.

ئەو پیاوەی دەسنیشان کرا جێی ئەم بگرێتەوە، عەلی حەسەن ئەلمەجیدی ئامۆزای سەدام حسێن بوو، کە پیاوێکی بەدی دڵڕەق بوو و سەرۆکایەتیی پۆلیسی نهێنی، واتە ئەمنی عێراقی دەکرد. لە ١٨ی مارتی ١٩٨٧دا، ئەنجوومەنی

حوکمڕانیی سەرکردایەتیی شۆڕشی عێراق، ئەلمەجیدی بە بەرپرسی مەکتەبی باکووری حیزبی بەعس لە کەرکووک دانا و دەسەڵاتێکی بەرفراوانی درایە بۆ سەرکوتکردنی کوردە یاخییەکان. ئەلمەجید لە سەرنەکەوتنی کاری پارێزگارەکەی پێش خۆیەوە، کە بە توندی لە وتاردانەکانیدا ڕەخنەی لێ دەگرت، تێگەیشت کەوا گەریلاکان بڕێکی زۆری هێز و توانایان تەنها هەر ناوچە شاخاوییەکان نییە، بەڵکو بە شێوەیەکی مەترسیدار لە پشتگیری و هاوکاریی خەڵکەکەوەیە. بەوپێیە پێویستی بە تێکشکاندنی پەیوەندیی نێوان گەریلا (پێشمەرگە، و) گوندنشینەکان بوو. چەکی هەڵبژاردەشی بۆ ئەم مەبەستە گاز بوو، کە دواتر بەکارهێنانی بەربڵاوی لە دێهاتی کوردنشیندا لە ساڵانی ١٩٨٧ ــ ١٩٨٨دا، نازناوی "عەلی کیمیایی" بەسەردا بڕی. بەکارهێنانی گاز لە لایەن ئەلمەجیدەوە، بەشێکی تەواوکەری ستراتیجێکی دوولایەنە بوو بۆ تێکشکاندن و بەزاندنی یاخیبوون. یەک لەو ستراتیجانە ڕاگواستنی خەڵکی دێهات و چۆڵکردنی بوو. بۆ ئەم مەبەستە ئەلمەجید دەستی کرد بە شاڵاوێکی سێ قۆناغیی گوند ڕووخاندن لە بەهار و هاوینی ١٩٨٧دا. ئەندازیارانی سوپا، بلدۆزەر و دینامیتیان خرایە بەردەست و هێزی سەربازییان کەوتە تەک و یەکەم جار ئەو گوند و شارۆچکانەیان (ناحیە) هەڵبژارد، کە دەکەوتنە سەر ڕێگەی قیر و پێگەیشتنیان ئاسان بوو. دووەم جار چوونە سەر گوندەکانی بنار شاخەکان، کە پێشمەرگە لەوێ سوودیان لە ڕووەک و دارودرەخت دەبینی لە بۆسەداناندا بۆ هێزەکانی عێراق کە بێ حەز و ئارەزووی خۆیان دەنێردران. قۆناغی سێیەمیش نیازی ڕووخاندنی ئەو

گونـدانه بـوو، که دەکەوتـنه نـاو دۆڵەکـانی نێـوان چیـا بەرزەکانەوە و له ساڵی ١٩٨٧دا جێبەجێ نەکرا و بۆ ماوەی ساڵێک دواخـرا. دواتـر هیومـان ڕایـتس ووچ گەیشـتە ئەو ئەنجامەی کە شاڵاوی وێرانکردنەکەی ئەلمەجید "پرۆژەیەکی تەواو نائاسـایی بـوو"، بەڵـگەش بـۆ ئەمە "له سەرانسـەری کوردسـتانی عێراقـدا بەرچـاوە کەوا گەلێـک گونـد کـاول و تەختی زەوی کراون"[١٢]. بێجگە لەوەش ئەلمەجید ئاشکرای کرد کە سەرجەم ناوچەکانی دێهات و گوندەکان، ڕووخابن یـان دەسـتیان لـێ نەدرابێـت، نـاوچەی "قەدەغەکـراون". گوندنشـینەکان له بـارودۆخێکی پرمەترسـیدا له شـوێنی خۆیان مابوونەوە و هێلیکۆپتەر و دەورێی سوپا و دەستە و تاقمی جەنگاوەرانی جاش، کردبوویانە ئامانجی بۆردمان و تەقەلێکردن.

بنەمـاکەی تـری سـتراتیجی ئەلمەجیـد، سـەربڕینی سـەرکردایەتیی کـورد بـوو، کە له "پـانکردنەوەی سـەری مـارەکەدا" گوزارشـتی لێـوە دەکـرد. بۆردمـانی فـڕۆکە و تۆپبـاران و هێرشـی هێـزی پیـادە، هەر هەمـوو نەیـانتوانی یـاخیبوان له سـەنگەری قـایمی خۆیـان هەڵکەنـن. وا ئێسـتا ئەلمەجید دەیەوێت گـاز بە کـار بێنێت و بە گـاز و دووکەڵ دەریانپەڕێنێت و کۆزەیـان بکـات بـۆ نـاوچە دەشـتاییەکان و لەوێ بە هێـزی ئاسـایی مامەڵەیـان لەتەکـدا بکـات. بەڵام تۆپـۆگرافیی نـاوچەکە بە قـازانجی ئەم سـتراتیجە نەبـوو. گازەکە وەک گەواڵە هەور بە ناو دۆڵەکاندا نزم دەبووەوە و بە کەمـی بەرەو سـەرەوە هەڵدەکشـا و نەدەگەیشـتە ئەشکەوتەکان. بۆیە پێشمەرگەش فێر بووبوون سووک و

ئاسـان بە قەدپـاڵی شـاخەکاندا هەڵـزنین بـۆ ئەوەی بـگەنە هەوایەکی پاک.

ڕژێم هەر زوو لەوە گەیشت کە خاڵی لاوازی سـەرەکیی پێشمەرگە خەڵکی دێهاتە، چونکە داڵدەیان دەدەن و بەوپێیە بە گازبـارانکردنی ئەو خەڵکە، گیـانی شـەڕکردنی یـاخیبوان تێـک دەشـکێنن و ورەیـان دەڕووخێـت و بە جـاریٚ ئیفلـیج دەبـن. پـێش هەمـوو شـتێک حیـزبە کوردییەکـان یـاخیبوونی خۆیان بە پێویستییەکی پارێزگاریی خەڵک پاساو دەدا. بەڵام کـاریگەریی تـۆقێنەرانەی چەکـی کیمیـایی پەردەی لەسـەر پیرۆزیی ئەم ئیدیعایە هەڵماڵی. ئەم پەردە هەڵماڵینەی عێراق وردە وردە لە مـاوەی سـاڵێکدا دەرکەوت و پاشـان لەگەڵ ئامـانجی چـۆڵکردنی سـەرتاپای گوندەکانـدا تـێکەڵ بـوو. پاشـانیش بە شـێوەیەکی ترسـناک بـازی دایە سـەر بۆچوونێکی تر کە تێکڕا پێکەوە بریتی بوون لە: بەکارهێنـانی گـاز بـۆ دەرپەڕانـدنی گوندنشـینان لە ماڵەکانیـان، کۆکردنەوەیـان و ئەوجـا ڕاپێچکردنیـان بـۆ شـوێنە دوورەدەسـتەکان و دوای ئەوە لەکۆڵکردنەوەیـان ـــ واتە کردنیـان بە ژێـر خـۆڵی بیابـانەوە و بەمەش کۆتاییهێنـان بە یاخیبوونی کورد بۆ هەتاهەتایە.

کەس لە ئەلمەجیـد خـۆی باشـتر گوزارشـت لە نیـاز و مەبەستەکانی ناکات و لە وتاردانێکدا بۆ دڵسۆزانی حیزب لە ساڵی ١٩٨٧دا، لەوە ئاگاداری کردنەوە کەوا کەس لە دێهاتی کوردسـتاندا دەربـاز نابێـت، تەنـانەت موستەشـارە هاوپەیمانەکـان و جەنگاوەرانیـان و کەسوکاریشـیان، ئەگەر گوندەکانیان چۆڵ نەکەن:

"به موستەشارەکانم گوت ڕەنگە بڵێن گوندەکانمان خۆش دەوێت و جێی ناهێڵین و پێیشم گوتن: 'من ناتوانم گوندەکانتان بهێڵمەوە و بە چەکی کیمیایی هێرشیان دەکەمە سەر و بەم جۆرە خۆتان و خێزانەکانتان دەکوژرێن. پێویستە ئێوە دەسبەجێ چۆڵی بکەن و ناتوانم پێتان بڵێم چ ڕۆژێک بڕیار دەدەم بە چەکی کیمیایی هێرش دەکەم'. من هەر هەموویان بە چەکی کیمیایی دەکوژم! با بزانم کێ قسە دەکات؟ کۆمەڵی نێودەوڵەتی؟ لە کۆمەڵی نێودەوڵەتی بەم! لەوانەش کە گوێیان لێ دەگرن... ئەمە نیاز و مەبەستی منە... هەر کە ڕاگوێزانمان تەواو کرد، لە هەموو شوێنێک پەلاماریان دەدەین، بەپێی نەخشە و پلانێکی سەربازی، تەنانەت لە ناو سەنگەرەکانی خۆیشیاندا. لە هێرشەکانماندا سێ یەک یان نیوەی ئەو شوێنانە دەگرینەوە کە لەژێر دەسەڵاتیاندایە. خۆ ئەگەر توانیمان لە سێ بەش دوو بەشی بگرین، ئەوە لە قوژبنێکی بچووکدا گەمارۆیان دەدەین و بە چەکی کیمیایی هێرشیان دەکەینە سەر. من هەر تەنها ڕۆژێک بە کیمیایی لێیان نادەم، بەڵکو ماوەی پازدە ڕۆژ بەردەوام بە کیمیایی دەیانکوتم... پاشان دەبینن هەر چی ئوتۆمبیلی خوا خۆی هەیە، بەشی گواستنەوەیان ناکات."(١٣)

لێرەوە بوو کە بیروبۆچوونی هێرش و پەلاماری ئەنفال هاتە ئاراوە.

## کەناڵی پەیوەندیی "تایبەت"

لە بەهاری ١٩٨٧دا، هەر دوو لا هەر شیروتیریان لێکتر دەسوی و شێوازی نوێی هێرش و بەرگرییان تاقی دەکردەوە و جاری گاز نەکەوتبووە بواری کارپێکردنەوە. کاتێ ئەلمەجید دەیویست سەری سەرکردایەتیی کورد بقرتێنێت، سەرکردە کوردەکانیش بە نۆرەی خۆیان دەیانویست چی زووە و تا دەکرێت گەمارۆی هێزی سەربازیی عێراق لەسەر بنکە و بارەگاکانیان هەڵبگیرێت. ڕەبایەکانی سوپا بە لوتکەی شاخەکانەوە چواردەوری دۆڵی جافەتییان گرتبوو و ئابلووقەیەکی بەردەوامیان بەسەردا سەپاندبوو و کۆنترۆڵی خاڵەکانی هاتوچۆیان کردبوو (هەندێ ڕاڕەوی قاچاخ نەبێت). لە شەوی ١٣ لەسەر ١٤ی نیساندا، هێزێکی پێشمەرگەی (ی ن ک)، پەلاماری هێزەکانی عێراقی دا لە چیاکانی چواردەوری دۆڵی جافەتی ـــ لە "شەڕی داستانی ڕزگاریدا" و لە ئەزمڕ و چوارتا و ماوەت و شاخە سپی و شوێنی تر، لە سەربازگە و ڕەبایەکانیان دەریانپەڕاندن. بە قسەی کوردێکی بەشداربوو لەو شەڕانەدا، کە ناوی جەمال حەمەکەریمە، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) پێشمەرگەکان ڕێگەی نێوان سلێمانی و شارۆچکەی دوکانیان گرت، کە دەکەوێتە سەر دەریاچەی دوکان و لەوێدا بەنداوێک لەسەر زێی بچووکە (کە لقێکی

ڕووبـاری دیجـلەیە) و وزەی کارەبـای نـاوچەکە بەرهەم دێنێت.

هێرشـی پێچەوانەی عێراق لە هەمان ڕۆژدا دەسـتی پێ کرد و یەکەم ئیشـارەتی ئەلمەجیدی وا لە خۆ گرتبوو کەوا کاتەکـان گـۆڕاون. بەوپێـیە لە گێـڕانەوەی نـاوچە لەدەسـتچووەکان سـەرنەکەوتن، بـوو بە هـۆی یەکەم بەکارهێنـانی تۆمـارکراوی گـاز لە کوردسـتاندا، کە بە شـێوەیەکی سـەرەکی ئاڕاسـتەی هێزەکانی ئێران نەکرابێت، وەک لە حاجی ئۆمەران و پێنجوێندا لە ساڵی ۱۹۸۳دا ڕووی دا. لەمەدا شـێردڵ حەوێـزی بـوو بە "یەکەم برینـداری چەکە کیمیاییەکەی" ئەلمەجید، وەک دواتر خـۆی دەیگێڕایەوە. ئەم وەک پێشمەرگەیەکی دێرین بە بۆنی فۆسـفۆر ڕاهـاتبوو، کە بە بـۆنی پیـازی دەچوانـد. ئێـوارەی ڕۆژی ۱۵ی نیسـان و کاتێک کە ئەم بە دۆڵی جافەتیدا شۆڕ دەبووەوە و چاوەڕێی هێرشێکی پێچەوانەی عێراق بوو، تۆپباران دەستی پێ کرد و مەسـەلەکەی زۆر بەلاوە گرنگ نەبوو، چونکە لەمێژ بوو پێی ڕاهاتبوون. شێردڵ لێرەدا دەڵێت: "تەقینەوەکـان بەلامەوە نامۆ بوون." ئەوجا لەسەری دەڕوات و دەڵێت:

"تۆپبـارانەکە ئاسـایی نەبـوو، کاتێـک گوللەتۆپەکـان دەتەقینەوە دووکەڵیان لێ پەیدا دەبوو و بۆنی پیازیان لێوە دەهـات و چەنـد کەسـێکمان بە سـووکی برینـدار بـووین. بـۆ بەیـانی تەماشـام کـرد دەسـتم تلـۆقی کـردووە و سـەرم ژان دەکـات و دەسـبەجێ چـووم بـۆ لای مـام جەلال و کـاک فەرەیـدون بـۆ ئەوەی پێیـان ڕابگەیەنـم کە هێرشـی فۆسفۆرمان کراوەتە سەر. بە ڕێکەوت شـالاوی ئامۆزام، کە دکتـۆرە، لەوێ بـوو و تەماشـایەکی دەسـتی کـردم و گـوتی:

'ئەمە گازی خەردەلە'. مام جەلال ئامۆژگاریی کردم کە بە کەس نەڵێم و تەنها ئەم چوارە بە مەسەلەکەمان زانی. بۆ ڕۆژی دواتر بە شێوەیەکی خەستتر تۆپباران کراین و پاشان بۆ هەموو کەس دەرکەوت کە ئەمە چەکی کیمیاییە و ئێمە ئەزموونێکمان لەگەڵی نەبوو!'

ڕەنگە پێشمەرگەکان ئەزموونی ئەم چەکەیان نەبووبێت، بەڵام وەنەبێت پێشتر ئاگاداری نەبووبێتن. فەرەیدون دەڵێت کەوا مانگێک لەوەوپێش پەیامێکی لە عەلی حەسەن ئەلمەجیدەوە پێ گەیشتووە و تێیدا دەڵێت 'ئێوە حەشارگەی چاکتان بۆ پێشمەرگەکانتان دروست کردووە و ئێمەش چەکی واتان بۆ بە کار دێنین کە لە ناو ئەو حەشارگانەدا بتانکوژێت'، هەڵبەت پەیام بە شێوەیەکی ڕۆتینی لە ڕێگەی کەناڵی نارەسمییەوە دەنێردرا. فەرەیدون دەڵێت: 'ئێمە تێگەیشتین کە ڕژێم گاز بە کار دێنێت، بەڵام بڕیارمان دا بە پێشمەرگەکان نەڵێین بۆ ئەوەی کار نەکاتە سەر ورەیان.' ڕاستییەکەی ئەلمەجیدیش هەمان مەبەستی هەبوو و دواتر لە ساڵی ١٩٨٧دا و لە کۆبوونەوەیەکی مەکتەبی باکووردا، باس لەوە دەکات کە 'جەلال تاڵەبانی داوای لێ کردم کەناڵێکی پەیوەندیی تایبەتی لەگەڵ بکەمەوە، بەڵام ئەو ئێوارەیە من چووم بۆ سلێمانی و بە چەکی تایبەتی لێم دان'، واتە بە چەکی کیمیایی[١٤].

پاش ئەوە بە ماوەیەکی کورت ئێرانییەکان تیمێکی پزیشکییان نارد بۆ تیمارکردنی هاوپەیمانە کوردەکانیان و ماسکی گازیان پێ دان و مەشق و ڕاهێنانیان پێ کردن لەسەر بەرگریکردن لە کیمیایی. شێردڵ دەگێڕێتەوە کەوا 'ئەوان باسی گازی جۆراوجۆریان بۆ کردین و هەر یەکە و

بۆنی چیی لێ دێت و پێیان گوتین لە کاتی پەلاماری گازدا خۆمان بشۆین، ئاگر بکەینەوە، خۆمان لە بەتانیی تەڕ بپێچینەوە و خاولی و جامانەی تەڕ لە سەر و دەموچاومانەوە بئالێنین".

شێردڵ هەر زوو تێبینیی دەسکارییەکی قێزەونی تاکتیکی عێراقی کردبوو، کە تۆپی ئاساییان بە کار دەهێنا بۆ ئەوەی پێشمەرگە ڕاپێچی حەشارگەکانیان بکەن و بە دوای ئەوەدا تۆپی کیمیاییان بەسەردا دەباراندن بۆ ئەوەی لە ناو حەشارگەکاندا بکوژرێن. "بەمپێیە و هەر کە گوێمان لە دەنگی نەرمتر دەبوو، دەمانزانی تۆپی کیمیاییە و بە پەلە ڕامان دەکردە دەرەوە و بە قەدپاڵی شاخەکاندا هەڵدەکشاین، بەڵام دواتر کەوتنە بەکارهێنانی تۆپی ئاسایی و کیمیایی لە یەک کاتدا. ئەمە کارەکەی لێ ئاڵۆز کردبووین و زۆر مەترسیدار بوو". هەروەها تێبینیی ئەوەشی کردبوو کە عێراقییەکان گوللەڕاجیمەی ١٥٢ ملیمیان بە کار دەهێنا بە مەودای کەوانەیی، "کە لە لایەن یەکەیەکی تۆپخانەی تایبەتەوە دەتەقێنرا و بە تایبەت بۆ ئەم هێرشانەیان هێنابوو، پاشان دەسبەجێ دەیانگێڕانەوە". ئەم تۆپانە بە قووڵی ڕۆ دەچوونە شوێنی خۆحەشاردانیانەوە.

بارەگای سەرکردایەتیی (ی ن ک) و بنکەکانی پێشمەرگە لە دەوروبەری، تاقە ئامانجی یەکەم بەکارهێنانی گاز نەبوون لە لایەن ئەلمەجیدەوە و بە تەنها گەریلا کوردەکان قوربانیی دەستی ئەم پەلامارانە نەبوون. لە ١٦ی نیساندا و ماوەیەکی کەم دوای تووشبوونی شێردڵ حەوێزی بەو زام و برینە نامۆیە، هێزەکانی عێراق کەوتنە هێرشکردنێکی سەرەکی بە گاز، دژ بە کۆمەڵە گوندێک لە دۆڵی بالیساندا،

که بنکەی فەرماندەیی ناوچەیی (مەڵبەندی) هەولێری (ی ن ک)ی لێ بوو. دۆڵەکە لە سنوورەوە دوورە، بەڵام شوێنێکی پەیوەندیی گرنگ پێک دێنێت لەگەڵ زنجیرە دۆڵەکانی نێوان سلێمانی و بادیناندا. پێشمەرگە لێرەولەوێ لە ناو خەڵکی ناوچەکەدا دەژیان، بەڵام وەک خۆیان دەڵێن ڕۆژی هێرش و پەلامارەکە لەوێ نەبوون. هیومان رایتس وۆچ وردەکارییەکی ئەو ڕووداوەی باس کردووە:

"دوانیوەڕۆیەکی درەنگ بوو، نمەنمە باران دەباری... گوندنشینان لە کێڵگە و مەزراکانیانەوە گەڕابوونەوە ماڵ و خەریکی ئامادەکردنی نانی ئێوارە بوون، کاتێک گوێیان لە دەنگی ورەوڕی فڕۆکە بوو، لێیان نزیک دەبووەوە. هەندێک هەر لە ماڵەکانیاندا مانەوە و هەندێک خۆیان گەیاندە کونە تەیارەکانیان، پێش ئەوەی پۆلە فڕۆکەیەک دەرکەون و بە نزمی بسووڕێنەوە بە ڕاسەری هەر دوو گوندی (بالیسان کە ٢٥٠ ماڵ دەبوو لەگەڵ شێخ وەسانان کە ١٥٠ ماڵ دەبوو)، بۆ ئەوەی بۆمبەکانیان بەسەریاندا بەردەنەوە کە دەنگی تەقینەوەیان کپ بوو و تڵپەی دەهات."(١٥)

شریتێکی ڤیدیۆ، کە لە لایەن جەنگاوەرێکی جاشەوە گیراوە، هێرشەکەی تۆمار کردووە. دواتر شایەتحاڵەکان باسیان لە شنەبایەکی ساردی بەهارانە دەکرد لەگەڵ بۆن و بەرامێکی سەرنجڕاکێشی گەواڵە دووکەڵێکدا کە بۆ خوارەوە دەنیشت، بەڵام لە هەمان کاتدا ژمارە برینداریێکی ترسناک و بەرکەوتنێکی زۆری بەرپا کرد. ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشینان هەر لە جێدا مردن و گەلێک لە بریندارانیان بە یارمەتیی پێشمەرگە توانییان بگەنە نزیکترین شارۆچکەکانی ئەو ناوە.

ئەوەی کە بەسەر دەربازبواندا هات، خۆی لە خۆیدا چیرۆکێکی دراماتیکیی سەیرە کەوا گەلێکیان لە کاتی هەڵاتندا مردن و زۆربەی ئەوانەی گەیشتنە هەولێر، لە لایەن ئەمنەوە گیران و بێسەروشوێن کران. بە هەرحاڵ، لە هەمووی گرنگتر، ژمارەیەکی کەم توانییان بگەنە سنوور و لەوێ دکتۆرە ئێرانییەکان برینەکانیان تیمار کردن و بردنیان بۆ باختەرانی پایتەختی ناوچەکە (مەبەست کرماشانە، وەرگێڕ) و ئێرانییەکان ئەوەی کە لە بالیسان ڕووی دا، نەیانشاردەوە. ئیقباڵ ڕەزای کاربەدەست لە نەتەوە یەکگرتووەکان (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۰دا) دەگێڕێتەوە کە لە سەردانێکی نیسانی ۱۹۸۷دا بۆ شارۆچکەی بانەی کوردستانی ئێران، کە ئەویش بەردەوام ئامانجی عێراق بوو، تیمەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەو عێراقییانەیان پیشان درا "کەوا بۆمان دەرکەوت خەڵکی سڤیلن" و بە سووکی برینداری گاز بوون. "ئێرانییەکان پێیان ڕاگەیاندین کە ئەم خەڵکە لە ناو عێراقدا وایان لێ هاتووە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە ئەرکی ئێمە نەبوو". کێشەکە لەوەدا بوو کە نەتەوە یەکگرتووەکان تەنها بۆی هەبوو لێکۆڵینەوە لە بەکارهێنانی ئەو چەکە کیمیاییانەدا بکات کە لە جوغزی جەنگی ئێران ـــ عێراقدا بوون، وەک ململانێیەکی چەکدارانەی نێودەوڵەتی کە پرۆتۆکۆڵی ساڵی ۱۹۲۵ی جنێڤ بە تەواویی بەسەریدا بسەپێت. بەڵام پرۆتۆکۆڵەکە باسی لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی نەکردووە لە کەیوبەینی ململانێی چەکداریی ناوخۆدا، چەشنی شەڕوشۆڕی یاخیبوون یان هێرشی دژەیاخیبوون. بەمپێیە تیمەکە لە گرژیی نێوان ئەنجوومەنی ئاسایش و سکرتێری

گشتیدا گیری خواردبوو، چۆن ڕاپۆرت لەسەر بەرکەوتوان و برینداراني نوێ بدات. ڕەزا زیاتر ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێت "ئێمە لە ناو عێراقدا نەبووین و وای بۆ دەچووین کەوا برینداربوونی ئەو خەڵکە ڕەنگە لە ڕێکەوتی جەنگەوە بووبێت. بەمپێیە ئێمە نامەیەکی جیاکارمان ئیمزا کرد و ناردمان بۆ سکرتێری گشتی بۆ ئاگادارکردنەوەی لەوەی کە بینیمان. بەڵام ئەو زانیارییەمان نەخستە ناو ڕاپۆرتی کۆتاییەوە و هەرگیز ئاشکرا نەکرا و نەخرایە بەردەمی ئەنجوومەنی ئاسایش".

بەڵگەی ئەم ستەمکارییە نوێیە، کە باس و گێڕانەوەی خەڵکێکی مەدەنی بوون لە بارودۆخێکدا بریندار بووبوون کە نەدەتوانرا بە سەربەخۆیی یەکلایی بکرێتەوە، هێند لاواز بوو کەوا بە ئاسانی پشتگوێ دەخرا، هەر چەندە کەمپێنێکی چالاکی میدیاش لە لایەن نوێنەرانی سیاسیی کوردەوە لە پایتەختەکانی ئەورووپادا بەڕێوە دەچوو، کە ناوبەناو پرسیاری پەرلەمانەکانیان دەورووژاند. بەو ڕەنگە سەرکردایەتیی عێراق جارێکی تر تێگەیشت کە دەستبەڕەڵایە لە کوشتندا و ئەمە وای لێ کرد هەست بکات بە تەواوی دەرگا ئاوەڵایە لە بەردەمیدا کە یاخیبوونی کورد لە کەمترین ماوەی گونجاودا کۆتایی پێ بێنێت، بە هەر کەرەستەیەک بێت لە بەردەستیدا و ئەم گەشبینییەی هۆکاری خۆی هەبوو. بەپێی قسەی بەرزان قادر محەمەد، کە لەو دەمەدا پێشمەرگە بووە و (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٤دا) دەڵێت کەوا ژیان لە گوندەکاندا زۆر سەخت و دژوار بوو و ورەی خەڵکەکە ڕووخابوو. چەکی کیمیایی لەم دەمەدا دیاردەیەکی نوێ بووە و کوردەکان هێشتا نەیاندەزانی چۆن خۆ

بپارێزن. "ترس باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشابوو، ڕژێم بەکرێگیراوانی خۆی دەنارده گوندەکان بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەنەوە کە حکومەت نیازی وایە هێرشی کیمیاییان بکاتە سەر و هانی خەڵکەکەیان دەدا بار بکەنە کۆمەڵگەکان، بۆ ئەوەی گیانی خۆیان ڕزگار بکەن".

لە حوزەیرانی ١٩٨٧دا، عێراق دەستی کردە پێشڕەوی بۆ سەر سەنگەر و قایمکارییەکانی کورد و بەرەوڕووی بەرگرییەکی سەخت بووەوە. هەر چەندە بەشێک لە دانیشتوانی دێهات گواستبوویانەوە بۆ موجەممەعات، بەڵام زۆرێکی تریان سووک و ئاسان بەرەو چیاکان هەڵاتبوون و داڵدەیان دابووە ئەو گوندانەی کە سوپا نەیدەتوانی پێیان بگات و لەوێ ژمارەیەکی زۆر سەربازی موتەخەلیف و هەڵاتوو چووبوونە پاڵیان و ئەم گەنجانە هیچ دڵسۆزییان نەبوو بۆ ڕژێم و نەیاندەویست ببنە خۆراکی جەنگێک کەوا هیچ سوودێکی بۆ ئەمان تێدا نەبوو وەک کورد. لە کاردانەوەی ئەمەدا، عەلی حەسەن ئەلمەجیدی گەورە دەسەڵاتدار لە کۆشک و تەلاری خۆیەوە لە کەرکووک، دوو فەرمانی کارپێکردووی بەردەوامی دەرکرد کە دەکرێت وەک دوو بەڵگەنامەی "دەسپێکی پەلامار" لەقەڵەم بدرێن. یەکەم فەرمان لە ٣ی حوزەیراندا بە ڕوونی ناوچە قەدەغەکراوەکان دەستنیشان دەکات و برگە پێنجی بەم جۆرەیە: "هێزە چەکدارەکان لە مەودای دەسەڵاتیاندا دەبێت هەر چی مرۆڤ و ئاژەڵ هەیە لەم ناوچانەدا بیانکوژن و بوونیان بە تەواوی قەدەغەیە".

فەرمانی دووەم لە ٢٠ی حوزەیراندا، لەوی پێشوو زیاتر هێزی ڕاماڵینی هەبوو، برگە چواری فەرماندەی فەیلەقەکان

ڕادەسپێرێت کە "لێدانی تایبەت جێبەجێ بکرێت بە تۆپخانە و هێلیکۆپتەر و فڕۆکەی جەنگی لە هەموو کاتێکدا، بە ڕۆژ و بە شەو، بۆ ئەوەی گەورەترین ژمارەی ئەو خەڵکانە بکوژێت کە لەو ناوچە قەدەغەکراوانەدان و لە ئەنجام ئاگادارمان بکەنەوە". بڕگە پێنجیشی دەبێت وەک کارنامەی کوشتاری ئەنفالی ساڵی دواتر تەماشا بکرێت، کە دەقەکەی بەم جۆرەیە: "هەموو ئەو کەسانەی لەم گوندانەدا دەگیرێن، دەبێت بەند بکرێن و لە لایەن دەزگا ئەمنیەکانەوە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکرێت و ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان ١٥ بۆ ٧٠ ساڵدایە دەبێت ئیعدام بکرێن، پاش ئەوەی زانیاریی بەسوودیان لێ وەردەگیرێت"(١٦).

ڕەنگە خوێنەر هەقی خۆی بێت بە تەواوی ڕاسپاردە جفرەئامێزەکانی بڕگە چوار تێنەگات، چونکە "لێدانی تایبەت (ضربات خاصة)" و "زەخیرەی تایبەت (العتاد الخاص)" واتای هێرشی گازیان دەگەیاند بە زمانێکی شیرین (euphemism)، کە فەرماندە پایە بڵندەکانی عێراق باش دەیانزانی چییە و ئەمە بە ئاشکرا لە بەڵگەنامەکانی ئەمن و ئیستیخباراتی سەربازیدا دەردەکەوێت و لە لایەن شارەزایانی چەکی کیمیایی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان و کەسانی جۆراوجۆری ئاگاداری عێراقییەوە سەلمێنراوە، لە نێویاندا وەفیق سامەڕایی بەرپرسی بەڕێوەبەریێتیی ئیستیخباراتی سەربازی و ئەو فڕۆکەوانانەی لە سەردەمی جەنگدا ئەرکی بۆردمانیان پێ سپێردرابوو.

ئەگەر هێرشی بەرچاوی گاز لە ناوچە قەدەغەکراوەکاندا ڕووی نەدابێت لە نێوان حوزەیران و کۆتایی ساڵدا، هۆی ئەوەیە کە عێراق سەرقاڵی شتی تر بووە، وەک بایەخدان بە

بڕیـــارێکی ئاگربەســـت لە ئەنجـــوومەنی ئاسایشـــەوە (لە تەمووزدا)، مامەڵەکردن لەگەڵ هێزێکی دەریاوانیی توندوتۆڵ و ڕکـابەریکی بالآدەسـت لە ئاوەکـانی کەنـداودا، ڕاییکردنـی ســـــەرژمێریی دە ســـــاڵ جارێـــــک (لە ئۆکتـــــۆبەردا)، بەرەوڕووبـــوونەوەی هێرشـــە بێزارکەرەکـــانی ئێـــران بە درێژایـی هێڵـی بەرەی شـــەڕ، ئامـــادەکردنی هێزەکـانی بـۆ بەرەنگـاربوونەوەی هێرشـی "کۆتـایی" داهـاتووی ئێـران و چاوەڕێکردنی توانەوەی بەفر لە کوردستاندا.

## · مەسەلەیەکی ناوخۆیی

لە هـاوینی ١٩٨٧دا بەڕێـوەبەرێتیی ڕێگـان چالاکـانە لە پەیجـۆری کۆتاییپێهێنـانی جەنگـدا بـوو، کە هێزەکـانی ئەمەریکای کێش کردبووە کەنداوی فارسـەوە و سۆڤیێتیش ئامـادەگییەکی بەرچـاوی خۆیـان هەبـوو لەوێ. ڕێگـان ئاگربەسـتێکی دەویسـت کە بەلای هەلـومەرجی عێراقـدا بشـکێتەوە، کە بریتـی بـوو لە ئیحتیـواکردنی فراوانخـوازیی ئێـران و گێـڕانەوەی بـاری سـەقامگیر بـۆ نـاوچەیەک کە سـەرچاوە سـەرەکییەکانی نەوتـی ڕۆژئـاوای لێـوە دەسـت دەکەوێـت. لە قسـەکانی گیانـدۆمێنیکۆ پیکـۆی لەمەڕ نەتەوە یەکگرتووەکـان، ئەوە دەردەکەوێـت کە "بڕینـی ڕۆیشـتنە دەرەوەی نەوت بوو، لە کەنداوی فارسـەوە کە دواتر هـۆش و دڵی کۆمەڵگەی جیهانیی بەلای خۆیدا کێش کرد، لەسـەر جەنگـی ئێـران ــ عێـراق"[١٧]. ئـاخۆ تـا چ مەودا و ئاسـتێک واشـنتۆن ئاگـای لە ڕووداوەکـانی کوردسـتان بووبێـت؟ ڕاپۆرتە هەواڵەکانی ڕۆژئـاوا تەمومژاوی و شـێواو بـوون و بە زەحـــمەت ڕاســـت و چەوت جیـــا دەکـــرانەوە. بەڵام ڕاپـۆرتێکی هاوبەشـی موخـابەرات و سـەرۆکایەتیی ئەرکـان، بەڵگەیەکمان دەداتێ کە ئیدارەی ئەمەریکی چۆن زانیویەتی. بەشـی سـەرەتای دەسـکاریی کـراوە و داڕێـژراوەتەوە، بەڵام بەشە ئاشکراکراوەکەی بەم جۆرەیە: "جەنگاوەرانی یەکێتیی

نیشتمانیی کوردستان، کە بوون بە فاکتەری بالادەست لە ناو بزووتنەوە بەرگرییەکانی کورددا و پارتی دیموکراتی کورد سەرکەوتنیان بە دەست هێناوە لە فراوانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیاندا، کە بە شێوەیەکی سەرەکی ناوچە شاخاوییەکانی سنووری گرتووەتەوە لە ڕۆژهەلاتی هێلی هەولێر ـ کەرکووک ـ سلێمانی و باکووری ئامێدی ـ دهۆک. دەسەلاتدارانی عێراق بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەشەنەکردنی یاخیبوون، دەستیان کردووە بە هەلمەتێکی نیشتەجێکردن و تەختکردنی نزیکەی سێسەد گوند و وێرانکردنی ناوچە نیشتەجێیەکان بە بۆردمانی بەردەوام. (لێرەدا بڕگەکە دەسکاری کراوە). سەرەڕای داپلۆسینی بێبەزەییانە، کە بەکارهێنانی تۆخمە کیمیاییەکانیشی گرتبووەوە و چەندین لیوای گاردی کۆماری و پالپشتیی هێزە چەکدارەکانی دەکرد، ئۆپەراسیۆنەکانی ئاسایشی عێراق، کە لە لایەن عەلی حەسەن ئەلمەجیدەوە ڕێک دەخرا و بەڕێوە دەبرا، لە دامرکانەوەی یاخیبوونی کورددا شکستی هێنا".[١٨]

بە هەمان شێوە، ڕاپۆرتێکی (سی ئای ئەی) کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئاخروئۆخریی سالی ١٩٨٧ یان سەرەتای سالی ١٩٨٨، هەلسەنگاندنێکی وردی تواناسازیی عێراق و ئەو شتانەی زانیاریی بایەخدار لە بارەی ڕووداوەکانی کوردستانەوە دەردەخەن، کە عێراق گازی بەسەر کوردەکاندا کردووە و ئەوجا ڕاپۆرتەکەشی پێشنیار دەکات کەوا:

"... گواستنەوەی هێز لە بەرە کاریگەرەکان کەم بکرێتەوە، لەگەل ئەو زیانانەی ئەگەری بەرپابوونیان هەیە لە

ناوچە دوورەدەستەکانی کەوا گەریلاکان تێیدا دەستبالآن... لە نیسانی ١٩٨٧ەوە هەڵمەتێکی سەربازی بەڕێوە دەچێت بۆ تەختکردن و سڕینەوەی گوندەکان، بە هۆی پشتگیریی گرووپەکانی گەریلای کوردەوە. هێزەکانی عێراق، بۆ کەمکردنەوەی زیانی بەشەری و ماددیی خۆیان، تۆخمە کیمیاییەکانی کۆنترۆڵی ئاژاوەگێڕی و فرەجاریش ئەگەری بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دەهاتە ئاراوە، کاتێک کە چەکی ئاسایی نەیدەتوانی بە تەواوی مل بە گوندنشینان کەچ بکات، پێش ئەوەی خانووەکانیان تەخت بکرێت"[١٩].

بێجگە لەوەش، (سی ئای ئەی) بە دووربینییەکی وردەوە هۆشداریی ئەوەی داوە کە "بەڵگە بە دەستەوەیە کەوا هێرشەکانی چەکی کیمیایی عێراق، پێدەچێت لە بەکارهێنان بە مەبەستی تەنها بەرگرییەوە پەرەی سەندبێت بۆ بەکارهێنانی پێشوەخت بە مەبەستی داگیرکردن. ئەگەر ئێران هەڕەشەی لە پێگە ستراتیجییەکانی عێراق کردبێت، پێمان وایە عێراق لە ئاستێکی گەورەدا کیمیایی بە کار دەهێنا، وەک سیاسییە عێراقییەکان ئاماژەیان پێ دەکرد... هەروەها دەبێت چاوەڕێی تێبینیکردنی بەکارهێنانی تۆخمی کیمیایی کوشندەتر بین وەک ڤی ئێکس VX". پاشان ڕاپۆرتەکە بەردەوام دەبێت و دەڵێت "وەک لە ئێستادا بە کار دەهێنرێت، چەکی کیمیایی هەندێک جار بواری سوودی تەکنیکیی دەدات، بەڵام بەغدا نیازی ئەوەی پیشان نەداوە کە پابەندی تەواو دەبێت بە سەرچاوەکانی چەکی کیمیاییەوە، کە پێویست بێت بۆ بەدەستهێنانی سوودێکی ستراتیجیی ڕاستەقینە"[٢٠].

هەندێک بەڵگەنامە ئەوە دەردەخەن کە دەزگاکانی تری حکومەتیش بە باشی ئاگادار کراونەتەوە. لە سەرەتای ئەیلوولدا، پیتەر گالبرەیس، کە دواتر بوو بە یاریدەدەرێکی کلەیبۆرن پێلی سەرۆکی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سەنات (ئەنجوومەنی پیران، و)، بە یاوەریی کاربەدەستێکی سیاسیی بالوێزخانە، کە ناوی هەیوود ڕانکین بوو، گەشتێکی کورتخایەنی بە عێراقدا کرد. ڕاپۆرتە بڵاونەکراوەکەی ڕانکین "گەشتێک لەگەڵ گالبرەیس ـ مەرگ لە بەسرە و وێرانکاری لە کوردستاندا" تێبینیی ئەوەی کردووە چۆن گالبرەیس "توانیویەتی یەکەم جار سەرنجی دۆخی ئاسایش بدات کە چۆن بە شێوەیەکی بەرچاو داڕووخاوە" بە بەراورد لەگەڵ یەکەم گەشتیدا سێ ساڵ پێشتر. لەگەڵ ئەوەشدا کە قەدەغە خرابووە سەر ئەو دوو پیاوە لە ڕێگەوبانە سەرەکییەکان لا بدەن، بەڵام توانییان ڕاپۆرتی ئەوە بدەن کەوا:

"ماڵ و خانوو بە تەواوی ڕووخێنرابوون و وەک تێبینیمان کرد هەموو شارۆچکە و گوندە کوردەکان، کە ئێمە بینیمانن، ڕووخابوون و تێکڕا ژمارەیان ٢٣ بوو. پاش ئەوەی ماوەی میلێکی تر ڕێگەمان بڕی، بە ناو شارۆچکەیەکی تری گەورەی کورددا گوزەرمان کرد کە بە تەواوی تێک درابوو. تا چاو بڕی دەکرد هەر وا کەلاوەی وێران بوو لە نێو تەپوتۆزدا دەردەکەوت و یەک دیوار بە پێوە نەمابوو... لەم ناوچەیەدا و لە هەموو شوێنێکی تر، بە درێژایی شارێکاندا لە کوردستان، ئێمە قەڵای سەربازیمان دەبینی کە نزیکەی هەر کیلۆمەترە و دانەیەک لەگەڵ قولەی تایبەتی بۆ پاسەوان، کە بە زۆری کوردی سەر بە ڕژێمیان

تێدا بوو. ئەم قەڵایانە تەواو چۆڵ بوون و تاقە کەسێکیان تێدا نەبوو، تەنانەت مێگەلە مەڕ یان شوانێکیشمان نەدی... لە باشووری شارۆچکەی عەربەتەوە، بڕێکی زۆر خانووی تازە دروستکراومان بینی، کە زنجیرەیەک کۆمەڵگە (موجەممەعات) بوون لە دەشتێکی پڕ بەرزی و نزمیدا ماوەی چەند میلێک درێژ بووبوونەوە. لەسەر ڕێگەی سلێمانی ـ کەرکووکیش دیسان ناوچەیەکی دە میلیمان بینی لە گوندی وێرانکراو... ئەم دەشتە پانوبەرینە، کە لە دۆخی ئاساییدا نایابترین شوێنی کشتوکاڵە، ئەمڕۆ نەک هەر بووە بە شوێن کەلاوەی گوندی ڕووخێنراوی کورد، بەڵکو بووە بە مۆڵگەیەکی سەربازیی گەورە و سەربازگە لە دوای سەربازگەی تێدا دامەزراوە"[٢١].

ئەم سەرنجانە لە سوورانەوەیەکی خێرا بە باکووردا دروست بوون و ئەگەر بهاتایە و ئەم دوو کەسە بە ئازادی لە دێهاتدا بگەڕانایە، هەڵبەت زۆر لەمە زیاتریان دەبینی، بەڵام عێراق ڕێگەی بە کەس نەدەدا ئەو کارە بکات. هەروەها ڕاپۆرتی ساڵانەی وەزارەتی دەرەوەش لەسەر مافی مرۆڤ، ئاگادارکردنەوەی ئەو ڕووداوانەی کوردستانی داوە و ئیشارەتی بە "وێرانکردنی بەربڵاوی گوندی کوردی بەر بلدۆزەر دراوی داوە، لەگەڵ ڕاگوێزانی بەکۆمەڵی کورد و ئاوارەکردنی ماڵ و خێزانەکانیان لە ناوچە غەیرە کوردەکانی عێراقدا"[٢٢]. دواتر بالیۆز نیوتن (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) باس لەوە دەکات کە واشنتۆن زۆر باش ئاگای لە شاڵاوەکەی دژەیاخیبوونی عێراق بووە: "ڕوون و ئاشکرا بوو کە عێراق دێهاتی کردبووە ئامانج و بە ئاشکرا کێڵگە و مەزرایان دەفەوتاند،

ئەمە شالاوێک بوو لە دژی کوردە نەیارەکانی حکومەت، بەڵام مەسەلەکە دیاریش بوو کەوا هەواڵێکە بۆ کەمکردنەوەی دانیشتوانی دێهات و بنبڕکردنی بنکەی پشتگیریی گەریلاکان. هەروەها ئاشکرا بوو کە ئەمە بەرنامەیەکی نامرۆڤانەیە و بە هەرحاڵ من نایەتەوە یادم کە لەگەڵ عێراقییەکاندا باسمان کردبێت، چونکە هیچ بەهانەیەکمان بە دەستەوە نەبوو، کە بە پێچەوانەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییەوە (دژ بە ئێران)، ئەمەیان مەسەلەیەکی ناوخۆیی بوو.

لە ساڵانی هەشتاکاندا، بیروبۆچوونی سەربەخۆیی وەک دە ساڵ دواتر نەبوو: داگیرکردنی عێراق و بە دوایدا شکستهێنانی لە کوەیت، سیستەمێکی پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکانی لێ کەوتەوە کە پێشینەی نەبوو لە هەڵکوتانەسەر و دەستتێوەرداندا. ڕووخانی دیواری بەرلین و پەرەسەندنی بزووتنەوەی مافی مرۆڤ ئاستەنگی بۆ حکومەتەکانی ڕۆژئاوا دروست کرد، کە لە پشت بیانووی 'کاروباری ناوخۆوە' خۆ بشارنەوە، بە مەبەستی پاساوهێنانەوە بۆ ستەمکاری و داپڵۆسینی وڵاتە ئەڵقەلەگوێکانیان. بەڵام کاروباری ناوخۆی عێراق لە ساڵی ١٩٨٧دا تەنها بێدەنگیی گشتیی بەرپا کرد. هیچ بەڵگەیەک نییە کەوا ئیدارەی ڕیگان ناخۆشحاڵیی خۆی دەربڕیبێت سەبارەت بە کاردانەوەی ڕژێم لە بەرانبەر 'یاخیبوونی کورددا'. لەم ڕووەوە ڕەنگە دانوستانێکی قورس و ئاڵۆز لە ئەنجوومەنی ئاسایشدا بەڕێوە چووبێت، کە دواجار لە تەمووزدا بڕیاری ٥٩٨ی لێ کەوتەوە و هەڵومەرجی ئاگربەستی گەڵاڵە کرد.

ئیداره به تەواوی شتێکی تری کرد و له وتاردانێکدا له ئیسرائیل و له ئۆکتۆبەری ١٩٨٧دا، جۆرج شوولْزی وەزیری دەرەوە، به ئاشکرا ڕەخنەی له "هەر دوو ئێران و عێراق" گرت له سۆنگەی بەکارهێنانی گازی ژەهراوییەوە[٢٣]. تۆمەتبارکردنەکەی ئێران شتێکی گەوجانه بوو، به هۆی نەبوونی سەلماندن و بەڵگەیەکی بەهێز کەوا ئێرانییەکان گازیان به کار هێنابێت و خزمەتی خۆدزینەوەی دەکرد لەمەڕ پرسیارکردن له عێراق، کە پێشێلکارییەکانی له مەیدانی جەنگدا مەسەلەیەک بوو هەموو لایەک ئاگاداری بوو. لەبەر ئەوەی نەسەلماندنی مەحاڵ بوو، سزاکه به تەواوی له جێی خۆیدا بوو ــ کە به دواشیدا هەڕەشەی ئێران هات و ڕەنگە ئەمەش کاردانەوەی هەبووبێت بەرانبەر به هێرشی گازی عێراق و ــ بەوپێیە کاربەدەستانی ئیداره دەیانتوانی به کاری بێنن له هەر دوو شەڕی بیرۆکراتی و میللیدا سەبارەت به ڕۆڵی ویلایەته یەکگرتووەکان له جەنگدا، چون لایەنەکان چوونه یاریی کۆتاییەوە له دوادوایی ساڵی ١٩٨٧دا. بەڵام عێراق نەیویست وا زوو سەری خۆی بۆ بلەقێنێت.

"من نیگەرانی ئەوە بووم سەدام حسێن چەکی کۆکوژی دژ بە گەلەکەی خۆی بە کار دەهێنا و بەرپرسیارێتیی دەخستە ئەستۆی ئێمە و ئەمەش لەگەڵ نموونە و شێوازی ئەودا یەکی دەگرتەوە."

**دۆناڵد رامسفیلد**

**وەزیری بەرگریی ویلایەتە یەکگرتووەکان**

**نیویۆرک تایمز**

**١٨ی شوباتی ٢٠٠٣**

"ڕژێمی عێراق لە لایەن ئەمەریکی و بەریتانییەکانەوە پشتگیری دەکرا لە کاتی جەنگی دژ بە ئێراندا. بەڵام کەس لە بارەی عێراقەوە هیچ قسەیەکی نەکرد، کاتێک کە چەکی کیمیایی دژ بە گەلی کورد بە کار هێنا..."

**ئوسامە بن لادن**

**نیوزویک**

**١١ی کانوونی دووەمی ١٩٩٩**

کە پێشـــمەرگە بە شـــاخەکانی کوردســـتاندا دەگەڕان، پیاوێک بە کامێرایەکی ڤیدیۆوە یاوەریی دەکردن و هەموو شـتێکیانی تۆمـار دەکـرد، سـەرکەوتن و شکسـتەکانیان، پێشـڕەوی و پاشەکشـێکانیان، مـامەڵە و تێکەڵبوونیـان بە خەڵکی ئاسایی. ئەم پیاوە ناوی عەباس عەبدولڕەزاق ئەکبەر بـوو، بەڵام هاوڕێکـانی "عەبـاس ڤیـدیۆ"یان پـێ دەگـوت. لە نیسـانی ١٩٨٧دا و لە کـاتی هێرشـە کیمیـاییەکەی عێـراق بـۆ سـەر شـێخ وەسـێنان، لەوێ بـوو و فیلمـی مردنـی پیـاوێکی گرتـووە بە نـاوی شەمسـەدین کە بە شـێوەیەکی سـەخت و سامناک بە گـازی خەردەل برینـدار بـووە و لە پـاش دە ڕۆژ تلانەوە بە ئازارێکی زۆر سەختەوە، مردووە.

لە ١٦ی مـــارتی ١٩٨٨دا، عەبـــاس ڤیـــدیۆ لە دۆڵـــی جافەتییەوە بە ناو خاکی ئێراندا خۆی گەیاندووەتە "هەڵەبجە، بە هیوای ئەوەی لەگەڵ هاوڕێکانیدا یەک بگرنەوە، کە لەگەڵ هێزەکانی ئێرانـدا ڕۆژێک لەوەوبەر ناوچەکەیـان گرتبـوو. بە هـۆی کـاری ڕۆتـین و بیرۆکـراتییەوە، عەبـاس چـوار ڕۆژ دواتـر هـاتەوە نـاو عێـراق و بە ڕێـگەیەوە بەرەو سـنوور، ژمـــارەیەکی زۆر ئـــاوارەی کـــوردی بینیـــوە بەرەو ئێـــران ڕێگەیـان گرتبـووە بەر و گەلێکیـان نیشـانە و برینـی گـازی خەردەلیان پێوە بووە. لەگەڵ ئەوەشـدا کە عەبـاس ئاگاداری ڕووداوەکـانی هەڵەبـجە بـوو، بەڵام (وەک لە چـاوپێکەوتنێکی

سـالّی ٢٠٠٢دا دەڵێـت) بـێ خۆئامـادەکردن چـووەتە نـاو شارەکەوە:

"بە چـاوی خـۆم خـانەوادەی تەواوم دەبینـی ــ دایکـان لەگەڵ منداڵەکانیان ـ کەس دەستی پێوە نەدابوون. یەک لەو یەکەم دەربازبوانەی من چاوم پێ کەوت، کچێکی گەنج بوو کە باوکیم دەناسی، وێنەگرێک بوو ناوی عومەری ڕەسام بوو. کچە بردمی بۆ ژێرزەمینەکەی ماڵی خۆیان و چیی تێدا بوو، مردبوو، تەنها ئەم کچە ڕزگاری بووبوو. هەموو ئەو خەڵکەی دەمبینین تووشی شۆک بووبوون. لە ژێرزەمینێکی تردا ژنێکی مردوو کوڕەکەی گرتبووە باوەش و هەر دوو دەستی بە شێوەیەک کردبووەوە وەک بیەوێت یارمەتیی بدەن. من هەستێکی وام لا دروست بوو کە ئەمانە خێزانی منن و دەستی ژنەکەم گرت نەرم بوو. پاشان بیرم کردەوە کە "ئەمە کۆتایی هەموو ژیانێکە" و ئارەزوویەکی بەهێزم لا دروست بوو لەولای ژنەکەوە ڕابکشێم و ئیتر هەڵنەسمەوە."

بەم ڕەنـگە، عەبـاس هەر دەڕۆیشـت و دیـمەنە سامناکەکانی مەرگی کوتوپڕی تۆمار دەکرد، هەندێک تەرم لە ساتەوەختی کاروباری ڕۆتینی ڕۆژانەیاندا ڕەق بووبوون، چەشـنی ئەوەی لە حەوشـەکەیاندا دانیشـتبوون، یـاخود دەستیان بە ستێرنی ئۆتۆمبیلەکانیانەوە بوو، یان منداڵی کۆرپەیان گرتبووە باوەشیانەوە. هەندێکی تر، وا دیار بوو لە کاتی هەڵاتنیاندا وشک بووبوون، وەختێک ڕایان کردبوو بـۆ دەربـازبوون لە گەواڵەهەوری ژەهـراوی، کە زاڵمـانە هەندێک کەسی کوشتبوو، لە کاتێکدا کە ویستبوویان فریای خەڵکانی تر بکەون. لە دەرەوەی شارەکەش، عەباس ڤیدیۆ دەگێڕێتەوە کەوا:

"گازەکە هەموو ژیانێکی سروشتیی کوشتبوو، بە ئاژەڵ و دارودرەختەوە. من هەزاران سەر مەڕ و بزنم بینی مردار بووبوونەوە. مانگایەکی مردارەوەبووم بینی گوێرەکەکەی هێشتا زیندوو بوو، گوانی دایکی دەمژی. من بە فلیم وێنەی سەدان ئاژەڵی مردارەوەبووم گرتووە لەسەر ڕێگەوبانەکانی دەوروپشتی هەڵەبجە. گوێم لە دەنگی هیچ شتێک نەبوو و هیچ باڵندەیەکم نەبینی و یەکپارچە دنیا خامۆش بوو، هەموو گیانلەبەرێک مردبوو. زۆری پێ نەچوو شارم بە جێ هێشت و ملی ڕێم گرت بۆ جێگایەک گوێم لە دەنگی باڵندە بێت، چونکە لەتاو ئەو کپی و بێدەنگییە خەریک بوو تێک دەچووم."

## هاوسەرگیرییەکی بەرژەوەندی

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨دا، پێشمەرگە بە شێوەیەکی کاریگەرانە کۆنترۆڵی بەشی زۆری دێهاتی کوردستانیان کردبوو، بە هەردە و دەشتاییەکانی گەرمیانیشەوە، کە ناوچەیەکە لە سلێمانییەوە بەرەو ڕۆژئاوا بۆ کەرکووک درێژ دەبێتەوە. ڕژێمی عێراقیش ئەمەی پێ قبووڵ نەدەکرا، بەڵام لەبەر سەرقاڵیی بە جەنگەوە، توانای نەبوو هێزەکانی بکاتە سەر کورد بۆ ملکەچکردنیان، بەڵام وا ئێستا بەخت یاوەریەتی. مەکینەی جەنگی ئێرانی ــ کە بریتی بوو لە پاسداران، خۆبەخشانی بەسیج، سوپایەکی بێتوانا لە سەربازی پیادە ـ تا دەهات لە هێزێکی شەکەت دەچوو، کە چاوەڕێ بێت لارەلار بەرەو ماڵ بێتەوە بۆ ناو خێزان و دۆستان. هێرشی بەهاری ئێرانییەکان، کە بووبوو بە ڕێورەسمێکی ساڵانە، نەیتوانی سەر بگرێت. بەم پێیە و متمانەکردن بە پشتگیریی ویلایەتە یەکگرتووەکان، عێراقییەکان خۆیان ئامادە کردبوو بۆ یەکلاییکردنەوە و چاویان بڕییە نەک تەنها دوژمنی ئێرانی، بەڵکو ئەو دوژمنەش کە لەگەڵیدا بوو، واتە کوردە خیانەتکارەکان و خێزانەکانیان کە ڕەتڵێکی پێنجەمی "تێکدەران" بوون، کە زۆر دەمێک بوو پشووکورتیی بەغدایان تاقی کردبووەوە.

هەر لە سەرەتای توانەوەی بەفرەوە، ڕژێم دەستی کردە بۆردمان و تۆپبارانێکی خەستی بارەگای سەرکردایەتیی (ی ن ک) لە دۆڵی جافەتی. ڕۆژەکەشی دەیکردە ٢٣ی شوباتی ١٩٨٨ و سەرکردەی شۆڕشەکەش، نەوشیروان مستەفا ئەمینی کەسی دووەمی یەکێتی بوو (ئەو دەمە جەلال تاڵەبانی لە ئەورووپا سەرقاڵی باسکردنی گوند تێکدان و هێرشە کیمیاییەکان بوو). ئۆپەراسیۆنەکە نزیکەی چوار هەفتەی برد، بەڵام ئەوەی بوو بە هۆی شکست و بەزینی گەریلاکان، کوشتاری سوپا نەبوو، کە هەر زوو لە بەرانبەر بڕیاری بەرگری لە ناوچەیەکی سەخت و هەڵەتدا بە چۆکدا هاتن، هەروەها نەک لەبەر بەکارهێنانی خەستی گازی ژەهراوییش، بەڵکو لەبەر داتەپینی تەواوی وەرەی پێشمەرگە بوو. تاقە هۆکاریش کە بۆچی ئەم جەنگاوەرە سەرسەختانە لەناکاو شکستیان هێنا، ئەو هەواڵانە بوون کە لە ١٦ی مارتدا لە هەڵەبجەوە پێیان دەگەیشت.

ئەوەی کە وای لە عێراق کرد بە گاز پەلاماری هەڵەبجە بدات، جێی مشتومڕە و ڕاستییەک کە یارمەتیی ڕوونکردنەوەی پشێوی و شپرزەیی دۆخەکە بدات، زانیاریی چەواشە و نەبوونی ئیدانەکردنی نێودەوڵەتییە. کەواتە بەوپێیە شتێکی گرنگە بە هەندێک درێژی باس لە پەرەسەندنی ڕووداوەکانی پێش ئەوە بکەین. لە چاوپێکەوتنی ژمارەیەک خەڵکدا، لەوانەی لە پەلامارەکەدا لەوێ بوون یاخود لە هەندێک ئاستی بەرپرسیاریی فەرماندەیی عێراقدا تێوەگلاون، کەس بە شێوەیەکی متمانەپێکراو ئیدیعای ئەوەی نەکردووە کە ئێران بەشدار بووە لە بەرپرسیارێتیی گازبارانی ١٦ی مارتدا. تاقە تۆمەت

گوێبیستی بیت، ئەوەیە کە تۆڵەکردنەوەی دڵڕەقانەی عێراق دەرەنجامێکی چاوەڕوانکراوی گرتنی سەرکەشانەی هەڵەبجە بــوو لە لایەن ئێــران و کــوردەوە، بەوپێــیە دەبــوایە ئەو ئۆپەراسیۆنە هەرگیز جێبەجێ نەکرایە. لە ئێران مەسـەلەکە بــابەتی مشــتومڕ و قسەلەســەرکردنی گشــتی نیـیە و ئەو پەیوەنـدییە بەتینـەی نیـیە بە کـارەکەوە، بەڵام کوردەکـانی عێـراق سـەرقاڵی مشـتومڕێکی گەرمـن لە بـارەی حیکمەتـی ڕزگـــارکردنی هەڵەبـــجەوە و یەک لە ســـەرکردەکان (کە شـەوکەتی حـاجی موشـیرە و خەڵکی نـاوچەی هەڵەبـجەیە و فەرمانــدەی یەکێتیــی نیشــتمانیی کوردســتان و بەرپرســی ئۆپەراسیۆنی هەڵەبجە بووە)، کتێبێکی بڵاو کردووەتەوە کە بە دوورودرێـژی بە شــێوەیەک لە ڕووداوەکــان دواوە، کە دەگاتە ئاستی بەرگری لەخۆکردن و پۆزشهێنانەوە[١].

بەپێــی هەمــوو بــاس و گێڕانەوەکــان، ئۆپەراســیۆنی هەڵەبـجە لە تێکەڵبـوونی بەرژەوەنـدییەکانی ئێـران و حیـزبە کوردییەکـانەوە سـەرچاوەی گرتـووە، بە تـایبەتی (ی ن ک). ئەوەی لە پـێش هەمـوو شـتێکدا جێـی مشـتومڕ بێـت، ڕۆڵـی وردی هەر لایەکە کە لە هێرشـەکەدا گێڕاویەتـی. کادرەکـانی (ی ن ک) دابەش بووبــوون بەســەر ئەوانەدا کە دەیــانگوت کــارەکە دەسپێشــخەرییەکی ســەربازیی ئێرانــی بــوو، کەوا جارێکی تر کوردی تێدا بووبوو بە داشـی دامەی گەمەیەک بۆ ئامانجگەلێک کە هەرگیز بە تەواوی درکـی پێ نەدەکرد، لە کاتێکدا هەندێکی تریـان سـوور بـوون لەسـەر ئەوەی کەوا ئێرانییەکان لەبەر خاتری خۆیان، باوەشـیان بـۆ پلانـی کـورد کــردەوە، کە جموجــووڵێکی نائومێــدانە و ڕەنگــدانەوەی

تێگەیشـتنی کوردەکـان بـوو، کەوا جەنـگ کۆتـایی دێـت و مەسەلەی ئەمانیش بە خێرایی دەداتە کزی.

مشـــتومڕی دووەم ـــــ ســـەبارەت بەوانەی بە ڕاســتی چووبوونە نـاو هەڵەبجەوە ـ زۆر گەرمتر و جیددیتر بـوو، چـونکە لە نـاوجەرگەی پرســە بنەڕەتییەکـانی پلانگێـڕی و خیانەت دەدات. پاشان یەکێتیی نیشتمانیی کوردسـتان (ی ن ک) بە فەرمـی لە لایەن عێـراقەوە بە "ئەڵقەلەگـوێی ئێـران" (عملاء إيران) ناوزەد کرا و پارتی دیموکراتی کوردستانیش (پ د ک) نازنـاوی "نەوەی خیانەتکـار" (سـليلي الخيانـة)ی بەسەردا بڕا، کە ڕاستەوخۆ پەنجەڕاکێشان بوو بۆ مەسعود بـارزانی کەوا مەلا مسـتەفای بـاوکی دەسـتی لەگەڵ شـای ئێـــران تـــێکەڵ کردبـــوو لە شۆڕشــــە بەدبەخـــت و ســـەرنەکەوتووەکەی کـــورددا، لە ناوەڕاســـتی ســـاڵانی حەفتاکاندا. سەرکردە کوردەکان فشـارێکی تەواویـان لەسـەر بوو، بە تایبەتی لە ناو ڕیزەکانی (ی ن ک) و (پ د ک)دا، بـۆ ئەوەی خــۆ دوور بگــرن لە ئێــران، نەوەک کــورد وا بێـتە بەرچاو کە بریکاری هێزێکی بێگانەیە، نەک بزووتنەوەیەکی سیاسیی خاوەن توانای سەربازی و داواکاریی ڕەوای خۆی هەیە بۆ وڵات و دۆزێکی سیاسیی لە پشتەوەیە، بە واتایەکی تر نەک وەک بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی نیشتمانی.

ئەوەی کەوا گومـــانی تێــدا نەبــوو، هەر لایەک بە دوای چارەسەری کێشەیەکی تایبەتیی خۆیدا دەگەڕا. ئێران لەژێر فشـارێکی سیاسـی و سـەربازیی گەورەدا بـوو، دامودەزگـا ئابوورییەکـانی لەژێر هێرش و پەلامـاردا بـوون و ویـلایەتە یەکگرتووەکـان بووبــووە پۆلیســی کەنـداو و ئەنجـوومەنی ئاسایشـی نەتەوە یەکگرتووەکـان خـۆی ئامـادە دەکـرد بـۆ

ســـەپاندنی ئـــابڵووقە بەســـەر چەکـــدا. ئێـــران ســـەرباری دەستپێکردنی هێرشی بەهاری، کەوتە کێبڕکێ لەگەڵ عێراقدا لە خولێکی دزێوی تری "شـەڕی شـاراندا". لە ٢٩ی شـوباتدا، عێراق بە شـێوەیەکی زۆر سـەخت دەسـتی کـرد بە لێدانی تاران و بۆ یەکەم جار مووشـەکی بالستیی بە کار هێنا. لە دە ڕۆژی دوای ئەوەدا ئێـران بیسـتودوو مووشـەکی نـا بە عێراقەوە لە بەرانبەر شەستوهەشتی ئەمدا، تا هەر دوو لا بە ئاگربەسـت قایـل بـوون. ئەم مووشـەکگرتنە یەکتـرە، کەمتـر کاری کردە سەر ورەی عێراق بە بەراورد لەگەڵ کاریگەریی بەسەر ئێرانەوە. لێدانەکانی عێراق خەڵکێکی زۆری کوشت و هەموانی تۆقاند و بەشێکی باشی دانیشتوانی تارانی ناچاری هەڵاتن کرد. بە پێچەوانەوە (بەپێی هەڵسەنگاندنێکی سی ئای ئەی) "نـزیکەی هەر بیسـت مووشـەکەکەی ئێـران، کە لە باشـووری ڕۆژهەڵاتـی بەغـدای دا، بەر ئەو ناوچـانە کەوتـن کە دانیشتوانیان کەم بوو"[٢].

ڕاپـۆرتێکی تـری (سـی ئـای ئەی) بە وردی باسـی هەڵبژاردەکـانی ئێـران دەکـات و پێشـنیار دەکـات کە جێبەجێکردنـی هێرشـی کـورتتر لە هێرشـە سـەرەکی و گەورەکە، تاران بەهیوا بوو هەر دوو ڕەخنە و ڕەخنەکاریی نێودەوڵەتی و نـاوخۆیی سـنووردار بکـات، وەک: "ڕەنـگە ئەگەر هێرشەکان لەسەر بەرەی باشوور دوور بکەونەوە و ببنە هۆی هێورکردنەوەی دەمـارگرژیی عەرەبی کەنداو و ئەگەری سـنووردارکردنی زیانگەیانـدن بە پەیوەنـدی لەگەڵ مۆسکۆ و دیمەشقدا"، وەک ڕاپۆرتەکە باسی دەکات. بێجگە لەوە "بە هۆی خۆدوورگرتن لە هێرشێک بۆ سەر ئامانجێکی سـتراتیجی، کە بە تونـدی بەرگریـی لـێ دەکـرا، زۆرتـر

پێدەچوو ڕژێم خۆ دوور بگرێت لە زەرەروزیانی زۆر، لەو ماوەیەدا کە لە هەڵبژاردنی پەرلەمان نزیک دەبووینەوە، کە بڕیار بوو لە نیساندا ئەنجام بدرێت[٣]. لەم هەڵسەنگاندنەدا هێرشێک بۆ ناو کوردستانی عێراق لەگەڵ پلاندا یەکی دەگرتەوە و هەڕەشە نەبوو بۆ بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییە گەورەکان، لە کاتێکدا بەرکەوتوان بە شێوەیەکی سەرەکی ئەو کوردانە بوون کە چاوەڕێ بوون زۆربەی ئەرکە قورسەکان لەسەر ئەوان بێت.

مانۆڕێکی ئاوها دەکرا لە هەمان کاتدا یارمەتیی ئێران بدات بۆ کەمکردنەوەی فشاری قورس لەسەر بەرەی باشوور، بە ناچارکردنی بەغدا بۆ ئەوەی هێز بنێرێتە باکوور. سەرەڕای ئەوەش بە نزیکبوونەوەی کۆتایی جەنگ، پێدەچوو تاران بە دوای دوا کات و ساتی سوودوەرگرتندا بگەڕێ لە دانوستانی داهاتوودا بۆ زەوتکردنی خاکی عێراق. لێرەدا بۆ سەرکردایەتیی ئێران دەرکەوت کەوا یاخیبوون زۆر سەرکەوتووترە بۆ پچڕینی خاک لە ڕژێمی عێراق، وەک لەوەی هێزە ئێرانییەکان لە باشوور جێبەجێیان کرد و بەو جۆرە کوردەکان، بە پێچەوانەی دانیشتوانی شیعەی عێراقەوە، سەلماندیان کە زۆر زیاتر هاوپەیمانی خوازراون. سوودێکی زیاتر، لە دیدی پرۆپاگەندەوە، ئەوە بوو کە هاووڵاتییە کوردەکانی عێراق لە شەڕدا پشکی شێر دەگێڕن، وەک جەختکردنێک لەسەر ناڕەوایی ڕژێمی عێراق (بە هەمان شێوە میدیای عێراقی بایەخێکی باشی دەدا بە ڕۆڵی میلیشیای جاشی کورد لە شالاوی ئەنفالدا، تا وای بگەیەنێت کە پێشمەرگە لە یاسا لادەرن و خەڵکێکی کەم پشتیوانییان لێ دەکات).

لە سیناریۆی ئێرانییەکاندا، هەڵەبجە کاندیدێکی لەبار بوو و بە شێوەیەکی جیاواز لەگەڵ بەشەکانی تری عێراق و گرتنی دەبووە بەرگرییەکی سروشتی دژ بە هەر هێرشێکی پێچەوانەی عێراق. لەگەڵ ئەوەشدا هاوپەیمانە کوردەکانی ئێران زۆر پەرۆش بوون بۆ گرتنی هەڵەبجە، لەبەر چەند هۆیەک کە دواتر دێینە سەریان. دواجار هەڵەبجەییەکان خۆیشیان وەک ڕزگارکەر پێشوازییان لە ئێرانییەکان دەکرد و ئەمەش وەرچەرخانێکی پرۆپاگەندە بوو. چونکە تەنها ساڵێک پێشتر، ڕژێمی عێراق گەڕەکی کانی ئاشقانی شارەکەی ڕووخاند، وەک تۆڵەسەندنەوەیەک بۆ ئەو خۆپیشاندان و ناڕەزایی سەرشەقامەی لە دژی شاڵاوی گوند ڕووخاندنی عەلی حەسەن ئەلمەجید بەرپایان کرد و بەمە پەیامیان بە پێشمەرگە دا کەوا هەڵەبجەییەکان بەپەرۆشن بۆ تۆڵە.

بێجگە لەم فاکتەرانە، دید و بۆچوونی تیۆرییش بۆ گەیشتنە بەنداوی دەربەندیخان، ڕەنگە سەلماندنی پەرۆشبوونی سەرکردایەتیی ئێرانییەکان بووبێت. هەڵسەنگاندنێکی (سی ئای ئەی) لە کۆتایی مانگی مارتدا هۆشداریی ئەوە دەدات، کە بەردەوامبوونی هێرشی ئێرانییەکان بە درێژایی لێواری باشووری دەریاچەی دەربەندیخاندا، پێدەچێت هێزەکانیان بخاتە "بارێکی زۆر باشەوە بۆ گرتنی سەلیم پیرک (گوندێکی دامێنی شاخی قاشتییە و ئێستا لەگەڵ شاری دەربەندیخاندا تێکەڵ بووە، و) لەگەڵ بەنداوەکە و ئەگەری پەڕینەوەش بۆ ڕۆخی ڕۆژئاوای دەریاچەکە لە باکووری بەنداوەکەوە"[٤]. عێراق بەپێی قسەی باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکان، دیڤید نیوتن

(له چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا)، گرتنی هەر دوو بەنداوی دەربەندیخان و دوکانی لە لایەن ئێرانەوە، بە هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە دەبینی. لەبەر ئەوە لە مارتدا ئاوی هەر دوو دەریاچەکەی بەردایەوە بۆ ئەوەی ڕێگە لە هەوڵ و تەقەلای ئێرانییەکان بگرێت، کە بەغدا بکەنە ژێر ئاوەوە[٥].

هەندێ لە فەرماندە کوردەکان بە ڕوونی لەوە گەیشتبوون کە بەنداوەکە یەکێکە لە ئامانجە سەرەکییەکانی ئێران. محەمەدی حاجی مەحموودی سەرکردەی حیزبی سۆشیالیستی کوردستان (حسک)، (لە پەیوەندییەکی ساڵی ٢٠٠١دا) جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئێران بە دوای کەمکردنەوەی مەترسیی هێرشێکی پێچەوانەی عێراقدا دەگەڕا لە باشوور، بۆ بەرفراوانکردنی مەیدانی جەنگ، بەڵام دەشیویست بەنداوەکە بگرێت. کۆنترۆڵکردنی ڕاڕەوی ئاو لە ڕووباری دیالەدا، دەسەڵاتێکی سیاسیی بایەخداری دەبەخشییە ئێران. بێجگە لەوەش گرتنی ڕێگەی سلێمانی ــ بەغدا کە بە قەراغ دەریاچەکەدا تێدەپەڕێت، ڕاڕەوێکی بۆ هێزەکانی ئێران دەکردەوە بەرەو ناوچەی یاخیبوون لە قەرەداغ و لەوێشەوە بۆ گەرمیان و دواتر بەرەو دوا خەڵاتی چەور کە بیرە نەوتەکانی کەرکووک بوون ــ وەک ئەگەرێکی جێگرەوەی بەسرە. بە هەمان شێوە، شەوکەتی حاجی موشیری سەرکردەی (ی ن ک) (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) سکاڵای ئەوە دەکات گوایە ئێرانییەکان نەخشە و پلانی خۆیان هەبوو بۆ بەنداوەکە و دەڵێت: "ئێمە زۆر جار ئەوەمان لەگەڵیان باس دەکرد و ئەوان دەیانویست بیشکێنن و ئێمە قایل نەدەبووین."

کوردەکان هەموویان لەسەر ئەو بۆچوونەی سەرەوە کۆک نەبوون. لانیکەم یەکێک لە فەرماندەکانی (ی ن ک) کە ناوی حەمەی حەمەسەعید بوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) بەو بارەیدا دەشکێنێتەوە کە ئەگەر بەنداوەکە ئامانجێکی ئێرانییەکان بوایە، ئەوە هێزەکانیان بەو شێوەیە نەدەهاتن کەوا کەرەستە و تفاقی تەواویان پێ نەبێت، چونکە تیمەکانی ئەندازیاریی پسپۆڕ لە هەڵگرتنەوەی مین و ڕێگە پاککردنەوەدا تەنها لە دەوروپشتی هەڵەبجەدا بڵاو بووبوونەوە و لە نێوان هەڵەبجە و سنووردا هاتوچۆیان دەکرد، نەک بە ئاڕاستەی بەنداوەکە. بێجگە لەوەش، وەک ئەو دەیگوت، ئێرانییەکان بە هیچ کلۆجێک هەوڵیان نەدەدا شاخی شەمێران بگرن، کە دەیڕوانییە سەر بەنداوەکە و تەنانەت هەوڵی ئەوەشیان نەدەدا هەر لێی نزیک ببنەوە.

هادی فەرەجوەند، کە فەرماندەی تاقمێک بەسیج بوو، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) ئەوە دەگێڕێتەوە کە ڕژێمی ئێران وای دانابوو بەنداوەکە بتەقێنێتەوە، بەڵام دواتر ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندەوە: "هەندێک دۆستم لە قەرارگای ڕەمەزان، لە ئەگەری دانانی تەقەمەنی لە ژێر بەنداوەکەدا کۆڵیونەتەوە و لەگەڵ ئایەتوڵڵا خومەینی مەسەلەکەیان تاوتوێ کردووە و ئەویش کە پرسیاری کردووە ئاوەکەی بەرەو کوێ دەچێت، پێی خۆش نەبووە ئەو کارە بکرێت و مۆڵەتی نەداون." خومەینی بە ئاشکرا لەوە ترساوە لافاوی دیالە زیان بە مەزارە پیرۆزەکانی شیعە بگەیەنێت (لە هیچ حاڵەتێکدا هێزەکانی ئێران هەرگیز نەگەیشتنە بەنداوەکە و شارۆچکەکەش. لە پێداچوونەوەیەکی دواتری شەڕەکەدا کە لە تەلەڤیزیۆنی ئێرانەوە پەخش کرا، موحسین ڕەزایی

فەرماندەی پاسداران بەوەوە خۆی با دەدا کەوا بە ڕادەیەک نزیکی دە کیلۆمەتری ڕێگەکە بوونەتەوە کە خستوویانەتە مەودای تۆپخانەی ناوەنجی ـ هاوێژی ئێرانەوە)[٦].

پاش ڕامالینی هەڵەبجە، هێزەکانی ئێران هەر لەمدیوی ڕۆخی دەریاچەکە مانەوە تا کۆتایی جەنگ و ئەوەیان لێ بەدی نەدەکرا کە نیازیان بێت لەوە زیاتر بێنە ئەملاوە. شێخ مەولا کە سەرکردەیەکی بالادەست بوو لە ئەنجوومەنی بالای شۆڕشی ئیسلامیی عێراقدا و لە بارەگای ئێرانییەکان بوو لە دزلی (نزیکی مەریوان)، لە کاتی ئۆپەراسیۆنی هەڵەبجەدا (لە چاوپێکەوتنێکی سالی ٢٠٠٢دا) پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت کە ئێرانییەکان بە هیچ شێوەیەک نیازیان نەبووە بەنداوەکە بتەقێننەوە، بەلام لەجیاتیی ئەوە پلانی ڕووخاندنی ئەو تونێلەیان دانابوو کە سلێمانی و دەربەندیخان و (بەغداش) پێکەوە دەبەستێتەوە. هەندێک پێیان وایە کە ئەو لێدانە کیمیاییە گەورەیەی هەڵەبجە، پلانێکی لەو چەشنەی تێک دا. هەروەها مشتومڕێکی واش هەیە کە عێراقییەکان خۆیشیان پێدەچێت زۆر بایەخیان بە هێرشی ئێران نەدابێت بۆ سەر بەنداوەکە. عێراقییەکان، لەبری پەلاماردانی هێزەکانی ئێران لە دەوروپشتی هەڵەبجە، کوردەکانیان گازباران کرد و لێگەڕان ئێرانییەکان کۆنترۆلی ناوچەکە بکەن بۆ ماوەی چوار مانگی تەواو، بێ ئەوەی تەنانەت ئاماژەیەکیان لێوە دەرکەوێت بۆ دەرپەڕاندنیان.

ئێران ئامانجێکی گرنگی تری هەبوو، کە هاوپەیمانە کوردەکانی لێ ئاگادار نەکردبوو، بەلام هەر کە هێزەکانی چوونە ناو خاکی عێراقەوە، ئەوە سەلما کە لە هەوڵدان بۆ لەناوبردنی چەند بتوانێت لە یاخیبوانی کوردی ئێران، کەوا

کوردستانی عێراقیان وەک پێگەی یاخیبوونی دژ بە ئێران بە کار دەهێنا. هەر دوو حدکا و کۆمەڵە، بنکە و بارەگایان هەبوو لە نزیک هێزەکانی عێراقەوە لە ناوچەی هەڵەبجە. بەڵام کاتێک کە بەرگریی عێراق تێک شکا و هێزەکانی ئێران ڕژانە ناو هەڵەبجەوە، کەوتنە ڕاوەدوونانی ئەو یاخییانە و دواتر لەم بارەیەوە دەدوێین.

لە بەرەی کوردی عێراقەوە، پاڵنەری یەکێتی لە دوو سەرەوە ئاڵۆز بوو. زۆر بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە فشاری عێراق بۆ سەر بنکە و بارەگاکانی لە دۆڵی جافەتیدا هێند ناچاری کردبوو کە بیر لە دوورخستنەوەی هێزەکانی عێراق بکاتەوە لە خۆی. حەمەی حەمەسەعیدی فەرماندەی یەکێتی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە ماوەی ئۆپەراسیۆنی هەڵەبجەدا (ی ن ک) بە مەبەست جفرەی پەیوەندیی بێتەلی بە کار دەهێنا لە نێوان هێزەکانی لەوێ و دۆڵی جافەتیدا و "بەمپێیە عێراقییەکان دەیانزانی ئێمە پەلاماری هەڵەبجە دەدەین. بەم شێوەیە ئێمە بەهیوا بووین کە ئەوان لە دۆڵی جافەتی پاشەکشە بکەن، بەڵام نەیانکرد".

بە هەمان شێوە بۆ کوردیش هەڵەبجە کاندیدێکی لەبار بوو. پرۆژەی ڕزگارکردنی هەڵەبجە هاوزەمان بوو لەگەڵ پلانێکی پێشتردا کە هەموو حیزبە کوردییەکان تێیدا بەشدار بوون و پلانیان دانابوو بۆ ڕێگەگرتن لە نەخشەیەکی عێراق کە بەن یازی تەختکردنی هەڵەبجە و شارۆچکە سنوورییەکانی تر بوو. چونکە هێزەکانی عێراق، هەر ئەو دەمە پێنجوێن و چوارتا و مێرگەسووریان تەختی زەوی کردبوو و کوردەکان گومانیان پەیدا کردبوو کە دوای ئەمانیش نۆرەی هەڵەبجە و قەڵادزێیە (هەڵبەت هێزەکانی

عێراق لە پاش کۆتایی جەنگ هەڵەبجەیان ڕووخاند و لە تەمووزی ١٩٨٨دا لە ئێرانیان سەندەوە). شەوکەتی حاجی موشیر دەگێڕێتەوە کەوا "ئێمە ڕێککەوتننامەیەکی نووسراومان لەگەڵ ئێرانییەکان هەبوو بۆ ئەوەی پێکەوە پارێزگای سلێمانی ڕزگار بکەین. یەکەم جار دەبوو ناوچەکانی نێوان قەڵادزێ و هەیبەت سوڵتان بگرین (کە شاخێکە سلێمانی لە هەولێر جیا دەکاتەوە)، پاشان دەبوو ناوچەی هەڵەبجە و دەربەندیخان و ڕێگەی نێوان سلێمانی و کەرکووک لە دەربەندی بازیان بگرین".

بە تێبینیکردنی پەیدابوونی هاوپەیمانیی نێوان کورد و ئێران، عێراقییەکان بڕیاریان دا پلانەکەیان لە بار ببەن، بە هێرشکردنە سەر (ی ن ک) لە دۆڵی جافەتی و لەمەدا عێراق دوو فەیلەقی خستە گەڕ. یەکێکیان لە ڕانیەوە و بەوەش ئەو پلانەی کوردیان پەک خست بۆ ڕزگارکردنی ناوچەکانی نێوان قەڵادزێ و هەیبەت سوڵتان، کە لەم کاتەدا جەمەی دەهات لە هێزەکانی عێراقدا. شەوکەت زیاتر مەسەلەکە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت "ئێمە هەنگاوی یەکەممان لا برد و لەبەر ئەوەی فشار لەسەر بنکە و بارەگاکانمان زۆر قورس بوو، ڕاستەوخۆ دەستمان کرد بە هەنگاوی دووەم، ئەویش ڕزگارکردنی هەڵەبجە بوو". بەڵام حامیدی حاجی غالی، جێگرەکەی شەوکەت و (ئامۆزایشی) (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) بە کەمێک جیاوازییەوە باس لە مەسەلەکە دەکات و دەڵێت کە بڕیاری بنەڕەتیی کردنەوەی سێ بەرە بووە: لە قەڵادزێ و هەڵەبجە و حاجی ئۆمەرانەوە، بەڵام "پاش گفتوگۆکردن لەسەر ڕێژەی گونجاوی و لەباریی ئەم سێ ناوچەیە، سەرکردایەتی لەسەر هەڵەبجە گیرسایەوە،

لەبەر ئەوەی دانیشـــتوانی لە ســـاڵی ١٩٨٧ ڕاپەڕیـــن (لە ئەنجـامی گونـد ڕووخاندنـدا). ئـاڵوگۆڕی ئەم پەیوەنـدییانە هەموو بە جفرە و لە ڕێی بێتەلەوە دەکرا".

شـەوکەت وای دەگێـڕێتەوە کە هانـدەری کوردەکـان لەم کارەدا، شتێکی تریش بووە: چونکە تا ئەو کاتە تەنها (ی ن ک) بنکە و بارەگای هەبوو لە ناو عێراقدا. بە هەمان شێوە پارتە کوردییەکانی تریش بەپەرۆش بوون بۆ دامەزراندنی بنکە و بارەگای خۆیان لە ناو عێراقدا. کەواتە گرتنی خاکی ئەو ناوچانە، ڕێگەی بەو کارە دەدا. شەوکەت دەڵێت "هەموو لا وەک یەک حەزیان دەکرد ناوچەی ڕزگارکراوی زیاتر بە دەست بێت".

پلانەکەی کورد لەوپەڕی حەز و واقیعیەتیدا، بریتی بوو لە ڕزگـــــارکردنی تەواوی پارێزگـــــای ســــلێمانی و کۆنترۆڵکردنی هەر دوو بەنداوی دەربەندیخان و دوکان و بڕینـــی ڕێـــگەی ســـلێمانی ـــ کەرکـــووک. ئەمە تەنهـــا ڕێخۆشکردن بوو بۆ پلانێکی گەورەتر کە خەون و خەیاڵی کورد تێیدا ڕەنگی دەدایەوە، ئەویش گرتنی کەرکووک بوو.

لە ســــەرەتای ســـاڵی ١٩٨٨دا، بەرەی کوردســـــتانی زنجیرەیەک کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرکردایەتیی ئێراندا ساز دا. ئەنجـوومەنی هەمـاهەنگیی بەرە پێـک هـاتبوو لە بـابەکر زێباری (پ د ک)، شێروان شـێرەوەندی (حسـک)، فەرەیدون عەبـدولقادر (ی ن ک)، مەلا عەلـی عەبـدولعەزیزی ڕابەری بـزووتنەوەی ئیسـلامی لە کوردسـتانی عێـراق، نـوێنەری ئەنجـوومەنی بـاڵای شۆڕشـی ئیسـلامی لە عێـراق عەلـی مەولانـی و ئێرانیش موحسـین ڕەزایـی فەرمانـدەی سـوپای پاسـدارانی نـاردبوو، لەگەڵ چەنـدین کەسـی تـردا. بڕیـاردانی

کۆتـایی گرتنـی هەڵەبـجە، بەپێـی قسـەی مـحەمەدی حـاجی مەحمـوودی سـەرکردەی حسـک، لە ٧ی مارتـدا بـوو، پـاش داواکـارییەکی پڕپەرۆشـی (ی ن ک) بـۆ یارمەتیـدان. ئەمە ئاماژە بوو بە دوا ئامادەکاریی هێرشی وەلفەجری ئێران.

**باسوخواسی دژبەیەکی شەڕمکە**

لەم خاڵەدا پرسیاری سروشتیی بەشداریکردنی ئێران، زۆر جێی مشتومڕە و کوردەکان دەڵێن کەوا تیپێکی کارایان لە حیزبەکان پێکەوە ناوە بۆ کارکردن لەگەڵ ئێرانییەکان، بەم جۆرەی خوارەوە: (٢٠٠) پێشمەرگەی (پ د ک) بە سەرکردایەتیی حەمید ئەفەندی و نادر عەلی هەورامانی دەبوو خورماڵ بگرن، (١٠٠ ــ ١٥٠) پێشمەرگەی حسک بە سەرکردایەتیی محەمەدی حاجی مەحموود دەبوو پردی ستراتیجیی زەڵم بگرن بۆ بڕینی ڕێگەی سلێمانی ـ هەڵەبجە، (٥٠٠) پێشمەرگەی (ی ن ک) بەرەو هەڵەبجە بڕۆن، (١٠٠ ــــ ١٥٠) پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامی بە سەرکردایەتیی مەلا عەلی بیارەیی و مەلا عەلی عەبدولعەزیز یارمەتیی لۆجستیک بۆ (ی ن ک) دابین بکەن، هێزێکی لەناکاویش لە (١٠٠٠ ــ ١٥٠٠) جەنگاوەری بەدری سەر بە ئەنجوومەنی بالآی شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق بە سەرکردایەتیی ئەبوعەلی و ئەبوزەینەب (هەر دوو ناوی خوازراون) و بە یاوەریی پێشقەرەوڵی کورد دەبوو شاخی شەمێران بگرن. لە هەڵەبجەدا یاخیبووەکان چەکیان دابوو بە دۆستانی خۆیان لە ڕێکخستنە نهێنییەکاندا و قسەیان لەگەڵ فەرماندەکانی جاشی ناوچەکەش کردبوو بۆ ئەوەی بە لای خۆیاندا ڕایانکێشن.

(ی ن ک) هێزێکی چوارسەد و پەنجا کەسیی پێکەوە نابوو، کە لە بەشە جیاجیاکانی کوردستانەوە هێنرابوون و لە نزیک گوندی هاوارەوە دانرابوون لە چیاکانی سەرووی هەڵەبجەدا (چونکە نەیدەویست هێزی خۆی لە جافەتی لاواز بکات). حامیدی حاجی غالی کە فەرماندەی ئەم گرووپە بوو، دەیگوت کەوا ناوچەکەیان کێومال کردووە و مینی ئەرزیی دژەتانکیان هەموو دەرهێناوە. "من و پێنج فەرماندەی تری (ی ن ک) بە نهێنی چووینە هەڵەبجەوە، هەفتەیەکی تەواوی تێدا ماینەوە و کاری هێرشەکەمان لەگەڵ ڕێکخستنەکانی ناوشاردا تاوتوێ دەکرد. ئێمە زانیاریمان لەسەر هێزەکانی عێراق کۆ دەکردەوە و وێنە و فیلمی ڤیدیۆییمان لەسەر بنکەکانی سوپا و سەربازگەکان دەگرت".

عێراقییەکان لیوایەکی تۆپخانەیان هەبوو لە دەڵەمەڕ لە سەرووی هەڵەبجەوە و چوار فەوجیش لە ئاوایی ڕۆستەم بەگ لە باکووری خورماڵ. لە ناو هەڵەبجەدا، لە زەمەقیی ڕێک لە باکووری هەڵەبجەوە و لە چەمی پاڵەنیا لە نزیک شارۆچکەی ڕووخاوی تەوێڵەوە لەسەر سنووری ئێران ـ کە تێکڕا هێزەکە دەگەیشتە (٣٥٠٠) کەس. سەرەڕای ئەوەش چوار فەوجی جاش لە هەڵەبجەدا هەبوو کە هەر یەکەیان (٨٠٠ بۆ ١٠٠٠) کەس دەبوون. حامیدی حاجی غالی وای بۆ دەچێت کە سێ لەسەر چواری ئەو جەنگاوەرانە هاتنە پاڵ پێشمەرگە و تەنها ئەم موستەشارانە: حەسەن مەحموود بەگ، خالید جەلیلەیی، ئیبراهیم نەسرەدین و حەمەڕەزای نامدار و هەندێک لە جێگرەکانیان بە دڵسۆزی ڕژێمی عێراق مانەوە. دواجار بەڕێوەبەرێتیی ئیستیخباراتی سەربازیی

عێراق، نزیکەی حەفتا ئەمن و شەست بریکاری چەکداریان لە هەڵەبجەدا جێگیر بوون.

بەپێی قسەی شەوکەت، هێزەکانی ئێران لە کاتی ئۆپەراسیۆنی هەڵەبجەدا، بوونێکی وایان لەو ناوچەیەدا نەبوو، لانیکەم تا هێرشە کیمیاییەکەی عێراق. لە گێڕانەوەکەی ئەمدا، کە حامیدی حاجی غالیش دەیسەلمێنێت، هێزە کوردییەکان بە پاڵپشتیی ئاگری تۆپخانەی ئێران لە بەتەرییەکانی ناو ئێرانەوە عێراقییەکانیان تێک شکاندووە و لە ١٤/١٥ی مارتدا، لە پەلامارێکی کوتوپڕدا، هەڵەبجەیان ڕزگار کردووە. بۆ ڕۆژی دوایی عێراقییەکان هێرشی پێچەوانەیان کردووە و بە گازی ژەهراوی بۆردمانیان کردووە و لێرەدا کوردەکان هەڵاتوون و هێزەکانی ئێران جێگەیان گرتوونەتەوە و بەلێشاو لە سنوورەوە ڕژاونەتە ناوچەکەوە لە ترسی ئەوەی نەوەک ئەو ناوچە بەرفراوانەی لە لایەن کوردەکانەوە گیرابوو، لە دەستی بدەن. بە شێوەیەکی سەرەکی، ئێرانییەکان تەنها ڕۆڵی پاڵپشتیان دەبینی، وەک شەوکەت باسی دەکرد، چەک و تەقەمەنی، خۆراک و جلوبەرگیان دابین دەکرد لەگەڵ هەماهەنگی و پەیوەندیکردن بە مەیدانی شەڕەوە بە بێتەل. "هێزی گەورەی ئێران لە سنوور و لە ناو ئێراندا بوو، نزیک بە مەریوان، نەوسوود، پاوە و جوانڕۆ. ئەم هێزانە نەهاتنە ناوچەکەوە تا دوای هێرشی کیمیاییەکە و کاتێک کە بارودۆخەکە لە گرێژەنە چوو". شەوکەت ئێرانییەکانی بە پەنجەکانی دەست دەژمارد، ئەوانەی کە لە ١٥ی مارتدا لەگەڵ تاقمەکەی ئەمدا بەرەو هەڵەبجە دادەکشان: ڕادیۆ ئۆپەرەیتەرێک بە ناوی مەحموود ڕەزایی، ڕەسەدێکی تۆپچی بە ناوی عەلی ڕەزا،

دوو فیلمساز کە وێنەی لێدانی کیمیاییەکەیان گرت، لەگەڵ پیاوێکدا کە ئامێری ڕادیۆ (بێتەلی) هەڵگرتبوو. وەک ئەو دەیگوت، هەر هێزێکی کورد، تیمێکی لەم جۆرە یاوەریی دەکرد. کۆلۆنێل محەمەد تارانی فەرماندەی گشتیی مەیدانیی ئێران بوو، کە بەرپرسی ئۆپەراسیۆنەکە بوو، عەلی شەمخانی کە بە عەرەبی قسەی دەکرد و دواتر بوو بە وەزیری بەرگری، فەرماندەی هێزەکانی ئێران بوو لە پاوە.

حامیدی حاجی غالی بەم شێوەیەی خوارەوە باسی هێرشەکە دەکات:

"سەعات یەکی شەوی ١٤ی مارت هێزەکەی من لە سنوور پەڕییەوە و بنکە و ڕەبایەکانی لوتکەکانی چواردەوری هەڵەبجەی گرت و بەیانیی زوو لە کارەکەمان بووینەوە و سەرجەمیشی سەرکەوتن بوو. پاشان بڕیارمان دا قۆناغی دووەم دەست پێ بکەین کەوا گرتنی هەڵەبجە بوو. لەملا و لەولا شەڕی پچڕپچڕ لەگەڵ عێراقییەکان بەرپا دەبوو، ئەوان بە هێلیکۆپتەر یارمەتییان پێ دەگەیشت — بەڵام لە ١٥ی مارتدا ئێمە هەڵەبجەمان ڕزگار کرد. ئەوجا بوو بە شایی و ئاهەنگێکی گەورە: خەڵکی شار هەڵدەپەڕین و سەرگەرمی چەپڵەڕێزان و گۆرانیگوتن بوون. بۆ دوانیوەڕۆیەکی درەنگ بەتەرییەکانی عێراق لە دەربەندیخان و سەیدسادقەوە کەوتنە تۆپباران و تا بەیانیی ڕۆژی ئایندە بەردەوام بوو. بە هۆی ئەمەوە زۆر لە هەڵەبجەییەکان چوونە ژێرزەمینیماڵەکانیانەوە."

ئا لەم کاتەدا بوو کە هێرشی کیمیایی دەستی پێ کرد. بە درێژایی ئەم هەموو ماوەیە، وەک حامیدی حاجی غالی دەڵێت، ئێرانییەکان تەنها بە تۆپخانە پاڵپشتییان دەکرد و بە

مووشەک و تۆپ سەربازگەی دەڵەمەڕ و ناوچەی هەڵەبجە و پردی زەڵمیان داگرتبووەوە. بنکەی تۆپەکان لە ناو ئێراندا بوون، بە تایبەتی لە دزلی و لەو چیا بەرزانەدا بوون کە بەسەر هەڵەبجەدا دەیانڕوانی. حامید جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هیچ شتێکی نائاسایی تا ئەم کاتە ڕووی نەدابوو، چونکە چەندین ساڵ بوو ئێرانییەکان لەم شوێنانەوە عێراقییەکانیان تۆپباران دەکرد، بەڵام لەم کاتەدا ئاگرەکەیان خەستتر کردبووەوە و بەردەوامیی زیاتری هەبوو. عێراقییەکان زۆر بە کەمی بەرگرییان دەکرد و زۆریان خۆیان بە دەستەوە دا و ئەوانی تریش بەرەو سەیدسادق کشانەوە و هەوڵیان دەدا لە پردی زەڵم دەرباز بن و لە دەریاچەکەوە دەپەڕینەوە، یان لە گوندە ڕووخاوەکانی نزیک دەریاچەکە خۆیان دەشاردەوە و چاوەڕێی یارمەتی و پشتیوانی بوون. هێزی سەرەکیی ئێران کە هاتە ناو خاکی عێراقەوە، تەنها لە دوای هێرشە کیمیاییەکەی ١٦ی مارت بوو، کە بە هەزاران سەربازی ئەم هێزانە هاتنە ناوچەی بەرفراوانی هەڵەبجەوە و بە درێژایی چەمی زەڵم و ئەوخوار بۆ دەریاچەکە سەنگەریان لێ دا و هێڵێکی نوێی بەرەی شەڕیان پێک هێنا. بەپێی قسەی شەوکەت، ئەمە سێ ڕۆژ پاش هێرشی کیمیاییەکە بوو. ئێرانییەکان ویستیان بەرگریی عێراق تێک بشکێنن و بگەنە سەیدسادق و پێنجوێن، بەڵام ئەمان بە توندی لێیان دان و گێڕانیاننەوە بۆ زەڵم. ئەم بۆچوونە لەگەڵ ڕاپۆرتە هەواڵەکانی (قۆناغی پێنجەمی) وەلفەجر/١٠دا یەک دەگرێتەوە کە لە بەرەبەیانی ٢٤ی مارتدا دەستی پێ کرد[٧].

بــۆ بەشــداربووە کوردەکــانی تــر، ئەم گێــڕانەوەیە خودپەســەندیی زۆری تێدایە، چونکە شکۆدانان بۆ کاری ســەربازیی کــورد، کەمکــردنەوەی ڕۆڵــی کــوردە و وێنــاکردنیەتی وەک بریکــاری ئێرانییەکــان کە دەسکێشــیی هێزەکانی دوژمنی کردووە بۆ ناو خاکی عێراق لە جەنگێکدا کە هەڕەشــە لە ڕژێمــی عێــراق دەکــات و بەوپێــیە کاردانەوەیەکی بەهێزی پاساودراو دەورووژێنێت، ئەگەرچی بە شــێوەیەکی نائاســایی دڵڕەقــانە و پاســاودانی نــاڕەوایە. بەڵام ئەم گێڕانەوەیە پێدەچێت ناوەڕۆکێکی ڕاستیی تێدا بێت و لانیکەم لە لایەن ســەرکردەیەکی بــاڵای تــرەوە پشــتگیریی دەکرێت، کە کۆسرەت ڕەسوڵ عەلیی فەرماندەی (ی ن ک) بووە لە ناوچەی هەولێر و دواتر (لە ساڵی ٢٠٠٦دا) بووە بە جێگری مەسعود بارزانیی ســەرۆکی هەرێمی کوردستان. هەروەهــا باســەکە لە لایەن دوو کەســی ئێرانیشــەوە پشــتیوانیی دەکرێــت کە لە ئۆپەراســیۆنەکەدا بەشــدارییان کردبوو. محەمەد زاهیدی، کە برینپێچێک بوو لە یەکەیەکی ئیمێرجنسیدا لە نزیک نەوســوودەوە بە نــاوی ئیمام ڕەزا، ڕێــک لەســەر ســنووری ئێــران لای هەڵەبــجەوە (لە چاوپێکەتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەگێڕێتەوە کە لە کلینیکێکی ئیمێرجنسیدا دەستبەکار بووە کە بۆ وەلفەجر/١٠ دروست کراوە، دوو سێ ڕۆژ پێش دەستپێکردنی هێرشی ســەرەکیی ئێران بۆ ســەر هەڵەبجە، وەک ئەم دەڵێت "ئێمە خۆمان بۆ هێرشــێک ســاز دەدا، بەڵام نەکرا. لەجیاتیی ئەوە ئاگــادار کراینەوە کە قوربانییانی چەکی کیمیاییمان بۆ دێنن. پاشان ژن و پیاو و منداڵیان هێنا بە هەموو جۆرە ئۆتۆمبیلێک و دوای ئەمە هێرشــەکە دەســتی پــێ کــرد". بە هەمــان شــێوە

پاسدارێکی ئێرانی کە یارمەتیی دەربازکردنی هەڵەبجەییە برینדارەکانی دابوو، هەروەها مردووەکانیشی ناشتبوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۲دا) دەگێڕێتەوە کەوا کاتێک هێرشە کیمیاییەکە دەستی پێ کرد، هیچ هێزێکی ئێرانی لە ناو هەڵەبجەدا نەبوو، تەنها دوای ئەوە بریکارەکانی ئیتلاعات و هێزەکانی ئێران ڕژانە ناو عێراقەوە و ڕاستەوڕاست بەرەو دەریاچەکە چوون. تۆماری ڕاپۆرتی جەنگی ئێران بە شێوەیەک دەیگێڕێتەوە کە تەواو پێچەوانەیە و تەنها ڕۆڵی ئێران باس دەکات لە گرتنی هەڵەبجەدا. بەڵام پاڵپشتیی ئەو بۆچوونەش دەکات کە هێزی سەرەکیی ئێران نەگەیشتبوونە شارەکە تا دوای هێرشی کیمیاییەکە.

لە ۱۳ی مارتدا، ئێران دەستپێکردنی هێرشی زەفەر/۷ی ڕاگەیاند بە ئاڕاستەی خورماڵ، کە شارۆچکەیەکە دەکەوێتە سەر چەمی زەڵم و لە هەمان حەوزی هەڵەبجەدایە. وەک باس دەکرێت ئۆپەراسیۆنەکە لە لایەن گرووپە ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراقەوە سەرکردایەتی دەکرا، وەک تیپی نۆی بەدری سەر بە ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی عێراق، یەکەی جەنگاوەرانی بزووتنەوەی ئیسلامی، (پ د ک)، (ی ن ک) و گرووپی جۆراوجۆری پێشمەرگە کە بنکە و بارەگایان لە پارێزگای سلێمانیدا بوو — "بە پاڵپشتی"ی یەکەکانی لیوای زەفەری/۷۵ی پاسداران. دواتر ئاژانسی هەواڵی ئێرانی ڕاپۆرتی لەسەر ئۆپەراسیۆنێک دا لە لایەن هێزەکانی پاسدارانەوە "پێکەوە لەگەڵ" جەنگاوەرانی عێراق و پێشمەرگەی کورددا، کەوا هەر لایە و ئەرکێکی لە ئەستۆ بوو. ئامانجی ئۆپەراسیۆنەکە، وەک ئێرانییەکان دەیانگوت، تۆڵەکردنەوەی "بۆردمانی کیمیایی عێراق بوو بۆ ۱۵ گوندی

کوردنشـــین لە بـــاکووری عێراقـــدا (هەفـــتەی پێشـــتر) و لە ئەنجـامی ئەوەدا هەشـت هەزار کـورد بێماڵوحـاڵ بـوون" ــ ئەمەش پێدەچێت ئاماژە بێت بۆ تۆپبارانی گونـدەکانی دۆڵـی جـافەتی، کە دانیشـتوانی کەوتـنە هەڵاتـن بەرەو ئێـران[8]. قۆناغێ یەکەم مەبەستی گرتنی پێگە و ڕەبایەکانی سـەر ئەو لـوتکە شـاخانە بـوو کە دەیـانڕوانییە سـەر دەشـتاییەکاندا و ئەم ئەرکە تـا ١٥ی مـارت جێبەجـێ کرا. قۆنـاغی دووەمـیش ئاڕاستەکەی بەرەو خورماڵ بوو، کە ئێران وای باس دەکرد بۆ ڕۆژی دوایی گرتوویەتی.

لەم دەمەدا، ئاژانسـی هەواڵـی کۆمـاری ئیسـلامیی ئێـران IRNA جـاڕی دەسـتپێکردنی وەلفەجـر/١٠ی دا "لە نـاوچەی خورماڵـدا" بە درێژایـی شـەوی ١٥ لەسـەر ١٦ی مـارت. ئەو هێـزانەی ئێـران کە پێشـتر خورماڵیـان گرتبـوو، وا ئێسـتا بە هەموو لایەکدا پەرشـوبڵاو بـوونەتەوە و هێزەکـانی عێراقیـان ڕادەماڵی و گوندە کوردییە "ڕووخاوەکانیان" دەگرت. لێرە بە دواوە بەیـــانە ســـەربازییەکانی ئێـــران ئاماژەکردنیـــان بە قارەمـانێتیی هاوپەیمـانە عێراقییەکـان ڕاگـرت و تەنهـا باسـی "جەنگـاوەرانی ئـازا و بـوێری پاسـدارانیان" دەکـرد و تەنهـا بانگەشەی ئەوەیان بۆ کـورد دەکرد "ئەو بـارودۆخە لەبـارە بقۆزنەوە کە جەنگاوەرانی ئێران ڕەخسـاندوویانە و شـەڕی پێشـمەرگایەتییان دژ بە ڕژێمـی بەعـس گەرمتـر بـکەن"[9]. بەمەش دەیانویســت وای بگەیەنــن کە پێشــمەرگە تەنهــا ڕۆڵێکی لاوەکییان بینیوە.

لە شــازدەی مارتـدا، ئێـران ئیـدیعای ئەوەی دەکـرد کە ڕێگەی نێوان خورمـاڵ و سـیروانی گرتـووە و بەردەوام بـۆ دەریـاچەکە پێشـڕەوی دەکـات. ئەمەش وای دەگەیانـد کە

ئەوان بەرەوپـێش دەڕۆن و بەم مـانۆڕە توانییـان ڕێـگەی دەربازبوونی هێزەکانی عێراق ببڕن لە نـاوچەی هەڵەبـجەدا. سـەرەنجام ورەی عێراقییەکـان ڕووخـا و سـووک و ئاسـان زۆربەی هێزەکـان خۆیـان بە دەسـتەوە دا. بـۆ ڕۆژی دواتـر ئێـران ڕایگەیانـد کە هێزەکـانی لە سـیروانەوە بـۆ هەڵەبـجە دەچـن و پەلامـاری بنکە و ڕەبایەکـانی عێراقیـان لە بـاڵامبۆ داوە، کە شـــاخێکە ڕاســـتەوخۆ دەکەوێـــتە ڕۆژئـــاوای هەڵەبـجەوە. ئەوجـا گرتنـی بەرزاییەکـانی بـاڵامبۆ لە بەیـانیی زووی ١٧ی مارتـــدا ڕاگەیەنـــرا و گرتنـــی "ســـەربازگەی ستراتیجیی" زەمەقیش، کە لای بـاکوورەوە کەوتبـووە قەراغ شـاری هەڵەبجەوە، سەعاتێک دوای ئەوە بوو.

دواینیـوەڕۆیەکی درەنگـانی ئەو ڕۆژە، هێزەکـانی ئێـران وەک بـاس دەکرێـت "لە چەنـدین لاوە پێشـڕەوییان کـرد بـۆ شـــاری گەمـــارۆدراوی هەڵەبـــجەی عێراقـــی، کە دەکەوتە بـــاکووری ڕۆژهەڵاتەوە"، وەک ئاژانســـی هەواڵـــی کۆمـــاری ئیسـلامیی ئێـران IRNA ڕاپـۆرتی لەسـەر دەدات و دەڵێـت "هاوزەمـــان لەگەڵ پێشـــڕەویی هێـــزە ڕزگارکەرەکانـــدا دانیشتوانی هەڵەبجە لەگەڵ هێزە بەعسییە گەمارۆدراوەکانـدا لە نـاوەوە بەشـەڕ هـاتوون و چەنـدینیان لـێ کوشـتوون و برینـدار کـردوون. دانیشـتوانی نـاوچەکە بە خۆشـحاڵییەوە کەوتـوونە تەک هێـزە موسـڵمانەکان بـۆ ناوشـار". سـەعات (٤:٢٠)ی پاشنیوەڕۆ بە کاتی گرینویچ و (٧:٥٠)ی پاشـنیوەڕۆ بە کـاتی نـاوخۆ) لە ١٧ی مارتـدا ڕادیـۆی تـاران بە هەڵـلا و خۆشـییەکی زۆرەوە ڕایگەیانـد "ئەڵڵاهـو ئەکـبەر! ئەڵڵاهـو ئەکـبەر! ئەی گەلـی قارەمـانی ئێـران! ئەی پیـاوانی بـوێر و

بەجەرگی نیشتمانی شەهیدان! خوشکان برایان! وا شاری هەڵەبجەی ستراتیجی ڕزگار کرا!"[١١].

بۆ ڕۆژی ئایندە ئێران ڕایگەیاند کە تەوێڵە و بیارەشی گرتووە، کە دوو شارۆچکەی کوردنشینی عێراقن لە سەرووی هەڵەبجەوە نزیک سنوور، هەروەها نەوسوودیش کە شارۆچکەیەکی کوردنشینی ئێرانە و کاتی خۆی، لە لایەن حدکاوە (بە هاوکاریی عێراق) گیرابوو. ئەمە وای دەگەیاند کە هێزەکانی ئێران جموجووڵێکی مەقاشئاسایان تەواو کرد کەوا ڕەزایی فەرماندەی پاسداران دواتر بەم جۆرەی باس دەکات: "لە یەک لاوە شاخ و بەرزایی دەوری دوژمنی دابوو و دەریاچەکەش دەکەوتە لاکەی ترەوە. لەو کاتەوە کە ئێمە پردی زەڵممان گرت، وەک ئەوە وا بوو دوژمن لە قوژبنێکدا بکەوێتە تەپکەوە و ئێمەش خڕ دەرکی ئەو قوژبنەمان لەسەر داخست"[١٢].

لایەنێکی گرنگی باس و گێڕانەوەکەی ئێران بە شێوەیەکی دژوار و پێچەوانە دەردەکەوێت. چونکە ئێران ئیدیعای ئەوە دەکات کە هەڵەبجەی لە ١٧ی مارتدا گرتووە و دانیشتوانی ناوخۆ "بە خۆشحاڵییەوە کەوتبوونە تەک" هێزەکانی. بەڵام لە هەمان ئەو ڕۆژەدا ئاژانسی هەواڵی ئێرانی ڕاپۆرتی ئەوە دەدات کەوا عێراق "بە کیمیایی بۆمبارانی شارۆچکەی هەڵەبجەی کردووە... دوو جار لە ئێوارەی چوارشەممەدا"، کە ١٦ی مارت بوو و "سەدان کەسی لە ژن و منداڵی بێتاوان" کوشتووە و بریندار کردووە. دوابەدوای هێرشەکە" هەزاران کەسی خەڵکی هەڵەبجە و ناوچەکانی دەوروبەری، کۆمەڵ کۆمەڵ بۆ بەیانیی پێنجشەممە ماڵەکانیان بە جێ هێشت و بە پێیان

بەرەو سنووری ڕۆژئاوای ئێران ڕۆیشتن". ئەوجا ئێران باسی لە خولی دووەمی لێدانی کیمیایی کرد لە لایەن عێراقەوە بۆ سەر خورماڵ و سیروان و هەڵەبجە لە بەیانیی پێنجشەممەدا"[١٣]. ئەو بۆچوونە تەڵخ و تەمومژاوییەی کەوا مەدەنییەکان لە بۆردمانێکی کیمیایی هەڵاتوون لە هەمان کاتدا ڕەنگە بەوە تەماشا کرابێت کە بە خۆشحاڵییەوە بوون بە پێشقەرەوڵی هێزەکانی ئێران کە چوونە ناو هەڵەبجەوە پێش ١٧ی مارت، یان باسوخواسی کەیفخۆشیی خەڵکی شار دەبێت بچێتە خانەی پرۆپاگەندەی جەنگەوە. یان پێدەچێت ئێرانییەکان بە هیچ کلۆجێ هەڵەبجەیان نەگرتبێت. ئەگەر ئێمە کرۆنۆلۆجیای ڕووداوەکان لە دیدی ئێرانەوە وەربگرین و ئیدیعای کوردەکان سەبارەت بە گرتنی شارەکە بێ یارمەتییەکی ئەوتۆی ئێرانییەکان ڕەچاو بکەین، ئەوە پێشڕەویی ئێران لە ١٧ی مارتدا بۆ شارێک بووە کە لەو کاتەدا کەوتووەتە بندەستی کوردە شۆڕشگێڕەکان و دانیشتوانەکەی چۆڵیان کردووە، لە پاش گازبارانی ڕۆژێک لەوەوپێش.

### لە نێوان بۆچوونە جیاوازەکاندا

گێڕانەوەیەکی ئەڵتەرناتیڤ کە دەکەوێتە نێوان باس و گێڕانەوەی ئێرانییەکان و فەرماندە پایە بڵندەکانی (ی ن ک)، لە فەرماندە پلە خوارترەکانی یەکێتییەوەیە، کە لە هێرشەکەدا بەشدار بوون و لە گێڕانەوەی ئەو خەڵکانەی شارەکەوەیە کە ساڵی ١٩٩٢ هیومان رایتس ووچ چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کردبوون، بێجگە لە ئەندامانی حیزبەکانی تریش، کە ئەو دەمە هێزیان لە ناوچەکەدا بووە و هەر هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە لە پێش ١٦ی مارتدا هەندێک ئێرانی هاتوونەتە ناو هەڵەبجەوە. لە کاتێکدا ئەم چاودێرانە ژمارەیەکی زۆریان لە هێزەکانی ئێران بینیوە لە ناوچەی هەڵەبجەدا و ئەو هێزانە نەهاتوونەتە ناو شارەکەوە، لانیکەم لە پێش هێرشە کیمیاییەکەدا. بەگوێرەی ئەم باسانەش، هێزەکانی ناوخۆ لە پێش مارتدا بە باشی خۆیان ئامادە کردبوو. مام هادی کە پێشمەرگەیەکی یەکێتییە و لەم ناوچەیەدا گەورە بووە و لە ساڵی ١٩٧٦ەوە پێشمەرگە بووە، گوند بە گوندی ناوچەکە گەڕاوە و شارەزایەکی تەواوی ئەم ناوەیە، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) باس لەوە دەکات کە بریکارەکانی ئیتلاعاتی ئێران، سێ مانگ لەوەوپێش کەوتبوونە گەڕان و پشکنینی ناوچەکە: "فەرماندەی یەکەیەک هەبوو پێیان دەگوت داودی، لەگەڵ پێنج شەش کەسدا ڕەنگە دە جار زیاتر هاتبێتنە ناوچەکە و هەر جارەی نزیکەی دوو ڕۆژێک دەمانەوە و

لەگەڵ پێشمەرگەکانی (ی ن ک) نزیک سەربازگە و ڕەبایەکانی سوپای عێراق دەبوونەوە و وێنەیان دەگرت و نەخشەیان دەکێشا. گرووپێکی تری لەو چەشنەش دەچوونە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی (پ د ک)" ـ لە سەرووی خورماڵەوە.

حەمەی حەمەسەعیدی فەرماندەی (ی ن ک) لە هەڵەبجە باس لە چالاکییەکی تەمومژاوی دەکات لە نێوان کورد و ئێرانییەکاندا. ئەو دەیگوت بەڵێ کەسانێک لە قەرارگای ڕەمەزانەوە ــ وەک کارپێکەری بێتەل، وێنەگر و پەیامبەری ماتۆڕسوار (تەتەر) ــ هاوڕێیەتیی ئەو هێزە کوردییانەیان دەکرد کە ناوچەکەیان ڕزگار کرد، بەڵام جیا لەوە، هێزە ئێرانییەکان بە چاوساغی و پێشەنگیی کوردەکان و لە پێش هێرشە کیمیاییەکەدا، هێرشیان دەکردە سەر سەربازگە گەورەکانی عێراق لە دەرەوەی هەڵەبجە: "من بەرپرسی ناوچەکانی پشتی هەڵەبجە بووم (نزیک سنوور). یەکەم ئامانجمان ئەوە بوو کە هێرش بکەینە سەر چیاکانی بالامبۆ و شنروێ، بە هاوبەشی لەگەڵ هێزەکانی ئێراندا". ئێران بۆ پاڵپشتیی هێزە زەمینییەکانی لە دزڵی و کانی خەیاران و هیروێ و دووئاوەوە تۆپبارانی بەرەکانی عێراقی دەکرد، بەپێی قسەی حەمەی حەمەسەعید: "ئێمە ڕەسەد تۆپچییەکی ئێرانیمان لەگەڵ بوو، ناوی ئەحمەد بوو، بەردەوام بە بێتەل هەواڵی شوێنەکانی ئێمەی دەدایە پشتەوە".

لە ١٤ی مارتدا هێزەکەی حەمەسەعید کە نزیکەی دووسەد پێشمەرگە دەبوون، بە یاوەریی ١٥٠ پاسدار، لە گوندی هەوارە کۆنی نزیک سنوورەوە بەرەو شاخی شنروێ پێشڕەوییان کرد و پەلاماری پێگە و ڕەبایەکانی سوپای عێراقیان دا، لە چادرگە و دارەڕەش و هەوارگەی بۆینیانەوە و بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر بە تەواوی کۆنترۆڵی

ناوچەکەیان کرد. گرووپێکی تری پاسداران، هێرشی کردە سەر تانکەکانی عێراق لە ناوچەی نەورۆلی لە نێوان گوندی هەسەناوا و پریس لە قەدپاڵەکانی لای خوارووی باڵامبۆدا، بەڵام لە دەڵەمەڕدا "تەنهاوتەنهـــا ئێرانییەکـــان بـــوون کە هێرشیان کردە سـەر تۆپخانـەی عێـراق و لەوێ لەو شـەڕەدا ژمارەیەکیان لێ کوژرا"، وەک سەعید جەختی لەسەر دەکات. دەڵەمەڕ بارەگای لیوایەکی تۆپخانەی سـەرەکیی عێراقی لێ بوو لە ناوچەکەدا، لەگەڵ هەشت تانک و شەش پارچە تۆپی دوورهاوێژدا. ئەگەر هەر بەرگرییەکی عێراق هەبووبێت، بۆ پێشـــڕەویی هاوبەشـــی پێشـــمەرگە و پاســـداران، ئەوە لە دەڵەمەڕدا بـوو، بەڵام تەنـانەت لێرەش شـەڕەکە لە مـاوەی چەنـد سـەعاتێکدا کۆتـایی هـات و فەرمانـدە عێراقییەکەی کە لیوا ڕوکنێک بوو، بە دیل گیرا و گوێزرایەوە بۆ ئێران.

بە هەمان شێوە مام هادی جەختی لەسـەر ئەوە کردەوە کە پێشـمەرگە شـەڕەکەیان بـۆ پاسـداران بە جـێ هێشـت و "هەر کە بەرگریـــی عێـــراق لە دەڵەمەڕدا هەرەســـی هێنـــا، پێشمەرگە چوونە نـاو هەڵەبـجەوە". ئەم گێڕانەوەیە لە لایەن شـــێردڵ حەوێزییشـــەوە پشـــتگیریی لـــێ دەکرێـــت، کەوا بەرپرسی پەیوەندیی (ی ن ک) و قەرارگـای ڕەمەزان بـوو و (لە چـاوپێکەوتنێکی سـالّی ٢٠٠٢دا) جەخـت لەسـەر ئەوە دەکـاتەوە کە "هێزێکـی زۆری ئێرانـی" لە پـێش هێرشـە کیمیـاییەکەدا لە نـاوچەی هەڵەبـجەدا بـوو. حەمەی حەمەسـەعید بەردەوامە لەسـەر قسـەکانی و دەڵێـت لە ١٥ی مارتـدا "لە کـاک شـەوکەتەوە بە بێتـەل فەرمـانم پـێ درا کە پێشـڕەوی بـۆ هەڵەبـجە بکەم"، چـونکە کـورد و ئێرانییەکان پردی زەڵمیان گرتبوو و "پاسدارەکان لە دواوە لە شنروێ

بە جێ مان" و تاقە کۆسپ کە مابووەوە، فەوجێکی جاش بوو لە کۆمەڵگەی عەنەب کە پاسەوانیی ڕێگە خۆڵەکەی نێوان هەڵەبجە و عەنەبیان دەکرد. ئەوان هەر ئەوەندە زانییان پشتیان نەما، "دەسبەجێ چەکیان فڕێ دا و تێکەڵی خەڵکی ئاسایی بوون و جیا نەدەکرانەوە. زۆریکیان هەڵاتن و ئەوانی تریش لای ئێمە خۆیان بە دەستەوە دا و پێشتریش هەندێکیان ژێربەژێر کاریان بۆ ئێمە دەکرد و وا ئێستا بە ئاشکرا هاتنە ناومان". سەبارەت بە عێراقییەکانیش حەمەی حەمەسەعید دەڵێت "ئێمە چەکەکانمان لەوانە سەند کە خۆیان بە دەستەوە دا و بەرەڵامان کردن. هەندێکیان توانییان لە زەڵم بپەڕنەوە و بچنەوە ناو هێزەکانیان و هەندێکیان لەگەڵ دەستپێکردنی هێرشە کیمیاییەکەدا، هەڵاتن بۆ سنوور". هەروەها هەندێکیشیان لە گوندە ڕووخاوەکاندا خۆیان شاردبووەوە. لە یەکێک لەو گوندانەدا، کە خێڵی حەمە بوو (لە نێوان هەڵەبجە و خورماڵدا)، "نزیکەی دووسەد سەربازی عێراقی دوای پێنج ڕۆژ لای هێزەکانی ئێمە خۆیان بە دەستەوە دا و پێمان گوتن خواردنێکی وامان پێ نییە بەشی ئەوانیش بکات، لەبەر ئەوە بەرەڵامان کردن و ئەوانیش چوون بۆ ئێران". گەلێک لە سەربازە عێراقییەکان وەک دیلی جەنگ ئاوارەییان پێ باشتر بوو لەوەی بگەڕێنەوە بۆ بەرەی شەڕ.

بەمپێیە لە نیوەڕۆی ١٥ی مارتدا، پێشمەرگە سەرکەوتووەکانی (ی ن ک) چوونە ناو هەڵەبجەوە. شەوکەت دەگێڕێتەوە کەوا "خەڵک هەموو هاتنە دەرەوە و پێشوازییان لێ کردین" و هاوکاریی پێشمەرگەیان کرد لە گرتنی بینا حکومییەکان و کەسانی سەر بە ئەمنی عێراقدا و

وەک ئەو دەیگــوت "لە ڕاپەڕینێــک دەچــوو". پاشــان دوایینیـوەڕۆیەکی درەنگـی ئەو ڕۆژە، فەرمانـدە کـوردە پـلە باڵاکان کۆبوونەوەیەکیان کرد و بڕیاریان دا هێزەکانیان بە نـاو شـاردا دابەش بـکەن و دانیشـتوان بپارێزن و بەرگریـی پچڕپچـڕی ئێـرەوئەوێ خەفە بـکەن و چەکە قورسـەکانیش بگـوێزنەوە. ئەوان بە بڵنـدگۆ بانگەوازیـان بـۆ خەڵـک دەکرد ئارام بگرن و واز لە تاڵانکردنی فەرمانگەکانی حکومەت بێنن و دەست لە مـاڵی خەڵک نەدەن. "ئێمە دڵنیامـان کـردنەوە کە بە جێیان ناهێڵین و هۆشداریمان دانێ کە ئاگادار بن، چونکە وای بۆ دەچین عێراق تۆڵە بکاتەوە"، شەوکەت پاش دە سـاڵ ئەم مەسـەلەیە ڕوون دەکـاتەوە، کاتێـک کەوتە بەر ڕەخـنەی ئەوەی کە دانیشـتوانیان تووشـی ئەو بـارە ترسـناکە کـرد. "ئــێمە هانمــان دان بچــنە لای خــزم و کەســوکاریان لەو گونــدانەی (کە نەڕووخــابوون) و لە ڕێگەوبانەکــان دوور بکەونەوە، لەبەر تۆپبارانی عێراق و بۆردمـانی فڕۆکە، کەوا ناوشار و ڕێگەکانیان کردبووە ئامانج".

لە چـاوپێکەوتنێکی کەسـانی خەڵکی شـاردا، چـوار سـاڵ دوای ڕووداوەکـان، دەرکەوت کە یـاخیبوان تەک ئێرانییەکان کەوتبــوون و ئەوەی بە نــاڕوونی مــاوەتەوە، ئەوەیە کە ژمـارەی تەواویـان چەنـد بـووە و چ ڕۆڵێکیـان گێـڕاوە. ئەو شــایەتحاڵانەی لە ســاڵی ١٩٩٢ لە لایەن هیومــان ڕایــتس وۆچەوە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کراوە، دەڵێن کەوا پاسدارەکان بینیوە "بە ئاشکرا لە ناوشار و سـەر شـەقامەکاندا نمایشـیان کردووە"، لە ئێوارەی ١٥ی مارتدا "سـڵاویان لە خەڵکی شـار کـردووە و هاواریـان کـردووە (ئەڵڵاهـو ئەکـبەر! خـومەینی ڕەهـبەر!). ئەوجـا خۆیـان کـردووە بە ماڵەکانـدا و فەرمانیـان

پێ کردوون نانیان بۆ ئامادە بکەن. هەندێکیان بە سواری ماتۆڕ بە دەوری هەڵەبجەدا سووڕاونەتەوە و هەندێکیان زۆر گەنج و مێرمنداڵ بوون و تەنها کوتەک و چەقۆیان پێ بووە. هەروەها زۆرێکیشیان ماسکی گازیان لەسەر کردووە. ئەوانە لەسەر شەقامەکان لە خەڵکی شپرزە و پەشۆکاویان پرسیوە کەوا شارە پیرۆزەکانی کەربەلا و نەجەف چەند لەوێوە دوورن"[14].

هەر چۆنێک بێت، لەم کەینوبەینەدا وا دەردەکەوێت بەڵگەیەکی وا نییە بیسەلمێنێت هێزەکانی ئێران پێش ١٧ی مارت، کە ڕۆژێک دوای پەلامارە کیمیاییەکە بوو چووبێتنە ناو هەڵەبجەوە. ئەو ڕاپۆرتانەی لە مەیدانی جەنگەوە دەگەیشتنە تاران تا ڕادەیەک ئەمە دەسەلمێنن ــ ئەو قەرەباڵغییەی لێ دەرچێت کە خۆشحاڵییان دەربڕیوە و بوارێکی باش بووە بۆ لەخۆڕازیبوونی ئێران لە ناوەوە. پێدەچێت لە ئێوارەی ١٥ی مارتدا قەرەباڵغییەکی بەخێرهێنان و پێشوازیی هەبووبێت، بەڵام ئەوە زیاتر جێی باوەڕە کە وای دابنێین هەڵەبجەییەکان خۆشحاڵیی خۆیان بۆ پێشمەرگەکان دەربڕیبێت، کە زۆرێکیان سەرلەنوێ چاوی بە خێزان و کەسوکاری کەوتووەتەوە بۆ یەکەم جار لە پاش چەندین مانگ یان ساڵ لە دابڕان و ئەو خۆشییە بۆ ئێرانییە ـ فارسە ـ شیعە ڕادیکاڵەکان نەبووە کە جێی گومان بوون لای کوردە هەڵەبجەییەکان، کە بۆ خۆیان سوننە مەزهەبی ئاسایی یان سێکیولار بوون. کەواتە دەرەنجام دەبێت وا بووبێت کاتێک ئێرانییەکان لە ١٥ی مارتدا چوونەتە ناو هەڵەبجەوە، زۆر لەوە چووە کە تاقمێک بووبێتن بە یاوەریی پێشمەرگە.

## "بۆ پاراستنی خەڵکی خۆمان"

هەڵەبجەییەکان خۆشحاڵ بوون بەوەی بەڕێوەبەرێتیی بێزلێکراوی شارەکەیان شکستی هێنا و ڕووخا. بەڵام لە هەمان کاتدا دانیشتوان ترسێکی تەواویان لێ نیشت و پێشبینیی سزای عێراقیان دەکرد. هەندێک هەر ئەو ئێوارەیە یان بەیانیی زووی ڕۆژی دواتر، شاریان بە جێ هێشت، سەرەڕای ترسی ڕێگەوبانەکانی لە شار دەرچوون، چونکە تۆپخانەی عێراق لە دەربەندیخان و سەیدسادقەوە دایانگرتبووەوە. گەلێکی تری خەڵکی شار لە شوێنی خۆیان مانەوە یان لەبەر ئەوەی هیچ هۆکارێکی گواستنەوەیان نەبوو پێی دەرباز ببن یان ڕەنگە وایان لەقەڵەم دابێت باشترە لە ژێرزەمینی ماڵەکانی خۆیاندا بمێننەوە، کەوا سالانی ڕابردوو لە ژێر خانووەکان یان لە ناو حەوشەکانیاندا هەڵیانکەندبوو، بۆ ئەوەی لە تۆپبارانی ئێران بیانپارێزێت.

شەوکەت پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە "ئێمە چاوەڕێ نەبووین عێراق چەکی کیمیایی بە کار بێنێت دژ بە خەڵکی مەدەنی. لە مەیدانی شەڕدا، بەڵێ چاوەڕێ بووین و لەبەر ئەوەش بوو کە هەموو ماسکی گاز و دەرزیی ئەترۆپینمان پێ بوو". حامیدی حاجی غالی داکۆکیی لە ئامۆزاکەی دەکات و وای بۆ دەچێت کە زۆر لە هەڵەبجەییەکان بەدەم

ئاگادارییەکەی شەوکەتەوە چوون سەبارەت بە چۆڵکردنی شار و ئەمەش بوو بە هۆی ڕزگاربوونی بەشێکی زۆری دانیشتوان. محەمەدی حاجی مەحموودی حسکیش، کە خەڵکی هەڵەبجەیە، بە شێوەیەکی پێچەوانە باس لە مەسەلەکە دەکات و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەر دوو لا، ئێران و یاخیبوانیش "چاوەڕێی پەلاماری کیمیایی بوون"، چونکە ئەوەی لە بارەی ڕژێمی عێراقەوە دەیانزانی، لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا یەکی دەگرتەوە: "لەبەر ئەوە ئێمە خۆمان ئامادە کردبوو بە ماسکی گاز و ئەترۆپینەوە و ئاگاداری خەڵکی هەڵەبجەشمان کردەوە. بەڵام ئەوان شاریان بە جێ نەهێشت و ئەگەر وایان نەکردایە ئەو ژمارە زۆرەی خەڵک نەدەکوژرا". حەمەی حەمەسەعید لەم ڕووەوە ڕەخنەیەکی توند دەگرێت و دەڵێت شەوکەت هانی هەڵەبجەییەکانی نەداوە چۆڵی بکەن و بە پێچەوانەوە "لەسەر فەرمانی ئەو، ئێمە ئامۆژگاریی خەڵکی هەڵەبجەمان کرد چۆڵی نەکەن، کاتێک کە تۆپباران لە ئێوارەی ڕۆژی ١٥ی مانگدا دەستی پێ کرد، چونکە پێمان گوتن کەوا دەیانپارێزین. من قەناعەتم نەبوو بەم بۆچوونەی کاک شەوکەت، بەڵام ئەو بەرپرس بوو". زیاد لەوەش سەعید جەختی ئەوە دەکات کە ئێرانییەکان یارمەتییان نەدەدا و هەڵبەت ئەو ئاوارانەی بەرەو سنوور هەڵاتن، بە زۆر ناچاری گەڕانەوە کران و دەسەڵاتدارانی ئێران ڕێگەیان نەدەدا لە سنوور بپەڕنەوە.

عومەر فەتاح سەرکردەیەکی تری (ی ن ک) و جێگری بەرپرسی مەڵبەندی یەکی یەکێتی بوو (کە سەنتەری سەرکردایەتیی ناوچەیی بوو) لە قەرەداغ و لە ڕووی

تەکنیکییەوە لێپرسراوی شەوکەت بوو، دەڵێت کەوا لە ئێوارەی ١٥ی مارتدا شەوکەت داوای ڕاسپاردە و فەرمانی کردووە لە مەکتەبی سیاسیی (ی ن ک) و بە بێتەل ڕاپۆرتی ئەوەی داوە کە هەڵەبجە زۆر قەرەباڵغە و چاوەڕوان دەکرێت عێراق تۆڵە بکاتەوە. عومەر فەتاح دەگێڕێتەوە: "کە لە مەسەلەکەم کۆڵییەوە، وەڵاممدایەوە و ئامۆژگاریی کاک شەوکەتم کرد شارەکە چۆڵ بکرێت، بەڵام ئەو لە وەڵامدا گوتی بارانە و خەڵک شوێنێک شک نابەن بۆی بڕۆن، منیش لە وەڵامی ئەو بۆچوونەدا گوتم باشترە باران لێیان دا نەک بۆمب. بەڵام ئەو ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە سەرکردایەتیی سیاسییەوە هەبوو (کە لە دۆڵی جافایەتییەوە نەوشیروان سەرکردایەتیی دەکرد) و من نازانم ئەوان ڕاسپاردەیان چی بووە، چونکە کۆپیی وەڵامەکە نەدەدرایەوە بە من".

ڕۆژی چوارشەممە، ١٦ی مارت، ڕۆژێکی سارد و مەیلەو فێنکیی ئاخروئۆخری زستان بوو، بەپێی قسەی شەوکەت. چەند پەڵەهەورێک بە ئاسمانەوە و شنەبایەکی سووک هەڵی کردبوو، سەرلەبەیانییەکەی بازاڕ کرابووەوە و خەڵک هەڵدەپەڕین و "خەڵکی دڵگەرم و بەپەرۆش دەوریان دابووین"، وەک شەوکەت دەگێڕێتەوە. یادەوەریی سەعید لەسەر باری کەشوهەوا کەمێک جیاوازیی هەبوو، "خۆر و باران کردبوویانە نۆرە و لە باشووری ڕۆژئاواوە کزەبایەکی فێنکی دەهات". ئەو دەمە ئەو لە شاخی ئەشکەوڵ بووە "لە پشتی عەنەبەوە"، کاتێک پەلامارە کیمیاییەکە دەستی پێ کردووە و بە ڕێگەوە بووە بۆ چەککردنی سێ فەوجی عێراقی کە خۆیان ڕادەست کردبوو. لەو کاتەدا وەک دەڵێت، شەش فڕۆکەی بۆمبهاوێژی سۆڤێتیی بینیوە بە

ڕاسەرەوە و پاشان سێی تر بە جیا و دوای ئەوەش دووی تر. فڕۆکەکان بۆمبەکانیان بەسەر هەڵەبجەدا بەردابووەوە و "دووکەڵ بەرز بووەوە کە هەندێکی سپی و هەندێک ڕەش و هەندێک سوور و هەندێک تێکەڵ. خەڵکم دەبینی دەستیان بە دەموچاویانەوە بوو".

لە هەڵەبجە خۆیدا، شەوکەت بە یاوەریی حامیدی حاجی غـــالیی ئـــامۆزای و لە کـــاتی دەســـتپێکردنی پەلامـــارە کیمیاییەکەدا، پیرۆزبایی و سڵاوی بۆ سەرهەنگ محەمەد تارانی دەنارد: "من بێتەلم بۆ کرد تاوەکو پێی بڵێم کە هەڵەبجەمان لەژێر دەستدایە و کاک حامیدم نارد بە ئۆتۆمبیل بیهێنێت بۆ ئەوەی بە چاوی خۆی ببینێت کە چۆن بارودۆخەکەمان کۆنترۆڵ کردووە". هەروەها شەوکەت دەڵێت سەعات پێنج و بیست دەقیقەی پاشنیوەڕۆ، لە ڕۆژێکی تۆپباران و بۆردمانی پچڕپچڕی فڕۆکەی عێراقیدا، پۆلێک فڕۆکەی بۆمبهاوێژ بە نزمی هاتن: "دەنگی تەقینەوەی ئەم بۆمبانە وەک ئەوانی تر ئاسایی نەبوو، بەڵکو دەنگەکە زیاتر لە تەپەیەک دەچوو. دووکەڵ بەرز بووەوە و پاشان نزم بووەوە بۆ سەر زەوی". تارانی و شەوکەت زانییان کەوا لەژێر پەلاماری گازدان و خێرا بەرگی کیمیایی خۆیان پۆشی و جامی ئۆتۆمبیلەکانیان داخست و بەرەو باکوور ڕۆیشتن. شەوکەت دەڵێت لێدانە کیمیاییەکە بە شێوەیەکی پچڕپچڕ تا سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر دەوامی کرد. "خەڵکەکە هەوڵیان دەدا شار بە جێ بێڵن و زۆر لەوانەی کە مردبوون، بەسەر ڕێگەوبانەکانی دەرەوەی هەڵەبجەوە بوون و ئەوانی تر لە ناو ژێرزەمینەکانی خۆیاندا گیانیان لە دەست دابوو".

شەوکەت باس لەوە دەکات کەوا لە ناوچەکەدا ماوەتەوە بۆ ڕاپیکردن و بەڕێوەبردنی هەوڵی فریاگوزاری و سەرلەنوێ جەنگاوەرە تۆقیوەکانی ڕێک خستووەتەوە، بەڵام تارانی گەڕابووەوە ئێران بۆ ئیدارەدانی هەوڵ و کۆششی گواستنەوەی خەڵک. حامیدی حاجی غالی چوو بۆ ئەحمەداوا (کە گوندێک و سەیرانگەیەکی بەناوبانگە بە هەر دوو بەری چەمی زەڵمدا ڕێک لە سەرووی خورماڵەوە) بۆ کۆکردنەوەی هێزەکەی کە لە هەلاتندا بوون بەسەر ڕێگە قیرەکەوە بەرەو دزڵی، ئەو ڕێگەیەی هێزەکانی ئێران و جەنگاوەرانی (پ د ک) و (حسک) پێش چەند ڕۆژێک لێوەی هاتنە خوارەوە. بۆ ڕۆژی دواتر شەوکەت بەر کیمیاوی کەوت و بریندار بوو، کاتێک کە سێ فڕۆکەی عێراقی گوندی عەبابەیلێیان بۆردمان کرد و ئەویش لەو کاتەدا لەوێ بوو. ئەو ڕۆژە، گەلێک لە خەڵکی گوندەکە کوژران و عەلی ڕەزای ڕەسەدە تۆپچییە ئێرانییەکەش بە سەختی بریندار بوو. ڕەزا گوێزرایەوە بۆ پشتی بەرەی هێزەکانی ئێران لە ناوەوە و لەوێ عەباس فروتان و تیمەکەی برینداریان تیمار دەکرد. شەوکەت باسی لە هێرشێکی کیمیایی تر دەکرد لە عەنەب، دواینیوەڕۆیەکی درەنگانی ئەو ڕۆژە، کە سێسەد کەسی کوشتووە. بە هەمان شێوە حەمەی حەمەسەعیدیش باس لە سێ چوار پەلاماری کیمیایی دەکات لە ڕۆژی ١٧ی مانگدا، لەوانە تۆپبارانێکی کیمیایی بۆ سەر هەوارە کۆن کە ناوچەیەکی پشتەوەی بەرەی ئێران بوو نزیک سنوور. دانیشتوویەکی خورماڵیش کە بیستوشەش خزم و کەسی لە هێرشەکەی هەڵەبجەدا لە دەست دابوو (لە چاوپێکەوتنێکی

ساڵی ٢٠٠٥دا) باس لەوە دەکات کە ئەحمەداواش یەکێک بوو لەو شوێنانەی ئەو ڕۆژە لێ درا.

لە پاش ١٧ی مانگ لێدانی کیمیایی وەستا. تا ئەو کاتە زۆربەی خەڵکە مەدەنییەکە گوێزرانەوە بۆ کەمپەکانی ئاوارە لە ئێراندا. هێزەکانی ئێران کە ئەو دەمە ڕژابوونە حەوزی هەڵەبجەوە، بە ئاشکرا تووشی هیچ هێرشێکی کیمیایی عێراق یان هیچ جۆرە هێرشێکی پێچەوانەی سەربازی نەبوونەوە. عێراقییەکان لە شوێنی ترەوە سەرقاڵ بوون و فشاریان بە ئاراستەی ورە ڕووخاندنی یاخیبووە کوردەکان دەبرد. بەم ڕەنگە ناوچەی هەڵەبجە بە ئارامی مایەوە تا ئەو کاتەی هێزەکانی ئێران بە ماوەیەکی کورت پێش کۆتاییهاتنی جەنگ لە تەمووزدا، کشانەوە.

ئێرانییەکان ئەم هەلەیان قۆستەوە بۆ داماڵینی هەڵەبجە و خورماڵ لە هەموو شتێک کە هەڵبگیرێت و بگوێزرێتەوە ـ ئۆتۆمبیل، تاوەری کارەبا، کەلوپەلی فەرمانگەکان و تالانکردنێکی بەربلاوی تەلار و بیناکان، لەوانە بانکەکان، پۆلیسخانەکان، بارەگاکانی پۆلیسی نهێنی، دادگاکان، نەخۆشخانەکان، کلینیکەکان، بەنزینخانەکان، کۆمپانیای پوختەکردنی توتن، دوکان و بازاڕەکان، پێش تەختکردنیان بە (تی ئێن تی). بێجگە لەوەش ئەوان هەر دوو پردی زەڵم و پردەکەی سەر سیروانیان لە تەوێڵە تەقاندەوە. هەڵبەت جێی سەرسوڕمان نییە کە تەواوی دۆسێ و فایلەکانی دەزگای ئەمنیشیان گواستەوە، کەوا زانیاریی وردیان تێدا بوو لەسەر ئەو گرووپە نەیارە چەکدارانەی هاوپەیمانی عێراق بوون وەک حدکا و کۆمەڵە و موجاهیدینی خەڵق. لە کۆتایی مانگی ئازاردا، عەلی ئەکبەر موحتەشەمیی وەزیری

نـــاوخۆی ئێـــران بە وردی هۆشـــداریی دا بە "ئەنـــدامان و داکۆکیکـــارانی تاقمەکـــانی دژەشـــۆڕش" کە خۆبەدەســـتەوە بدەن، چونکە ناسنامە و ناوەکانیان لە لیستەکانی ئەندامیتیدا لە هەڵەبجە دۆزراونەتەوە"[١٥].

بەمپێـــیە، هەر چەنـــدە پێشـــمەرگە زۆر منەتبـــاری ئەوە بووبێتن کە ئێران خەڵکە سڤیل یان مەدەنییەکەی لە هەڵەبجە دەربـاز کـردووە، بەڵام سـکاڵایەکی تاڵیـان لەوە هەبوو کە لە نـــــاوچەکە دایـــــانبڕین و ئەمەش ئـــــازادییەکی تەواوی بە هێزەکانی ئێران دا بۆ تاڵانکردن. شـەوکەت دەگێڕێتەوە کەوا "ئەمە بە تـاڵانێکی ئاسـایی دەسـتی پـێ کـرد، بەڵام پاشـان بارهەڵگریـان هێنـا و بـوو بە دزی و تـاڵانییەکی ڕێکخـراو، تەنـانەت فەرش و ڕاخەری مزگەوتەکانیشـیان بـرد. ئـێمە لەگەڵیـان کەوتیـنە شـەڕەوە، بەڵام ژمـارەی ئـێمە و ئەوان ئاسـمان و ڕێسـمان بـوو، لەبەر ئەوە هیچمـان پـێ نەکـرا". هەڵەبجەییەکـان کە شـانازییان بە خۆیـانەوە دەکـرد کەوا لە ڕیزی هەرە خوێندەوارترین کورددا دەژمێردران، بە تـایبەتی لەوە کۆسـتیان کەوت کە کتێبەکانیشـیان بەر دزی و تـاڵانی کەوتن.

ئەو وێرانکـردنە دڕندانە بێپاسـاوەی هەڵەبـجە و خورمـاڵ هەر بە برینێکـی بەسـوێ دەمێنێـتەوە لە پەیوەنـدیی نێـوان کورد و ئێراندا. ئەمە بوو بە زەمینەی گوناهبارکردنی تر دژ بە سـەرکردە کوردەکـان و بە تـایبەتی شـەوکەت، کە بـوو بە پێشـــقەرەوڵی ئێرانییەکـــان لە کوردســـتانی عێراقـــدا. بەڵام تەنانەت حەمەی حەمەسـەعیدیش، هەر چەنـدە زۆر ڕەخنەی هەبـوو لە بڕیارەکـانی سـەرکردەکانی، بە پێویسـتی دەزانـێ هەق بـدرێت بە پەیوەنـدیی کـورد لەگەڵ ئێرانـدا: "ئێرانییەکـان

پێیان گوتین ئەوان بە نیازن هێرش بکەنە سەر ناوچەی هەڵەبجە و بە هەر شێوەیەک بووە دەبێت بکەوینە تەکیان بۆ پارێزگاریکردن لە خەڵکەکەی خۆمان".

بە هەرحاڵ، حیزبە کوردییەکان بە شێوەیەکی دراماتیکی سەلماندیان کەوا سەرکەوتوو نەبوون لە پاراستنی هەڵەبجەییەکاندا چ لە عێراقییەکان بێت یان ئێرانییەکان. پاش ئەوەی ئێرانییەکان کشانەوە، عێراقییەکان بە زەبری هێز گەڕانەوە و بەپێی قسەی سەعید، کە لەو ناوەدا خۆی هێشتبووەوە، چی خانووبەرەیەک بە پێوە مابوو تەختیان کرد. عێراقییەکان ئاوارە گەڕاوەکانی هەڵەبجەیان لە کۆمەڵگەیەکدا نیشتەجێ کرد کە لەوبەری دەریاچەکەوە بۆیان دروست کردبوون و تەنانەت هەندێکیشیان ڕەهەندەی دەوروبەری هەولێر کردن و ئەوانەشیان کەوا کارمەندی حکومەت بوون، بۆ ماوەی یەک ساڵ لەسەر کار لا بران.

گێڕانەوە جۆراوجۆرەکان لە بارەی ڕۆڵی ئێرانەوە لە هەڵەبجەدا، وادیارە مەسەلەیەکی پڕ مشتومڕە و لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێت لە ناوچەیەکی سەختدا و لە نێو پەشۆکان و تەمومژی جەنگدا، هەموو فەرماندەیەک ئاگای لەو ڕووداوانە نەبووە کە لە شوێنی تردا بەرپابوون و ڕاستەوخۆ لەژێر ڕکێفی ئەمدا نەبووە. بونیادنانەوەیەکی ورد و بەئاگای مەسەلەکان وا دەگەیەنن کە متمانەپێکراوترین سیناریۆ بەم جۆرە بوو بێت: جموجووڵی خێرای یەکەکانی حسک و (پ د ک) بە هاوڕێیەتیی هێزێکی گەورەی پاسداران و بەسیج و سوپا، داویەتی بەسەر ئەو بنکە و ڕەبایانەی عێراقدا کە پاسی خورماڵ و پردی زەڵمیان کردووە و ڕایانماڵیون و ڕێگەی دەربازبوونی

عێراقییەکانیان لە هەڵەبجەوە بڕیوە. لە هەمان کاتیشدا پاسدارانی ئێران بە هاوکاریی پێشمەرگەکانی (ی ن ک)، لوتکە سەرەکییەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجەیان لە عێراق گرتووە و پاشان سەرکەوتوانە داویانە بەسەر بنکەی قایموقوڵی تۆپخانەی عێراقدا لە دەڵەمەڕ و گرتوویانە. بەمە بەرگریی عێراق لە تەواوی ناوچەکەدا هەرەسی هێناوە و هەڵەبجە بە ئاسانی کەوتووەتە دەستی پێشمەرگە. ئێرانییەکان کەسانی دەزگای هەواڵگریی خۆیان ناردووە بۆ پاسەوانیکردنی دامودەزگا سەرەکییەکان، بەڵام بە پێچەوانەوە کەمترین بایەخیان بە شارەکە دا و تا ١٦ی مارت شەڕ تەواو بوو. ئێرانییەکان، بە دەسنیشانکردنی کوردە یاخیبووەکانی ئێران، شانبەشانی هێزە هەڵاتووەکانی عێراق، کەوتنە ئۆپەراسیۆنێکی پاکسازی و ڕامالین بە درێژایی لێواری دەریاچەکە و لە ناوچەیەکی دابڕاوی دەوروپشتی نەوسوود و تەوێڵە و بیارەدا و ئەم ئامادەکارییە جێی سەرنجی محەمەد زاهیدیی بەرپرسی ئێرانییەکە بوو. ڕاپۆرتەکانی میدیای ئێرانی بە وردەکارییەوە ڕۆڵی ئەو دوو بەشەی کەم کردەوە کە لە لایەن کوردەکانەوە لە خورماڵدا ئەنجام درا و ڕۆڵی یەکەکانی پاسداران لە شەڕەکانی قەدپاڵەکانی شنروێ و بالامبۆدا و تیشکی دەخستە سەر ڕیپۆرتاجی پێشڕەویی هێزە سەرەکییەکان بە درێژایی قەراغ دەریاچەکەدا.

ڕەنگە نەتوانرێت گێڕانەوە جیاوازەکانی شەوکەتی حاجی موشیر و حەمەی حەمەسەعید یەک بخرێن، چونکە ئەمەی دواییان شانۆی جەنگەکەی بە شێوەیەکی سنووردار بینیوە و تەنها لەگەڵ فەرماندە خۆجێییەکاندا پەیوەندیی هەبووە،

کاتێک کە سەرچڵانە ملیان بە هەڵەبجەوە ناوە و دواتر شانبەشانی ڕەشەخەڵکە تووشی هیستێریا بووە کە پاشەکشەیان کردووە. بە پێچەوانەوە شەوکەت کە پەیوەندیی ڕۆتینیی لەگەڵ فەرماندە و سەرکردە باڵاکانی تردا بووە، دەبێت وێنەیەکی تەواوتری لا بێت. بەڵام ئەم وەک فەرماندەی باڵای ئۆپەراسیۆنەکە، بەشێکی زۆر گلەیی و گازندەی دەکەوێتە سەر، لەبەر ئەوەی هەندێک ئەوە بە هەڵەیەکی ستراتیجیی پارتە کوردییەکان دەبینن کە جەنگ بئاڵێنیتە ناو شارە کوردنشینەکانەوە و بەوپێیەش ڕقی عێراقییەکان بە ڕادەیەک هەڵسێنیت کە تۆڵە بکەنەوە. شەوکەت تا کۆچی دوایی کرد لە ساڵی ٢٠٠٣دا ئەوپەڕی بەرگریی لە ڕۆڵی خۆی دەکرد.

هەر چۆنێک بێت مشتومڕەکە لە هەندێک ڕووەوە تیۆرییە و بێجگە لە ڕۆڵی ئێران، عێراق بە شێنەیی و بە ئەنقەست بە پەلاماردانێکی گازی ژەهراویی دژ بە دانیشتوانی مەدەنی، تۆڵەی خۆی کردەوە و ئەمەش تاوانێک بوو دژ بە مرۆڤایەتی کە پاساوی بە شکستهێنانی هێزە زەمینییەکانی نادرێتەوە. بەڵام فەرماندە کوردەکان جیاوازییان لەسەر وردەکاریی شەڕەکە هەر چییەک بووبێت، کۆکن لەسەر دوو خاڵی سەرەکی کە تەنها هەر بایەخی تیۆرییان نییە و ئەوەیە کە بێجگە لە ئەفسەرانی هەواڵگری و شوێنوڕێ تاقیکردنەوە، هێزە داگیرکەرە سەرەکییەکەی ئێران، لە پێش هێرشە کیمیاییەکەدا نەچووە ناو شاری هەڵەبجەوە (وەک هاوسەنگیراگرتنێکی ناوچەکە)، بەڵکو ئەوە عێراق بوو و تەنها عێراقیش بوو کەوا چەکی

کیمیـــایی لە هەڵەبـــجە و ناوچەکـــانی دەوروبەری بە کـــار هێناوە.

ئەمـــڕۆ وەچەیەکـــی نـــوێ پرســـیار لە ســـەرکردایەتییە بەتەمەنەکەی (ی ن ک) دەکات، کەوا چ ئەقڵ و حیکمەتێک لە پشـــت هێرشـــە چاوبەســـتەکەی هەڵەبـــجە و جێبەجێکـــردنیەوە بـــوو، بە هاوپەیمـــانی لەگەڵ ئێرانـــدا، کە ئۆپەراســـیۆنەکە بـــۆ ئەوان هیچێکـــی وای تێنەچـــوو، بەڵام خێرێکـــی زۆری بـــۆ دانەوە. هەندێک وای دەبینن کارەساتێکی حیساب بۆ نەکراو بـــوو، کەوا کەس لێـــی بەرپرســـیار نیـــیە. مـــام هـــادییش وای لەقەڵەم دەدا کە "تراجیـــدیایەک لە هەڵەبـــجەدا ڕووی دا و کەســـیش ڕوونـــی نەکـــردەوە بـــۆچی ڕووی دا، یـــان بە هانامانەوە بێت".

"مەترسیی ئەوە هەیە سەدام حسێن شتێک بکات
کە پێشتر کردوویەتی و ئەو لە ڕابردوودا چەکی
کیمیایی بە کار هێناوە."

**دۆناڵد ڕامسفێڵد**
**وەزیری بەرگریی ویلایەتە یەکگرتووەکان**
**ئەسۆشیەیتد پرێس**
**١٥ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٢**

## گێژەڵووکەی دووکەڵ

لە بەهاری ١٩٨٨دا ئاستی مەترسییەکان بەرز بوو. خافێر پێرێز دیکوێلار بەپێی بنەماکانی بڕیاری ٥٩٨ (کە لە تەمووزی ١٩٨٧دا دەرکرا)، بە دوای ئاشتیدا دەگەڕا و بەنیاز بوو بە جیا لەگەڵ هەر دوو لای شەڕکەردا دابنیشێت بۆ دیاریکردنی زەمینەی هاوبەش. ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش، سەرقاڵی گفتوگۆ بوون سەبارەت بە سەپاندنی ئابڵووقەیەکی چەک دژ بە ئێران ـ کە ئیجرائێک بوو یەکێتیی سۆڤیەت بەرهەڵستیی کرد. هەفتەیەک پاش هێرشەکەی هەڵەبجە، ئێران هەڕەشەی ئەوەی کرد کە ناچێتە گفتوگۆی ئاشتییەوە، ئەگەر نەتەوە یەکگرتووەکان نوشوستی بێنێت لە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەدا. ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز ڕاپۆرتێکی بڵاو کردەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان و فەڕەنسا فشاریان خستووەتە سەر سکرتێری گشتی، هیچ

تیمێکی لێکۆڵینەوە نەنێرێت بۆ کەنداو و "مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو کە سەردانەکە سەرنج لەسەر پرۆسەی ئاشتی لا دەبێت". کاتێک پێرێز دیکۆیلار، وەک دەسپێشخەرییەکی خۆی، کاری دەکرد و تیشکی سەوزی هەڵکرد، قۆناغێکی هێنایە ئاراوە بە جۆرێک گوڤاری تایمز وای ناو برد کە "ئەگەری پەردەلادانە لە بارەی کۆششی جەنگیی عێراقەوە و پێدەچێت کۆسپێک بێت بۆ ئەندامە ڕۆژئاواییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، چونکە دەیانەوێت ئابلووقەیەکی چەک بەسەر ئێراندا بسەپێنن"[1].

دواتر ئەو تاقە پسپۆڕە پزیشکییەی نێردرا، سەردانی هەر دوو ئێران و عێراقی کرد و ڕاپۆرتەکەشی، کە لە ناوەڕاستی نیساندا بڵاو کرایەوە، ئاسان نەبوو پشتگوێ بخرێت. ئەوەی لە هەڵەبجەدا ڕووی دا، هێند بەرجەستە و سامناک بوو کە ناتوانرێت فەرامۆش بکرێت. ئێستا وا کاری لێکۆڵینەوە ڕێکخراوە و بینییان بەکارهێنانی چەکی کیمایی چ ژمارەیەکی بێپێشینەی قوربانیی مەدەنیی لێ کەوتەوە، ئەوجا دەبوو نەتەوە یەکگرتووەکانی بۆ بکەوێتە کار. کەچی سەرباری ئەوەش، لە هێرشکردنیدا بۆ سەر پێرێز دیکۆیلار لە سۆنگەی فەرمان دەرکردنیەوە بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی هەڵەبجە (بڕوانە پێشەکی)، تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوە، ناڕەزاییەکی توندی لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش دەربڕی. بروسکەیەکی وەزارەتی دەرەوە کە بە توندی داڕێژرابوو، باس لەوە دەکات کەوا نامەکەی تاریق عەزیز "لە ڕاستیدا ڕەخنە لە هەموو نێردراوان دەگرێت و لەوانەش هەندێک لە نزیکترین دۆستە عەرەبەکانی عێراق و بە دڵنیاییەوە دەبێتە هۆی هەندێک کار

و بڕیـاری نـوێی ئەنجـوومەنی ئاسـایش لە بـارەی چەکـی کیمیاییەوە"[٢]. بۆیە وا پێدەچێت کە عێراق، بۆ یەکەمین جار، بوو‌بێتە ئامانجی بڕیارێک بە گوناهبارکردنی لە بەکارهێنانی گازدا، بەڵام لە کاتێکدا کە واشنتۆن بەری لە بڕیار و کاری دواتری نەتەوە یەکگرتووەکان نەگرت، ئەو تۆمەتبارکردنەی کەوا ئێران هاوبەشە، لانیکەم لە هەندێک گلەیی و گازندەی هێرشەکەی هەڵەبجەدا، بوو بە هۆی سووککردنی مەسەلەکە لەسـەر هەر دوو لا (هەڵـبەت ئەمە لە لایەن بەڕێـوەبەرێتیی ڕێگـانەوە چالاکـانە کـاری لەسـەر دەکـرا). بەڵگەنـامە ئاشـکراکراوەکانی وەزارەتـی دەرەوەی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان ئەوە دەخەنە ڕوو کە چـۆن گوناهبـارکردنی ئێـران لە مـانۆڕێکی دیبلۆماسـیدا خـرایە چوارچێـوەی نەخشەیەکی واوە کە عێراقی تێدا نەبێت بە قولاپەوە.

لە پێنجی نیسـاندا، باڵوێزخـانەی ویلایەتە یەکگرتووەکـان لە لەنـدەن، ڕاپـۆرتێکی دا کە حکـومەتی خـانمی خاوەنشـکۆ باڵیۆزی عێراقی بانگ کردووە بۆ "دەربڕینی نـاڕەزایی تونـد لەسەر بەکارهێنانی ئاشـکرای چەکـی کیمیایی لە هەڵەبـجەدا، لە لایەن عێـراقەوە". سـەرنج بـدە مەملەکەتـی یەکگرتـوو (بەریتانیا، و) بە ڕوونی دەسنیشـانی نـاوی عێراقی کردووە، نەک ئێـران، وەک تاوانبـار، کەچـی بـاڵیۆزی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان داوای کـردووە "زانیـاریی پێشـتری بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی بـدرێتێ لە کەنـداودا، لەگەڵ وردەکاریی زیاتر لەسەر بەڵگەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن ئێرانەوە"[٣]. بە واتـایەکی تـر، بروسـکەکە ئامـاژە بە بەڵـگە دژوار و پێچەوانەکـانی نێـوان تێکەوڵـێکەی تۆمەتبـارکردنی نێـودەوڵەتیی دژ بە عێـراق و جەختکردنـی

واشنتۆن دەکات، کەوا ئێرانیش دەبێت سەرزەنشت بکرێت و بۆ ئەو مەبەستەش ڕوونکردنەوەیەک ئامادە کرا.

لە کاردانەوەی ئەوەدا، وەزارەتی دەرەوە ئەم ڕاگەیاندنە ناوخۆییەی خوارەوەی دەرکرد و ئەوەی کە ئیشارەتی پێ کرابوو بە "بنەماکانی سیاسەتی ئێمە" سەبارەت بە هەڵەبجە، دەبێت وەک ڕێنمایی لە لایەن دیپلۆماتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە بە کار بێت:

((• هەر دوو ئێران و عێراق بەشداریی پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی قەدەغەکردنی شەڕی کیمیایین.

• ئێمە عێراقمان ئیدانە کردووە لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژ بە دانیشتوانی مەدەنیی هەڵەبجە.

• ئێمە باوەڕمان وایە کە هەر دوو لا، ئێران و عێراق، چەکی کیمیاییان بە کار هێناوە لە شەڕی دەوروپشتی هەڵەبجەدا.

• بەکارهێنانی چەکی کیمایی دژ بە دانیشتوانی مەدەنی، بە تایبەتی پێشێلکردنێکی مەترسیداری پرۆتۆکۆڵی جنێڤە.

• ئەم ڕووداوە زیاتر هانی جێبەجێکردنی بڕیاری (٥٩٨) دەدات.

• FYI: "بەڵگەی بەکارهێنانی ئێران جێی قەناعەتە، بەڵام ئێمە ئێستا لە بارێکی وادا نین بە ئاشکرا گفتوگۆ لەسەر ئەو بەڵگەیە بکەین"[٤])).

لەو "خاڵانەی قسەیان لەسەر کراوە" کە هەفتەیەک لەوەودوا بەسەر باڵوێزخانەکانیدا لە هەموو وڵاتاندا دابەشی کرد، وەزارەتی دەرەوە، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە "ویلایەتە یەکگرتووەکان باوەڕی وایە هەر دوو لا، عێراق و ئێران چەکی کیمیاییان بە کار هێناوە لە شەڕی دەوروبەری

هەڵەبجەدا (بۆ تەنها بەکارهێنان، ئەگەر پێویست بوو بۆ زانیاریی زیاتر، لە کاتێکدا کە ئێمە ئەنجامگیریی ئەوەمان کردووە کە ئێران بە کاری هێناوە، ئێمە ناتوانین ئەو زانیارییانەی کە ئەنجامگیرییەکەمان لەسەر بونیاد ناوە، بخەینە بەر باس و گفتوگۆ)"[٥].

هەر چەندە ویلایەتە یەکگرتووەکان، وەک حکومەتەکانی تر، بە عادەت نکووڵیی لە ئاشکراکردنی زانیاریی هەواڵگری دەکات بۆ پاراستنی سەرچاوە و میتۆدەکانی بەڕێوەچوونی کاروباری هەواڵگری، بەڵام بڕیارەکەی بە دەرکردنی تۆمەتبارکردنێکی گشتی، بێ هیچ سەلماندنێک، کارێکی سەرسامکەر بوو. هەر چۆنێک بێت، ستراتیجەکە بەری گرت و دیپلۆماتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان خێرا توانییان ڕاپۆرتی خۆیان لە بارەی هەڵوێستی تازەوە بدەنە حکومەتە هاوپەیمانەکان. پورتوگاڵ، بۆ نموونە، پشتگیریی کۆششێکی کۆمەڵی ئەورووپیی کرد لە لای سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ ئیدانەکردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە جەنگدا. کاربەدەستانی پورتوگاڵ مەسەلەکەیان داوەتە باڵوێزخانەی ئەمەریکا "کە سوورە لەسەر ئەوەی کەوا ڕاگەیاندنەکەی کۆمەڵی ئەورووپی تاقە یەک وڵاتی دیاریکراوی جیا نەکردووەتەوە و هەر دوو لای وەک یەک تەماشا کردووە"[٦].

هەروەها دیبلۆماسیەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان شێوازی کارکردنی ئەنجوومەنی ئاسایشی لەسەر هەڵەبجە لە چوارچێوە گرتووە. جۆرج شوولزی وەزیری دەرەوە، لە باسکردنی ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەیانێکی سەرۆکایەتیی پێ باشترە بۆ تۆمارکردنی ناڕەزایی خۆی

لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمایی و لەم ڕووەوە باس دەکات کە:

"ئەگەر پشتگیرییەکی بەربڵاو هەبوایە لە ناو ئەندامانی ئەنجوومەندا بۆ بڕیارێک، ئەوە لەو بڕوایەدا بووین کە لە بەرژەوەندیمانە لەگەڵیدا بڕۆین. ئێمە دەمانەوێت ڕوون بین لە تۆماری ئەم مەسەلەیەدا، بۆیە پێویست ناکات بچینە بەردەم ئەندامانی تری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەگەر بەرهەڵستییەکی بەربڵاو هەبێت لە بەرانبەر بڕیارێکدا. ئەوانی تر ڕەنگە لە هەر هەوڵێکی ئەمەریکا بگەن بۆ ڕاگرتنی بڕیارێک لە ئەنجامی نەبوونی بەڵگەی تەواو لەسەر قەناعەتهێنان بە مەسەلەی چەکی کیمیایی یان هەوڵدان بۆ پاراستنی عێراق. بەم جۆرە پەیامی ئەمەریکا (بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان) دەبێت بە کارکردن هەوڵ بدات بۆ پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە لێکدانەوەی لەم چەشنە، جێی باوەڕ و متمانە نییە".

پاشان شوولز دێتە سەر خاڵی بنەڕەتیی مەسەلەکە و دەڵێت: "ئێمە پێشتر ئەنجامگیریی خۆمان ڕوون کردووەتەوە کە ئێران شانبەشانی عێراق چەکی کیمیایی لە ڕووداوی هەڵەبجەدا بە کار هێناوە (ئاوها). ئەوە هەڵسەنگاندنی ئێمەیە کە هەر دوو لا پێشتر چەکی کیمیاییان بە کار هێناوە لە کاتی جەنگدا و هەر دوو لا توانای ئەوەیان هەیە دەست بدەنە هەمان هێرش لە داهاتوودا. بەوپێیە باوەڕمان وایە کە هەر بڕیار یان ڕاگەیاندنێک، دەبێت ناوی هەر دوو ئێران و عێراق بێنێت بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی"[(٧)].

بەم ڕەنگە، هەوڵ و کۆششی بێپەڕوای دیپلۆماتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان جێی پێزانینە بۆ بڕیاری ٦١٢ (لە

٩ی مایسدا) کەوا ئیدانەی "بەکارهێنانی بەردەوامی چەکی کیمیایی" دەکات و هانی "هەر دوو لا دەدات بۆ ئەوەی لە داهاتوودا واز لەو کارە بێنن". لە ڕاگەیاندنێکی گشتیی جیاوازدا، بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە: "ئێمە بێ سڵکردنەوە، بەکارهێنانی نایاسایی چەکی کیمیایی گوناهبار دەکەین لە لایەن هەر دوو لاوە، لە شەڕ و ناکۆکی کەنداودا". ئەمە دەمچەورکردنێک بوو بۆ عێراقییەکان، بە نیازی نەرمکردنی سەرزەنشتی واشنتۆن کە دوای "بە شێوەیەکی تایبەتی" لە ڕاگەیاندنەکەدا ئەم بڕگەیە دێت: "بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژ بە خەڵکی بێچەک و بێدیفاع، دەسدرێژییەکی سامناکە دژ بە شارستانیەت و مرۆڤایەتی". چونکە هەر دوو ئیدارە و ڕژێمی عێراق، دەیانزانی کێ ئەم دەسدرێژییەی کردووە و (واشنتۆن هەرگیز نکووڵیی لەوە نەکرد کە عێراق گازی لە هەڵەبجەدا بە کار هێناوە) و عێراق لەوە تێگەیشتبوو ئاگادار بێت کەوا گازبارانی خەڵکی مەدەنی، مانای خەتی سووری دەگەیاند. بەڵام کاریگەریی گشتگیریی بەیانەکە، جەختکردنەوە بوو لەسەر داشکاندن بەلای عێراقدا، بە بیرهێنانەوەی ئەوەی کە "سامناکیی بەکارهێنانی نایاسایی ئێستای چەکی کیمیایی، تەئکیدکردنی پێویستی زۆری بەجێهێنانی چارەسەرێکی دانوستان لەسەرکراوی جەنگی کەنداوە بە زووترین کات، لە ڕێگەی جێبەجێکردنی تەواوەتیی بڕیاری ٥٩٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە" ـــ ئەو بڕیارەی ئاگربەست کە عێراق قبووڵی کرد و ئێران ڕەتی کردەوە[٨].

وەک دواتر دیپلۆماتێکی ئەمەریکی نووسیویەتی، ئەمە یەکەم جار بوو کە ئەنجوومەن کاردانەوەی هەبێت بۆ

بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی عێراقـی، بە بڕیارێـک نەک بە ڕاگەیانـدنێکی سـەرۆکایەتی، "بەڵام تێکسـتەکە نە ئەو هێـز و گوڕەی هەبوو نە ناڕەزاییەکی ئەوتۆیشی پێوە دیار بوو"[٩٠].

بەڵکـو لانیکەمـی پێویسـتیی ئەخلاقـی و لایەنە زۆرەکەی ئەگەری سیاسیی تێدا بوو و دوور بوو لەوەی کە توانایەکی وای هەبێـت لە داهـاتوودا ڕێـگەی بەکارهێنـان لە عێـراق بگرێت.

بە هـۆی دروسـتبوونی کێشـەی دیبلۆماسـییەوە، تۆمەتبارکردنی ئێران، کە بۆ یەکەم جار لە ٢٣ی مارتدا لە لایەن قسەکەری فەرمیی وەزارەتی دەرەوە بڵاو کرایەوە، بۆ ماوەی دوو مانگێک عێراقی سەندەوە، بێ ئەوەی باری گران بکرێت بە گوناهبارکردنی دەستەجەمعی لەسەر شێوازەکانی شـەڕ و بەکارهێنـانی چەک و وا ئێسـتا دەتوانێـت دەم لە گەمەی کۆتـایی جەنگ بکوتێت. بەمپێیە لەم بـارە سـەختەدا، عێراق دەستی دایە زنجیرەیەک هێرشی پێچەوانە لە بەرەی باشـووردا، لەژێـر نـاوی نهێنیـی (توکلنـا علـی اللـه)، بەڵام شـتێکی ئەوتـۆی بە دەسـت نەهێنـا و بەرەو مـایەپووچیی دەڕۆیشـت. هەروەهـا کەمپێنـی دژەیـاخیبوونی ئەنفـالی بەرفراوان کرد، لە دۆڵی جافەتییەوە بەرەو دێهاتی بەربڵاوی کوردنشین و لە ماوەی شەش مانگدا هەمووی تەواو کرد. چەند فاکتەرێکی کەم، بوون بە هۆی ئەم دوو سەرکەوتنە سەرسامکەرەی عێراق، وەک کـاریگەریی نـاڕەزایی هێرشـی کیمیـایی هەڵەبـجە و تـا ڕادەیەک بێـدەنگیی کـۆمەڵی نێودەوڵەتی لە گەرماوگەرمی دوای ڕووداوەکاندا.

## گازی ژەهراوی وەک بەشێکی تەواوکەری ئەنفال

ئەگەرچی ئەنفال سێ هەفتە پێش هێرشی هەڵەبجە دەستی پێ کرد، بەڵام یەکەم سەرکەوتنی لە سێ ڕۆژی دواتردا دەرکەوت وەک دەرەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو گازبارانە و تەواوی ورەی پێشمەرگەی ڕووخاند. کۆسرەت ڕەسوڵ عەلیی سەرکردەی (ی ن ک)، کە لە مارتی ١٩٨٨ لە جافەتی بوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەڵێت "هەڵەبجە کاری کردە سەر حاڵەتی بەرگریمان و ئێمە لە هەڵەبجە، لە ڕووی سەربازییەوە شکستمان نەهێنا، چونکە ژمارەیەکی زۆر کەمی پێشمەرگەمان کوژران، کەوا گەلێکیان تەنانەت لە ناوشار یان کۆمەڵگەکانی نیشتەجێی نزیکدا نەبوون. بەڵام ئێمە نەماندەویست ببینە هۆی زیانی گیانیی زیاتر، بە تایبەتی لە ناو ڕیزی مەدەنییەکاندا. لەبەر ئەوە بڕیارمان دا پاشەکشە بکەین و خەڵکی شار دەرباز بکەین". وەک ئەو بۆی دەچوو، بگرە هەڵەبجە کاریگەرییەکی گەورەتری هەبوو: "چونکە ڕاستیی ڕژێمی سەدام حسێنی بە وردی دەرخست، کە سیاسەتێکی نوێی لەناوبردنی خەڵکی کوردی پەیڕەو دەکرد".

لە ئەنجامی ڕاوەدوونانیان لە شوێنە سەختە مەحکەمەکانی چیاکانی جافەتی لە لایەن هێزی زەمینیی عێراقەوە، پێشمەرگەی ورەڕووخاو و گوندنشینانی ژێر

دەسەڵاتیان، بەرەو ئێران هەڵاتن و زۆرێکیان لە بارودۆخی زستانی سەختدا لەو شاخە بەرزانە گیانیان لە دەست دا. لە ١٩ی مارتدا ڕادیۆی عێراق، بە خۆشیدەربڕینەوە کەوتن و تێکشکانی بارەگای سەرکردایەتیی (ی ن ک)ی ڕاگەیاند لە "ئۆپەراسیۆنی ئەنفالدا" کە بە دوای "شەڕێکی قارەمانانە و تۆڵەسێن لەگەڵ خیانەتکاراندا هات"[١٠]. سەردێڕی ڕۆژنامەکانی بەغداش بەم جۆرە بوو: "ئۆپەراسیۆنی ئەنفال تاجی سەرکەوتنی گەورەی عێراقی کردە سەر چیاکانمان"[١١]. یاداشتێکی پۆلیسی نهێنی دواتر ڕاپۆرتی ئەوەی دابوو کە (ی ن ک) شەشسەد جەنگاوەری لە جافەتی و هەڵەبجە لە دەست داوە و دەنگۆی ئەوە بڵاو بووەوە کە ڕژێم پلانی ڕووخاندنی سلێمانی دادەنێت و نیازی وایە بە چەکی کیمیایی پەلاماری بدات[١٢].

بەم جۆرە ترس و سامێکی لە ڕادەبەدەر بەرپابوو لە هێرشی زیاتری گاز، کەوا بزووتنەوەی دە ساڵەی گەریلا، کە ڕۆژگارێک کۆنترۆڵی زۆربەی دێهاتی کردبوو بۆ ماوەی سێ ساڵ، لەناکاو تووشی هەرەس بوو. هەڵسەنگاندنێکی هەواڵگریی سەربازیی عێراق لەو ماوەیەدا دەگاتە ئەنجامی ئەوەی کە "لێدانی بنکە و بارەگای سەرکردایەتیی تێکدەران و ئەو شوێنانەی کە تێیدا کۆ دەبنەوە، لە ڕێگەی بەکارهێنانی چەکی تایبەتەوە، بووەتە هۆی کوژران و برینداربوونی زۆرێکیان و بە جارێک تۆقاندوونی و ورەی ڕووخاندوون و گەلێکیانی ناچار کردووە بگەڕێنەوە ڕیزی نیشتمان" (ئەمە تێرمێکی فریودەرانەی ڕژێم بوو، بۆ "خۆبەدەستەوەدان")[١٣].

فرەی نەبرد کارەکە لقوپۆپی زۆری لێ بووەوە و ئاشکرا بـوو. ڕژێـم درکـی بە سـوودی دەروونیـی کـارەکە کـرد و کەوتە فشـارهێنان بەرەو سـەرکەوتنی تەواو. لە ٢ی نیسـاندا سـوپا جـاڕی کۆتـایی "ئۆپەراسـیۆنی ئەنفـالی دووەمـی" دا لە قەرەداغی باشـووری سلێمانیدا[١٤]. بە دوایـدا شـەش قۆنـاغی تری ئەنفال هـات و تەواوی دێهـاتی کوردسـتانی گرتەوە، کە هەر شــــوێنە و نــــاوچەیەکی جــــوگرافیی تــــایبەت و سەرکردایەتییەکی پێشمەرگەی تایبەت بە خۆی هەبوو. ئەمە خـاڵی یەکـلاکەرەوە بـوو و لە یەکەم ڕۆژی هەر قۆنـاغێکی ئەنفالـدا، سـوپای عێـراق بە گـاز تۆپبـارانی دەکـرد یـان لە فـڕۆکەوە بـۆمبی گـازی ژەهراویـی دەخسـتە خـوارەوە و بە عــادەت بەســەر یەک دوو کــۆمەڵە گونــددا، کە بــنکەی پێشمەرگەیان تێدا بوو. هێزە زەمینییەکانی عێراق و جاشـە کــوردە هاوپەیمانەکانیــان دەبــوو ناوبەنــاو نــاوچە دەسنیشانکراوەکان ئابڵووقە بدەن و گوندنشینان بتۆقێنن بۆ ئەوەی خـۆ بهـاونە باوەشـیان و خـۆ بە دەسـتەوە بـدەن و ئەوانیش بە ترس و نائومێدییەوە چ ماڵێکیان بە عەرەبانەی تراکتۆرەکانیـان بـۆ دەربکـرایە، لەگەڵ خۆیـان دەیـانبرد. ئەم شێوازە مامەڵەیە پەیڕەوی کرا لە: ئەنفالی دووەم لە قەرەداغ (کۆتایی مارت)، ئەنفالی سێیەم و چوارەم لە دەشـتی بەرینـی گەرمیـان لە ڕۆژهەڵاتـی کەرکـووکەوە (نیسـان و مـایس)، ئەنفالی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم بە دوای یەکدا لە دۆڵی سـماقووڵی (کۆتـایی مـایس)، دۆڵـی بالیسـان و ئاکۆیـان (حوزەیران و تەمووز)، ناوچەی چیای قەندیل (ئاب)، ئەنفـالی کۆتـایی (خاتمـة الأنفـال) لە بادینـان، لە سـنووری تورکیـا و نــاوچەی ژێــر دەســەڵاتی (پ د ک) (دوادوایــی ئــاب و

سـەرەتای ئەیلـوول). لە هەمـوو قۆناغەکـانی بەکارهێنـانی تەکتیکی گازدا، بە زۆری پێشمەرگەی دەکردە ئامانج، بەڵام بە شـێوەیەکی سـەرەکی خەڵکـی مەدەنیـی دەکوشـت و برینداری دەکرد و دەبووە هۆی ترس و تۆقینێکی بێئامـان بۆ خەڵکەکە و دەرپەڕاندنیان لە گوندەکان لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا و لە هەندێک کاتدا لە چەند سـەعاتێکدا ئەو گوندنشـینانەی چەنـدین سـاڵ بەرگەی پەلامـاری تـۆپ و بۆردمانیان گرتبوو، لە ماڵ دەردەپەڕین و هەڵدەهاتن.

فایەق گوڵپی، دکتۆری پێشمەرگە لە چیاکانی قەرەداغ، کە لە ١٦ی مارتدا فڕۆکەی دەبینی بە ڕاسەرەوە تیژ تێدەپەڕین بۆ بۆردمـانی هەڵەبـجە، لەگەڵ تـاقمێکی پێشـمەرگەدا بـوو کە ڕاستەوخۆ چوار قۆناغی ئەنفالیان تاقی کردبووەوە، (چونکە ئەمان بە پێچەوانەی زۆرێک لە گوندنشـینە بێبەختەکانەوە)، بەختیان دەیهێنا هەموو جار لە داوی سوپا دەرباز دەبوون، بەڵام بۆ هەر شوێنێک هەڵدەهاتن ئەو شوێنە "ئەنفال دەکرا". گـوڵپی (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٢دا) دەگێـڕێتەوە کەوا لە ٢٢ی مارتـدا لە بەلەگجـاڕ بـوو (کە گونـدێکی نـاوچەی قەرەداغە و مانگێک لەوەوپێش بەر پەلاماری گـازی خەردەل کەوتبـوو)، کاتێـک گـوێی لە دەنگـی تەقینەوە بـوو تەماشـای دەرەوەی کـــرد، ڕوانیـــی هەوری دووکەڵ بەســـەر سێوسـێنانەوەیە، کە گونـدێکی نزیکـی ئەو نـاوە و بـنکەی ناوچەیی (ی ن ک)ی تێدا بوو:

"یەکەم قوربـانی جووتیارێـک بـوو بە نـاوی کەمـال، دوای سەعاتێک گەیشتە ئێمە و بیلبیلەی چاوی تەسک بووبووەوە و نیمچەکوێر بووبـوو، بە ئاسـتەم هەناسـەی بۆ دەدرا. بیـرمە مـن گـوتم 'ئەمە دەبێـت دەمارەگـاز بێـت'، چـونکە گـازی

خەردەل چاو بچووک ناکاتەوە. پاشان ئەترۆپینم دایە و شۆردم. ئێمە خەڵکمان ئاگادار کردبووەوە کە ڕەنگە عێراق هێرشی کیمیایی بکات و بۆ ئەم مەبەستەش بۆ گوندە گەورەکان نامیلکەی خۆپاراستنمان لە ماددەی کیمیایی بڵاو کردبووەوە. ئەوانەی خوێندەوارییی باشیان نەبوو، ئەم زانیارییانەیان بە تەواوی وەرنەگرتبوو. من چەندین حاڵەت ئاگادارم کەوا گەلێک خێزان تێداچوون، بەڵام ئەم پیاوە ڕزگاری بوو، چونکە ئەوەی خوێندبووەوە کە چۆن خۆی بپارێزێت. ئەو شەوە و ڕۆژی دواتر ئێمە نزیکەی سێسەد برینداری کیمیاییمان پێ گەیشت لە حاڵەتی کلینیکیی جیاجیادا. هەر هەموو ئەمانە چاک بوونەوە و خۆشبەختانە ئەو دەمە دوو هەزار ئەمپوولی ئەترۆپینمان پێ گەیشتبوو. لە سێوسێنان نزیکەی حەفتا کەس بە کیمیایی مردن و زۆریان ژن و منداڵ بوون".

دواتر ئیستیخباراتی سەربازیی عێراق لە ڕاپۆرتێکی وەرزیدا لەسەر چالاکیی "تێکدەر" لە مانگی مارتدا باس لەوە دەکات کە "فڕۆکە جەنگییەکانمان بنکە و بارەگای تاقمەکانی تێکدەریان بۆردمان کرد لە گوندی سەیوان (ئاوها) و بەلەگجار بە لێدانێکی کیمیایی. لە ئەنجامدا پەنجا تێکدەر کوژران و بیستی دیکەش بریندار بوون"[(١٥)]. گوندنشینەکان لە هەواڵی گازبارانکردن بە جارێک تۆقین و بە بیستنی ئەوەی کەوا پێش کەمتر لە هەفتەیەک لە هەڵەبجە چی ڕووی دابوو، هەر هەموو لە قەرەداغ هەڵاتن. گوڵپی دەیگوت دوای ماوەیەکی کورت هێزەکانی عێراق کەوتنە ئەنفالکردن و لە هەموو لایەکەوە پێشڕەوییان کرد[(١٦)]. گوڵپی و هاوڕێکانی بەرەو ڕۆژئاوا بۆ گەرمیان هەڵاتن و

نەخۆشــخانەیەکی مەیــدانییان لە باشــووری شــارۆچکەی ڕووخــاوی ســەنگاوەوە دامەزرانــد. بەڵام بــۆ بەدبەختیــی ئەمــان، ئەنفــال لە ســێیەم قۆناغیــدا دە ڕۆژ دواتــر گەیشــتە ئەویَ و ناچاری کردن بڕۆن. گوڵپی ئاگای لە هیچ هێرشێکی کیمیــایی نەبــوو لەم بەشــەی گەرمیانــدا. بەڵام گەلێــک شــایەتحاڵ لە یەکەم ڕۆژی ئەنفــالی ســێیەمدا، پەلامــارێکی کیمیاییــان بینیــوە و فڕۆکەکــانی عێراق گونــدی تازەشــاریان بۆردومــان کــردووە، کە ســەنگەرێکی پتەوی (ی ن ک) بــوو، نزیــک بەو ڕێــگەیەی لە توزخورمــاتووەوە دەچــوو بــۆ قادرکەرەم. لێرە بەرگریکارانی پێشمەرگە شانبەشانی ئاژەڵ و گاوگۆتــــــاڵ و باڵنــــــدە وەک یەک تێــــــداچوون[١٧].

کاریگەرییەکەشــی هەمــان شــت بــووە، تــرس و تــۆقین و هەڵاتن. گوڵپی و هاوڕێکانی لە بەردەمی هێزەکانی عێراقەوە لە شارێی سلێمانی ـ کەرکووک پەڕیونەتەوە و لە باکووری ناوچەی ئاغجەلەرەوە و لە ئاوی زێی خواروویان داوە و لە قزڵوو وەستاونەتەوە، کە گوندێکە لەسەر ڕۆخی رووبارەکە و دەگێڕێتەوە کەوا: "لە ٣ی مایسدا لە قزڵوو بووم کاتێک لە درەنگــانێکی دواینیــوەڕۆدا چــوار فــڕۆکە هــاتن و کەوتــنە بۆردومــانکردن و بەوپێــیەی دەنــگەکەی نــزم بــوو، گومــانی هێرشی کیمیاییم لێ کرد. نیو ســەعات دوای ئەوە هەواڵمان بــۆ هــات کە لە گونــدەکانی گــۆپتەپە و عەســکەری داوە، لەوبەری زێوە و زۆری لێ کوشــتوون. یەک لە بریندارەکان بە بەلەم لە ڕووبــــارەکە پەڕیــــیەوە، بەڵام عێراقییەکــــان دەرگاکانی بەنداوی دوکانیان کردبووەوە و ئاستی ئاوەکە بەرز بووبووەوە و مەحاڵ بوو خەڵکەکە لە ڕووبارەکە بدەن و بپەڕنەوە، چونکە ئاوەکە بە شێوەیەکی نائاسایی بەرز

بووبـووەوە و خێرایـی زیـادی کردبـوو. بە هەرحـاڵ، مـن ئەتـرۆپینم پـێ نەمـابوو. بـۆ بەیـانیی ڕۆژی دواتـر ئەنفـالی چـوارەم دەسـتی پـێ کـرد و سـوپا پـاش چەنـد سـەعاتێک گەیشـتە گـۆپتەپە. لێـرە بە لایـکەمەکەی ١٥٨ و ئەگەری ئەوەش هەیە سێسـەد گوندنشـین لە گـۆپتەپە و عەسـکەردا کـوژرابێتن و پێـدەچێت ڕاسـتەوخۆترین هێرشـی کیمیـایی کوشندە بێت لە تەواوی شاڵاوی ئەنفالدا[١٨].

گـوڵپی و پێشـمەرگەکانی هـاوەڵی، دیسـانەوە ڕایـانکرد و ئەم جارەیـان یەکڕاسـت بـۆ دۆڵـی سـماقووڵی (کە هەولێـر و شـەقڵاوە بە دوکـانەوە دەبەسـتێت). لێـرە لە گونـدی خەتـێ، ئەنفالی پێنجەمیان پێ گەیشت، کە بە پەلامـارێکی دەمارەگـاز بـۆ سـەر گونـدەکانی وەرێ، وەرتـێ، نـازەنین و گـوڵان لە ناوەڕاسـتی مایسـدا دەسـتی پێ کـرد. ئەم جارەشـیان تـاقمە پێشـمەرگەکە و گـوڵپی ناچـاری هەڵاتـن بـوونەوە بەرەو قەنـدیل، کە شـاخێکی سـەر سـنووری ئێـرانە و هێرشـی کیمیـایی و ئەنفـالی شەشـەم و حەوتەم بە دۆڵ و چیاکانـدا شوێنیان کەوتن تا مانگی ئاب و لە دواجاردا یـاخیبوونی (ی ن ک) شکسـتی هێنـا و جەنگـاوەرانی بڵاوەیـان لـێ کـرد و ئاوارەبوونی ئێران بوو بە دوا مەنزڵیان[١٩]. ئەم جارەیان دوا ئامـانجی سـەربازیی نـاوچەی بادینـانی ژێـر دەسـەڵاتی (پ د ک) بـوو. پاشـان بەرەو ئەوێ فشـاری بـرد، پـاش ئەوەی لە ئـاخروئۆخریی ئابـدا جەنـگ تەواو بـوو، بە بۆردمـانی گوندەکان بە چەکی کیمیایی، پێش ئەوەی کوردە تۆقیوەکان ڕاپـێچ بکـات، ئەوانەی کە نەیـانتوانیبوو بـگەنە سـنووری تورکیا.

لە پێشهاتێکی نامۆ و چاوەڕواننەکراودا، هێزی ئاسمانیی عێـــراق لە مـــانگی ئابـــدا بە هەڵە جەنگـــاوەرە ئێـــرانییە هاوپەیمانەکانی کۆمەڵەی گازباران کردبوو، کە گرووپێکی یاخیبووی کورد بوون و بنکەیان لە گوندی بۆتیی دۆڵی ئاکۆیان بوو. نەجمەدین فەقێ، کە کوردێکی عێراق و لەگەڵ ئەم یاخیبووە ئێرانییانەدا بووە و لە گوندی گولانی ئەوە نزیکانەوە ئەم هێرشەی بینیبوو، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٦دا) باس لەوە دەکـــات کە بیســـتودوو جەنگـــاوەری کۆمەڵە کوژران و زۆرێکی تریش بریندار بوون. دواتر کۆمەڵە سکاڵای لای دۆستەکانی بەغدا کرد و عێراقییەکانیش پێیـــان لە هەڵەی خۆیـــان نـــا، وەک فەقـــێ دەڵێـــت، بەڵام سەرکردایەتیی کۆمەڵە هەرگیز بە ئاشکرا ڕووداوەکەی باس نەکرد.

لە پاش دەستپێکردنی هێرشە کیمیاییەکاندا، شێوازەکە هەمـــان شـــت بـــوو بـــۆ هەر قۆنـــاغێکی ئەنفـــال: هەڵاتنـــی گوندنشینەکان و گەیشتنیان بۆ سەر ڕێگەی قیر و پاشان ڕاپێچکردنیان لە لایەن هێزەکانی عێراق و میلیشیای کوردی سەر بە ڕژێمەوە و ڕاگیرکردنیان لە سەنتەری کاتیدا و دواجاریش بە ئۆتۆمبیلی بارهەڵگر ڕەوانەی سەربازگەی سوپای میللی دەکران لە نزیک کەرکووکەوە. لێرە نێرینەی تەمەن پازدە تا شەست ساڵ لە خێزانەکانیان جیا دەکرانەوە و ڕاپێچی شوێنەکانی ئیعدام دەکران لە ڕۆژئاوای عێراق و لەوێ دەکوژران و لە گۆڕی بەکۆمەڵدا دادەپۆشران. زۆرێک لە پیرەمێرد و پیرەژنەکانیش ڕەوانەی نوگرە سەلمان کران، کە بەندیخانەیەکی بەدناوە لە بیابانی ڕۆژئاوای سەماوە لە باشووری عێراق. ئەوانەی کە لەوپەڕی سەختیی بەندیخانە

ڕزگاریان بوو (کەمیی خۆراک، نەبوونی چاودێریی پزیشکی، گەرما و سەرمای زۆر) لە لێبووردنەکەی ٦ی ئەیلوولدا بەربوون و ئەمە بوو بە کۆتایی ئەنفال. پاشان ئەمانە نێردران بۆ کۆمەڵگەکانی نیشتەجێبوون.

چارەنووسی ژن و منداڵ بە شوێنی نیشتەجێبوونیانەوە بەند بوو. ئەگەر ئەوان خەڵکی ناوچەکانی ئەنفالی ٢، ٥، ٦ یان ٧ بوونایە، ئەوا دەیاننناردن بۆ بنکەیەکی سەربازی لە دبس لە باکووری کەرکووکەوە و لە لێبوردنەکەدا بەربوون و لە کەمپەکاندا نیشتەجێ کران. ئەگەریش لە ناوچەی ئەنفالی ٨ بوونایە، ئەوا لە کەمپە بەندیخانەی سەلامییەی نزیک موسڵ بەند دەکران و دەربازبوانیان لە لێبوردنەکەدا بەردران. ئەگەر خەڵکی گەرمیانیش بوونایە (ئەنفالی ٣ و ٤)، ئەوا لە زۆربەی حاڵەتەکاندا وەک پیاوان مامەڵە دەکران و ڕاپێچی شوێنەکانی ئیعدام دەکران بۆ کۆمەڵکوژی. ئەوانی ناوچەی ئەنفالی ٢ کە بەرەو گەرمیان هەڵاتن و لە ماوەی ئەنفالی ٣دا پاکۆ دران و ئەمانیشیان ڕەوانەی مردن کرد. پێدەچێت نزیکەی هەشتا هەزار کورد، کە زۆربەی زۆریان خەڵکی مەدەنی بوون، کوژرابێتن و تەنها شەش پیاو و مێرمنداڵێک بە موعجیزە ڕزگار بوون و گەڕانەوە بۆ گێڕانەوەی چیرۆک و بەسەرهاتیان[٢٠].

فەریق ڕوکن وەفیق سامەڕایی، جێگری بەڕێوەبەری هەواڵگریی سەربازیی عێراق بوو (ئیستیخبارات)، لە ساڵی ١٩٨٨دا، کە چاودێری و سەرپەرشتیی جەنگ لەگەڵ ئێران و شاڵاوی دژ بە کوردەکانی کردووە. (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ١٩٩٧دا) حاشای لە تێوەگلانی ئەنفالدا کرد بە شێوەیەکی شەخسی و ئەمە جەختکردنێک بوو کە سیفەتێکی

ساویلکەیی سەیری بە پیشەکەی دەدا. وەک خۆی دەیگوت ئەو دوو هێڵی لە بەرپرسیارێتی هەبوو، یەکەمیان لە بەردەم بەڕێوەبەری ئیستیخباراتی سەربازیدا کە سابیر ئەلدوری بوو، ئەوی تریش ڕاستەوخۆ لە بەردەم سەدام حسێندا، کە متمانەی تەواوی پێی هەبوو و بەلای کەمەوە ڕۆژی جارێک دەیبینی. سامەڕایی لە کاتێکدا کە نکوولیی لە هەر ڕۆڵێک دەکات کە لە ئەنفالدا بینیبێتی و حەزی دەکرد هۆکاری ئەنفال و دەرەنجامەکانی ڕوون بکاتەوە، تا ڕادەیەک لەبەر ئەوەی دۆستایەتیی لەگەڵ کوردەکان بووە و بەپێی قسەی سەرکردەکانی (ی ن ک)، لە سالانی هەشتاکاندا ئەم وریاکردنەوە و هۆشداریی بۆیان ناردووە. قسەکانی ئەم پیاوە بایەخدارن، بۆیە لێرەدا بە بەرفراوانی وەرگیراوە و نزیکیی لە هەر دوو ڕژێمی عێراق و ئەو ڕووداوانە، بە چاودێریی ئەم، پەردەیان لەسەر هەڵدرایەوە.

نیاز و مەبەستی سەدام حسێن لە ئەنفال سێ شت بوو، وەک سامەڕایی دەڵێت: "یەکەم، بڕیاری دابوو هەڕەشەی کورد کەم بکاتەوە، چونکە لە پێش مارتی ١٩٨٨دا پێگەی سەربازیی عێراق زۆر لاواز بوو و کورد سوپای ناچار کردبوو زۆر لە یەکەکانی بنێرێتە باکوور (لە کاتێکدا کە ئەوان لە بەرەی باشووردا پێویستیان پێیان بوو). دووەم، ویستی دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێتەوە. سێیەم، ئەو دەیویست زۆر بە توندی کوردەکان سزا بدات لەسەر خیانەتکردنیان و خولیای تۆڵەکردنەوەی کەوتبووە سەر، کاتێک بڕیاری کوشتنی هەموو کوردێکی دا لە ناوچە قەدەغەکراوەکاندا. بە هەرحاڵ، کوردەکان بەختیان هەیە،

لەبەر ئەوەی دەبوو سێ ملیۆنیان لێ بکوژرایە، چونکە ژیانی مرۆڤ لای سەدام حسێن هیچ مانایەکی نەبوو".

سەبارەت بە چارەنووسی ئەنفالەکان (کورد ئەم ناوەی لە قوربانییانی ئەنفال ناوە)، سامەڕایی دەڵێت: "ئێمە چەند یاداشتێکمان پێ گەیشت دەڵێن کەوا ئەوانە لە گۆڕی بەکۆمەڵدا نێژراون. سەرکردە کوردەکان لە دانوستانی ساڵی ۱۹۹۱دا پرسیاری چارەنووسی ئەوانیان لێ کردین (دوای ڕاپەڕینی پاش جەنگی کەنداو). ئێمە پێمان گوتن ئەوانە کەسیان لە بەغدا نین. پاشان سەدام حسێن فەرمانێکی دەرکرد بە "بەردانی هەموو زیندانییە کوردەکان"، بەڵام کەس دەرنەکەوت. دوای ئەوە زانیمان کە ئەوانە هەموو کوژراون. ئەوان لە عێراقدا نەمابوون و هەموو خرابوونە ژێر خاکەوە. سەدام حسێن و عەلی حەسەن ئەلمەجید دەیانگوت ئەوانە دەیان هەزار کەسن. کەس ژمارەی ڕاستەقینەی نەدەزانی، چونکە هەموو کەس لە ئەنفالدا کوژرابوو بە پیاو و ژن و منداڵەوە."

ئەگەر ئەوە موچڕکەیەکی تەواوت پێدا نەهێنێت، سامەڕایی کوشتنی هەڵبژاردەی ژن و منداڵت بۆ باس دەکات وەک بەشێکی تەواوکەری بەعەرەبکردنی کەرکووک لە لایەن ڕژێمەوە، چونکە ئەوانەی کوژراون لەو ناوچانەن کە نزیکی کەرکووکن، وەک ئەو دەڵێت، بە وردی کرابوونە ئامانج بۆ کەمکردنەوەی دانیشتوانی کەرکووک:

"تۆ دەتوانی نیو ملیۆن کورد لە هەولێر بکوژیت، بەڵام ئەوە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، چونکە هەولێر هەر بە کوردی دەمێنێتەوە. بەڵام کوشتنی پەنجا هەزار کورد لە کەرکووکدا، بۆ هەتاهەتایە کۆتایی بە کێشەی کورد دێنێت."

بە واتایەکی تر، ڕژێم لە ئەنفالدا بەعەرەبکردنی کەرکووکی کرد بە دەرەنجامێکی مەنتیقیی خۆی. ڕاستییەکەی نازانرێت چەند کورد لە ماوەی ئەنفالدا کوژران، بەڵام دەگونجێت خەملاندنێکی ژیرانەی بۆ بکرێت. پێشتر (ی ن ک) ئیدیعای ١٨٢ هەزار کوژراوی دەکرد، کە ژمارەیەکە دۆخێکی خەیاڵی لە ناو کوردەکاندا گریمانە دەکات، بەڵام پشت بە تێکڕا قەبارەی گوند دەبەستێ لە ساڵی ١٩٨٨دا و پەیوەندیی نییە بە بێسەروشوێنبوون یان کوشتنی ڕاستەقینەوە. هیومان ڕایتس وۆچ، بە پشتبەستن بە ڕووپێوییەکی ورد بەڵام ناتەواو، کە لە لایەن ڕێکخراوێکی مافی مرۆڤ لە سلێمانی و کۆمیتەی بەرگریکردن لە مافی قوربانییانی ئەنفالەوە ئەنجام درابوو، مەزەندەی کوشتنی بە "لایکەمەکەی پەنجا هەزار و ئەوپەڕی سەد هەزار کەس"[٢١] کردبوو. کۆمیتەکە تەنها شەستوسێ هەزار "بێسەروشوێنی تۆمار کردبوو، بەڵام ناوچەی بادینانی تێدا نەبوو (کە ناوچەی ئەنفالی هەشتەم بوو و بە حەوت یان هەشت هەزار مەزەندە دەکرا)[٢٢]. ئەم مەزەندەیەی کۆمیتەکە، کە لە حەفتا هەزار تێنەدەپەڕی و ساڵی ١٩٩٥ لە کوردستان چاپ و بڵاو کرایەوە، مشتومڕێکی زۆری بەرپا کرد و بەڕێوەبەرەکەی ناچار کرد وڵات بە جێ بێڵێت (چاوپێکەوتنی ساڵی ٢٠٠٦). وەک پەردەهەڵماڵینێک، خودی عەلی حەسەن ئەلمەجید خۆی، لە کاتی ئەو دانوستانەی بە دوای ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١دا هات، لەو ژمارەیەی قوربانییانی ئەنفال کە لە لایەن (ی ن ک)ەوە باس دەکرا، وەک دەڵێن هاواری لێ هەڵساوە و گوتوویەتی: "ئەوانە ژمارەیان لە سەد هەزار تێپەڕ ناکات!"[٢٣]

ڕژێمی عێراق نەیدەتوانی بە شێوەیەکی سیستماتیکی ئەم هەموو کوردە بکوژێت، ئەگەر لە پێگەیەکی وادا نەبوایە کە یەکەم جار توانیی لە گوندەکانیان دەریانپەڕێنێت و ئەم کارەیان بە تایبەت شکستی دەهێنا، لە هەوڵی بەردەوامی سوپا بۆ ملکەچکردنی دێهات، بە هۆی سەختیی ناوچەکە و بەرگریی توندی پێشمەرگەوە. لە ماوەی ئەنفالدا بەکارهێنانی تەکتیکی و ئینتیقائیی چەکی کیمیایی، لەسەر بنەمای کاریگەریی خۆپیشاندانی هەڵەبجە، فاکتەرێکی نەوعی بوو بۆ گۆڕینی هاوسەنگیی دێهات. ئەمە وای کرد کۆمەڵکوژیی سیستماتیکیی دەیان هەزار کوردی دێهات ئەنجام بدرێت، بە جۆرێک کە هیومان رایتس وۆچ و ئۆفیسی یاسایی وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە سەردەمی بەڕێوەبەریتیی کلینتۆندا، وایان دانا کەوا گەیشتبێتە ئاستی جینۆساید[٢٤]. کۆسرەتی (ی ن ک) دەڵێت: "فاکتەری کیمیایی یەکلاکەرەوە بوو. ئێمە پێمان وابوو کە شکست ناهێنین، بەلام ئەوان ویستیان دەرسمان دابدەن. پلانی ئێمە بەرگریکردن بوو لە خۆمان تا چەند بتوانین و کاتێک گەیشتینە ئەوسەری دەبوو بکشێینەوە."

## ئەنفال و موخابەراتی ئەمەریکی

ئایا جیهان، یان هەر هیچ نەبێت هەواڵگریی ویلایەتە یەککگرتووەکان بە ئەنفالیان دەزانی و ئاگایان لەوە هەبوو کە چی دەگوزەرێت لە پشت شاڵاوێکی دژەیاخیبوونەوە؟ وەڵامەکە بەڵێ و نەخێریشە. ڕاپۆرتەکانی میدیا باسیان لە هێرشی کیمیایی دەکرد لە ناوچە کوردییەکاندا، بە قەرەداغیشەوە. جەلال تاڵەبانی لە گەشتەکەی ئەورووپایدا، لە کۆبوونەوە و بۆنە گشتییەکاندا، ئاماژەی بە پەلاماری گاز دەکرد. دیپلۆماتە ئێرانییەکان ڕاپۆرتیان لە بارەی لێدانی کیمیایی عێراقەوە دەدا لە پەیوەندیی گرژ و تووڕەیان لەگەڵ نەتەوە یەککگرتووەکاندا. سوپای عێراق بە ئاشکرا باسی لە پێشکەوتنی خۆی دەکرد لە ئۆپەراسیۆنی ئەنفالدا و لە مەسەلەی بەکارهێنانی گازی ژەهراویدا بێدەنگیی لێ کردبوو. ڕاستیی تاڵ ئەوە بوو کە باس و ڕاپۆرتی زۆر کەم دەردەکەوتن لە بارەی ئەنفال و لێدانی کیمیاییەوە لەو کاتەی کوردستاندا و بە دڵنیاییشەوە لە چاودێرانی سەربەخۆوە نەبوو، کە ئاسان نەبوو بگەنە ئەو شوێنانە. لەوەش خراپتر ناوی ئەنفال هەرگیز بە ئاشکرا نەچووە فەرهەنگی ئەو کاربەدەستانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانەوە، کە چاودێریی عێراق و جەنگیان دەکرد.

سیازده ساڵ دواتر، دیڤید نیوتنی باڵوێزی ئەمەریکا لە بەغدا، ساڵی ١٩٨٨، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) دەڵێت کەوا وشەی ئەنفال لەو کاتەدا هیچ مانایەکی لای ئەم نەبووە و ئەگەریش هەیبووبێت "هیچ کاریگەرییەکی بە جێ نەهێشتووە". دەرکەوت کە نیوتن ئەنفالی بیستووە و ڕوونیش بووەوە کە هیچ کاریگەرییەکی لا بە جێ نەهێشتووە. بەپێی مەحزەر و تێبینیی کۆبوونەوەیەک، لە نیسانی ١٩٨٨دا نوێنەرێکی حدکا لە بەغدا سەردانی باڵوێزخانەی ئەمەریکای کردووە و بۆ نیوتنی گێڕاوەتەوە کە "شاڵاوی ئێستای عێراق (ئەنفال ــ ١) و (ئەنفال ــ ٢) دژ بە کوردی (ی ن ک) بەڕێوە دەچێت لە ڕۆژهەڵات و باشووری سلێمانیدا"[(٢٥)].

بە پێچەوانەوە ناوی ئەنفال لە گەلێک دۆکیومێنتی موخابەراتیی ئەمەریکادا دەرنەدەکەوت و لەگەڵ شیکارانی موخابەراتیشدا باسێکی لێوە نەدەکرا، هەر چەندە لە میدیای عێراقیدا بە شێوەیەکی بەربڵاو باس دەکرا و لە لایەن (دەزگای پەخش و ززانیاریی دەرەوە Foreign Broadcast Information Service FBIS)ی سەر بە سی ئای ئەی CIA وەردەگێڕدرا و دابین دەکرا. لە کۆتایی مارتی ١٩٨٨ەوە ڕۆژنامەکانی عێراق بە شێوەیەکی ڕۆتینی ڕاپۆرتیان لەسەر ئەنفال بڵاو دەکردەوە. بۆ نموونە سەردێڕی ڕۆژنامەی ئەلسەورە (الثورة) لە ٣ی نیساندا دەنووسێت:

"دانیشتوانی سلێمانی و دهۆک و هەولێر، سڵاو لە ئۆپەراسیۆنی قارەمانانەی ئەنفال دەکەن". لە پەسن و پیاهەڵدانی ئەنفال و جاشی کورددا، لە ١٦ی نیساندا

ڕۆژنامەکە هاوپەیمانێتیی کورد و ڕۆڵی لە پرۆسەی ئەنفالدا باس دەکات وەک بەهێزکردنی یەکێتیی کورد. وەک ڕەنگدانەوەیەک بۆ هەندێک ددانپێدانان، شیکارییەکی "ئەوپەڕی نهێنی"ی هاوپێچ لەگەڵ یاداشتێکی ئەیلوولی ١٩٨٨ی وەزارەتی دەرەوەدا، ئاماژەی بە ئەنفالی هەشتی کۆتایی ئاب کردووە و بە "پێنجەم لە زنجیرە (ئەنفالی) ئۆپەراسیۆنی دژەیاخیبوونی عێراقدا" لەقەڵەمی داوە[٢٦].

لێکۆڵەرەوەیەکی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بە مۆڵەتدانێکی ئەمنیی ئاست بەرز (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەگێڕێتەوە کە ئاگای لە مەسەلەی گوند ڕووخاندنە بەربڵاوەکە بووە، (چونکە ئەمەریکا وێنەی سەتەلایتیی ئەو وێرانکردنەی دێهاتی گرتووە)[٢٧]. بەڵام لێکۆڵەرەوەکە دەڵێت تێگەیشتنی ئەو لەو دەمەدا وا بووە کە خەڵکی سەرلەنوێ نیشتەجێ دەکرێنەوە: "من هەرگیز هیچم لە بارەی بێسەروشوێنکردن و کوشتنی بەکۆمەڵەوە نەبیستووە". بەڵگەنامەیەکی ئەرکانی هاوبەش لە بارەی "سیاسەتی نیشتەجێکردنەوەی عێراقەوە" لە ترۆپکی جێبەجێکردنی ئەنفالی سێدا، دەنووسێت: کەوا کاتێک ژمارەیەکی زۆری کوردەکانی گەرمیان ڕاپێچی مەرگ دەکران، مەزەندە دەکرا کە "ژمارەیەکی هێجگار زۆر، بەڵام نەزانراوی کورد خراونەتە کەمپەکانی (کۆکردنەوەوە) لە سنوورەکانی ئوردن و سعودیە"[٢٨]. لە ئەیلوولی ١٩٨٨دا و پاش ئەوەی ئەنفال تەواو بوو، کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوە، لەسەر زاری مەسعود بارزانی، سەرکردەی (پ د ک) دەگوێزێتەوە، کاتێک نامەیەکی بۆ پێریز دیکۆیلار ناردووە و تێیدا دەڵێت کەوا ئەو پیاوانەی لە کەمپێنی

سەربازیدا گیراون، "ڕەوانەی شوێنێکی نادیار کراون و مەترسیی گەورە هەیە لەسەر چارەنووسیان"[٢٩]. بە هەرحاڵ ئەم پیاوانە (چونکە هیچ باسێک لە ژن و منداڵ نەکراوە) لە دیدی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە گوێزراونەتەوە "ناوچە تەختایی و بیابانەکانی خۆرئاوا و باشووری عێراق و لەوێ بە ئاسانتر دەتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێن"[٣٠].

شیکاران و لێکۆڵەرەوانی تری ئەمەریکا، کە چاودێریی جەنگیان دەکرد، دیسان هەمان سکاڵایان هەیە لە بارەی فەرامۆشکردنی ئەنفالەوە. بۆ نموونە، ستێفن پیلیتایەر، کە پۆستێکی لە کۆلێجی جەنگی سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکان هەبوو، لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨دا، لە پاش ئەرکێکی دوورودرێژی چاودێریکردنی عێراق، کە لە لایەن (سی ئای ئەی)ەوە پێی سپێردرابوو، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) دەڵێت کەوا ئەو هەرگیز ناوی ئەنفالی نەبیستووە. لە ساڵی ١٩٩٠دا و لە لێکۆڵینەوەیەکدا خۆی و دوو هاوکاری ئیدیعای ئەوە دەکەن کە "بە شێوەیەکی سەرەتایی، ئەو ڕاپۆرتانەی بڵاو کراونەتەوە، کەوا کوردەکان بە زۆر لە ماڵوحاڵی خۆیان لە چیاکاندا ڕاگوێزراون و سەرلەنوێ لە بیابانەکانی باشوور نیشتەجێ کراونەتەوە، دواتر ڕوون بووەوە مەسەلەکە وا نییە و لە ڕاستیدا براون بۆ ئەو شارۆچکە نوێیانەی کە حکومەتی عێراق لە ناوچە کوردییەکاندا دروستی کردووە بۆیان"[٣١]. بێگومان وا نەبووە، هەر هیچ نەبێت تا پێش لێبوردنە گشتییەکەی ئەیلوول.

ڕیک فرانکۆنای لێکۆڵەرەوەی دەزگای هەواڵگریی بەرگریی ئەمەریکا، کە ماوەیەکی باشی لە عێراق بەسەر

بردبـــوو وەک نـــوێنەری پەیوەنـــدیی ئەو دەزگـــایە لەگەڵ ئیســـتیخباراتی ســـەربازیی عێـــراق لە ســـاڵی ١٩٨٨دا، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) ئەمیش سەرسووڕمانی خۆی دەردەبڕێت: "باشە عێراقییەکانیش هەر ئەنفالیان پێ دەگوت؟ وابزانم هەر کوردەکان خۆیان ئەو ناوەیان لێ نابوو. کاتێک من لە عێراق بووم، هیچم لە بارەی ئەنفالەوە نەدەبیست و دواتـر لە کوردەکـانەوە (لە پـاش سـاڵی ١٩٩١) گوێبیسـتی بـووم". هەڵسـەنگاندنێکی دوای جەنگـی دەزگـای هەواڵگریـی بەرگـــری، لە بـــارەی پێشـــهات و پەرەســـەندنەکانی کوردستانەوە، وای بۆ دەچێت کە گوندنشینەکان بوون بە دوو بەشـەوە، دڵسـۆز و ناپـاک. ئەوانەی کە "بێلایەنن یـان دڵسۆزی بەغدان، گوێزراونەتەوە بۆ ژمارەیەک شارۆچکە، کە لە بـاکووردا دروسـت کـراون" و خزمەتگـوزاری و کارئاســانیی باشــیان بــۆ کــراوە. کــوردە ناپــاک یــان نادڵسـۆزەکانیش "گـوێزراونەتەوە بـۆ ئۆردووگـای کـاتی و دواتـریش بـۆ هەنـدێک کەمـپ لە قـووڵایی باشـووردا"[٣٢]. ڕاستییەکەی کوردە "دڵسۆزەکان" ساڵی ١٩٨٧ سەرلەنوێ لە کـــۆمەڵگەدا نیشـــتەجێ کـــرانەوە و زۆربەی کـــوردە "نادڵسۆزەکانیش" ـ کە ئەوانە بوون بەرەنگاری سیاسەت و فەرمانی ڕاگوێزانی ڕژێم بوونەوە ـ ڕاپێچی بیابان کران بۆ کوشتن، نەک نیشتەجێکردنەوە.

واڵـتەر (پـات) لانـگ، کە سـەرۆکی کەرتـی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتی دەزگـای هەواڵگریـی بەرگـری بـوو، دواتـر (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٠دا) ئیـدیعای ئەوە دەکـات کە فەرامۆشـکردنی ئەنفـال لە لایەن دەزگـاکەیەوە، دەگەڕێـتەوە بـۆ سـەرقاڵیی پێنتـاگۆن بە بەرەی باشـوورەوە: "(سـی ئـای

ئەی) و وەزارەتـی دەرەوە لە دەزگـای هەواڵگریـی بەرگـری زیاتر بە کوردەوە خەریک بوون". بەڵام هیچ سەرسامییەکی دەرنەبـــڕی لە کۆمەڵکوژییەکـــانی ئەنفـــال، کاتێـــک کە لە چاوپێکەوتنەکەی بۆ ئەم کتێبە ئەنجام درا گوێبیستی بـوو، بەڵکو وەک "زۆر لە شێوازی هیتلەرییانە دەچێت" و "هەموو کەسێکی تێوەگلاوە"، گوزارشتی لێوە دەکرد، بە شێوەیەک کە لەگەڵ سروشـتی ڕژێمـی عێراقـدا یەک بگـرێتەوە. بـاڵوێز نیـــوتن، بەپێـــی ئەو پـــلە و پۆســـتەی لە بەغـــدا هەیبـــوو، گەیشتووەتە ئەم ئەنجامەی خوارەوە و دەڵێت:

"ئـێمە دەمـــانزانی گونـــدەکان تەخـــت کـــراون و خەڵکـــیش براون بۆ بیابان. هەروەها ئەو بۆچوونەمان لا دروست بـوو کە ئیعـدام کـراون. ئەمە دەرەنجـامێکی لـۆجیکی بـوو، نەک ئەنجامێک بێت پشت بە ئەزمـوون و بەڵـگە ببەسـتێت. ئەمە شـــتێکی ئەوتـــۆی دروســـت نەکردبـــوو (کە نەکـــوژرێن). بە هەمـان شـێوە ئـێمە دەمـانزانی بارزانییەکـان چییـان بەســەر هـــاتووە کە هەرگیـــز نەگەڕانەوە (لە ســـاڵی ١٩٨٣دا). ئەوەی کەوا کەس لەو کـاتەدا درکـی پـێ نەدەکـرد، ڕادە و ئاسـتی شاڵاوەکە بوو. تەنانەت کەسانی موخابەرات و حکومەت، کە عێراقییەکانیـان بـاش دەناسـی، دواتـر سـەریان سـووڕمابوو کاتێک بەم ئاست و خەستییەی دڕندەییەکەیان زانی".

بە کورتی، هۆکاری لاوازیی زانیاریی ئەمەریکا لە بارەی ئەنفال و دەسـتتێوەرنەدانی، تەنـانەت لە ئاسـتی دیبلۆماسـیدا، ڕەنـگە لە سـۆنگەی سـەرقاڵیی واشـنتۆنەوە بێـت بە بەرەی باشـــوورەوە، شـانبەشـــانی پاڵپشـتیکردنی بەهێـزی کۆششـــی جەنگی عێراق. پێش هەمـوو شـتێک کوردەکـان هاوپەیمـانی ئێـران بـوون و ڕژێمـی عێـراق هەر چییەکـی پێـب کردنـایە

واشـنتۆن بە مەسـەلەیەکی نـاوخۆیی دەزانـی. عێـراق کە هەستی کرد دەستی کراوەیە، ویستی بە یەکجاری ئەم کێشە ناوخۆییەی یەکلا بکاتەوە و کۆتـایی پـێ بێنێت لە ڕێگەی بەکارهێنـانی گـازەوە، بـۆ ئەوەی گوندنشـینەکان بتۆقێنێت و ڕاپێچیـان بکـاتە نێو باوەشـی خـۆی و لانـیکەم وا بکـات ئەم کێشە وەرسکەرە بە بـارێکی باشـدا بشـکێنێتەوە بۆ خـۆی و لەسـەر ئەو بـارە بیچەسـپێنێت. ئەگەر بهاتـایە و جەنگـی کەنداوی سـاڵی ١٩٩١ و ئەوەی بە دوایدا هـات نەقەومایە و دەرفەتێکی نـوێی ژیـانی بـۆ بـزووتنەوەی نیشـتمانیی کـورد نەڕەخسـاندایە، ئەوە کوردسـتان هەر بە خـاکێکی چـۆڵ دەمـایەوە و هەڵەبـجە لە بیر دەچووەوە و ئەنفالیش لە ژێر چینەکانی لمی بیاباندا دەشارایەوە.

## بەکارهێنانی گاز بۆ کۆتاییپێهێنانی جەنگ

لە سێیەم هەفتەی نیسانی ١٩٨٨دا، گەلێک فاکتەر پشتگیریی دید و بۆچوونی ئێرانیان دەکرد، کە ئێستا واشنتۆن دەیەوێت عێراق جەنگەکە ببێتەوە، بە چەشنی بێدەنگیی نێودەوڵەتی لە ئاست هەڵەبجەدا، هێرشی ئەمەریکا بۆ سەر کەشتی و سەکۆ نەوتییەکانی ئێران لە کەنداودا و ڕەنگە بایەخدارترینیشیان ئەو هەستکردنە بێت کە واشنتۆن یارمەتیی عێراقی دابێت لە گرتنەوەی نیمچەدوورگەی فاودا، چەند ڕۆژێک پێش ئەوانەی باس کران. ئیلیان سیۆلینۆ لە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزدا[٣٣] دەنووسێت "هەر چەندە ویلایەتە یەکگرتووەکان بێلایەنیی فەرمیی خۆی هێشتووەتەوە لە جەنگی ئێران ـ عێراقدا، بەڵام داشکاندنی هەنگاو بە هەنگاوی بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان بەلای عێراقدا، بوو بە دەستلەملانێکی تەواو". هەروەها ئەمە هەست و تێگەیشتنی عێراقیش بوو. فەریق ڕوکن نەبیل خەلیل سەعیدی پاشکۆ (مولحەق)ی سەربازیی عێراق لە واشنتۆن لە سالانی١٩٨٧ ـــ ١٩٩٠دا، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٤دا) دەگێڕێتەوە کە واشنتۆن هەمیشە دەیگوت بێلایەنە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان لە ئێمەوە نزیکتر بوون. لە ساڵی ١٩٨٧دا کاسپەر واینبێرگەری وەزیری بەرگری، کە پیاوێکی خۆشمەشرەب بوو و هەمیشە بە بینینی من خۆشحاڵ

دەبوو و پەسن و سەنای دەکردم، کاتێک بە سەرپشتیی کەشتییەکی ئەمەریکییەوە بوو لە کەنداودا، فەرمانی دا سەکۆیەکی نەوتی ئێرانی بۆردمان بکەن. ئەمە نموونەیەکی باشی ئەوەیە کە چۆن لایەنگیریی ئێمەیان دەکرد".

دوابەدوای گازبارانی هەڵەبجە، ئەو زانیارییەی کە لە سەرانسەری ئێرِاندا بڵاو بووەوە، لەدەستدانی فاو بوو لە لایەن ئێرانەوە، کە لە ڕووی سەربازی و سایکۆلۆجییەوە کاردانەوەی قورسی هەبوو، چونکە فاو تاقە ناوچەی بایەخدار بوو کە هێزەکانی ئێران توانییان دەستی بەسەردا بگرن (بە تەواوی بەراورد دەکرێت لەگەڵ ئەو ناوچەیەی دەوروپشتی هەڵەبجە، کە بایەخی ستراتیجیی خۆی هەبوو). (سی ئای ئەی) ڕاپۆرتی ئەوەی دابوو کەوا ئایەتوڵڵا خومەینی بە ئاشکرا دەرنەکەوتووە "لەو دەمەوە کە ئێران شکستی سەربازیی لە فاودا تووش بوو و لەو زەرەروزیانانەیەوە لە بەرانبەر هێزی دەریایی ئەمەریکا لە کەنداو لە سەرەتای ئەم هەفتەیەدا. چونکە ئەو بە زۆری لە کاتی قەیرانەکاندا دەردەکەوێت، وەک هەوڵێک بۆ پشتگیریی سەرکردایەتیی ڕژێم و... بێدەنگی لەم کاتەدا جێی سەرنجە".[٣٤]

هێرشی پێچەوانەی عێراق بۆ فاو، کە لە نیساندا دەستی پێ کرد، یەکەم قۆناغ بوو لە زنجیرە هێرشی "توکلنا علی اللە" و چوار قۆناغی تری بە دوادا هات، کە تێیدا توانیی هێزەکانی ئێران لە هەموو سنوورەکانەوە بگێڕێتە دواوە. ئەم سەرکەوتنە یەکلاکەرەوە سەربازییانە بۆ چەند فاکتەرێک دەگەڕێنەوە، لەوانە مەشق و دیسپلینی باشتر، کەلوپەل و تفاقی تۆکمە، لەناکاو پەلاماردان و لە لایەکی

تریشەوە پەرەسەندنی نارەزایی میللی لە ئێراندا. بەڵام دوو فاکتەری ئیزافی، کە هەمیشە قورسایی شیاویان وەک پێویست باسی لێوە نەدەکرا: ئەویش وێنەی سەتەلایتیی وردی جموجووڵی سەربازی بوو ـــ کەوا دەزگای هەواڵگریی بەرگری (DIA) بۆی دابین دەکرد، لەگەڵ پەنابردنێکی خەست و قورس بۆ چەکی کیمیایی لە فاودا و دواتریش.

شیکارانی سەربازیی وەک پێڵیتایەر و جۆنسن و ڕۆزنبێرگەر، کە نەیاندەتوانی بگەنە لای ئێران و بەپێی ددانپێدانی خۆیان، تێڕوانینێکی ناتەواویان هەبوو لەسەر بیرکردنەوەی سەربازیی عێراق ئیدیعای ئەوە دەکەن کە "بەڵگەی قەناعەتبەخشیان بە دەستەوە نییە کەوا گاز بە کار هێنرابێت بۆ گرتنەوەی فاو، ئەگەریش بە کار هێنرابێت، ئەوە پەیوەندیی بە یەکێک لەو چوار شەڕە یەک لە دوای یەکانەوە بووە"[٣٥] و ئەوانی تریش گومانیان لەم ئیدیعایەی فاوە. بە هەرحاڵ، هەڵسەنگاندنەکەیان نەک تەنها پێچەوانەی تۆمەتبارکردنە ڕاچڵەکێنەکەی ئێرانە سەبارەت بە هێرشە کیمیاییەکانی عێراق "کە هێند قورس بووە... کەوا گازە ژەهراوییەکان چەند بەشێکی بەندەرە شاری ئابادانی باشووری ئێرانیان ئالوودە کردووە، لەوبەری ڕووباری ئەروەندەوە"[٣٦]، بەڵکو پێچەوانەی زانیارییەکانی دەزگای هەواڵگریی بەرگرییش بوو. وەک پات لانگ سەرنجی داوە، عێراقییەکان: "دۆزەخێکی گازیان داخستووە" لە فاودا.

سەرچاوەی بنەڕەتیی لانگ، ڕیک فرانکۆنای پیاوی دەزگای هەواڵگریی بەرگری (DIA) بوو لە عێراقدا. بایۆگرافیای فرانکۆ وەک ئەفسەری پەیوەندیی بە

ئیستیخباراتی سەربازیی عێراقەوە، ئەوە دەخاتە ڕوو کە هاتوچۆیەکی بەردەوامی شەڕگەکانی کردووە وەک چاودێرێکی ئۆپەراسیۆنی سەربازیی عێراق دژ بە هێزەکانی ئێران و لەگەڵ ئەرکەکانی هێزی ئاسمانیی عێراقدا دەرچووە. ڕاستییەکەی فرانکۆ بەشێک بوو لە تیمێک کە پێک هاتبوو لە زیاتر لە شەست ئەفسەری دەزگای موخابەراتی بەرگری، کەوا بەپێی نیویۆرک تایمز "زانیاریی وردیان لەسەر شوێن و ڕێی بڵاوبوونەوەی ئێرانییەکان، نەخشە و پلانی تەکتیکی شەڕ، پلانی بۆمببارانی هێزی ئاسمانی و هەڵسەنگاندنی زیانی بۆمب لە بەکارهێنانی چەکی کیمیاییان" بۆ دابین دەکرد[٣٧]. فرانکۆنا لە کتێبێکیدا کە ساڵی ١٩٩٩ دەری کرد، لە بارەی ئەزموونی خۆیەوە دەنووسێت "بەکارهێنانی عێراق بۆ مادده کیمیاییەکان لە فاودا، ڕوون و ئاشکرا بوو"[٣٨]. (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) فرانکۆنا لە بارەی سەردانی خۆیەوە بۆ فاو ڕاستەوخۆ لە گەرماوگەرمی پاش شەڕەکەدا، دەگێڕێتەوە کە "من خودی خۆم دەرزیی ئەترۆپینی بەکارهێنراوم لە شوێنی شەڕەکە و ئۆتۆمبیلە دەستبەسەرداگیراوەکانی ئێران هەڵگرتووەتەوە و بە شەخسییش تێبینیی هەوڵەکانی عێراقم کردووە بۆ پاکژکردنەوەی ئامێر و کەرەستە گیراوەکانی ئێران، کە پێویست نەبوو ئەوە بکەن، ئەگەر نەیانزانیبایە کەوا کیمیاییان بە کار هێناوە".

لە چاوپێکەوتنێکی جیادا (ساڵی ٢٠٠٠)، فرانکۆنا ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کە بەربڵاویی دەرزیی ئەترۆپین، زۆر باش ئەوە دەگەیەنێت کەوا دەمارەگاز بە کار هاتووە، چونکە بە زۆری تیمارکردنەکە لە برینەکە خراپترە و سەربازە

ئێرانییەکـــان دەرزیـــی ئەترۆپینیـــان لە خۆیـــان نەداوە، کە دەبووە هـۆی ئەوەی زیـاتر نەخۆشیان بخـات، چونکە تەواو دڵنیـا بـوون کە بە دەمارەگـــاز هێرشـــیان کـــراوەتە ســـەر. دەزگای هەواڵگریی بەرگریی (DIA)، بە دوای دەرزییەکاندا چوو، تا بردیەوە بۆ کارگەکانی ئەورووپا، کە لە ڕاستیدا ئەو دەرزییانەیان بە ئێران فرۆشتبوو. بەڵگەنامەیەکی هەواڵگریی ویـــلایەتە یەکگرتووەکـــان، ئەم ســـەلماندنەی خـــوارەوە بە دەست دێنێت:

"... دیارنەمـانی باڵنـدە و مێـروو مـاوەی چەنـدین ڕۆژی پـاش شـــەڕەکە و ژمـارەیەکی هێجگـار کەمـی دیلـی ئێرانـی، بەڵـگەی ئەوەن کەوا کەرەســتە و تفـاقی جەنگیـی ئێـران بە کەمی بە کار هاتوون و بە جێ ماون و داواکارییەکی عێراق بۆ هێنـانی بلدۆزەر بـۆ ئەو شـوێنە... (داواکـارییەک) وادیـارە بـۆ هەڵکەندنی گۆڕی بەکۆمەڵ بووە، چونکە هیچ قۆرت و کۆسـپێک لەسـەر ڕێگەوبانەکـان نەبـوو پێویسـت بە لابـردن بکـــات. چـــاودێران ڕێگەیـــان پـــێ نەدەدرا بچـــنە نـــاوچەی شەڕەکەوە لە فاودا، تاوەکو عێراق دەرفەتی تەواوی دەبێت بـــۆ پـــاککردنەوەی نـــاوچەکە"(٣٩). بەڵگەنـــامەیەکی تـــری هەواڵگریـی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان، بـاس لەوە دەکـات کە عێراق نزیکەی دوو هەزار ڕۆکێتی ١٢٢ ملیمی تەقاندووە کە گـازی خەردەل، سـارین، فرمێسـکڕێژیان تێدا بـووە لە کـاتی هێرشەکەی فاودا(٤٠).

شـێخ مەولا، کە فەرماندەیەکی فەیلەقی بەدر بـوو لە فـاو (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٢دا) دوو پەلامـاری کیمیـایی جیـــا دەگێـــڕێتەوە، کە هەردووکیـــان گـــازی خەردەل و دەمارەگازیان تێدا بە کـار هـاتووە. لە یەکەم پەلامـاردا، وەک

دەڵێت: بایەکی قایم هەڵی کرد و گازەکەی بردە دواوە بەسەر هێزەکانی عێراقدا و زۆری لێ کوشتن، دووەم پەلامار بوو بە هۆی کوشتن و برینداربوونی زۆرێک لە ئێرانییەکان. فڕۆکەوانێکی عێراقی (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۲دا) باس لەوە دەکات کە فڕۆکەیەکی ئیلیوشنی بارهەڵگریش، ئێرانییەکانی گازباران کردووە: "فڕۆکەکان بەرەو بەرزاییەکی زۆر بەرز هەڵدەکشان و پەستانی کابینەی فڕۆکەوانەکە هەموار و ڕێکخراو بوو، ئەوجا پشتەوەیان دەکردەوە و بەرەو گۆشەیەک دەفڕین و بەرمیلە پڕ لە گازەکەیان تلۆر دەکردە خوارەوە. ئەمانە بۆمبی پڕ بوون و مەبەست لێی بەرپاکردنی تۆقینێکی گەورە بوو. ئەمە هەندێک شت بوو کە ئێمە (فڕۆکەوانان) لە ناو خۆماندا بە ئاشکرا باسمان دەکرد و ئەمە شتێکی گەورە بوو. فڕۆکەوانەکانی بارهەڵگر، شانازییان بەوەوە دەکرد کە ئەوانیش داوایان لێ کراوە بۆردمان بکەن. من دواتر سەردانی فاوم کرد و ئەو دەمە بووبوو بە شوێنێکی زۆر بەناوبانگ". بەکارهێنانی پەنجاوپێنج بەرمیلی پڕ لە ماددەی کیمیایی و خستنە خوارەوەی لە هێلیکۆپتەری عێراقییەوە، لە بەڵگەنامەکانی هەواڵگریی ئەمەریکیدا باس دەکرێت[٤١].

ڕاپۆرتگەلێک دەرکەوتن کە عێراق تۆخمێکی تازەی دەماری بە کار هێناوە لە فاودا بە ناوی ڤی ئێکس VX. بۆ نموونە جەنەراڵ وەفیق سامەڕایی، سەرۆکی پێشووی بەڕێوەبەرێتیی ئیستیخباراتی سەربازی، پاش هەڵگەڕانەوەی لە ساڵی ۱۹۹٤دا، بە پەیامنێرانی ڕاگەیاند کە بەرگریی ئێرانییەکان لە فاودا بە هۆی بەکارهێنانی VX لە لایەن عێراقەوە، شکستی هێنا. ئەم تۆخمە گازە کە لە سالانی

١٩٥٠كاندا له لایەن ئەمەریکا و بەریتانیاوه پەرەی پێ درا، دەمارەگازێکی زۆر کوشندەی کاریگەر خێرایه و تاقه دڵۆپێکیشی دەبێته هۆی مردن و ئەمیش وەک گازی خەردەل له مەیدانی شەڕدا دەمێنێتەوه. وەفیق دەڵێت VX' له شەڕی فاودا و له ڕۆژانی ١٧ و ١٨ی نیساندا به کار هێنرا و کردمانه تۆپی دوورمەوداوه و له ڕێگەی بۆردمانی فڕۆکەشەوه به کارمان دەهێنا. ئەمه ترس و تۆقینێکی زۆری له ناو ڕیزەکانی گاردی شۆڕشی ئێرانیدا بەرپا کرد و... ئێمه به هۆی بەکارهێنانی توخمه گازی ڤی ئێکسەوه بردمانەوه'[٤٢].

ئیدیعاکەی سامەڕایی، شتێک نییه پشتگیریی لێ بکات و هەڵسەنگاندنەکانی موخابەراتی ئەمەریکی له بارەی تواناکانی عێراقەوه لەپێش جەنگی کوەیتدا، ئەوه دەگەیەنن که بەرنامەی VXی عێراق له ساڵی ١٩٩٠دا[٤٣] هێشتا هەر له قۆناغی پەرەسەندندا بووه. به هەرحاڵ، لانگی سەر به دەزگای هەواڵگریی بەرگرییش دەگێڕێتەوه کەوا عێراق VXی له فاو به کار هێناوه و گەلێک ڕاپۆرت لەسەر بەکارهێنانی ئەم توخمه هەن، له ماوەی قۆناغەکانی دواتری (توکلنا علی الله)، له دەریاچەی ماسی له مایسدا و مەجنوون له حوزەیراندا و ڕەنگه له مەهرانیشدا دواتر هەر لەو مانگەدا به کار هێنرابێت.

چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەفسەرانی عێراق، ئەوه دەگەیەنێت که عێراقییەکان، ڕێک وەک ئەوەی له ئەنفالدا کردیان، چەکی کیمیاییان به شێوەیەکی سەرەکی له یەکەم ڕۆژی هەر قۆناغێک لەو پێنج قۆناغه به کار هێنابێت که ژمارەیەکی زۆر سەربازی ئێرانیی دەکوشت و ترس و سامێکی

بەکۆمەڵی لە نێویانـدا بەرپـا دەکـرد و ورەی دەڕووخانـدن. پاشـان بە هێـزی زەمینـی هێرشـیان دەکـرد، کە لە ڕاسـتیدا ئۆپەراسیۆنێکی ڕاماڵینی یەکلاکەرەوە بوو و بڕێکی هێجگار زۆر کەرەسـتە و ئـامێری سـەربازیی بەجێماویـان دەگـرت. کامیل ئەنوەر بوترس، کە سەربازێکی عێراقی بوو و لە هەر پێنج هێرشـەکەدا شـەڕی کردبـوو (لە چاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٤دا) دێتەوە یادی کەوا: "ئێمە یەکەم ڕۆژی هێرشـەکەی فاو، چەکی کیمیاییمان بە کار هێنا لە سەعات پێنجی بەیانیدا. هەموو ڕاجیمەکانمان ڕۆکێتی کیمیاییان دەتەقاند. پاش ئەوە کەوتیـنە هاوێشـتنی مووشـەکی ئاسـایی، چـونکە چیتـر پێویسـتمان بە چەکـی کیمیـایی نەمـا پـاش ئەوەی هەمـوو ئێرانییەکان مردن. بۆ هەر ئۆپەراسیۆنێک ئێمە تەنها چەکی کیمیاییمان بە کار دەهێنا لە یەکەم ڕۆژدا و یەکبینە بە ڕیز". کۆلۆنێل ئیبراهیم حەسەن ئەلیاس (لە چاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٤دا) دەگێڕێتەوە کە "ئێرانییەکان وەک شێتوهاریان لێ هـاتبوو و هەر ئەوەنـدە فریـا دەکەوتـن هەڵبـێن" و دەیگـوت زۆر لە ئێرانییەکان بە گازی عێراق دەکوژران، بەڵام گەلێک سەربازی عێراقیش تووشی برینی پەیوەندیدار بووبوون بە گازەوە.

جەعــفەر ئەســلانی، کە دکتــۆرێکی ئێرانــی بــوو، (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٢دا) تێبینیـی هەنـدێ حـاڵەتی کردبـوو لە ئۆپەراسـیۆنی (توکلنـا علـی اللـه)ی دووەمـدا لە دەریـاچەی ماسـی، کە هەنـدێک لە برینـدارەکان نیشـانەی سەیریان تێدا دەرکەوتبوو کە "زۆر خێرا و قورس بوو وەک فرمێسک لەچاوهـاتن، ڕشـانەوە، فیلێهـاتن و گۆڕانی حـاڵەتی ئەقڵـی. کـاردانەوەی نەخۆشـەکان بە چارەسـەرکردن بە

ئەترۆپین، زۆر کەم بوو یان هەر کەڵکی نەبوو و ژمارەیەک سەربازی زۆر مردن". ئەمە پێدەچێت حاڵەتی VX بوو بێت، وەک ئەو دەڵێت. عەباس فروتانیش هەر بە حاڵەتی VX باسی دەکات، بەپێی ئەزموونی خۆی لە هێڵەکانی بەرەدا[٤٤]. هەروەها ڕاپۆرتەکانی عێراقیش لەوەدەچێت ئەم ڕاستییە بسەلمێنن. محەمەد حەنوون، کە سەربازێکی پیادەی عێراق بوو، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) دەڵێت کەوا لە ماوەی قۆناغی سێیەمدا، لە حوزەیراندا و لە مەجنوون "ئێمە زۆر زۆر بە خەستی چەکی کیمیاییمان بە کار هێنا و ئەگەر کیمیایی نەبوایە، قەت ئەو شوێنەمان نەدەگرت. ئێمە فەرماندەکانمان پێیان گوتین ئەمە ڤی ئێکسە و دەبێ ماسکەکانمان لە سەر بکەین، چونکە ناوچەکە تەختایی بوو و هەموو ساتێکیش باکە دەیگۆڕی". حەنوون تێبینیی کردبوو کەوا لە مەشقی بەرگریی کیمیاییدا، سەربازەکانی وەک ئەم موحازەرەیان لەسەر VX دەدرایە، لە پاڵ گازەکانی تردا. ئێرانییەکان سکاڵای ئەوەیان دەکرد کە سەدان کەس لە هێزەکانیان لە مەجنووندا بە گاز مردوون[٤٥]. دواتر تیمێکی پسپۆڕانی سەر بە نەتەوە یەککگرتووەکان هەندێک لە برینداره دەربازبووەکانیان پشکنیبوو[٤٦].

هەروەها لە مەهرانیشەوە (قۆناغی چوارەم) ئیشارەتی ئەوە هەبوو کە VX بە کار هاتووە، بەڵام هیچ سەلماندنێک نەبوو. عەقید ڕوکنی عێراقی عەبدولوەهاب ئەلساعیدی (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) دەگێڕێتەوە کەوا خۆی و سەربازەکانی، مووشەکهاوێژی ئارپیجییان (RPG) پێ بووە و گوللەکانی کیمیایی بوون و ڕاسپێردراون کاتێک بە کاری

کەوا ئەو گوندانەی کە هێزیان تێدا نەبوو، بۆردمان دەکران. بۆ نموونە، دوو ڕۆژ پێش هێرشەکەی هەڵەبجە، هێزەکانی عێراق ناوچەی نێوان قەڵاگە و قەڵایجەیان کوتا. هەر چەندە کەس نەکوژرا، بەڵام زۆربەی گوندنشینان هەڵاتن بۆ دارستان و چیا و ئەشکەوتە نزیکەکانی ئەو ناوە. ئەوانی لە ماڵەکانیاندا مانەوە، ڕۆژێ دواتر بەر هێرشێکی تری گاز کەوتن، کە بیست کەسی کوشت و لەوانە پێنج کەس لە یەک خێزاندا. بەهمەن سوڵتانی، گوندنشینێکە و گەڕاوەتەوە و هاوکاریی کردووە لە گواستنەوەی هەشت لاشەدا بۆ مزگەوت (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەڵێت: "ئێمە لە ڕادیۆوە گوێمان لە بانگەوازی سوپا بوو کە هێرشی کیمیاییە و بچینە شوێنە بەرزەکان، بەڵام خەڵکەکە خۆیان کۆ نەکردبووەوە". چەندین ڕۆژ دوای هێرشەکەی هەڵەبجە، خەڵکی گوندی نژمار بەر هێرشێکی کیمیایی کەوتن و بیستودوو کەسی لێ کوشتن. لە گوندی کانی دیناری نزیکیشی، هەر لە گازبارانێکی ئەو سەروبەندەدا، پێنج کەس کوژران. لە کاتێکدا هێزی ئاسمانیی عێراق نکووڵیی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دەکرد لە مەریواندا[٤٨]، عەباس فروتان کە لە نەخۆشخانەی سەربازیی ئەوێ کاری دەکرد، نیشانەکانی بەم جۆرە باس دەکرد: "لەگەڵ دەمارەگاز یەکی نەدەگرتەوە، بۆیە مامەڵەی بە سیانید ژەهراوییبوونیان دەکرا و پاش بەینێک دەرمان و تیمارکردنەکەیان پێ کەوت". بەڵام ئەم ئەو ئەگەرەشی نەخستە لاوە کە جۆرە تۆخمێکی نوێی کاریگەر خێرای دەمارەگاز بێت و پێشتر ئەم نەیدیبێت و گومانی VXی لێ دەکرد[٤٩].

## هەڕەشەی گازبارانی تاران

بە شـێوەیەکی ڕوو لە زیـاد، هێرشـە گەورەکـانی ئەم دواییەی گـاز، یارمەتیدەر بـوون لە کۆتاییهێنـان بە جەنـگ، بەڵام تەنها پاش ئەوەی عێراق دووبەرابەری کردەوە، لەگەڵ هەڕەشـەکردن بە هێرشـی کیمیـایی بـۆ سـەر تـاران و شارەکانی تر. ئەمەش هەڕەشەیەکی هەر وا خۆڕایی نەبوو، چونکە عێراقییەکـان پەرەیـان دابوو بە تواناسـازییەکی نوێی مەترسـیدار و مووشـەکە سـکۆدەکانی سـۆڤیێتیان پەرە پـێ دابـوو و مەودای هاوێشـتنیان زیـاد کردبـوو و لەم دەمەدا پایتەختی ئێران بووبووە ئامـانجێکی دەسـت بە دوگمەدانـان. یەکەم مووشـەکی بالسـتیی ئاسـایی ڕۆژی ٢٩ی شـوبات لە تـارانی دا. وا ئێسـتاش عێراقییەکـان هۆشـداریی ئەوە دەدەن کە ڕەنـگە کـڵاوەی کیمیـایی بـکەن بەسـەر مووشـەکە دوورهاوێژەکانیانەوە[٥٠].

(سـی ئـای ئەی) لە نـزیکەوە چـاودێریی ئەم پەرەسەندنانەی دەکرد و لە سـەرەتای نیسـاندا، پاش ئەوەی تەپوتـۆزی پەلامـاری هەڵەبـجە کەمێـک ڕەویـیەوە ئەم هۆشـداریی ئەوەی دا کە "مەترسـییەکە لە گەورەبوونـدایە" و پێـدەچێت مەڵبەنـدە بچووکەکـانی نیشـتەجێبوون، بە چەکـی کیمیایی پەلامار بدرێن:

"سـنووربەزاندنێکی سـتراتیجیی زەمینـی لە لایەن ئێـرانەوە،

ڕەنگە سیناریۆیەکی وای لێ بکەوێتەوە کە بە زۆری پاڵ بە عێراقەوە بنێت هێرشی کیمیایی بکاتە سەر شارە گەورەکانی ئێران. هەروەها ئەگەری ئەوە هەیە کە عێراق دیسان چەکی کیمیایی بە کار بێنێت لە شەڕێکدا دژ بە شارە گەورەکانی عێراق، وەک بەسرە یان سلێمانی، ئەگەر بەغدا لەو بڕوایەدا بێت کە هێزەکانی ئێران نزیکیان بووەتەوە و دەیانگرێت".

دەزگاکە بەردەوام دەبێت لەسەر شیکردنەوەی و دەڵێت ئەگەر کۆمەڵی نێودەوڵەتی شکستی هێنا لە کاراکردنی سزاکانی ئابلووقەدا "ئەوە دەرفەتی لێدانی کیمیایی لە شارە گەورەکان بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکرێت"[٥١].

وێنە و دیمەنەکانی هەڵەبجە بەراورد بە هەڕەشەکانی بەغدا، ترس و تۆقینێکی دەستەجەمعیی لە ئێراندا بەرپا کردبوو، کە دانیشتوانی شارنشین تاقییان کردبووەوە. ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز ڕاپۆرتێکی بڵاو کردبووەوە کە ڕادیۆی تاران "سێ جۆر ئیشارەتی نوێی شاوری ئینزاری پەخش کردووە بۆ ئاگادارکردنەوەی هێرشی کیمیایی بە شێوەی جیاجیا، تاوەکو خەڵکە مەدەنییەکە فریا بکەون خۆ بپارێزن" و پێدەچێت نزیکەی نیوەی دانیشتوانی شار، کە بە شەش ملیۆن مەزەندە دەکرێت، لە ترسی هێرشی مووشەکی ئاسایی هەڵاتبێتن[٥٢]. چیرۆکێکی بەناوبانگ هەیە لە بارەی نانەواخانەیەکی تارانەوە، کە مووشەکێک لێی داوە و ئەو ئاردەی کە بردوویەتی بە ئاسماندا، ترسێکی گەورەی بەرپا کردووە و بووەتە هۆی چوڵکردنی گەڕەکەکەی چواردەوری. دکتۆر حەمید سوهرابپوور، کە خەریکی ئامادەکردنی تیمە پزیشکییەکان بووە بۆ پەلاماری کیمیایی، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەگێڕێتەوە کەوا "ئێمە

چاوەڕوانی زەرەروزیانی گیانیی گەورە بووین و ترسێکی تەواو هەبـــــوو لەوەی کە ڕوو دەدات. هەڵـــــبەت، لەو سەروبەندەدا مووشەکی عادەتییش بەسەرماندا دادەباری..."

هەڵبەت پەلامــاری کیمیـایی دژ بە تــاران ڕووی نەدا و ئەمەش مشـتومڕێکی بەجـێ هەڵـدەگرێت کە بـۆچی عێـراق پایتەختی ئێرانی گازباران نەکرد و هۆکارەکەی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هێشتا پەرەی بە کڵاوەی کیمیایی نەدابوو بۆ مووشـەکەکانی. بەڵام تەنها هەڕەشـەکە ئێرانییەکانی خسـتە ترسـێکی گەورەوە و ئەو پشتگیرییەشـی تێک شـکاند کە بـۆ جەنـگ هەیـانبوو، بە ڕادەیەک کاتێـک عێـراق دەسـتی کـردە ئەنجامـــدانی دوا هێرشـــی پـــێچەوانەی خـــۆی، توانـــای وەڵامــدانەوەی ئێـــران تووشـــی نوشوســـتیی بووبـــوو. هێرشەکەی فاو کاریگەرییەکی دۆمینۆئاسای هەبوو، کە بـوو بە هـۆی ئەوەی پێویسـت بە زیـادکردنی بەکارهێنـانی چەکـی کیمیایی نەکات لە پشتی شـەڕگەکانەوە. پێشـبینیی (سـی ئـای ئەی) لە بارەی جەنگێکی کیمیـاییەوە بـۆ سـەر شـارەکان، کە دەبـوو لە پەرەسـەندنی مەیدانی شـەڕی ئێرانەوە سـەرچاوە بگرێت، هەرگیز نەهاتە دی.

هەنـــدێک لە هەر دوو لا ئێـــران و عێـــراقیش بـــاوەڕی بەهێزیـان بەوەیە کە تێکەڵکردنـی هەڕەشەوگوڕەشـە لەگەڵ بەکارهێنانی گازدا، لە ڕووی تەکتیکییەوە لە لایەن عێراقەوە، لە هەر فاکتەرێکی تر زیاتر بوو بە هۆی کۆتاییهاتنی جەنـگ. عەقید ڕوکـن ئەلساعیدی دەڵێت: "ئێمە پەیامێکمـان نـارد بـۆ خـومەینی، کەوا ئەگەر جەنـگ نەوەسـتێنێت ئەوە شـارەکانی ئێـران دەدەیـنە بەر چەکـی کیمیـایی". لێکـۆڵینەوەیەکی (سـی ئـای ئەی) دەگـاتە هەمـان ئەنجام و دەڵێت: "بەرگریی ئێران

هەر زوو لە هەموو شوێنێک تێک شکا و چەکی کیمیایی کۆتایی بە جەنگ هێنا و... سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنەکانی هێرشبردن لە کەرتی باشوور و لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٨دا بە تەواوی بوو بە هۆی ئەوەی کە ئێرانییەکان واز لە دوژمنکاری بهێنن. بەکارهێنانی چەکی کیمیاییش هاوکاریی سەرکەوتنی ئەم ئۆپەراسیۆنەی کرد".[٥٣]

هەڵسەنگاندنێکی هەواڵگریی پاش جەنگ، زۆر ڕاشکاوانەتر دەڵێت:

"ئێمە پێمان وایە توخمە کیمیاییەکان یەکلاکەرەوە بوون لە ویست و خواستی عێراقدا بۆ ئەنجامدانی هێرشە سەربازییەکانی ئەمساڵ کە ناوچە گرنگەکانی خاکی عێراقیان گرتەوە. بێجگە لەوەش زیاتر بڕوامان بەوەیە کە چەکی کیمیایی ڕۆڵێکی کاریگەر و تەواوی بینیوە لە بەرپەرچدانەوەی هەڕەشەی کوردە یاخیبووەکانی باکووری عێراق لەسەر حکومەتی عێراق، کەوا ئێران پشتگیریی لێ دەکردن".[٥٤]

پسپۆڕێکی چەکی کیمیایی ئێرانی (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا)، دیدێکی هەندێک جیاوازی هەیە و دەڵێت: "ئەوەی وای لە ئێران کرد بە ئاگربەست قایل بێت، لێکدانی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق و جەنگی شارەکان بوو، چونکە هێرشەکانی گاز ورەی سەربازەکانی ڕووخاند و بە سەربازگرتنی نوێی تووشی ئاستەنگێکی زۆر کرد، لە کاتێکدا کە هێرشی مووشەک بڕبڕەپشتی پشتگیریی میللیی بۆ جەنگ دەشکاند. مۆتەکەی بەستنی کڵاوەی کیمیایی لەسەر ئەم مووشەکانە، زۆر زیندوو بوو لە مێشکی خەڵکدا". بە هەرحاڵ، بۆ ئەو پسپۆڕە، زەبری گورچکبڕ،

خستنەخوارەوەی فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانیی ئێران بوو لە لایەن ئەمەریکـــاوە لە ســـەرەتای تەمـــووزدا، کەوا زۆر لە ئێرانییەکان وایان لێک دەدایەوە کە ئەمە پەیامێکی واشنتۆنە لەبـری عێـراق و ئامـادەیە هەمـوو شـتێک بکـات لەپێنـاو کۆتاییهاتنی جەنگدا. کۆلۆنێل ئەفرایم کام، کە دواتر بوو بە سەرۆکی هەواڵگریی سەربازیی ئیسرائیل، بێتوانـایی ئێرانـی لە بەدەسـتهێنانی چەکـی نوێـدا گەڕانـدەوە بـۆ هۆکـاری سـەرەکیی بڕیـاری هەوڵـدانی بەپەرۆشـی بـۆ ئاشـتی. بەڵام وەک (لە چاوپێکەوتنێکی سـالّی ٢٠٠٠دا)، دەڵێت هێرشـەکانی عێـراق بە مووشـەکی سـکۆد بـۆ سـەر شـارەکانی ئێـران و ترسی ئەوەی کە عێراق چەکی کیمیایی بە کـار بێنێت، خاڵی دووەمی هۆکارەکە بوو.

بە پـێچەوانەوە مەسـەلەکە هەر ئەوە نییـە کە تـاقە یەک فـاکتەر بڕیـاری بە خـومەینی دابێت ــ وەک خـۆی دەڵێت ــ دواجـار "لەو پەرداخە ژەهـرە بخـواتەوە" و بە ئاگربەسـتێکی (سەرشۆڕانە) قایل بێت. ئێران هەرگیز لە ڕووی سـەربازی و سـایکۆلۆجییەوە نەهـاتەوە سـەر خـۆی لە ئەنجـامی شکسـتهێنانی هێرشـە "کۆتاییەکـانی" دوو سـاڵی پێشـتری و بەرەوڕووی کێشـەی سـەربازگیریی بـووەوە. لە هەمـان کاتیشـدا عێـراق پێشـکەوتنێکی بایەخداری بە دەست هێنـا لە بـواری مووشـەکی بالسـتی و تواناسـازیی تەواوی لە بەکارهێنـان و هاوێشـتنی چەکی کیمیاییدا، زاڵبوونی بەسـەر ئاسمانی شـەڕدا، زرێپۆشی دەستباڵای لە مەیدانی شـەڕدا و توانـای ئـازوگوێزی زرێپۆشـی لە سەرانسـەری وڵاتـدا، بە ئاسـانی. پـات لانگـی دەزگـای موخـابەراتی بەرگـری (لە چـاوپێکەوتنێکی سـالّی ٢٠٠٠دا) دەڵێـت: "سـوپای عێـراق بە

بەردەوامی هێز و توانای خۆی لە ماوەی جەنگدا پەرە پێ دا و بە خێرایی بوو بە کاریگەرترین و بەتواناترین هێز لە ناوچەکەدا و ترسولەرزی خستبووە دڵی ئیسرائیلییەکانەوە. سەرباری ئەوەش دەستتێوەردانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کەنداودا، کۆتایی بە کاریگەریی هێزی دەریایی ئێران هێنا و هەڕەشەی زیادی گەرمبوونی شەڕی هێنایە ئاراوە. لە ڕووبەڕووبوونەوەی جیاکارییەکی لەم چەشنەدا، سەرکردایەتیی ئێران دەبوو بە دوای مەبەستی گەورەتردا بگەڕێن، کە دەچووە خزمەتی بەردەوامیی جەنگەوە. چاوەڕوانکردنی سەرکەوتن لە پاش شەڕێکی دووردرێژی شەکەتکردن، بێهودە بوو ـ چونکە شەکەتکردن ئێستا زیان بە کۆماری ئیسلامی خۆی دەگەیەنێت، هاوکات لەگەڵ ئەو شۆڕشگێڕییە توندەی کە ژیانی پێ دەبەخشی. بەوپێیە، ئەوەی کە جەنگی کۆتایی پێ هێنا، ئەقڵیەتی توندڕەوانەی سەرکردایەتیی ئەکلیرکی بوو، چونکە کۆماری ئیسلامی دەبوو شتێک بکات بۆ مانەوە.

بەڵام دەبێت ئەم خاڵە ڕەچاو بکرێت: ئەگەر تا هاوین عێراق توانیی دوژمنەکەی لەو شوێنانە دەرپەڕێنێت کە گرتوونی، لەوە زیاتر چیتر بە دەست بێنێت کە ئەو بڕە هێجگار زۆرە زرێپۆشە بەجێماوەی ئێرانی دەست کەوتبێت؟ هەر دوو لا زیانێکی گیانیی هێجگار قەبەیان لێ کەوت. سەرباری ئەوەش، عێراق خۆی کردە ژێر قەرزێکی واوە کە نەتوانێت وا زوو بیداتەوە، تەنانەت ئەگەر کەرتە نەوتییەکەشی بگەڕایەتەوە سەر داروباری خۆی. هەروەها هەر چەندە هەر دوو ڕژێمەکە بە چەسپاوی لە شوێنی خۆیان مانەوە، بەڵام کاتێک کە ڕێککەوتننامەی ئاگربەستیان

لە ئابدا مۆر کرد، گەڕانەوە هەمان سنووری نێودەوڵەتیی کۆن، وەک ڕاستییەک کە جەختکردن بوو لەسەر بێهودەیی جەنگەکە.

کەوابوو ئەمە سەرکەوتنی عێراق نەبوو و درەنگوەختێکیش ئێران تێگەیشت کە نەیبردووەتەوە. بێجگە لە شکستهێنانیش، ئێران بە تەواوی پەکی کەوت و توانای فشارهێنانی نەما. ئەوجا بۆ ئەوەی ئێرانییەکان بهێنرێن بە چۆکدا، لەوە زیاتری پێویست دەکرد کە عێراقییەکان خۆیانیان بۆ ساز کردبوو، ئەویش تەرخانکردنی سەرچاوەگەلی بەرفراوان و هاوپەیمانیی ئاشکراتری ئەمەریکا و عێراق بوو. لە بەر ڕۆشنایی ئەمەدا، هەر دوو هەڕەشەی عێراق و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، فاکتەرێکی خێراکردنی کۆتایی جەنگ بوو، چونکە وەک ڕاستییەکی بنەڕەتی ـ با درەنگوەختیش بووبێت ـ حەزکردنێکی ڕژێم بوو بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتنێکی مەحاڵ.

"ئەنجوومەنی ئاسایش بە توندی ئیدانەی بەردەوامیی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دەکات، لە شەڕ و ململانێی نێوان کۆماری ئیسلامیی ئێران و عێراقدا و واش چاوەڕوانە کە هەر دوو لا لە داهاتوودا واز لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بێنن."

**بڕیاری (٦١٢)ی ئەنجوومەنی ئاسایشی**
**نەتەوە یەکگرتووەکان**
**٩ی مایسی ١٩٨٨**

**مەڕەڕەش دەباڕێنێت(*)**

(*)(لە دەقە ئینگلیزییەکەدا بە ئیدیۆمی Black sheep bleating واتە مەڕەڕەش دەباڕێنێت لە بنەڕەتدا ئیدیۆمێکی ئینگلیزە کەوا کاتی خۆی لەبەر هۆکاری بازرگانی مەڕی سپییان لا پەسەند بووە لەبەر خورییەکەی و لە بەرانبەردا خوریی مەڕی ڕەش کەمبایەخ و کەمنرختر بووە و هەڵکەوتنی مەڕێک یان چەند مەڕێک لە ناو ڕان یان مێگەلەمەڕێکدا بە نەشاز و ناپەسەند لەقەڵەم دراوە و تەنانەت لە باوەڕی میللییشدا مەڕ و بەرانی ڕەشیان بە شەیتان داناوە و لای گەلێک میللەتی دنیاش مەڕی ڕەش پەسەند نییە. من لە چاپی یەکەمدا تێرمی 'دێزەم' بە کار

هێناوە کە لە زمانی کوردیدا پەندی 'کەری دێز تۆپینی خۆی و زەرەری خاوەنی گەرەکە' هەیە و مەبەستی تێکستەکەش لێرەدا ئەوەیە کە مەڕی ڕەش وەک کەری دێز ناپەسەندە، وەرگێڕ.)

جەنگی سارد لە سالانی ١٩٨٠کاندا، بەرەو کزی دەچوو. سالی ١٩٨٢ لیۆنید بریجنێڤ کۆچی دوایی کرد و دوو سەرکردەی نەخۆش یەک لە دوای یەک جێگەیان گرتەوە، تا هاتنی میخائیل گۆرباچیۆڤ لە سالی ١٩٨٥دا. هێزەکانی سۆڤیێت لە ئەفغانستاندا تووشی ئاستەنگێکی قورس هاتبوون و سەریان لێ شێوابوو و جەنگاوەرانی بەرگریی ئیسلامی (موجاهیدین)، کە ئەمەریکا پشتی گرتبوون، خراپیان بەسەر هێنابوون و خواخوایان بوو لەو بارودۆخە سەختە ڕزگاریان بێت. دۆخەکە لە ناوچە داگیرکراوەکانی ژێردەستی ئیسرائیلدا بەردەوام نائارام بوو. سیاسەتی بەردەوامی ئیسرائیل لە دروستکردنی نیشتەجێی نوێی جوو لەسەر خاکی فەلەستین، بە شێوەیەکی حەتمی بەرگریی بەرپا دەکرد و سوپاش لە سالی ١٩٨٥دا سیاسەتێکی 'مشتەکۆلەی ئاسنینی' دلڕەقانەی گرتە بەر لە ڕاگواستن و گرتنی بێدادگاییکردن و مال و خانوو ڕووخاندندا. هەروەها ئیسرائیلییەکان بەشێکی لوبنانیان لە سالی ١٩٨٢دا داگیر کرد، بۆ دەرپەڕاندنی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین. ئەمە بوو بە هۆی بەرپابوونی بەرگریی شیعە، بەو بۆردمان و خەلک فڕاندنەی حیزبوللا لە پشتیانەوە بوو، کە بزووتنەوەیەکی ناوخۆ بوو و پشتگیرییەکی سیاسی و ماددیی بەهێز دەکرا لە لایەن سەرکردایەتیی ئایینیی

ئێرانەوە. لە تاران مەلاکان هەراوهوریای ئەوەیان بوو کە بە نیازن شۆڕشی ئیسلامی بڵاو بکەنەوە و هەر دوو قەوارەی زایۆنی و فەرمانڕەوا گەندەڵەکانی شێخنشینانی نەوت لە کەنداودا تێک بشکێنن. لەم قۆناغەدا ئەگەر سەرکردایەتیی ئێران بچوایەتە لای نەتەوە یەکگرتووەکان و سکاڵای ئەوەی بکردایە کە عێراق بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتیی مرۆڤایەتیی پێشێل کردووە، دەبوو کێ گوێی لێ بگرتایە؟ ئێران، بە دژایەتیکردنی ڕۆژئاوا و پاڵپشتیکردنی تەکتیکە توندوتیژەکانی حیزبوڵڵا و هەڕەشەکردن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەوەی سیستەمێکی ئیسلامیی مۆدێل خومەینی تێیدا دەسەپێنێت، خۆی خستبووە بارێکی بێزلێکردن و دابڕینەوە و بە شێوەیەکی کاریگەرانە پێگەی خۆی لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە دەست دابوو، بە تایبەتی وەک داواکاریی جێبەجێکردنی مافی مرۆڤ. تاران بە شێوەیەکی سارد و نیوەناچڵ مامەڵەی لەگەڵ کۆمەڵی نێودەوڵەتیدا دەکرد و بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی پشتگوێ دەخست، ئەگەر لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیدا یەکیان نەگرتایەتەوە و دەیویست بە تۆپزی دابڕینی خۆی بکاتە خاسیەتێکی پاک و پوختی ئایدیۆلۆجیی هەماهەنگ لەگەڵ تێڕوانینی وشکوبرینگی خۆیدا. بەوپێیە جێی سەرسووڕمان نییە، کە نارەزاییدەربڕینی ئێران سەبارەت بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە، بە زۆری گوێی نەدرایە و بە تایبەتی لە قۆناغە بەراییەکانی سالانی ١٩٨٣ و ١٩٨٤دا، کاتێک عێراق دەستی کرد بە تاقیکردنەوەی هەر دوو: تەکنۆلۆجیای نوێ و چاوپۆشینی نێودەوڵەتی لە ڕەفتار و

هەڵسوکەوتی، لە کاتێکدا کە دەستتێوەردان جیاوازییەکی بەرچاوی دروست دەکرد.

ئێران بە تەواوی لەسەر هەق بوو کە سکاڵای لەسەر ئاوها پێشێلکارییەکی ئاشکرا و بێپەردە دەکرد بۆ ڕێککەوتننامەیەکی ددانپێدانراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤ بوو. سەرنەکەوتنی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕاگرتنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە عێراقدا، دەرەنجامی ترسناکی لێ کەوتەوە و ئێرانییەکان دەیانبەستەوە بە پەرەسەندنی حاڵەتێکی داڕێژراوەوە کە بەکارهێنانی گازی ژەهراوی لە لایەن عێراقەوە، تێیدا ڕوو لە هەڵکشان بوو. گاڵتەجاڕییەکە لەوەدا بوو کەوا کردەوەکانی عێراق هێند درندانە بوون، ئێران دەیتوانی بێ هیچ ڕازاندنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرا باسیان بکات و ڕاپۆرتیان لە سەر بدات. بە پێچەوانەوە، عێراق پاڵی لێ دابووەوە و پشتی بە هاوکاریی نێودەوڵەتی بەستبوو، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم تۆمەتانە، بە نکوڵیلێکردنێکی وشک و پاساوهێنانەوەیەکی فێڵاوییەوە ـــ ئەوەی لێ بەدەر کە لە سنوور دەچوونە دەرەوە، وەک ئەوەی کە لە هەڵەبجەدا کردی. پاشان دروستکردنی پەشۆکان و شپرزەییەکی بە ئەنقەست تاقە ڕێگە بوو بۆ دەربازبوون لە ئابڕووچوونەکە. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨دا بیانووەکە زۆر درەنگوەخت بوو بۆ پێچەوانەبوونەوەی پەرەسەندن و هەڵکشانی کیمیایی پرمەترسی.

مامەڵەنەکردنی گونجاوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەگەڵ مەسەلەی چەکی کیمیاییدا، زیانی بە پێگە و هەڵوێستی گەیاند، وەک ناوبژیوانێکی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی و

هەمــوو ئیــدیعایەکی ئەوەی لە بنــدا بــڕی کە داکۆکیکــار و پاڵپشــتی مــافی مــرۆڤە لە ســەروەختێکدا کە مــافی مــرۆڤ بووەتە وێردی ســەرزاری هەمــوو کەســێک و ســەرۆکایەتیی نەتەوە یەکگرتووەکــان دەبــوو ئەم چەمکەیــان لە پێشــی پێشــەوەی هەمــوو شــتێکەوە دابنــایە. ئەگەر شــتێک نەتەوە یەکگرتووەکــانی ڕزگــار کردبێــت لە تــێکەوتن و ڕووشــانی ناوبــانگی، ئەوە خــافییر پێرێــز دیکــۆیلاری ســکرتێری گشــتی بوو.

لە پرۆتێستکردن و نارەزاییدەربڕین لەســەر بەکارهێنــانی گــاز لە لایەن عێــراقەوە، ئێــران باشــترین ڕۆڵــی گێــڕا، بــۆ ئاشــکراکردنی و لە لایەکــی تریشــەوە وەک ســەرســەختترین دوژمنــی. لە دەســپێکی هــاوینی ١٩٨٣وە، سکاڵا و داواکــاریی ئێران هاوکات لەگەڵ هێرشەکانی گازی عێراقدا زیــادی کــرد، بەڵام لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایشــەوە گوێی لــێ نەدەگیــرا، بــۆیە ئێــران دەســتەودامێنی ســکرتێری گشــتی بــوو بە شــێوەیەکی شەخســی بکەوێــتە بەیــنەوە. لە کاتێکــدا کە وردەکاریی مەسەلەکە نارێکوپێک بوو ـ چونکە مێژووەکــان هەڵە بوون، ناوی شوێنەکان شێواو بوون و جۆری گازەکان دەسنیشــان نەکرابــوون ـ بەڵام تکاکارییەکــان بە شــێوەیەکی چەســپاو ئامــانج بــوون، یــان لای کەمەکەی هەرگیــز هەڵە نەبوون لەوەدا کە عێراق، جارێکی تر، چەکی کیمیایی بە کــار هێنــاوەتەوە. تیمــی پســپۆڕان، کە بە تەخــویلی خــودی پێرێــز دیکــــۆیلار نێردرابــــوون و لە ڕاپەڕانــــدنی ئەرکەکەیانــــدا گەیشتبوونە ئەو ئەنجامەی کەوا هێزەکانی ئێران بە ڕاســتی کەوتوونەتە بەر کاریگەریی گــازی ژەهــراوی لە ســاڵی ١٩٨٦ بەملاوە، بێ هیچ دوودڵی و گومانێک تاوانبار عێراق بووە.

بێجگە لەوەش، ئێران وردەوردە شارەزایی پەیدا کرد لە گرێدانی سکالاکانی بە یاسای نێودەوڵەتییەوە و بە تایبەتی بە پرۆتۆکۆڵی جنێڤەوە. وەختێ عێراق دەستی کرد بە گازبارانی خەڵکی مەدەنی، دیپلۆماتە ئێرانییەکان پەنایان بردە بەر زیاد لە چەمکێکی ئەخلاقی و قەدەغەکردنی پەلاماردانی خەڵکی مەدەنی ــ بە هەر چەکێک بێت ــ لەژێر پەردەی ڕێککەوتننامە مرۆڤایەتییە نێودەوڵەتییەکاندا. بە تێپەڕینی کات، مشتومڕی ئێران لە سەرەتا لاوازەکانیەوە، کە بە شێوەیەکی دڕندانە چەک و تەقەمەنی کارنەکراو و پاشان کاری زۆر خراپ و بەد بەجێ بهێڵرێت بۆ گفتوگۆیەکی هێمنانە لەسەر دەرەنجامە ئەخلاقی و سەربازییەکانی وەلاخستنی یاسای نێودەوڵەتی. بەم چەشنە کاردانەوەی ئێران بۆ یەکەمین هێرشە سەلمێنراوەکانی عێراق لە هاوینی ١٩٨٣دا، ئەوە بوو لەسەر بناغەی پێشتری لێدانی ئاسایی عێراق بۆ سەنتەرەکانی نیشتەجێی ئێران، کەوا "ملکەچکردنی ئەنجوومەنی ئاسایش و بایەخنەدانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی، بوون بە هاندەرێکی ڕژێمی حوکمڕانیی عێراق، کە بەردەوام بێت لەسەر کاری دڕندانەی خۆی"[1].

ئێرانییەکان بە درێژایی چەندین ساڵ، سەلماندنی خۆیان پوختە کرد و هێرشی بێپێشینەی گاز بۆ سەر شارۆچکەی سەردەشت لە حوزەیرانی ١٩٨٧دا، بە شێوەیەکی تایبەتی یارمەتیی تیژکردن و چڕکردنی بەڵگە و سەلماندنی دا. ئەم هێرشە، وەک ئێرانییەکان جەختیان لەسەر کردووە، "خاڵێکی وەرچەرخانی لە مێژووی بەکارهێنانی چەکی کیماییدا پێک هێنا" و "تیشکی سەوزی" دا بە عێراقییەکان بۆ چەندبارەکردنەوەی بەزاندنی پێوەرە نێودەوڵەتییەکان و

"بەوپێیەش گاڵتەکردن بە ویژدانی جیهان"[٢]. بێجگە لەوەش، ئەوان دەیـانگوت کەوا ئەنجـوومەنی ئاسـایش زۆر بـاش دەیزانـی کە "ڕاگەیانـدنە لاوازەکەی" لە وەڵامـی ڕاپـۆرتی پسـپۆڕانی نەتەوە یەکگرتووەکـان لە مایسـی ١٩٨٧دا "ڕەنـگە لە لایەن عێراقەوە بە ڕێگەپێدانێکی ڕەهـا لێک بـدرێتەوە بـۆ پەنـابردنە بەر چەکـی کیمیایی و ـ هەڵبەت لە ڕاستیدا هەر واش کەوتەوە"[٣]. لەو کـاتەدا عێـراق دای لە هەڵەبـجە و مشتومڕی پارێزبەنـدی و دەربـازبوون لە سزا، هێزی خـۆی لە دەسـت دابـوو. پـاش ئەوانە هەمـووی، دەبێـت چـی لە گازبارانی شارێک بەو گەورەییە خراپتر بێت؟ هەموو ئەوەی ئێران دەیتوانی بیڵێت ئەوە بوو، کە "ئێسـتا بە تەواوی ڕوونە کە سـەرنەکەوتنی میکـانیزمی مـامەڵەکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا، سەبارەت بەکارهێنـانی جینۆسایدییانەی چەکی کیمیایی لە هەڵەبجەدا و پەنـابردنێکی ئاسـت گەورەی تـر بـۆ شـەڕی کیمیـایی دژ بە نیشـانەکانی ئێـران و عێـراق وای لـێ دەکـات، لانـیکەم تـا ڕادەیەک بەرپرسیار بێت لە بەردەوامی و هەڵکشانی ئەو هەڵسوکەوتە تاوانکارییانەی دەستدرێژیکارە عێراقییەکان دەینوێنن"[٤].

هەروەهـا ئێـران وەک ئەنجـامێکی سروشـتی ئەم مشـتومڕەی پەرە پێ دا: بێدەنگیی ئەنجوومەنی ئاسـایش لە ئاسـت کـارە دڕنـدانەکانی عێراقـدا، ئەوە دەگەیەنێـت "کە هاوبەشـە لەم تـاوانە پڕشـوورەییانەدا"[٥]. ئەنـدامانی ئەنجوومەن بە هـۆی هەڵوێسـتی دیبلۆماسییان و پشـتگیریی سەربازی و دارایی چالاکیانەوە بۆ عێراق، بوون بە لایەن لە شـەڕ و ململانـێکەدا و بەو ڕەنـگە بـوون بە پشـکداری بەرپرسیار لە کار و کردەوەکانی عێراقدا و ئەم ڕاستییانەش

ئێـران وەک تـاوانی جەنـگ و جەنـگ لە دژی مرۆڤـایەتی و جینۆساید باسی لێوە دەکرد[٦].

لە سـاڵی ١٩٨٣دا، ئێـران پێـی لەسـەر ئەوە دادەگـرت کە ئەنجـوومەنی ئاسـایش لەجیاتیی ئەوەی سزای عێراق بـدات لەسـەر بەکارهێنـانی گـاز، بە پێچەوانەوە بە بڕیـاری (٥٤٠) خەڵاتی کرد کە هیچ باس و ناوهێنانێکی چەکی کیمیـایی تێدا نەبـوو. ئێـران جەختـی لەسـەر ئەوە دەکـردەوە کەوا "لەبەر هاندانی لەو چەشنە بوو کە حوکمدارانی عێراق هەستیان بە ئازادی دەکرد لە دۆزینەوەی کەناڵی تری تـاوان و پەنـابردنە بەر چەکـی کیمیاییدا"[٧]. ڕاسـتییەکەی عێراق هەر زوو دوای ئەوە لە قۆناغی گازی خەردەلەوە سەرکەوت بۆ توخمەکانی دەمارەگاز.

ئێرانییەکـان پـێ لەسـەر ئەوە دادەگـرن کە مەسـەلەکە پێچەوانە کەوتەوە. بـۆ نمـوونە ئەوان تێبینیـان کـردووە کە تەنهـا لە سـاڵی ١٩٨٦دا، ئەنجـوومەن بە تونـدی بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی ئیـدانە کـردووە، پـاش ئەوەی شـارەزاکانی نەتەوە یەکگرتووەکـان بۆیـان دەرکەوت کەوا عێـراق بەرپرسـیارە. هەر چەنـدە ئەنجـوومەن نەیتـوانی عێـراق گوناهبـار بکـات، بەڵام ئێـران هەر بە هێمنـی مـایەوە و وەزیـرەکەی دەرەوەی بە داخەوە سـەرنج دەدات کە "دەبـوو ئەم گوناهبـارکردنە سـێ سـاڵ لەمەوپـێش بکەوتـایەتە کـار، کاتێک کە ڕژێمـی عێراق ئەم چەکە قەدەغەکراوانەی خستە بواری کارپێکردنەوە لە شـەڕەکەدا، کە دەبوو بەردەوامـی و پەرەسـەندنی بەکارهێنـانی چەک و تەقەمەنیـی کیمیـایی، لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە بە ڕوونی قەدەغە بکرێت"[٨]. تەنـانەت ئەگەر ئەنجـامێکی لەو چەشـنە بە حـوکمی زەرورەت "ڕوون"

نەبوو، خۆ دەبوو لانیکەم لە ئاستێکی بەجیدا بێت و بەوپێیە هەوڵێکی بۆ بدرایە.

کردارێکی تر کە ئێران سوور بوو لەسەری و دەبوو ئەنجوومەن بەهەند وەری بگرتایە، جێگیرکردنی شارەزایانی چەکی کیمیایی بوو لە تاراندا، چونکە ئەوانە تاوتوێی ڕاستیی مەسەلەکەیان دەکرد لە کات و ساتی خۆیدا و لە ڕێگەی پشکنینی ئەو شوێنانەوە، کە عێراق گازی تێدا بە کار هێنابوو. دەبوایە بوار بەمە بدرێت بۆ دەستنیشانکردنی وردتری کارەکە (بە هۆی ڕەوینەوەی خێرایی دەمارەگاز و تا ڕادەیەکیش گازی سیانیدەوە) و ئەوجا دابینکردنی پاڵنەری بەهێزتر بۆ کردەوەی نێودەوڵەتی، ئەگەر ئاستی ڕاستەقینەی کێشەکە تێبگەیشتنایە[٩]. ئەم بۆچوونە لە لایەن پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، تەنها لە ساڵی ١٩٨٨دا دەنگی دایەوە و هیچ سەرنجراکێش نەبوو بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشێک کە تەواو بە لای عێراقدا دایشکاندبوو[١٠]. ئێرانییەکان هەندێک پێشنیاری تری لووتشکێنیان کرد، کە بریتی بوو لە ــ ئابلۆوقە سەپاندنێکی ئیلزامی لەسەر هەناردەی توخم و تەکنۆلۆجیا کیمیاییەکان بۆ عێراق[١١] یان تەنانەت ئابلۆوقەیەکی تەواو لەسەر هەموو جۆرە چەکێک ــ کە ئەمیش بە هەمان شێوە پشتگوێ خرا. هەموو ئەوەی کە سکرتێری گشتی ئامادە بوو بیکات، ناردنی پسپۆڕان یان شارەزایان بوو بۆ ناوچەکە و هەمووو ئەوەش کە ئەنجوومەن کردی گوناهبارکردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و هاندانی هەر دوو لا بوو، کە واز لە شەڕوشۆڕی کیمیایی بێنن، تەنانەت با عێراق خۆی بە تەنهاش گوناهبار بێت.

لەم پرۆسەی هیچنەکردنەدا، ئێران نارەزایی دەردەبڕی و ئەنجوومەنیش پێگە و هەڵوێستی خۆی دۆڕاند، وەک ناوبژیکەرێکی نێودەوڵەتی: "کاتێک بۆچوونە سیاسییەکان زاڵ دەبن بەسەر ئۆرگانێکی نێودەوڵەتیدا" وەک دیپلۆماتەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان پێیان لەسەر دادەگرت "بۆ ئەنجامدانی ئەرکی دەستووریی ئەو ئۆرگانە" لە بەرانبەر پێشێلکاریی گەورەی یاسای نێودەوڵەتیدا و پاشان "ئەوانەی هۆکاری بوونی ئەم ئۆرگانەن، دەبنە قوربانیی راستەوخۆی"[١٣]. ئەگەر مەسەلەکە زۆر بە گەرمی وەربگرین، وەک ئێران دەڵێت، چاوپۆشیی بەردەوامی نێودەوڵەتی لە پێشێلکارییەکانی عێراق بۆ پرۆتوکۆڵی جنێڤ، بوو بە هۆی "داماڵینی دەسەڵات لە هەموو بنەما و پێوەرێکی یاسای مرۆڤایەتیی نێودەوڵەتی"[١٤]. ئەمەش بە رۆڵی خۆی بوو بە هۆی کەمکردنەوەی "بێزکردنەوە و رقلێبوونەوەی ئەم چەکە تۆقێنەرانە"[١٥].

راستییەکەی گەلێک سوود هەبوون درەنگوەخت پێیان زانرا و ئێران هەردەم باسی لە مۆتەکەی پەرەسەندنی چەکی کیمیایی دەکرد و هاتنەکایەی تەنانەت چەکی کوشندەتر و بڵاوبوونەوەی بەکارهێنانی زیاتری ئەم تەکنۆلۆجیا کوشندانە. هەروەها ئێران پتر جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە "ترسی ئەوە لەئارادایە بەم زوانە کێبڕکێیەکی نێودەوڵەتیی قەبە و زەبەلاح لە بواری چەکی کیمیاییدا بێتە ئاراوە"[١٦]. بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن کە عێراق پەرەی بە توخمەدەماری خێرا و کوشندەتر داوە لە چەشنی ڤی ئێکس و دەستی کردووە بە بەرهەمهێنانی توخمی بایۆلۆجییش. عێراق ئەگەر ئەو هەڵە و گەوجێتییەی

داگیرکردنـــی کـــوەیتی نەکـــردایە، ئەوە دەیتـــوانی چەکـــی ئەتـــۆمییش دروســـت بکـــات. هەروەهـــا ئێـــرانیش دەســـتی کردبـووە پەرەپێـدانی پرۆگرامـی چەکـی کیمیـایی و گومـانی ئەوەش هەبـــوو، کە لە پـــاش جەنـــگ، پرۆگرامـــی چەکـــی بایۆلۆجی و ئەتۆمییشی دەست پێ کردبێت.

ئێران هەرگیز وەڵامێکی کاریگەرانەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراقی دەست نەکەوت و سـەرکردەکانی بەردەوام ئەوەیـان دووپـات دەکـردەوە کە ئێـران گـازی ژەهراویـی بە کــار نەهێنــاوە لەبەر ڕێــزی "مرۆڤــایەتی و ئەحکامەکــانی ئیســـلام و یاســـای نێـــودەوڵەتی"، هەر چەنـــدە بە ئیـــدیعای خۆیان، توانایان بووە ئەو کارە بکەن ـ کە پێدەچێت فڕوفێڵ بێــت[17]. بەڵام جارجــارە ئاماژەیــان بەوە دەدا کە هێرشـــە گازەکـــانی عێـــراق و "کـــاردانەوەی نێگەتیڤـــی" کـــۆمەڵی نێـــودەوڵەتی، هـــیچ بـــوارێکی تـــری لە بەردەم ئێرانـــدا نەهێشتبووەوە، لەوە زیاتر کە بە هەمان شت وەڵامـی عێـراق بداتەوە[18]. بە تایبەتییش لە پاش هێرشەکەی سەردەشت، کە وەک بانگەشەیان بۆ دەکرد لە گرنگی و بایەخی بۆمبەکـانی هیرۆشـیما و ناگازاکیـدا بـوو، ئێـران "تەحەفـوزێکی کـاتیی" تۆمـار کـرد ســەبارەت بە ئیمزاکردنـی لەسـەر پرۆتۆکـۆڵی جنێڤ و بەوە مافی تۆڵەکردنەوەی کیمیایی بە خۆی دا، "تا ئەو کـاتەی ئیجرائـاتی پراکتیکی بـۆ قەدەغەکردنـی عێـراق لە ئەنجامـدانی هێرشـی کیمیـایی زیـاتر بەرجەسـتە دەبێـت"[19]. پرۆتۆکۆڵی جنێڤ ڕێگەی بەکارهێنانی گـاز نـادات لە شـەڕ و ململانـــێ نێودەوڵەتییەکانـــدا، بەڵام گەلێـــک وڵات لە کـــاتی ئیمزاکردنیـــدا، تەحەفوزێکیـــان کـــردووەتە هـــاوپێچ و ڕایانگەیاندووە کە پرۆتۆکۆڵەکە "لە کار دەکەوێت" ئەگەر لە

حاڵەتێکدا کە دوژمنێک پێشێلی کرد. عێراق کە لە ساڵی ١٩٣١دا ئەم ڕێککەوتننامەیەی مۆر کردووە، تەحەفوزێکی لەم چەشنەی تۆمار کردووە و ئێران نەیکردووە. بەڵام وا ئێستا دۆخەکە ئێرانی ناچار کرد کە ئەویش تەحەفوزێکی وا تۆمار بکات.

تاران، بۆ ئەوەی قورسایی بداتە هەڕەشەی پەنابردنی بۆ بەکارهێنانی گاز، خۆی بەوەوە هەڵدەکێشا کە بەرنامەیەکی چالاکی چەکی کیمیایی هەبووە. بەڵگەکان ئەوە دەردەخەن کە لە ئاخروئۆخریی جەنگدا، شتێکی وای کردووە و جاڕنامەکەی بەپێی ڕێککەوتننامەی چەکی کیمیایی ساڵی ١٩٩٣ ئەوە دەسەلمێنێت. ئێران ئەم شێوە ڕازاندنەوەیەی زمانی بە کار دەهێنا بە درێژایی جەنگ ـ "ئێمە بە کارمان نەهێناوە و بەدەر لە پرەنسیپ و بنەماکان بە کاری ناهێنین، بەڵام پێدەچێت بە کاری بێنین، چونکە دەتوانین و ڕەنگە بە کاری بێنین، چونکە ئێوە هیچ شتێکی ترتان لە بەردەمماندا نەهێشتووەتەوە". بە پێچەوانەی عێراقەوە، ئێرانییەکان زۆر ئیشارەتیان بەوە نەدەدا کە ئەوان هیچ کات چەکی کیمیاییان بە کار هێناوە و ئەمەش وا دەگەیەنێت کە نەیانکردووە.

ئەگەر بە ڕاستی هەرگیز گازیان بە کار نەهێنابێت، لەبەر ئەوە بووە کە ئێران لەوە گەیشتووە کە ناتوانێت بە شێوەیەکی کاریگەرانە بەرەنگاری پەلاماری گازی عێراق بێتەوە بە کاردانەوەیەکی کیمیایی و ڕەخساندنی درەنگوەختی دەگێڕێتەوە بۆ پەرەسەندنی ئەم چەکە. بەپێی قسەی باڵوێز تەباتەبایی کە کاربەدەستێکی باڵا بوو لە وەزارەتی دەرەوە و (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) عێراق لە ساڵی ١٩٧٠وە دەستی بە بەرنامەی چەکی کیمیایی

کـردووه. بەڵام ئێـران لە سـەرەتای سـاڵانی ١٩٨٠کـانەوە دەسـتی داوەتـێ و لەم بـوارەدا سـیازدە سـاڵ لە دوای عێراقەوەیە. پاشان ئێران "دوو کارگەی کاتیی دامەزراندووە و توانیـویەتی بڕێکـی سـنووردار گـازی خەردەل بەرهەم بێنێت و دواتر توخمی تری کیمیاییمان بەرهەم هێنا، بەڵام هەرگیـز وەک چەک نەمانخسـتە کـار". لەبـری ئەوە ئێـران بڕیاری دا بایەخی پڕۆپاگەندە زیاد بکات، کە وای بۆ دەچوو بە ڕووهەڵماڵینی بەردەوامی گاز بەکارهێنانی عێراق ئەمیش بـرەو پەیـدا دەکـات. ئەم سـتراتیجە سـەرکەوتنێکی سنووورداری لێ کەوتەوە، چونکە ئێران کەرەدێزی کۆمەڵی نێـودەوڵەتی بـوو. تەنـانەت ئەگەر تۆمەتبارکردنەکەشـی بنەمایەکی ڕاستی هەبووبێت، ئەی ئێران خۆی چی بوو ــ کۆمـارێکی تونـدڕەوانی دەمـارگرژی ئیسـلامی، بـارمتە گلـدەرەوە و پاڵپشـتی تیرۆریـزم ــ بەولاوە زیـاتر نەبـوو. بێجگە لە هەندێک کاربەدەستی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە بۆ سـکرتێری گشـتی کاریـان دەکـرد و پێـک هـاتبوون لە پسـپۆڕانی چەکـی کیمیـایی و ئەوانەی بـۆ پەکخسـتنی پەرەسـەندنی چەکی کۆمەڵکوژ کاریـان دەکـرد، پێنەدەچـوو کەس گـوێ بـداتێ. ئەمە زیـانی بە پـێگە و بـایەخی ئێـران دەگەیانـد، وەک: شکسـتهێنانی لە قەنـاعەتپێکردنی جیهـان کە بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لە لایەن عێـراقەوە دەبێـت بوەستێت و زەمینەی ڕەخساند بۆ بەکارهێنانی گـازی زۆری ئەو وڵاتە لە دوا شەڕگەکانی جەنگدا و هەڕەشـەکردنی کەوا تاران دەکاتە نیشانە و ئامانج.

عێراق بە زۆری نوێنەرانی ئێرانی نەتەوە یەکگرتووەکانی پشـتگوێ دەخسـت، یـان لای لـێ نەدەکـردنەوە و خـۆی بە

مشـتومڕییانەوە سـەغڵەت نەدەکـرد. یەک لەو کـاردانەوە و وەڵامانەی پێی باش بوو، تۆمەتبارکردنی ئێران بوو بە درۆ و دووڕوویـی و جەختـی لەسـەر ئەوە دەکـردەوە کە ئێـران خەڵکـی مەدەنیـی کـردووەتە ئامـانج و نیشـانە (بە چەکـی ئاسایی) لە سـەرەتای جەنگەوە[٢٠]. شـتێکی تر ئەوە بـوو کە بیـری چـاودێرانی نێـودەوڵەتی بێنێـتەوە، کە بـوونی تەواوی عێـراق لە مەترسـیدایە لە بەرانـبەر داگیرکەرێکـی دڵڕەقـدا و "شتێکی سروشتییە کەوا عێراق وەک قوربانیی داگیرکردن و دەسـتدرێژی، دەبێـت پەنـا بەرێـتە بەر هەمـوو هۆکـارێکی پێویسـت بـۆ بەرگریکـردن لە ئەمـن و ئاسایشـی خـۆی، لە بەرژەوەندیی زیندووی خۆی و لە بوونی خۆی"[٢١].

وەڵامدانەوەی عێراق لەوە زیاتر ڕۆیشت و لەمەدا عێـراق پشـتگیریی ئەنجـوومەنی ئاسایشـی بـۆ خـۆی دابـین کـرد. هەروەهـــا پێـــداگری و مشـــتومڕی عێـــراق، پـــاڵی بە ئێرانییەکانەوە نـا بەرەو باوەشـی سـکرتێری گشـتیی نەتەوە یەککگرتووەکـــان، وەک تـــاکە ئەڵتەرنـــاتیڤێکی بەجـــێ. ئەو گفتوگـۆیەی هۆکـاری پەیوەندیـداری گەلاڵە کـرد لە بەرانـبەر کۆتاییهـــاتنی جەنگـــدا، یـــان بە شـــێوەیەکی جیـــاواز، دژە پچڕپچڕەکـــانی خســـتە بەرانـــبەر جێبەجێکردنـــی تەواوی پابەندییە نێودەوڵەتییەکان لە لایەن عێراق و ئێرانییەکانەوە. یـــان دانـــانی ڕێگەیەکـــی تـــر، ئەنجامێـــک لە بەرانـــبەر نزیکبـوونەوەیەکی گشـتگیر و هاوکـات بـۆ کۆتاییپێهێنـانی ململانێکە.

مشتومڕی عێراق بەم شێوەیە بەڕێوە چوو: ئێران (سـاڵی ١٩٨٢) خـاکی عێراقی داگیـر کـرد و یەکەم دەسـدرێژیکاریش بـوو لە سـاڵی ١٩٨٠دا. ئێـران پابەنـدیی ئەوەی دەربـڕی کە

ملکەچی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش بێت، کە داوای لە هەر دوو کـرد کۆتـایی بە نـاکۆکی و ململانـێ بێـنن، بەڵام نەیتوانی ئەوە بکات، لەبەر ئەوە نابێت ڕێگە بە ئێران بدرێت لە ناو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییە جۆراوجۆرەکاندا کامی بە دڵ بێت ئەوە هەڵبژێرێت و بەو یاسایانەی جەنگ قایل بێت (کە چەکـــی کیمیـــایی قەدەغە دەکەن) وەک ڕەوایەک و لە هەمـان کاتیشـدا دەسـتووری نەتەوە یەکگرتووەکـان ڕەت بکـاتەوە (بە بەردەوامبـوون لەسـەر یاساشـکێنیی ئاشـتی و ئاسایشی جیهانی). بۆ نموونە عێراق مشتومڕ لەسـەر ئەوە دەکات کە:

"... هەر داواکـارییەک بـۆ ڕێزگـرتن لە بنەمـای یاسـاکانی نێودەوڵەتی و دەستووری نەتەوە یەکگرتووەکان، کە ڕۆڵ و دەسـەڵاتێکی ناوەنـدی بۆ ئەنجـوومەنی ئاسـایش دانـاوە، لە بـارودۆخی ململانێی چەکداریدا. ڕژێمـی ئێران، بە سـووک تەماشـاکردنی دەســەڵاتی ئەنجــوومەن و ڕەتکــردنەوەی بڕیارەکـــانی، کە بە کـــۆی دەنـــگ دەرچـــوون لە بـــارەی چارەســـەری ئەو ململانـێ چەکـدارانەی بەســـەر عێراقـدا سەپاوە، ئەو لایەنەیە کە دەبێت بەپێی ئەو بنەما یاساییانەی ئەو داوای دەکات ئیدانە بکرێت".[٢٢]

ئێــران بەو ســکاڵایە وەڵامــی دایەوە کەوا کارتەکــانی ئەنجـــوومەنی ئاســـایش لە دژی ئەو ڕێـــک خـــراون و بڕیـــارگەلێکی دەرکـــردووە کەوا بە شـــێوەیەکی نەگـــۆڕ لایەنگری دوژمنەکەیەتی. ئێران لە سـەرەتای ساڵی ١٩٨٣دا، سـکاڵا لەوە دەکـات کە "وادیـارە ئەنجـوومەنی ئاسـایش، لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ نـاکۆکی و ململانێی ئێـران ـ عێراقـدا، بەپێی بنەمای دەستوورێکی جیاوازی نەتەوە یەکگرتووەکان

کار دەکات، نەک ئەو دەستوورەی کە ئێران پابەندیەتی".
لایەنگرییەکە، وەک ئێران دەڵێت، بە ئاشکرا لەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتووە کە عێراقی "دەسدرێژیکار" خراوەتە پرۆسەی مامەڵە لەگەڵ کردنەوە لە کاتێکدا کە ئێرانی "قوربانیی" لێ دەرکراوە[٢٣].

ئێران خاڵێکی هەبوو، بەڵام باسکردنی ئەوەی فەرامۆش کردووە بڵێت کەوا ئێران خۆی لە پرۆسەکە دەرکردووە و خۆی لە ئەنجوومەن دوور خستەوە، چونکە ئەو دەزگایە نەیتوانی عێراق وەک دەسدرێژیکار بناسێنێت. هەڵبژاردنی ئەم خۆدوورخستنەوە بوو، لە تاوتوێکردنی ئەنجوومەن و شانبەشانی زیادکردنی مەترسیی هێرشکردنە سەر مەدەنییەکان، کە وای لە پێرێز دیکۆیلار کرد هەر لە سەرەتاوە لێکۆڵینەوە لەسەر تۆمەتی گازبارانەکان بکات. ئەو لەم کارەیدا پابەندییەکی ئیلزامیی هێنایەوە بۆ مسۆگەرکردنی و پێکهاتنەوە لەگەڵ یاسای گونجاوی نێودەوڵەتیدا، نەک هەر تەنها "گەڕان بە دوای کۆتاییهێنانی ناکۆکی و ململانێ" و هەروەها "بۆ خاوکردنەوەی کاریگەرییەکانی، لەو ناوچانەی چەشنی هێرشکردنەسەر مەڵبەندی نیشتەجێی دانیشتوان، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، مامەڵەکردنی دیلەکانی جەنگ و سەلامەتیی گەشتی دەریایی و ئاسمانی"[٢٤]. سکرتێری گشتی بە ئاشکرا هیوای ئەوەی دەربڕی کە بە پەیوەستکردنی سەرکردەکانی ئێران بە مەسەلەیەکەوە، کە جێی بایەخی تەواویان بێت، ئەو کاتە دەتوانی ڕایانکێشێتە پرۆسە دیبلۆماسییەکەوە و بەم ڕەنگە دانوستان بکرێت لە بارەی دانانی کۆتاییەک بۆ شەڕ و ناکۆکی. بە هەرحاڵ، دەسپێشخەرییەکەی شتێکی ئەوتۆی لێ

نەکەوتەوە و لە کاتێکــدا کە عێــراق بەکارهێنــانی چەکــی کیمیایی خۆی زیاد کرد، ئێرانییەکان نەک هەر ڕانەکێشرانە نێـو هـیچ پرۆسـەیەکەوە، بەڵکـو قەناعەتیـان بەوە هێنـا کە ئەوان تەنها قوربـانیی دەسـدرێژیکاری نین، بەڵکو قوربـانیی شێوازی نایاسایی شەڕەکەشن.

یاســاکانی جەنــگ (کە بە یاســای نێــودەوڵەتیی مرۆڤــایەتییش دەناســرێن)، بــریتین لە کۆمەڵێــک ڕێککەوتننـامەی نێـودەوڵەتی، کە دەوڵەتـان گفتوگۆیـان لە بارەوە کردووە لەسـەر بنەمـای ئەزموونەکـانی جەنگ و بە تـایبەتی تێگەیشـتنی ئەوەی کە بەرژەوەنـدیی زینـدوویان، بە ڕێگـرتن لە هۆکارەکـانی جەنـگ، دەپارێزرێـت. زۆربەی ئەم ڕێگرتنانە لە شێوەی پابەندبوون بە ڕێککەوتننامەکانەوە دێن و بەناوبانگترینیـان ڕێککەوتننامەکـانی سـاڵی ١٩٤٩ی جنێڤن، بەڵام هەندێکیان هێند بنەڕەتین و وەک ئەوە وان کە حـاڵەتی کـۆدەنگیی جیهانییـان بە دەسـت هێنابێـت، بـێ ڕەچـاوکردنی ئەوەی وڵاتێـک ڕێککەوتننامەکـانی ئیمـزا کردبێـت یـان نە. قەدەغەکردنـی هێـرش و پەلامـار بـۆ سـەر خەڵکـی مەدەنـی، یەکـێکە لەو ڕێگـرتنە جیهانییـانە و پێشێلکردنیشــی دەگــاتە ئاســتی تــاوانی جەنــگ. یاســاکانی جەنــگ جیــاوازن لە دەســـتووری نەتەوە یەکگرتووەکـــان، کەوا کـــردەوەی دەسدرێژیی قەدەغە دەکات. بە هۆی بەکارهێنانی بەردەوامی عێراقیشــەوە بــۆ چەکــی کیمیــایی، ئەوە ئەفزەلیەتــدانی بە دەسـتوورەکە جێـی سەرسـوڕمان نەبـوو، چـونکە تەنـانەت ئەگەر عێـراق دەسـدرێژیکاریش بووبێـت، ئەوە ئەنجـوومەنی ئاسـایش هێنـد نـاحەز بـوو بە ئێـران کەوا مەسـەلەکەی بـێ بڕیاردان بەجێ هێشت. تەنها لە پاش داگیرکردنـی کوەیت لە

لایەن عێراقەوە، ساڵی ۱۹۹۰، پێریز دیکۆیلار ئەوەی کرد و لە یەکێک لە دوا کارەکانیدا، پێش ئەوەی ئۆفیس بەجێ بێڵێت، بە ئاشکرا عێراق وەک دەستدرێژیکار ناو دەبات لە شەڕ و ناکۆکیی پێشوودا[٢٥].

ئێران پشتی بە لێکۆڵینەوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەستبوو بۆ کۆسپ خستنەڕێی بەغدا و ئەمەش ڕقی عێراقییەکانی هەڵساند. لە ساڵی ۱۹۸٦دا، پاش ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان عێراقی بەوە تاوانبار کرد کە بووەتە سەرچاوەی برینی کیمیایی سەربازە ئێرانییەکان، ڕژێمی عێراق زۆر بە توندی ڕەخنەی لە شێوازی "هەنگاو بە هەنگاوی" پێریز دیکۆیلار گرت، کە پشتگیریی لەو پرۆسە دیبلۆماسییە بریوە، کە بە نیازە کۆتایی بە جەنگ بێنێت و بەمە کات بە ئێران دەدات خۆ ئامادە بکات بۆ هێرشی سەربازیی نوێ. عێراق ئەو بڕیارانەی بیری ئەنجوومەنی ئاسایش هێنایەوە کەوا "لە چوارچێوەیەکی گشتیدا" بە کۆی دەنگ وەرگیراون لە مامەڵەکردنی جەنگی ئێران ـ عێراقدا و بانگەشە بۆ کۆتاییپێهێنانی جەنگ دەکات "بەپێی ئەو بنەمایانەی لە دەستوور (لائیحە)ی نەتەوە یەکگرتووەکان و یاسای نێودەوڵەتی و پەیوەندیی نێوان وڵاتاندا دانراون". ئێران (وەک عێراق دەڵێت) دەبێت ڕێگەی پێ نەدرێت "شێوازی لێکدانەوە بە خوایشتی خۆی" پەیڕەوی بکات لەم بڕیارانەدا، وەک ڕێگەیەک بۆ بەردەوامپێدانی جەنگ[٢٦].

بە تێپەڕینی کات عێراقییەکان فێر بوون چۆن گەمەکە بەڕێوە ببەن. لە ساڵی ۱۹۸۷ بەدواوە، ویستیان لێکۆڵینەوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بقۆزنەوە و بە گەڕانەوە بۆ هەمان ئەو بنەمایانە،

عێراق تا ئەو کاتە تۆمەتبار دەکرا. بۆ نموونە، لە نیسانی ١٩٨٨دا، عێراق کە بە درێژایی وەخت داوای جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەی سێیەمی جنێڤی دەکرد سەبارەت بە مامەڵەکردنی دیلی جەنگ[٢٧]، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە: "ئێمە لە فرە بۆنەدا ئەوەمان ڕوون کردووەتەوە کە ڕژێمی ئێران، لە کاتێکدا کەوا کردەوەی تاوانکاری ئەنجام دەدات و پێشێلکاری بنەماکانی یاسای مرۆڤایەتیی نێودەوڵەتییە، سکاڵای ساختە دەکات لەسەر جێبەجێنەکردنی ئەو بنەمایانە بۆ داپۆشینی تاوانەکانی و سەرنجلادان لە سیاسەتەکەی لەمەڕ درێژکردنەوەی جەنگ و دەستدرێژیکاری و فراوانخوازی"[٢٨].

لە کۆتاییدا عێراقییەکان بردیانەوە و ئەنجوومەنی ئاسایشیش بەکارهێنانی کیمیایی عێراقی بەخشی بە ئیدانەکردنی هەر دوو لا وەک یەک و نەیتوانی سزای دەستدرێژیکاریی بەڵگە لەسەر بدات. عێراق توانیی تا کۆتایی شەڕەکە گازباران بکات، بێ هیچ سزایەک و بیانووی ئەوە بوو بەو ڕێگەیە ڕایانکێشێتە سەر مێزی گفتوگۆ. ئەوجا ئێران ناچار بوو شکۆ و شانازیی خۆی وەلا بخات و بە ئاگربەست قایل بێت. ئەمە وەک سەعید خۆراسانیی باڵوێزی ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکان (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) سکاڵای لەسەر دەکات، ڕەنگە ڕێک وەک ئەوە کەوتبێتەوە کە ئەنجوومەن دەیویست ــ کەوا تاقە ڕێگە بۆ ئەوەی ئێران بە چۆکدا بێت، بەر بەرەڵاکردنی عەمباری کیمیایی عێراق بوو.

لە بەدواداچوونی ئەم ئامانجەدا، یاسای مرۆڤایەتیی نێودەوڵەتیی بە تەواوی لاواز کرابوو ــ کە تاقە میکانیزم

بــوو جیهــان شــکی دەبــرد بــۆ ئەوەی نەهێڵێــت لایەنە شــەڕکەرەکان ســتەمکاریی زۆر خــراپ ئەنجــام بــدەن. ئێرانییەکـــان ئیشـــارەت بەوە دەدەن کەوا ئەنجـــوومەنی ئاســایش هەڵوێســتێکی وای وەرگرتبــوو کە "تــاقە ڕێــگە بــۆ نەهێشتنی دووبارەبوونەوەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێــراقەوە، کۆتاییهــاتنی جەنــگە"[29]. تێگەیشــتنێکی لەم چەشنە، گاڵتەکردن بوو بە پاساوی بوونی یاساکانی جەنگ و مشــتومڕەکەش بەم جـۆرە بـوو: ســووککردنی ئازارەکـانی شەڕوشــۆڕ بە نەهێشــتنی شــێوازە نابەجێیەکــان دەتوانێــت هۆکاری ئاشتی پێش بخات، بە هێورکردنەوەی هەڵچوون و تــووڕەیی و شــکاندنی بــازنەی یەکتــر تاوانبــارکردن. بــێجگە لەوەش، بــواردان بە پیــادەکردنی تاقیکردنەوەکــانی چەشــنی بەکارهێنــانی چەکــی کیمیــایی، دەرەنجــامی جیــددیی لــێ کەوتەوە، دوورتر لە جوغز و چوارچێوەی مەیدانی تــایبەتیی شەڕ، وەک ئێرانییەکانیش پێداگیرییان لەسەر دەکرد، چونکە سنووری قبووڵکردنی بەزاند.

## ئایا ئێران گازی بە کار هێنا؟

لە بەهــاری ١٩٨٧دا، ڕێــک ئەو کــاتەی کە بەکارهێنــانی چەکی کیمیایی عێراق بەو جۆرە گەورە بوو ــ هێرشکردنە سەر هێزەکانی ئێران و گەریلاکانی کورد و خەڵکی مەدەنی ـ ئەوجا جیهان دەبوو سەرنج بدات و سەرکردایەتیی عێراق کەوتە تۆمەتبارکردنی ئێرانییەکان بە هەمان کردەوە. عێراق بە پشتیوانیی واشنتۆن ڕوانی خەڵکێکی کەم پێویستیان بە بەڵگەیە، چونکە مەسەلەیەکی چاوەڕوانکراو بوو، هەروەها ئامادە بوون بۆ قبووڵکردنی ئەوەی کە ئێرانیش چەکی کیمیایی بە کار دێنێت. لەو دەمەدا دەبوو ئێرانییەکان بە وردی نکووڵی لە بەرپاکردنی ئەم کارە دڕندانەیە بکەن بە شێوەیەکی ئاشکرا و لەبەر ڕێزگرتن لەو بنەما مۆراڵییانەی ڕەگیان لە ناخی مرۆڤایەتی و ئاییندا داکوتاوە، ڕێگە بە خۆیان نادەن کاری وا بکەن ــ بەڵام لە ڕاستیدا بە هۆی ئەوەوە بوو کە ئەو توانایەیان شک نەدەبرد. ئەوان هەر دەنگێکیان بوویێت لەسەر شەڕی کیمیایی، تەنها بە زمانپاراوی بە عێراقیان دەفرۆشت ــ بەڵام وا ئێستا ئەو بنەما بەرزەی مۆراڵیان لە دەست دا، کە ڕاستەوخۆ بەرەنگاری عێراق دەبوونەوە پێی.

بە هەرحاڵ، بەڵگەی قەناعەتبەخش بە دەستەوە نییە کە ئێران هیچ کاتێک چەکی کیمیایی بە کار هێنابێت. ئەم دید و

بۆچوونە، لە لایەن کۆمەڵێک عێراقیی پلەدارەوە، کە بۆ ئەم کتێبە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کراوە، بە ڕاست دەزانرێت ــ لەوانە ئەفسەرانی سوپا و سەربازان، سەرۆکێکی ئیستیخباراتی سەربازی، مولحەقێکی سەربازی لە واشنتۆن، دیپلۆماتێکی پایەبەرز لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕاوێژکارێکی پایەبەرزی سەدام حسێن، ئەمانە هەر هەموویان یان شەڕیان کردووە، یان خزمەتی وڵاتەکەیان کردووە لە کاتی جەنگدا و هیچ کامیان مەیلیان بەلای ئێرانەوە نەبووە و بە پێچەوانەوە هەندێکیان بە ئاشکرا ناحەزی ئێران بوون و دەیانگوت خۆیان ئامادە کردووە بۆ ئەوەی جارێکی تریش لەگەڵیاندا بجەنگن. هەیانە بوون بە نەیاری ڕژێمی عێراق و لە ساڵانی ١٩٩٠کانەوە هەڵگەڕانەوە و بە ئاشکرا بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ناسیۆنالیستەکانی عێراق هەموو چونیەکن و ئامادەن بۆ بەرگریکردن لە وڵاتیان. هەندێکیان بەوە پاساویان بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق دەهێنایەوە کە شتێکی ناخۆش بووە، بەڵام لە جەنگێکی دڕندانەشدا وای پێویست کردووە و کەمێکیشیان سۆز و بەزەییان بۆ کوردەکان دەربڕی. ئەوان ڕاشکاوانە حوکمی ئەوەیان دەدا کە ئێران گازی بە کار نەهێناوە یان حەزی نەکردووە ئەو کارە بکات. بەوپێیە ئەمە دەبێت "بە ئیفادەی دژ بە بەرژەوەندی" وەربگیرێت، لەبەر ڕۆشنایی بەشداربوونی ناڕاستەوخۆیان لە گازبارانی وڵاتەکەیان بەسەر ئێرانییەکان و کوردەکانی عێراقدا. ئەو عێراقییانەی لە سەرەوە باسمان کردن، ئەمانە بوون:

• لیوا ڕوکن وەفیق سامەڕایی، جێگری سەرۆکی ئیستیخباراتی سەربازی لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا و دواتر سەرۆکی ئەو دەزگایە، پێش ئەوەی (لە ڕژێم) هەڵبگەڕێتەوە (چاوپێکەوتنی ١٩٩٧): "ئێران بە هیچ کلۆجێک چەکی کیمیایی بە کار نەهێناوە لە جەنگدا و ئەو چەکەی نەبووە. ئەوانە تەنها دواتر ئەم شتانەیان پەرە پێ دا".

• عەمید ڕوکن نەبیل خەلیل سەعید، فەرماندەیەکی زانیاری بووە لە بەرەی شەڕدا، ساڵانی ١٩٨٠ ــ ١٩٨٦ و پاشان مولحەقی سەربازی لە واشنتۆن لە ساڵی ١٩٨٧ ــ ١٩٩٠ (چاوپێکەوتنی ساڵی ٢٠٠٤): "لە تەواوی ئەو ماوەیەدا من لە بەرە بووم، ئێران گازی بە کار نەهێناوە، بەپێی ئەزموونی شەخسی و زانیاریی خۆم".

• باڵوێز عیسمەت کەتانی، کوردێکە و وەک نوێنەری هەمیشەیی عێراق لە نەتەوە یەککرتووەکان لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا، بەردەوام ئێرانی تاوانبار دەکرد کە چەکی کیمیایی بە کار دێنێت (چاوپێکەوتنی ساڵی ٢٠٠٠): "لە ڕاستیدا من نازانم ئاخۆ ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێناوە یان نە. تەنها شت کە من لەگەڵیدا ڕۆیشتووم، هەڵسەنگاندنی ئەمەریکا بوو. باڵیۆز نیوتن (لە باسوخواسی هەڵەبجەدا) دەیگوت هەر دوو لا چەکی کیمیاییان بە کار هێناوە و من خۆم هیچ بەڵگەیەکم لا نییە و هەمیشە دەگەڕامەوە بۆ ئەمەریکییەکان".

• عەقید ڕوکن یاسر ئەلگەیلانی، فڕۆکەوانێکی جەنگاوەری عێراقە و فڕۆکەیەکی میگ ٢١ی بەرپەرچدەرەوەی بە دەستەوە بووە لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەڵێت: "من هەرگیز

بەڵگەی ئەوەم نەبینیوە کە ئێران لە کاتی جەنگدا گازی بە کار هێنابێت و هەرگیز ئەوەم نەبیستووە و ئەگەر ئەوەیان بکردایە، سەدام حسێن هەر وا لێی بێدەنگ نەدەبوو و دەیکردە هەرایەک ئەوسەری نەبێتەوە".

• عەقید مونقیز فەتحی (منقذ فتحی)، ئەندازیارێکی میکانیکی بووە لە فەیلەقی دووی عێراق لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا و (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) دەڵێت: "من هەرگیز نەمبیستووە کە ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێنابێت. ئێمە گەلێک کۆرسی ڕاهێنانمان لەسەر بەرگریی کیمیایی بینیوە، بەڵام هیچ کاتێک بە تەمای ئەوە نەبووین ئێران هێرشی کیمیاییمان بکاتە سەر. سەرکردایەتیی عێراق درۆیان دەکرد و ئێرانییەکان چەکی کیمیاییان بە کار نەهێناوە. من زۆر زۆر ڕقمە لە ئێرانییەکان، بەڵام ئەمە ڕاستییە". هەروەها ئەوەشی گوت کەوا لە هەر پێنج هێرشەکەی (توکلنا علی الله) لە ساڵی ١٩٨٨دا، بەشداریی کردووە و زانیاریی تەواوی لایە کە عێراقییەکان هیچ شوێنەوارێکی عەمباری کیمیاییان نەدۆزیوەتەوە لە نێو ئەو هەموو چەک و تەقەمەنییە زۆرەی ئێراندا، کە دەستیان بەسەردا گیرابوو.

• عەقید ئیبراهیم حەسەن ئەلیاس، فەرماندەی بەتالیۆنێک بووە و (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٤دا) دەڵێت: "ئێران قەت چەکی کیمیایی بە کار نەهێناوە. من لە ساڵانی ١٩٨٠ تا ١٩٨٨ لە جەنگدا بووم و لە پلەی مولازمی یەکەمەوە دەستم پێ کردووە تا پلەی کۆلۆنێل و هەرگیزاوهەرگیز نەمبیستووە کەس بڵێت ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێناوە بە درێژایی هێڵەکانی بەرە".

• محەمەد حەنوون، سەربازێکی پلە یەکە (جندي أول)، کە لە ماوەی جەنگدا لە هێڵەکانی بەرەدا بووە و (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) دەڵێت: "لە ڕۆژی یەکەمەوە تا کۆتایی، من هیچ کاتێک نەمبیستووە ئێرانییەکان چەکی کیمیاییان بە کار هێنابێت — بە مەرجێک من خۆشم نەدەویستن. من قەت ئاگام لەوە نەبووە کە ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێنابێت".

• مەعاز عەبدولڕەحیم، نەتەوەپەرستێکی عێراقیی دژەسەدامە، لەگەڵ ئەیاد عەللاویی ویفاقی نیشتمانیی عێراقدا و لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا ڕۆژنامەنووس بووە لە عێراقدا، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەڵێت: "ئێمە هەرگیز (لە برادەر و هاوڕێکانمان) نەبیستووە کە ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێنابێت. حکومەت دەیویست وا بڵێت، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نەبوو. ئێمە وەک ڕۆژنامەنووسان زۆر جار بەکارهێنانی چەکی کیمیاییمان باس دەکرد. منداڵەکانمان، کە لە ناو سوپادا بوون، لەو بارەیەوە قسەیان بۆ دەکردین و دەیانگێڕایەوە کە (با) گازی کیمیایی هێناوەتە دواوە بە سەر عێراقییەکاندا و ئەمە گەلێک جار ڕووی دەدا".

• کامیل ئەنوەر بوترس، سەربازێکی تۆپچی بوو و بەشداریی لە هەر پێنج قۆناغەکەی هێرش یان ئۆپەراسیۆنی (توکلنا علی الله) کردبوو، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٤دا) دەڵێت: "من هەرگیز بەکارهێنانی چەکی کیمیایی ئێرانم نەدیوە لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە لە بەرە بووم. ڕەنگە چەکی کیمیاییان بە کار هێنابێت، بەڵام من نە بینیومە و نە بیستوومە ئەو کارە کرابێت".

هەنــدێک عێراقیــی تــر هەبــوون، کەمتــر دڵنیــا بــوون و مەزەنـدەی ئەوەیـان دەکـرد کە ئێـران ڕەنـگە گـازی بە کـار هێنابێـت، بەڵام ئەوان هـیچ نمـوونەیەکی دیاریکراویـان لا نەبـوو. یەک ئەفســەر بە نــاوی عەقیــد عەبــدولوەهاب ئەلساعیدی (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۳دا) ئیدیعای ئەوە دەکات کە جارێکیان تێبینیی هێرشێکی گازی ئێرانی کردووە، کاتێک کە فڕۆکەیەکی ئێرانی ڕۆکێتێکی هەڵداوە بۆ قەدپاڵی چیـایەک لە نزیـک سـەیف سـەعدەوە لە قۆنـاغی چـوارەمی ئۆپەراسیۆنی (توکلنا علی الله) لە مانگی تەمووزی ۱۹۸۸دا و ئەو گەواڵە دووکەڵە ڕەشــەی وەک بەڵــگە هێنــایەوەیە کە چەشنی قارچک بەرز دەبووەوە، بەڵام لە بینینی ئەم دیمەنە بەولاوە هـیچ وردەکـارییەکی لا نەبـوو و هیچـی لە بـارەی بریندار و کوژراوی عێراقیشەوە نەدەزانی لەم هێرشەدا. ئەو پێـی لە بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی عێـراق نـا، لە مـاوەی هەمـان ئۆپەراسـیۆندا و ڕووداوەکـانی ڕابردووی بە نموونە دەهێنایەوە و ئەو سەربازە عێراقییانە دەناسێت کە بە گـازی عێراقـی برینـدار بـوون بەو هـۆیەوە کە بـا هێنـاویێتیە دواوە بەسـەر سـەنگەرەکانیاندا. دواجـار دەگـاتە ئەو ئەنجـامەی کە دەڵێت: "من لە سـەدا سـەد دڵنیـام عێراق چەکـی کیمیـایی بە کار هێناوە، بەڵام سـەد لە سـەد دڵنیـا نیم ئێران ئەو کـارەی کردبێت".

فڕۆکەوانێکـی جەنگـاوەری عێراقـی (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ۲۰۰۳دا) دێـتەوە یـادی کە سـەردانی نەخۆشـخانەی ڕەشـیدی بەغـدای کـردووە، کە ژمـارەیەک زۆری قوربـانیی عێراقـی ببینـوە بەر گـازی خەردەل کەوتـوون. فـڕۆکەوانەکە دەڵێــت "وایــان تێگەیانــدم کە ئەوانە قوربــانیی هێرشــێکی

کیمیایی عێراقن". بەڵام لە دوو ساڵی فڕۆکەوانیدا لە ماوەی جەنگدا (١٩٨٧ ــ ١٩٨٨) تاقە یەک ڕووداویشی نەبینیوە کە بەکارهێنانی گازی ئێرانی تێدا تۆمار کرابێت. بە پێچەوانەوە ئەو ئاگای لە چەندین حاڵەت بووە، کەوا گازی عێراق دەگەڕایە دواوە بەسەر هێزەکانی عێراق خۆیدا.

جەنەراڵ نزار خەزرەجی، سەرۆکئەرکانی سوپای عێراق لە ساڵانی ١٩٨٧ ــ ١٩٩٠دا، کە ئیدیعای ئەوە دەکات گوایە ئەندازیاری سەرەکیی هێرشی (توکلنا علی اللـه) بووە، لە دوای هەڵگەڕانەوەی لە ڕژێم جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێناوە، بەڵام تەنها لە ڕێگەی "ڕۆکێت و تۆپەوە و ئەمەش کاریگەر نەبوو وەک هێرشی فڕۆکە". ئەو زۆر بە ئاسانی بەکارهێنانی گازی لە لایەن عێراقەوە سەلماند لە هەر پێنج هێرشەکەی (توکلنا علی اللـه)دا، "بەڵام تەنها بەسەر هێزە یەدەگەکانی ئێراندا لە ناوچەکانی پشتی بەرە... چونکە زۆر جێی مەترسی بوو بۆ ئێمە کیمیایی بە کار بێنین لە هێڵەکانی بەرەدا، کەوا هەر دوو لا تەواو لە یەکترەوە نزیک بوون"[٣٠].

ڕاگەیاندنێک کە لە ئەفسەرێکی پایەبەرزی وەک خەزرەجییەوە دەربچێت، دەبێت بەهەند وەربگیرێت. بە هەرحاڵ، لە ساڵی ٢٠٠٢دا خەزرەجی لە دانیمارک لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرا لەسەر تاوانی جەنگ، کە لەوێ داوای پەنابەریی کردبوو و بە ئاشکرا لەسەر پەتی بەکارهێنانی گاز لە لایەن ئێرانەوە یاریی دەکرد، وەک پاساوهێنانەوەیەک بۆ عێراق. بێجگە لەوەش نیازی ئەوەی دەربڕی بۆ بونیادنانەوە و سەرکردایەتیکردنی سوپای عێراق دوای ئەو جەنگەی کە ئەمەریکا هەڕەشەی دەکرد

بەرپای بکات، هەروەها بۆ هۆکاری ئەو کەمتەرخەمییە گەورەیەشی گێڕایەوە کە فڕۆکەوانە عێراقییەکان کە بە درێژایی هێڵەکانی بەرە دەیانتوانی کاتێک سەربازە مۆڵخواردووەکانی ئێرانیان گازباران دەکرد و بەوانیشەوە زۆرێک لە هێزەکانی پیادەی عێراقیان دەکوشت و بریندار دەکرد. ئەمە وا ناگەیەنێت کەوا قسەکانی خەزرەجی بە درۆودەلەسە لەقەڵەم بدرێن و تەنها دەکرێت لە هەندێک ڕووەوە بایەخێکیان بدرێتێ و لە هەمان کاتیشدا بە ڕاگەیاندنی دژ بە بەرژەوەندی دانەنرێن.

ئەی لە بارەی لێکۆڵەرەوان و داڕێژەرانی سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە چی بڵێین؟ ئەوانە ئەو دید و بۆچوونەیان لا زاڵە کەوا ڕەنگە ئێران هەندێک هێرشی کیمیایی جێبەجێ کردبێت لە لای خۆیەوە، بەڵام تەنها پچڕپچڕ و بە ئاستێکی کەم و بەکارهێنانی توخمی کیمیایی سادە (کە ڕەنگدانەوەی سێوایی بەرنامەی چەکی کیمیاییەکەی بوو) یان تەقاندنی چەک و کەرەستەی گیراوی عێراق خۆی بەرەو دواوە بۆ هێزەکانی عێراق. ئەم کاربەدەستانە تا ڕادەیەکی باش کەمتر گومانیان دەردەبڕی لە سەرەتای ساڵەکانی ۲۰۰۰دا وەک لەوەی کە هەندێک لە کاربەدەستانی تری ئەمەریکا کردیان لە هەمان کاتدا، بۆ نموونە:

• دیڤید نیوتنی باڵیۆزی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە بەغدا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۱دا) دەڵێت: "(لە واشنتۆندا) هەستێکی گشتی هەبوو کە هەر دوو وڵات توانای چەکی کیمیایی خۆیان پەرە پێ دەدا، بەڵام ئێران زۆر لە دواوە بوو. لەبەر ئەوە هەستێکی گشتی هەبوو کە ئێران لەم

بوارەدا بە تەواوی پەرێزی پاک نییە. هەندێک بەڵگە هەن کە ئێرانیش چەکی کیمیایی بە کار هێنابێت، بەڵام لە سنوورێکی زۆر دیاریکراودا".

• جیم پلاک، جێگری یاریدەدەری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری ڕۆژهەلاتی نزیک (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۰دا) دەڵێت: "ئێران هەوڵی دەدا چەکی کیمیایی بە کار بهێنێت، بەڵام هێشتا مابووی. لە کاردانەوەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییدا لە لایەن عێراقەوە، ئێران بە پەلەپرووزێ دەستی دایە پرۆگرامی خۆی، بەڵام تا کۆتایی جەنگ نەیانتوانی نە چەکەکە دروست بکەن و نە ڕێگەی بەکارهێنانیشی بدۆزنەوە و ئەگەری ئەوە هەیە دوای جەنگ کردبێتیان".

• فرانک ڕیکیاردۆنی، ساڵانێک دوای خزمەتکردنی وەک کاربەدەستی مەکتەبی عێراقی وەزارەتی دەرەوە (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۰دا) دەگێڕێتەوە: "من بە هیچ کلۆجێک بەڵگەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی ئێرانم نەبینیوە".

• ڕیک فرانکۆنا، لێکۆڵەرەوەی دەزگای هەواڵگریی بەرگری (DIA)، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۰دا) دەڵێت: "ئێمە دەزانین ئێران چەکی کیمیایی (لە هەڵەبجەدا) بە کار هێناوە". بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی زیاد: "بە تەواوی کارەکەمان لێ تێک چووبوو و ناوچەکە پڕ لە ململانێ بوو. ئێمە هەندێک لە قوربانییانی (عێراقمان لە هەڵەبجەدا) بینی و لە قوربانیی گازی خەردەل یان دەمارەگاز نەدەچوون و پێم وانییە هەرگیز لەوە دڵنیا بین. پێم وایە ئەوەی کە پێی دەگەین و دەیدۆزینەوە، تیۆری دەبێت نەک ڕاستی. ئێمە

نەماندەتوانی بگەینە لای ئێران و... لە عێراقیشدا بۆ هەموو شوێنێک گاردی ئاسایشیان خستبووە تەکمان".

• ڕۆبەرت میکولاک، کە کاربەدەستێک بوو لە بیرۆی کۆنترۆڵی چەکی سەر بە وەزارەتی دەرەوە و ڕۆڵێکی بەرچاوی بینی لە دانوستانی ڕێککەوتننامەی چەکی کیمیایی ساڵی ١٩٩٣، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەڵێت: "من هیچ شتێکی تایبەت ناگێڕمەوە، بەڵام هەندێک بەڵگەی ئەوە هەن کە ئەو زەخیرە و تەقەمەنییانەی عێراق، کەوا ئێران گرتبوونی، بەرەو عێراقییەکانی دەهاوێشتە دواوە".

• ئەحمەد هاشم، لێکۆڵەرێکی سەربازی بوو و (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەگێڕێتەوە: "بەپێی سەرچاوە ئەمەریکییەکان، بەکارهێنانی ئێران شتێکی لاوەکی بوو و ئەگەری ئەوە هەیە تەقەمەنیی دەستبەسەرداگیراوی عێراق بووبێتن و پێدەچێت ئەوە تەنها ڕێگە بووبێت. چونکە ئێرانییەکان تەنها گازی فرمێسکیان شک دەبرد، نەک سیانید".

• لێکۆڵەرەوەیەکی (سی ئای ئەی) (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەگێڕێتەوە: "بەپێی زانیاریی موخابەراتیی ئێمە، هەر دوو لا ئێران و عێراق چەکی کیمیاییان بە کار هێناوە". کاتێک فشار خرایە سەر لێکۆڵەرەوەکە، بە نابەدڵییەکەوە گەڕایەوە سەر قسەی سێس کارۆس لە زانکۆی بەرگریی نیشتمانی، وەک ڕێگەپێدراوێکی ویلایەتە یەککگرتووەکان لەو بارەیەوە.

• سێس کارۆس، لێکۆڵەرەوەیەکی سەربازی بوو لە سالانی ١٩٨٠کاندا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەڵێت "ئێمە لەو کاتەدا بە وردی دەمانزانی چی ڕوو دەدات.

ئیدیعای بەکارهێنان لە لایەن ئێرانەوە، مەسەلەیەکە جێی مشتومڕە. کەسانێک هەن لە ناو حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، بە ڕاستی قەناعەتیان وایە کە ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێناوە. من ئەوپەڕی گومانم هەیە، چونکە هیچ بەڵگەیەک نییە کە ئەوان توانای ئەوەیان هەبووبێت. ڕەنگە بەڵگە هەبن لە ناو دۆکیومێنتەکانی موخابەراتدا، بەڵام ئەگەر ئەوە مەسەلەکە بێت ئەوە من نەمدیون".

ڕاپۆرتە ئاشکراکراوەکانی (DIA) و (CIA)ی پێش جەنگ، ئێران بەوە تۆمەتبار دەکات کە جارجارە چەکی کیمیایی بە کار هێناوە، بەڵام بە شێوەیەکی نەگۆڕ نموونە بە دەستەوە نادات (وەک شوێن و مێژوو)، خۆ ئەگەر ئێران شتێکیشی شک بردبێت، ئەوە توانایەکی سەرەتایی بووە. بە شێوەیەکی نموونەیی، زمانی ئەم دۆکیومێنتانە بە وردی تاوتوێ کراوە کە بوار بە ئەگەری بەکارهێنانی ئێران بدات تەنانەت وەک کەمکردنی بایەخیشی. لە نموونەیەکی ئابی ١٩٩٠دا (سی ئای ئەی) ئەوە دەخاتە ڕوو کە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق لە سەردەمی جەنگدا "لە ڕێگەی توانای سنوورداری خۆپاراستنی ئێران لە چەکی کیمیایی هان دەدرا و نەتوانینی ئێران بۆ تۆڵەکردنەوەی هاوشێوە، لەسەر هیچ ئاستێکی مەزەندەکراو"[٣١]. هەر بەو ئاراستەیەدا، بەڵگەیەکی (DIA) باس لەوە دەکات کە "هەڕەشەیەکی ڕاستی تۆڵەکردنەوەی ئێران بە چەکی کیمیایی لەئارادا نەبوو"[٣٢]. دۆکیومێنتێکی تری (سی ئای ئەی) باس لەوە دەکات کە ئێران بەپەرۆش نەبووە بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، بەڵام "هەستیان بەوە کردووە کە ناچارن تۆڵەی پەلامارەکانی عێراق بکەنەوە. ئێران تەنها

(جارێـک یـان دوان) کیمیـایی بە کـار هێنـاوە لەسـەر هێـزە کۆکراوەکان و کاریگەریی کەم بووە"[٣٣]. ئەم تـاوتوێکردن و هەڵسەنگاندنە دەبا بکەوێتە بەر پرسیار و گومانی لێ بئاڵێت کاتێـک کە بە ئاشـکرا پشـت بە سـەرچاوەیەکی نـاوخۆ دەبەستێت، بۆ نموونە گریمانەی ئەوە بکەین کە هێرشـەکەی هەڵەبـجە مێژوویەکـی نادیـاری هەیە وەک ئەوەی لە ئـابی ١٩٨٧دا ڕووی دابێـت. هەر سـێ دۆکیـومێنتەکە پـڕن لە وردەکـاریی باسـی پرۆگرامەکـانی چەکـی کیمیـایی عێـراق و نمـوونەی بەکارهێنانیـان و یاداشـتی ئەم دواییەی (سـی ئـای ئەی) کە بە ڕوون و ئاشـکرا بـاس لەوە دەکـات هەڵەبـجە "بە سـەختی پەلامـار دراوە" لە لایەن عێـراقەوە و بە چەکـی کیمیـایی. پسپۆڕێکی سـەنگینی سـەربازی، بە نـاوی ئەنتـۆنی کۆردسمان، باس لەوە دەکات کە "ئێران یەکەم بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی سـەلمێنراوی لە سـاڵی ١٩٨٥دا جێبەجـێ کردووە و تێیدا تۆپخانە و هاوەنی بە کار هێناوە بۆ هەڵدانی تەقەمەنیـی گـاز، کە هەنـدێکیان لە بنەڕەتـدا دەستبەسەرداگیراوی عێراق بوون"[٣٤]. بە هەرحاڵ، ئەو نـاڵێ کێ ئەمەی پشتڕاست کردووەتەوە، یـان لە کوێ و کەی ئەم ڕووداوە ئیدیعاکراوە بەرپا بووە. ئەمە تیشـک دەخـاتە سـەر کێشـەیەکی پەیوەندیـدار بە هەمـوو ئیـدیعاکانی ئێـرانەوە، چونکە بە پێچەوانەی ئەو تۆمەتـانەی بەر دەرگـای عێراقیـان دەگـرت، لای ئەوان بە شـێوەیەکی بەردەوام شـتەکان وردی و دیاریکردنیان ناتەواو بوو. بە هەمان نەفەس، شـیکارییەکی سوپای ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٨٦دا ئاماژە بە هەر دوو گـازی خەردەل و تـابوون دەدا لە زەخیـرە نەتەقیوەکـانی عێـراق و دەڵێـت: "گریمـانەی ئەوە هەیە کەوا ئێرانییەکـان هەنـدێک

حەشــوەی کیمیاییــان کــۆ کــردبێتەوە و لای خۆیــانەوە بە کاریان هێنابێت. هەروەها وەک باس دەکرێت، ئێران هەوڵی ئەوە دەدات کە توخمەکانی چەکی کیمیایی بە دەست بێنێت لەگەڵ مــاددەی کیمیــایی و کەرەســتە و تفاقــدا، بــۆ دروستکردنی توخمی کیمیایی تایبەت بە خۆیان و نازانرێت سروشــتی ئەم هەوڵە چــۆنە. هەمــان دۆکیومێنــت زۆر بە ڕاشــکاوانەتر و وردەکــارییەوە لەســەر تواناکــانی عێــراق دەدوێت(٣٥).

## تاقیکردنەوە لەسەر کوردەکان

ئەگەرێکی تر هەیە کە پێویستە ڕەچاو بکرێت و بە تەواوی دوورە لە شانۆی جەنگی ئێران ـ عێراقەوە. ئێران مەسەلەی یاخیبوونی کوردی خۆی هەبوو لەگەڵی چنگ بدات و هەر چەندە ئەمە هەرگیز لە مەودای جموجوڵیدا شانی لەوەی کوردی عێراق نەدەدا، بەڵام هەموو کات هەر مایەی سەرئێشە بووە بۆ سەرکردایەتیی ئێران. لە سەرەتای سالانی هەشتاکاندا بە تایبەتی، ئێرانییەکان زنجیرەیەک هێرشیان کردە سەر حەشارگەکانی حیزبی یاخیبووی سەرەکی، واتە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا). جار لە دوای جار بەرپرسەکانی حدکا سکالایان دووبارە دەکردەوە کە ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێناوە دژ بە هێزەکانیان. بۆ نموونە عەبدولڕەحمان قاسملووی سەرکردەی حدکا، لە ئەیلوولی ١٩٨٨دا لە بارەگای خۆیەوە لە بەغدا، سکالای ئەوەی تۆمار کرد کەوا ئێران دوو جار گازی ژەهراویی بە کار هێناوە دژ بە هێزەکانی: لە ساڵی ١٩٨٢دا و جارێکی تریش لە ١٣ی ئابی ١٩٨٧دا، کاتێک کە حدکا ئاهەنگی یادی دامەزراندنی گێڕاوە[٣٦].

قاسملوو لە نیسانی ١٩٨٩دا لە ڤیەننا، لە لایەن کرێگرتەکانی ئێرانەوە تیرۆر کرا و دوای خۆی تیشکی تر نەخرایە سەر سکالاکەی. هاشمی کەریمی، کە ئەندامێکی

مەکتەبی سیاسیی حدکایە لە لەندەن (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) دەڵێت کەوا نەیتوانیوە بگەڕێتەوە سەر ئەو جەختکردنەی سەرکردەکەی، بەڵام سکاڵای ئەوەی دەکرد کە شایەتحاڵ بووە لە هێرشێکی کیمیایی دیکەی ئێراندا و وەک دەڵێت لە زستانی ١٩٨٣دا، لە ناوچەی گەورەدێی نزیک ماوەت ئەنجام دراوە (لە ناو عێراقدا و زۆر لە دۆڵی جافەتییەوە دوور نییە) و بارەگایەکی تێدا بووە: "ئێرانییەکان لە ئاسمانەوە هێرشیان کردە سەر گرووپەکەی ئێمە بە ژمارەیەکی زۆری بۆمبی ئاسایی، بەڵام هەندێک گازیشی لەگەڵدا بوو. دوو سێ پێشمەرگەمان بریندار بوون و بە دەست ئازاری پێستەوە دەتلانەوە. ئێمە دکتۆرێکی فەرەنسیمان لەگەڵ بوو و ئاگاداری کردین کە هۆکاری ئەم برینانە لە بەرکەوتنی توخمی کیمیاییەوەیە و ئێمەش ئاگرمان کردەوە و دووکەڵێکی زۆرمان کرد و ئەمە کەڵکی هەبوو". بەرپرسێکی تری حدکا، کە ناوی مەولوود سوارە بوو، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) دەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ١٩٨٠ یان ١٩٨١دا هێرشێکی تری گازی ئێرانیان کراوەتە سەر و لە گوندی میراوای نێوان سەردەشت و پیرانشار لە ناو ئێرانەوە بە تۆپ دەیانتەقاند. ڕەنگە ئەمە یەکێک بووبێت لەو هێرشانەی قاسملوو ئاماژەی پێ دابوو. سادق زەرزا، بەرپرسێکی حدکایە و لە هۆڵەندا دەژی، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) باس لە هێرشی سێیەم دەکات کە لە پایزێکی درەنگی ساڵی ١٩٨٢ یان ١٩٨٣دا ئەنجام دراوە (ساڵەکەی باش بیر نەدەهاتەوە)، کاتێک کە ئەو فەرماندەی هێزێکی نزیکەی هەشتسەد کەسی بووە لە ناوچەی سەقزی کوردستانی ئێران:

"ئێمە لە ناوچەی شاقەڵا بووین، کاتێک گوێم لە دەنگی فرۆکە بوو بە ڕاسەرمانەوە لەناکاو کەوتنە بۆردمانکردن. دەنگی بۆمبەکان وەک جاران ئاسایی بوو و هیچ شتێکی نائاسایی تێدا نەبوو. پاشان هەواڵمان زانی کە گوندی باینگانی نزیکمان بە کیمیایی لێی دراوە. ئێمە ڕۆیشتین بۆ شنوێنێکی نزیک گوندەکە و برینداریان هێنا بۆ کلینیکە گەڕۆکەمان و لەوێ زانیمان حەوت گوندنشین کوژراون و زۆر کەسیش بریندارن. دوو سێ کەسی کوێر کردبوو و نۆزدە کەسی تریش تووشی برینی سەختی سووربوونەوەی پێست و تلۆقکردن بووبوون. هەروەها پیاوێک دەستێک و قاچێکی پەڕیبوو. خەڵکەکە پێیان گوتین هێرشی کیمیایی بووە و ئێمە نەماندەزانی چییە".

ئەو دەیگوت ئەوەی کە دەمانزانی ئەوە بوو کە فرۆکەکانی ئێران هێرشەکەیان کردووە و وای بۆ دەچێت کە ڕەنگە ئێرانییەکان ویستبێتیان گوندنشینەکان بتۆقێنن و بەو جۆرە بیانکەنە دژی پێشمەرگە. گازبارانی باینگان، ئەگەر وا بووبێت، بوو بە سەرپشکی باسوخواسی ئەو کاتە. حدکا لە دەرەوەی وڵات وایان بڵاو کردەوە فرۆکەکانی ئێران "جۆرە بۆمبێکیان بەرداوەتەوە کە دووکەڵێکی هێجگار زۆریان لێ بەرز بووەتەوە" و هەشت کەسی لە باینگان کوشتووە. ڕاپۆرتەکە ئیشارەت بەوە دەدات کە تۆمەتبارکردنی ئێستای عێراق لە لایەن ئێرانەوە لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، هەوڵێک بوو بۆ "خۆدزینەوە لە بەرپرسیاریێتیی" ئەم هێرشانە[٣٧]. ئێرانییەکانیش لای خۆیانەوە گوناهی هێرشی باینگانیان خستە ئەستۆی عێراق و ئیدیعایان دەکرد کە لە ٢٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٣دا "فرۆکە جەنگییەکانی عێراق

لەناکاو هەڵیانکوتاوەتە سەر گوندی باینگان لە نزیک بانە و بـۆمبی کیمیاییـان بەسـەر خەڵکـی مەدەنیـی بێتاوانـدا بەرداوەتەوە، کەوا گازی خەردەل و زنکیان تێدا بووە و لە ئەنجامـدا کۆمەڵێک گوندنشـینی بێـوەی شـەهید و برینـدار بـوون*[٢٨]. تۆمەتبـارکردنەکەی حـدکا دەبێـت بە هەنـد وەربگیرێت، چونکە عێراقییەکان هۆیەکی ئەوتۆیان نەبوو بۆ لێدانی ناوچەی باینگان لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٣دا. بەرپرسەکانی حـدکا سـوورن لەسـەر ئەوەی کە هـیچ پێشـمەرگەیەکی کوردی عێراق لەو نـاوە نەبوون و نـاوچەی پشـتی بەرەی هێزەکانی ئێرانیش نەبووە. لە لایەکی تریشەوە کەس وای بۆ ناچێـت ئێـران لەو کاتـانەی وەک سـاڵی ١٩٨٣دا توانـای بەکارهێنـانی چەکی کیمیـایی بوو‌بێت. وەڵامەکە ڕەنگە ئەوە بێت کە ئەو چەند گوندنشینەی بریندار بوون یان کوژراون بە هۆی گازی ئێرانەوە نەبووە، بەڵکو بە هـۆی ماددەیەکی سـووتێنەرەوە بـووە، وەک ناپـاڵم یـان فۆسـفۆر، یـاخود تێکەڵەیەکی فۆسفۆر و بۆمبی ئاسایی بووە و (پارچەکانیشی بوون بە هـۆی برینداربوون). ڕەنگە هاوزەمـان نەبووبێت و هێزەکانی ئێران کەوتبێتنە ڕاوەدوونـانی حدکا، وەک بەشێک لە هێرشـی وەلفەجـر/٤ لە نزیـک پێنجـوێن و لە نـاو خـاکی عێراقدا. چونکە ئەگەر فڕۆکەکانیـان هێرشـێکی هاوشـێوەیان کردبـا لە نزیـک کـۆمەڵێکی حـدکاوە لە نـاوچەی بـانە، ئەوە ڕەنـگە بـۆ ڕێگـرتن بووبێـت لەم هێـزە کە بێـنە هانـای هاوڕێکانیانەوە.

ئاخۆ ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێنابێت دژ بە کوردە یاخیبووەکان یان دانیشتوانە کوردەکەی خۆی؟ تاقە وەڵامـی شـیاو ئەوەیە کە مەسـەلەکە هێشـتا سـاغ نەبـووەتەوە.

سەبارەت بەو هێرشانەی باسیان لێوە کراوە لە ساڵی ١٩٨٢دا (یەک) و لە ساڵی ١٩٨٣دا (دوو)، گێڕانەوەی شایەتحاڵ وایان لێ دەکات ڕێیان تێبچێت، هەر چەندە هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە نییە کە ئێران دەستی کردبێتە بەرهەمهێنانی تۆخمی کیمیایی لەو کاتەدا، چجای توانای چەک لێدروستکردنیان. ئەگەری ئەوە هەیە کە ئێران، لەژێر فشاری هێرشی گازی عێراقدا، دەستی کردبێتە پەرەپێدانی تۆخمی کیمیایی و بە شێوەی تاقیکردنەوە لە دژی کوردە یاخیبووەکەی خۆی بە کاری هێنابێت. بە نەبوونی باس و گێڕانەوەی ورد و شایەتحاڵی ڕاستگۆ و نەگۆڕ و بەڵگەی پشتڕاستکەرەوە لە لایەن ئەو دکتۆرانەی لەو کاتەدا ئامادەی ئەو بارودۆخە بوون، ئەوە ئیدیعاکانی حدکا ناتەواون و ناتوانن ئەو شتە بسەلمێنن. سەبارەت بە هێرشی گازی ساڵی ١٩٨٧یش بۆ سەر بارەگای حدکا وەک قاسملوو ئیدیعای دەکرد، ئەوە کاربەدەستانی حدکا وای دەردەبڕن کە هیچ شتێک لەو بارەیەوە نازانن.

### چاووڕاوی با بەسەرداهێنانی گاز

لە ماوەی جەنگدا عێراق سکاڵای ئەوەی دەکرد کە ئێرانیش گازی بە کار هێناوە. لە ساڵانی بەرایی جەنگدا ئەم تۆمەتانە، بەپێی کرچوکاڵییان، تەنها بەوە لێک دەدرانەوە کە هەوڵی ئاشکران بۆ سەرنجلادان لەسەر بەکارهێنانی گاز لە شەڕگەکانی عێراق خۆیدا. بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٨٦دا و کاتێک هێزەکانی ئێران فاویان داگیر کرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە عێراق بە خەستیی گازبارانی دەکردن، عێراقییەکان سکاڵایان لەسەر هێرشێکی کیمیایی ئێران تۆمار کرد، بەڵام هیچ وردەکارییەکیان باس نەکرد و سکاڵای ئەوەیان دەکرد کەوا: "ڕژێمی ئێران بە هۆی ئەو زیانە قورسانەی لێی کەوتووە، دوێنێ و ئەم بەیانییە سوودی لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بینیوە لەژێر چاوبەستیی مانۆڕێکی قێزەوندا تاوەکو لەم ئاستەنگ و قەیرانە کوشندەیە ڕزگاری بکات"[٣٩]. بەڵام هەر زوو عێراقییەکان تێگەیشتن کە زیانە کیمیاییەکان لە گازبارانی خۆیانەوەیە و دەکرێت وەک بەڵگەی بەکارهێنانی ئێران سوودی لێ وەربگیرێت و بەمە فێڵ لە نەتەوە یەکگرتووەکان بکرێت کە وای تەماشا بکات دەستێکی ئێرانی تێدایە.

لە هەمووی گرنگتر، زانینی ئەوەی کە ئێران بە هەمان شێوە تۆڵەی نەکردووەتەوە و کاتێک عێراق بەو قورسییە

پشتی به گاز بەستووە، نەک تەنها زیانی بە کۆششی پرۆپاگەندەی عێراقی گەیاند، بەڵکو پەشۆکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانیشی لێ کەوتەوە، کە پشتیوان و پارێزەری سەرەکیی عێراق بوو. پایزی ١٩٨٧ بوو کە واشنتۆن کەوتە خوێندنی ئەو ئاوازەی گوایە ئێرانیش کیمیایی بە کار دێنێت. جۆرج شوولزی وەزیری دەرەوە، لە وتاردانێکدا لە ئینستیتیوتی وایزمان بۆ زانست لە ئیسرائیل، لە ئۆکتۆبەردا، بە ئاشکرا ڕەخنەی لە "هەر دوو ئێران و عێراق گرت لەسەر ئیدیعای بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە جەنگی کەنداوی فارسدا"[٤٠].

"ئیدیعای" بەکارهێنان؟ کێ ئەم ئیدیعایەی کردووە؟ تۆمەتبارکردنەکەی شوولز یەکەم جار بوو لە لایەن کاربەدەستێکی پایەبەرزی ئەمەریکاوە باس بکرێت. هەر لە سەرەتای ئەو ساڵەوە، عێراق ئێرانی تۆمەتبار دەکرد کەوا گازی خەردەل و فۆسجین بە کار دەهێنێت، کە توخمێکی قورسە و لە جەنگی جیهانیی یەکەمیشدا بە کار هاتووە و ئازار و زیانێکی سەختی بە شانەکانی لەش گەیاندووە لە "پەلامارە کیمیاییەکانی" شەڕگەکانی باشووردا[٤١]. ئەمە یەکەم تۆمەتبارکردنی دیاریکراو بوو لە لایەن عێراقەوە لە ماوەی جەنگدا و تەنها لەوەدا تەمومژاوی بوو کە نەیتوانی شوێنی ڕووداوەکە دەسنیشان بکات. ڕەنگە ئەوە ڕاست بێت و ئەگەر واش بووبێت، دەبوو بە بەڵگە بیسەلماندایە. بە هەرحاڵ، ڕەنگە عێراقیش هەوڵی دابێت سەردانیکەرانی نێودەوڵەتی ئامادە بکات بۆ بینینی بریندارانی کیمیایی لە عێراقدا.

لە نیسانی ١٩٨٧دا و لە کاردانەوەی زیادکردنی هێرشی کیمیایی عێراقدا ـ کە لەم کاتەدا وەک باس دەکرا کاریگەریی بۆ سەر خەڵکی مەدەنیش هەبوو ـ لە ئەنجامی گەورەبوونی فشاری ئێراندا، سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، جارێکی تر تیمێکی پسپۆڕی نارد بۆ ناوچەکە و ئەم جارەش عێراق دەرگای خستە سەرپشت بۆ پسپۆڕ و شارەرەزایان. تیمەکە بە گەشتێک برا بۆ نەخۆشخانەکانی بەغدا و بەسرە و سەردانێکی کورتی بەرەیان کرد لە ڕۆژهەڵاتی بەسرەوە. پسپۆڕان لەو ڕاپۆرتەیاندا کە مانگێک دواتر بەرزیان کردەوە، گەیشتبوونە ئەو ئەنجامەی کە هەندێک بریندای عێراق کەوتوونەتە بەر کاریگەریی گازی خەردەل و هەندێکی تر بەر "ماددەیەکی وروژێنی توند کەوتوون، کە ڕەنگە فۆسجین بووبێت"[٤٢].

ڕاپۆرتەکە لە نزیکەوە شتەکان دەخوێنێتەوە و پسپۆڕەکان بە ئاماژەکردن بۆ سەردانەکەیان بۆ ئێران، تیشکیان خستە سەر هێرشە کیمیاییەکان دژ بە هەر دوو پێگە سەربازی و مەدەنییەکان و پارچەی ئەو چەکانەیان کردە بەڵگەی ئەوەی کە عێراق ئەنجامدەر بووە. سەبارەت بە سەردانەکەشیان بۆ عێراق، بە پێچەوانەوە، تیمەکە دەنووسێت کە لە دەوروبەری بەسرەدا "هێزەکانی عێراق بەر گازی خەردەل و توخمێکی کاریگەر لەسەر سییەکان کەوتوون، کە پێدەچێت فۆسجین بێت. بە نەبوونی بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی بەکارهێنانی ئەو چەکانە، ناتوانرێت دەستنیشانی ئەوە بکرێت کە ئەو برینانە چۆن و بە هۆی چییەوە دروست بوون"[٤٣].

تاریق عەزیز بە تووڕەبوونێکی زۆرەوە نارەزایی لەسەر دارشتنی ڕاپۆرتەکە دەربڕی و بەوە تۆمەتباری کرد "کە دەگاتە ڕادەی ناتەواوییەکی جیددی و... لە ململانێیەکی بنەڕەتیدایە لەگەڵ هەندێک بەڵگەی جێمتمانەدا کە تیمەکە زانیاریی لە بارەیانەوە هەبووە و دەیتوانی ئەنجامگیریی ئەوە بکات کە لە ڕاستیدا ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێناوە". ئەوجا دەپرسێت، چیتر ئەگەر ڕاپۆرتەکە نەتوانێت ناوی فۆسجین بێنێت، وەک توخمێکی کیمیایی لە کۆگاکانی ئێراندا، کەواتە "چۆن کەسێک باسی ئەو ڕاستییە دەکات کە سەربازان و دەرەجەدارانی سوپای عێراق تووشی برینی ئەو توخمە کیمیاییە بوون؟"[٤٤]

مەسەلەکە دەکرێت بەم جۆرە لێک بدرێتەوە: عێراق هێزێکی ئامادەی هەبووە، کە تووشی برینی کیمیایی بوون ـ یان لەو گازانەوە کە بە شێوەیەکی نارێکوپێک لە لایەن هێزەکانی عێراق خۆیەوە بە کار هاتووە، یاخود لەو گازانەوە کە لە تەقەمەنیی ناتوندوتۆڵەوە دزەیان کردووە. بەڵگەی بنەڕەتی هەن کە فڕۆکەی بۆمبهاوێژی عێراق بەردەوام هێزەکانی خۆیانیان گازباران کردووە لە ماوەی جەنگدا. ئەمە زۆر جار بە هۆی باوە بووە، کە بە شێوەیەکی تایبەتی لە هێڵەکانی بەرەدا ڕوو دەدات، لەو کاتانەدا کە هێزەکانی هەر دوو لا لە نزیکەوە سەنگەریان لە یەکتر گرتووە. کێشەکە توندتر بووەوە وەختێک ئێران مووشەکی دژەفڕۆکەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بە دەست هێنا (وەک بەشێک لە مەسەلەی ئێران ــ کۆنترا). لەو سۆنگەیەوە بۆمبهاوێژەکانی عێراق بە ناچاری بەرز دەفڕین و ناوچەی

بڵاوبـوونەوەی گـازەکە بەرفراوانتـر دەبـوو، کە فرەجـاریش بەسەر هەر دوو هێزەکانی عێراق و ئێراندا دەهات[٤٥].

ڕاپـۆرتێکی پـاش جەنـگ لە لایەن (سـی ئـای ئەی)ەوە کێشـەی بـا بەسـەرداهێنان و هێرشـکردنە سـەر هێزەکـانی ئێران بە چەکی کیمیایی عێراق دەسـەلمێنێت، چونکە عێراق: "... تـا ڕادەیەک بـایەخێکی وای بە سـەلامەتیی هێزەکـانی (خـۆی) نەدەدا کە لە نـاوچەی ئـالوودەبووی کیمیاییدا بـوون یان لە نزیکیەوە... عێراق تا چەند ئامادە بوو چەکی کیمیایی بڕێژێت بەسەر هێزەکانی خۆیدا، یان لە نزیکیانەوە بە کاری بێنێت بە ئاشکرا دەگۆڕا و بەند بوو بە مەودای ئامادەباشیی تـاقمە سـەربازێکەوە بـۆ خۆڕزگـارکردن لە پەلامـارێکی کیمیـایی. ئەم بێـدەنگی و شـاردنەوەیە ڕێـگەی لە عێـراق نەدەگرت چەکی کیمیایی بکات بەسـەر ناوچەکانی شـەڕ و پێکدادانـدا، لە کاتێکدا کە سـەربازەکانی خـۆی لە گەلێک لاوە شـەڕیان دەکـرد و بەر کیمیـایی دەکەوتـن. لەبەر ئەوەی کە عێراق گوێی بە هیچ بنەمایەکی ئەقڵانیەت نەدەدا، ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکـانی خـۆی لە گەرمـاوگەرمی هێرشـە کیمیاییەکانیدا دەکوژران یان بریندار دەبوون".[٤٦]

سـەرباز و فـڕۆکەوانە عێراقییەکـان پشـتی ئەم بۆچـوونە دەگـرن و فڕۆکەوانێـک بە نـاوی عەقیـد ڕوکـن یاسـر ئەلگەیلانی (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) جەخت لەسـەر ئەوە دەکاتەوە کە فڕۆکە عێراقییەکان بە ڕێکەوت هێزەکـانی خۆیـان لە گەلێـک بـۆنەدا بۆردمـان کـردووە، بە هەر دوو چەکی ئاسـایی و کیمیـایی و تەنـانەت جارێکیان بە ناپاڵمیش لە زۆنگاوەکـانی باشـوور دا و وەک ئەو دەیگـوت کەوا ئەم هەڵانە زیـانێکی زۆریـان بەرپـا دەکـرد. بـێجگە لەوە ئەو،

سەدام حسێنیشی بەوە تۆمەتبار دەکرد کەوا "توانیویەتی قوربانییە عێراقییەکان وەک بەڵگەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی ئێران بە کار بێنێت". بەشی سێیەم (لەم کتێبەدا، و) باس لەوە دەکات کە چۆن سەربازە عێراقییەکان لە فاودا بە گازی عێراق خۆی بریندار بوون. (لە چەند چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) عێراقییەکان هەمان ڕێکەوتیان دەگێڕایەوە لە شەڕەکانی تردا. بە شێوەیەکی ئاسایی سەربازان پێشتر بە زنجیرەیەک ئیشارەت ئاگادار دەکرانەوە لە هەڕەشەی پەلاماری گازی عێراق، وەک: شووتێک دوو جار دەیلووراند و سێیەم جاریش هاواری دەکرد "گازا!" هەروەها هەندێک کەڕەتیش دوو جار بە دارێک دەیانکێشا بە ویلی ئۆتۆمبیلێکدا و ئەمە ئیشارەتێک بوو کە دەبێت ماسکی گاز لە سەر بکەن، بەڵام فرەجار ئەمەیان نەدەکرد و لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا ئەو کیمیاییەی بە تەمای بوون، نەدەهات. هەروەها بە دەگمەن کەلوپەلی تری کیمیاییان دەپۆشی، لە چەشنی بەدلە و پووت و دەسکێش، بەڵکو بە وەڕسییەکەوە تەنها ماسکیان لە سەر دەکرد. ئەمە وا دەگەیەنێت کە عێراقییەکان بە درێژایی هێڵەکانی بەرەی شەڕ و بە شێوەیەکی تایبەتی ئەو توخمە دەمارانەیان بە کار هێناوە کە کاریگەریی خێرایان هەبووە و زووش ڕەویونەتەوە، وەک ڕێگەیەک بۆ کوشتنی ئێرانییەکان و لە هەمان کاتیشدا کەمکردنەوەی مەترسی لەسەر سەربازەکانی خۆیان. گازی خەردەل بەسەر بنکەکانی پشتەوەی ئێرانییەکاندا بەردەدرایەوە، لەو شوێنانەی کە لێی دەمانەوە، بۆ دروستکردنی پەشۆکان و شپرزەیی لە هێڵەکانی

فریاکەوتنیان. گازی خەردەل پێویستی بە دەستەجلی تەواو هەبوو، بەڵام لە دەمارەگازدا ماسک لەسەرکردن بەس بوو.

بەڵام کە (بـا) بە پـێچەوانەوە هەڵیـدەکرد، ئەوە هـیچ هۆشـدارییەکی پێشـوەخت کەڵکی نەبـوو. کۆلۆنێل ئیبـراهیم حەسـەن ئەلیاس، کە فەرماندەی فەوجێکی عێراقی بـوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٤دا) باسی شەڕێک دەگێڕێتەوە لە نزیک شاری موحەممەرەی وێرانکراوی ئێران و ڕووباری کـاروونەوە لە نیسـانی ١٩٨٧دا: "مـن لە دوورگەی ئـوم ڕەساس و شەتولعەرەب بووم. ڕۆژێکیان تەماشام کرد دوو فڕۆکەمـان کیمیـایی بەردەدەنەوە بەسـەر شـاری موحەممەرەی ئێرانی و ڕووباری جاسمدا و تەنانەت بۆنی دەهـاتە لـووتی منـیش. ئێرانییەکـان مووشـەکێکی هۆکیـان تەقاند و یەکێک لە فڕۆکەکانی ئێمەیان خستە خوارەوە کە میکێکـی ـــ ٢١ بـوو. فـڕۆکەکە تەقیـیەوە و لە نـاوچە زۆنگاوەکانـدا تێکشـکا. مـن لەگەڵ خالیـدی پاسـەوانمدا، کە کـوردێکی خەڵکـی کەلار بـوو، چـووم تۆمـارەکەی بێـنم (سندووقی ڕەش، و). لەو کـاتەدا کە لە فـڕۆکە سـووتاوەکە ورد دەبووینەوە، خوودەکەی خالید کەوتە نـاو ئاوەکەوە و پاشان هەڵیگرت و لە سـەری کردەوە و چەند دڵۆپە ئاوێک لە خـوودەکەوە بە ڕوومەتیـدا هـاتنە خـوارەوە. وەختێـک گەڕاینەوە بۆ فەوج، پێی گـوتم کەوا چاوی هـیچ نابینێت و منیش بردم بۆ نەخۆشـخانەی مەیدان و لەوێ خستیانە ناو حەوزێک سـەهۆڵاوەوە و پشـوویەکی تێدا وەرگرت و باری تەندروسـتیی کەمێک بـاش بـوو، بەڵام هەر کە لە ئاوەکەیـان دەرهێنـا، وەکـو خـۆیی لـێ هـاتەوە و پاشـان بە هەلیکۆپتەر بردیـان و مـاوەی شـەش مانـگ لە نەخۆشـخانە کەوت و

هەموو جەستەی بووبوو بە تلۆق ــ چونکە بەرکەوتنەکە هیی گازی خەردەل بوو. ڕۆژی پێشتریش شازدە کەس لە سەربازەکانم بەر کیمیایی کەوتن و کەوتنە نەخۆشخانە".

لیوا ڕوکن نەبیل خەلیل سەعید، کە پێشتر مولحەقی سەربازی بوو لە واشنتۆن، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٤دا) دەگێڕێتەوە کە لە سەرەتای جەنگدا و پاش کشانەوە پڕ کارەساتەکەی لە ساڵی ١٩٨٢دا، عێراق دەستی کرد بە تاقیکردنەوەی گاز بە تۆپی ١٢٢ ملم، ١٣٠ ملم و ١٥٥ ملم و هاوەنی ١٢٠ ملم. ئەنجام وا کەوتەوە کە عێراق بە تۆپی کیمیایی بۆردمان بکات و وەک ئەو ئەفسەرە دەڵێت:

"مەودای ئەرزی حەرام زۆر کەم بوو (ئەو زەوییەی نێوان هێزی دوو بەرەی شەڕ کە بەرانبەریان لە یەکتر گرتبێت و هیچ کامیان دەسەڵاتیان بەسەردا ناشکێت، و)، لەبەر ئەوە ئەگەر تۆپی کیمیایی مەودا کورتمان بە کار بهێنایە، کەس نەیدەزانی کێ بەرپرسیار دەبێت و دەکرا ئێران بەو کارە تاوانبار بکەین. بەڵام ئەگەر بۆ دوور بمانتەقاندایە بۆ پشتی هێڵەکان، ئەوە ئاشکرا دەبوو کە ئێمەین و مەسەلەکە ئابڕووچوونی لێ دەکەوتەوە. سەیرمان کرد مەسەلەکە لەبارە و کەسانێک لە بارەگاوە حەزیان دەکرد جێبەجێی بکەین و هەندێک فەرماندە زۆر دڵگەرم بوون بۆ بەکارهێنانی گاز، بەڵام هەندێکی تر مەترسیی ئەوەیان هەبوو کە لە سەربازەکانی خۆمان بدرێت".

سەرچاوەیەکی تری بەرکەوتن و بریندابوون بە کیمیایی، دزەکردن یان لێچوونی گاز بوو لە بۆمبە کیمیاییەکان، کە مەترسییان هەبوو بۆ ئەوانەی مامەڵەیان

لەگەڵـــدا دەکـــرد، یـــان بە ناچـــاری لە نزیکیـــانەوە بـــن. فڕۆکەوانێکـی جەنگیـی پێشـوو (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٣دا) ئەمەی وەک کێشـــەیەکی چەنـــدبارە و بەردەوام لەقەڵەم دەدا:

"هەر کاتێک لە بەرەدا گـاز بە کـار بهێنـرایە، ئێمە لە نـاو خۆماندا دەستمان دەکرد بە گاڵتە و قەشمەری: دیسـان بیـف بافەکەیە! (ئەمە گۆکردنی عەرەبی بوو بۆ دەرمانی پیف پافی سیسرککوژ کە لە بازاڕەکانی ئەو سەردەمەدا هەبوو). ئێمە ڕێگەمـان پێ نەدەدرا لە "لێدانی تـایبەتی" بـدوێین لەگەڵ ئەو فڕۆکەوانـانەی ئەم کارەیـان بە فڕۆکەکانیـان دەکـرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قسـە و بەیتوبـاوی زۆر تێدا بە کـار دەهـات. هەروەها ڕاهاتبووین کە بەم بۆمبانە بڵێین (أبـو خـط الأسـود ـــ واتە بـۆمبە خەت ڕەشـــەکان)، چـونکە بە خەتـــی ڕەش ئیشـــارەت کرابـوون. کـاتی وا هەبـوو نەیاندەهێشـت بچیـنە هەندێک جێگەی بنکەی هێزی ئاسمانی تا ئەرکی دەرچوونی فڕۆکەکان تەواو دەبوو، یان بـۆ مـاوەیەکی کـاتی تەلەفۆن لە کار دەکەوت و بەوەدا دەمانزانی کیمیایی بە کار دێت".

بەڵام پـــاش بەینێـــک چیتـــر کـــاری تـــایبەت نەمـــا و فڕۆکەوانەکـان حەزیـان نەدەکـرد سـەر بخـرێتە سـەریان، چونکە زۆر ڕووداو بەرپا بووبوون و ئەوانیش دەترسـان و کارەکە زۆر چەپەڵ بوو. بۆمبەکان بە پەلە ئامـادە دەکران و لە ئەنجـامی ئەوەدا لێیـــان دەچـــوو. مـــن لە فڕۆکەوانێکـــی بـــرادەرم بیســـت کە یەکێـــک لەو بۆمبـــانەی خرابـــووە فڕۆکەکەیەوە، لێی دەچوو، لەبەر ئەوە دەبوو لە فـڕۆکەکەی دەرچێـتە دەرەوە و لە سـێبەرەکەیدا چـاوەڕێ بکـات. بـۆیە بـاری تەندروسـتیی تێـک چووبـوو و سـمت و پشـتی هەمـوو

بووبوونه تلۆق (بڵق) و نەیدەتوانی پەنجەی بنووشتێنێتەوە. ئەمە تەنها یەک چیرۆک بوو بەسەر کەسێکدا هاتبوو کە من دەمناسی، بەڵام ئێمە گەلێک چیرۆک و بەسەرهاتی لەو چەشنەمان دەبیست".

باس و گێڕانەوەی فرۆکەوانەکان دۆکیومێنتێکی ئاخروئۆخریی سالآنی هەشتاکان پشتگیریی لێ دەکات. بەڵگەنامەکە باس لەوە دەکات کە یەکەی دیاریکراو بە کار دەهاتن بۆ گواستنەوەی بۆمبە کیمیاییەکان، کە بە "بۆمبە تایبەتەکان" ئیشارەتی پێ دەدات و پێویستیان بە مامەڵەیەکی تایبەت هەبوو، چونکە "زۆریان لێیان دەچوو"، ئەم لێچوونانە ڕووداویان بەرپا دەکرد، چونکە "بەرکەوتنیان سووتاوی و تلۆق و کێم و جەراعەتی لێ دەکەوتەوە. لەبەر ئەوە یەکەکانی بەرگریی کیمیایی پێویست بوون بۆ تیمارکردن و پاککردنەوەی سەربازە سووتاوەکان".(٤٧)

کامیل ئەنوەر بوترس، کە سەربازێکی عێراق بوو لە هێرشەکانی (توکلنا علی الله)ی ساڵی ١٩٨٨دا، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٤دا) دەگێڕێتەوە کەوا کاتێک هێزەکانی عێراق ڕۆکێتە کیمیاییەکانی دروستکراوی ئیتاڵیایان دەتەقاند، یەکەم قۆناغ لە فاودا بوو، بەڵام لە قۆناغەکانی دواییدا پەنایان بردە بەر ڕۆکێتی دروستکراوی ئەمەریکا، کە دەبوو ئەم و هاوەڵەکانی کڵاوەی ئەو ڕۆکێتانە لا ببەن و بیانگۆڕن بە جۆرە کڵاوەیەک کە پڕ بوون لە گازی شل. کامیل دەیگوت "ئێمە هەشت ساڵ بوو ئەم ڕۆکێتانەمان بە کڵاوەی ئاساییەوە بە کار دەهێنا و ئەمە یەکەم جار بوو کەوا دەسکارییان بکەین". وەک ئەو دەڵێت، کێشەکە لەوەدا بوو کە پاش ئەم دەسکارییە لێیان دەچوو.

ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی لە تەواوی ئەو چوار شەڕەدا کە ئەو بەشداری تێدا کردبوو، ڕووداویان لێ بکەوێتەوە:

"پیاوانی ئاسایشی نەتەوەیی (ئەمنی قەومی) کە جلی مەدەنییان لە بەردا بوو، بە ئۆتۆمبیلی بارهەڵگر ئەم ڕۆکێتانەیان دەهێنا و سەرپەرشتیی داگرتن و هەڵگرتنیان دەکرد و پێیان دەگوتین لای کەس باسی نەکەین. ئێمە دەمانزانی کە بۆمبەکان کیمیاییان تێدایە و ئەوان ئەمەیان پێ دەگوتین، بەڵام جۆری کیمیاییەکەیان دیاری نەدەکرد. ئێمە چەشنی منداڵی ناو بێشکە بۆمبەکانمان هەڵدەگرت و جارێکیان من هۆشداریی ئەوەم دانێ کە ئەگەر ئەمانە نەگەیشتنە بەری ئێرانییەکان و کەوتنە ناو هێزەکانی خۆمانەوە، چی ڕوو دەدات. لە وەڵامدا سەرپەرشتیاری کارەکە گوتی: "ئەگەر لەم چل ڕۆکێتە دەیان ئامانجی خۆی بپێکێت بەسە". لە پاش هەر هێرشێک، نەخۆشخانە مەیدانییەکانمان پڕ دەبوون لە برینداری کیمیایی عێراقی و جێگە لە قاوشەکاندا نەدەما. ئەوانە هەر دەبوو برینداری خۆمان بوونایە، چونکە گەلێک لەو ڕۆکێتانە بە هەڵە دەتەقێنران و کورتیان دەکرد و کیمیاییەکە ڕاست لە بەرەی دەدا، لە بەردەمی سەنگەرەکانی خۆمانەوە".

لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٨دا و لەمیانەی قۆناغی پێنجەمی هێرشەکەدا، لە زۆنگاوەکانی حویزەدا نزیک قەلعەساڵح، خودی بوترس خۆی بریندار بوو، "کاتێک کە ڕۆکێتە کیمیاییەکانمان دەخستە تۆپەکانەوە یەکێکیان لێی دەچوو. ئێمە نۆ سەرباز و دوو ئەفسەر بووین و یەکەم جار بردینیان بۆ خێوەتێکی پاکژ و ئەوجا لەوێوە بۆ نەخۆشخانەیەکی چەکی کیمیایی لە عەمارە. ئێمە کێشەی

تەنگەنەفەسیمان هەبوو و لەوێ دەرزیی کۆرتیزۆنیان لێ داین. ماوەی دوو ڕۆژ نەمانتوانی هیچ شتێک بخۆین و بخۆینەوە. ئەوانی تریش دەرزیی ئەترۆپینیان لێ دابوون، بەڵام کاتێک ئەفسەرە دکتۆرەکە گوێی لە ناوەکەم بوو گوتی 'تۆ مەسیحیت و دەرزیت لێ نادرێت'.

بوترس کاریگەریی دواتری تووش نەبوو و هەرگیز پێیان نەگوت کام جۆرە گاز بوو بە هۆی برینداربوونی و تەنها گوتیان 'کیمیاییە'. پاشان چەند ڕۆژێک پێش ئاگربەستی ٨ی ئاب گەیشتەوە بەرە.

ڕاپۆرتەکەی ساڵی ١٩٨٧ی نەتەوە یەکگرتووەکان، باسی لەوە نەدەکرد کە عێراق فێڵ و چاوبەستیی دەکرد لە پیشاندانی بریندارە کیمیاییەکاندا، بەڵکو بە هەندێک دووروودرێژیش و بە دەستەواژەی بێلایەنانە بەڵگەکانی تیۆەگلانی سەربازیی عێراقی بە درۆ دەخستەوە. ئەمە دوو تۆپی ١٣٠ ملیمی دەگرتەوە کە بەپێی قسەی عێراقییەکان خۆیان گازی خەردەلیان تێدا بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی پاک نەکراونەتەوە، ڕاپۆرتەکە بەوەیان وەسف دەکات کە 'لە ناوەوە ڕووپۆش نەکراون بە ماددەی بەرگریی کیمیایی' و هیچ شوێنەوارێکی گازی خەردەلیان پێوە دیار نییە و 'بە شێوەیەکی ئاسایی بۆ ماددەی تەقینەوەی سەخت بە کار هاتوون'. بە واتایەکی تر، ئەم تۆپانە لەوە ناچێت توخمی کیمیاییان تێکرابێت. سەبارەت بە پارچەی دووەمی بەڵگەکە، کە چاڵی گوللەتۆپێک بوو لە نزیک بەسرەوە، ڕاپۆرتەکە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە 'چاڵێک بەم قووڵییە و بەم تیرەیە بە شێوەیەکی ئاسایی پەیوەندیی بەو تەقەمەنییانەوە نییە کە دیزاین کرابێتن بۆ بڵاوکردنەوەی توخمە کیمیاییەکان بەسەر

شـــوێنێکی تەختــدا[٤٨]. زەخیــرەی تەقیــنەوەی ســەخت، بە شـــێوەیەکی تـــایبەت نەگونجـــاوە بـــۆ هەڵگرتنـــی تـــوخمە کیمایییەکان، چونکە ڕەنگە لە کاتی تەقینەوەدا پارچە پارچە ببێت و نەتوانێت کیمایییەکە بڵاوە پێ بکات.

بەوپێـیە گــاز بە شـێوەیەکی عــادەتی بە هــۆی تــانکیی پرژاندن یان کەرەستەی تەقینەوەی بچووک بڵاوە دەکات، کە بە فیـوزی کـات بـۆ دانـان بتەقێـتەوە. بە واتـایەکی تـر، ڕاپـۆرتەکە ئەوە دەگەیەنێـت، کە ئەو شـتانەی عێراقییەکـان دەیانەوێـت وەک بەڵـگە بـیگەیەنن، لەوەناچێـت پەیوەنـدییان لەگەڵ بەکارهێنـانی چەکی کیمایـیدا هەبێت. بێجگە لەوەش، عێراقییەکــان نەیــانتوانی هــیچ پاشــماوەیەکی گوللەهــاوەنی ئێرانییەکان بخەنە ڕوو کەوا فۆسجینی تێدا بێت.

پێدەچێت کەم کەس لە چاودێرانی جەنگی ئێران ـ عێراق ڕاپـــۆرتێکی نەتەوە یەککگرتووەکانیـــان خوێنـــدبێتەوە بەم چەشنە وردەکارییەوە. ئەوەی بەلای جیهانەوە جێی سەرنج بێت، پێشەکیی ئەو نامەیە بوو کە سکرتێری گشتیی نەتەوە یەککگرتووەکـان بـۆ ئەنجوومەنی ئاسایشـی نـارد، کاتێک کە ڕاپـۆرتەکەی بـۆ ڕەوانە کـردن. پێشـــەکییەکە دەڵێـت کەوا ئەنجـامگیریی شـارەزایان ئەوە دەردەخـات کە جـارێکی تـر چەکی کیمیایی لە لایەن هێزەکانی عێراقەوە دژ بە هێزەکـانی ئێـران بە کـار هــاتووە و دیسـان بـووەتە هـۆی کـوژران و بریندارbوونی خەڵکی مەدەنی لە کۆماری ئیسلامیی ئێراندا و وا ئێســتا هەمـدیس هێزەکـانی عێـراق بریـنداری کیمیاییـان تێکەوتووە و ئەمە شـتێکی لەناکاوی نوێ دەخـاتە سـەر ئەو مەترسییەی بووەتە جێی نیگەرانیی کۆمەڵی نێودەوڵەتی[٤٩].

لێـرەدا جیـاوازییەکی گرنـگ دێـتە کـایەوە، زۆر گرنـگ بـۆ

چـاودێری ئاسـایی و بەوپێـیەش سـوودبەخش بـوو بـۆ ئەوانەی دەیانویست فێڵ و چاوبەستی بکەن.

گەلێـک هەوڵـی عێـراق وەک بەهـانە و پاسـاو بە دوای ئەوەدا هـات، چەشـنی تۆمەتبـارکردنی سـاکار بـێ هـیچ وردەکارییەک و داواکردنێکی بێبایەخی لێکۆڵینەوەی نەتەوە یەکگرتووەکـان[٥٠]. لە تەمـووزی ١٩٨٨دا عێراقییەکـان گرەویـان بـردەوە و نەتەوە یەکگرتووەکـان ڕەزامەنـدیی دەربـڕی بـۆ ڕەوانەکردنـی نێـردەیەک بـۆ عێـراق، بـۆ تـاقە مەبەسـتی لێکـۆڵینەوە لە ئیـدیعایەکی تـایبەت بە هێرشـێکی کیمیـایی ئێران. ئەم جارەشـیان بە ئاشـکرا ڕێگەیـان نەدا بە شـارەزایان لایەنـی بەرپرسـیار دەسنیشـان بـکەن لەو برینـدارانەی تەماشـایان کـردن[٥١]، بەڵام ئەو ڕاسـتییەی کەوا نەتەوە یەکگرتووەکان لێکۆڵینەوەیەکی تەواوی تەرخـان کـرد بـۆ سـکالایەک و پاشـان نەیتـوانی پەردە لە ڕووی سـاختەکارییەکە هەڵماڵێـت، تەنهـا خزمەتـی پاڵپشـتیکردنی ئیـدیعاکە بـوو. تـیمەکە لەجیـاتیی ئەوەی متمـانە بە بەڵـگەی عێراقییەکـان بـکەن ــ کە تـۆپێکی هـاوەنی ٨١ ملـیم گـازی خەردەلـی تێـدا بـووە و دەیـانگوت گـوایە هێزەکـانی ئێـران هاویشتوویانە ـ گومـانی بەرچاویـان لا گەلاڵە بـوو، چەشـنی ئەوەی ئەم گوللەتۆپـانە "لە بارێکی خراپـی لەو چەشـنەدا کە بەکارهێنانیـان وەک تەقەمەنـی و لەبەر هۆکـاری سـەلامەتی، مەحـاڵ و ڕێتێنەچـوو بـوو"، هەروەهـا وا دەردەکەوت کە گوللەتۆپەکان پڕ بووبێت لە مـاددەیەک کە لە سـاڵی ١٩٨٧دا شـووڵز بە هەڵە جەختـی لەسـەر دەکـردەوە کە بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـاییە لە لایەن ئێرانەوە و ڕەنـگە بە ڕواڵەت جێـی باوەڕیش بووبێت بە لێکدانی هەندێک فـاکتەر[٥٢]. ئەمە یەکەم

ئیدیعای دیاریکراوی لەو چەشنەی عێراق بوو، بۆ یەکەم جاریش بوو کە عێراقییەکان بانگهێشتی لێکۆڵەرەوانی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن بۆ بەغدا و لێرە بەڵگەی وایان خستنە بەردەست، کە وا دەهاتە بەرچاو جێی باوەڕ بێت بۆ کەسێکی ئاسایی. بە پێچەوانەشەوە ئەمە وا دەگەیەنێت کە عێراق دەیویست ئێران لە قاڵب بدات، بەڵام بە ڕوونی لە ئەنجامگیریی تیمەکەدا دەرناکەوێت.

ئەگەر عێراقییەکان خۆیان خەریکی کارێکی تەفرەدان کردبێت، ئەوە هەڵبژاردنی ئەم کاتەیان گونجاو بوو: چونکە ئێرانییەکان هەرایەکی وایان نابووەوە کە ئەگەر نەتەوە یەکگرتووەکان نەتوانێت عێراق لە بەکارهێنانی گاز بوەستێنێت، ئەوە پێدەچێت ئێران هەمان کاردانەوەی هەبێت، بەو بنەمایەی کە دەوڵەتان مافی تۆڵەسەندنەوەی هەمان شێوەیان هەیە بەگوێرەی پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤ، "چونکە ئیجرائاتی پراکتیکی بۆ بەربەستکردنی هێرشە کیمیاییەکانی عێراق بەرجەستە نەبوون"[٥٣]. بە گشتی گریمانەی ئەوە هەبوو کە ئێران پەرەی بە تۆخمە کیمیاییەکانی خۆی دابێت و ڕێی تێدەچوو ئێرانیش بە زوویی دەست بکاتە بەکارهێنانی گاز. کەوابوو جەختکردنەوەی چەندبارەی ئێران لەوەی کە کۆماری ئیسلامی بڕیاری داوە هەمان جۆر تۆڵە نەکاتەوە، جێی بایەخی کەس نەبوو.

ڕاپۆرتەکەی ساڵی ١٩٨٧ی نەتەوە یەکگرتووەکان و بە وردی داڕشتنی، بە شێوەیەک چێکرابوو کە چاوی لەسەر بەهێزکردنی متمانەی ڕاپۆرتەکە بوو، بە دروستکردنی کێشەیەکی زۆر تەواو بوو. نەتوانایی فەرامۆشکردنی

تەواوی ئیدیعاکانی عێراق وێنەیەکی ناڕاستی هاوسەنگیی پێ بەخشی و وای لێ کرد لێکدانەوەی جۆراوجۆری بۆ بکرێت. ئیقبال ڕەزای کاربەدەستی نەتەوە یەکگرتووەکان کە یاوەری لێکۆڵەرەوان بوو لەم ئەرکەیاندا لەو دەمەدا ناڕوونیی ڕاپۆرتەکەی وا باس کرد بۆ ڕۆژنامەنووسان کە نەتەوە یەکگرتووەکان بەڵگەی دۆزیوەتەوە لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە لە هەموو جارێکدا (نێردەکانی لە ساڵانی ١٩٨٤ و ١٩٨٦ و ١٩٨٧دا هاتبوون)، بەڵام "بەڵگەمان بە دەستەوە نییە کە ئێران ئەو چەکەی بە کار هێنابێت"[٥٤]. ڕەزا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) مەسەلەکەی بە ڕەقتر باس کرد و گوتی: بەڵگەی عێراق "بە ئاشکرا دروستکراو بوون". سەرەڕای ئەوەش، وەک دەیگێڕایەوە، لێکۆڵەرەوان لە گەڕانەوەیاندا ئەمەیان ڕوون کردەوە و بە ئاشکرا لە ناو نەتەوە یەکگرتووەکاندا قسەیان لەسەر دەکرد بۆ هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ ئەوەی جوان گوێیان لێ بێت. ئەلستێر هەی و جولیان پێری ڕۆبنسن، کە دوو پسپۆڕی چەکی کیمیایی سەربەخۆ بوون، دواتر (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) ئەوەیان ڕوون کردەوە کە ئەوەی لە بارەی ئێرانەوە دەگوترا، گوایە لە کاتی جەنگدا گازی بە کار هێناوە، کوتومت درۆ بوو و لە دارشتنی ڕاپۆرتەکەی نەتەوە یەکگرتووەکانی ساڵی ١٩٨٧ وەرگیراوە و وەک دەڵێن "هەندێک کەس بە هەڵە لێکیان داوەتەوە".

کەواتە ئەو بۆچوونەی کەوا ئێرانیش وەک عێراق تاوانباری بەکارهێنانی چەکی کیمیاییە چووبووە ئەقڵەوە و فرەجار لە پشت تێرمی تەمومژاوییەوە خۆی حەشار دەدا.

بۆ نموونه، له ٢٤ی مارتی ١٩٨٨دا، ڕۆژنامەی لیبراسیۆنی فەڕەنسی، له ڕاپۆرتێکدا دەربارەی هێرشەکەی هەڵەبجە، که هەفتەیەک پێشتر ڕووی دابوو، جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کەوا "له حوزەیرانی ١٩٨٧دا، نێردراوێکی لێکۆڵینەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان له ڕاپۆرتێکدا ئەوەی سەلماندووە که سەربازانی هەر دوو وڵات بوون به قوربانیی چەکی کیمیایی". له کاتێکدا ڕاستییەکەی، له ڕووی تەکنیکییەوە، ئەو دارشتنەیە که بەردەوامی به تیۆریی بەرپرسیارێتیی هاوبەش دەدات(٥٥).

### ئێران و عێراق و هەڵەبجە

هەڵاوبگری عێراق لە پڕۆپاگەندەی جەنگدا بووبوو بە قەڵغانی پارێزگاری بۆی لە مەسەلەی هەڵەبجەدا. سەرەتا عێراقییەکان تەنانەت لە خۆشیان نەگرت نکوولّیی لە تاوانەکانیان بکەن، هەندێک شێوەی بێباکانە نەبێت. تەنها کاتێک کە فشاریان کەوتە سەر و پێیان بە ئاگردا چزا، بە پەلەپڕووزێ کەوتنە حاشاکردن و هەوڵدان بۆ ئەوەی خەتاکە بەسەر ئێراندا بشکێننەوە. زۆربەی کات عێراق لەم مەسەلەیە خۆی بێدەنگ دەکرد و دەبوو بە ددانپێدانانێکی زمنیی گوناهەکە بخوێنرێتەوە، بە پێچەوانەشەوە چۆن دەکرێت ڕژێمێک هێند پەرۆش بێت بۆ ئەوەی ئێران لە قافدا بگرێت بە تاوانەوە، هەر وا لە پرۆپاگەندەیدا بێدەنگ بێت لە ئاست درندەییەکی بەم قەبەیەی ئێران، لە پاش نزیکەی پێنج ساڵی تاوانبارکردنی لە لایەن ئێرانەوە، کە ڕاپۆرتەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانیش پشتگیرییان لێ دەکرد، لەمەڕ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە.

ئێوارەی ١٦ی مارتی ١٩٨٨، بەشی عەرەبیی ڕادیۆی سەربەخۆیی مۆنتی کارلۆ، لە زاری عێراقەوە تەئکیدی لەسەر بەرپابوونی شەڕێک کرد لە نێوان هێزەکانی عێراق و ئێراندا لە خورماڵ ــ کە ئێران وای لەقەڵەم دەدا بەیانیی زووی ئەو ڕۆژە بووە ــ بەڵام هیچ وردەکارییەکی لەو

بــارەیەوە بــاس نەكــرد. بــۆ ڕۆژی دوایـــی عێراقییەكــان نكوولّییــان لە ڕاپــۆرتی شـــەڕ و پێكــدادان كــرد لە نزیــك خورماڵ و هەڵەبجەوە و بە "بێبنەمایان" وەسف كرد، بەڵام پێیــان لە پاشەكشــەی هێزەكانیــان نــا لەو ناوچــانە و هــیچ باسێكیشـــیان لە هێرشـــی كیمیـــایی نەكـــرد، نە لە لایەن هێزەكــانی خۆیــان و نە لە لایەن هێزەكــانی ئێرانیشـــەوە لە ١٦ی مارت و ڕۆژانی دواتردا[٥٦].

یەكەم ناوهێنـــانی چەكـــی كیمیـــایی لە ٢٣ی مارتـــدا و هەفـتەیەك دوای ڕووداوەكە هــات، كاتێــك كە عەبـدولئەمیر ئەنبـــــاریی نـــــوێنەری هەمیشـــــەیی عێـــراق لە نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ تێد كۆپێڵی دووپات كردەوە كەوا چارڵس ڕێـــدمانی وتەبێـــژی وەزارەتـــی دەرەوەی ویـــلایەتە یەكگرتووەكان لەو ڕۆژەدا ڕایگەیاندووە كە "ئێران بە چەكی كیمیایی تۆپبارانی هەندێك ناوچەی خاكی عێراقی كردووە". بەڵام دوو ڕۆژ دواتــر تــاریق عەزیــزی وەزیــری دەرەوەی عێراق، كە لە ڕادیۆی ئوردنەوە چاوپێكەوتنی لەگەڵدا كرا، تەنــانەت بە شــێوەیەكی لاوەكیــیش نەیتــوانی ئیــدیعاكەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریكا دووبارە بكاتەوە و دەیگوت:

"گومـانی تێدا نـیە كە لەدەسـتدانی هەڵەبـجە شـتێكە زۆر جێی داخە... ئەم ناوچەیە نە ستراتیجییە و نە قایموقۆڵە و... بوونی ئێران لێرە تەنها ڕواڵەتە و هەڕەشـەیەكی سـەربازی بۆ بەرەی شەڕ پێك ناهێنێت". لە بارەی چەكی كیمیاییشـەوە تەنها ئەمەی گوت: ئێرانییەكـان "هەر هاتوهاواریـانە لەسـەر جەنگی شـارەكان و بەكارهێنـانی چەكـی كیمیـایی... ئەوانەی كە دەیانەوێت جەنگ درێژە بكێشێت بە هەر نرخێك بووە،

ئەم سکالایە وەک پاساوێک بۆ ئەو درێژەپێدانە بە کار دێنن.[٥٧]

لەگەڵ ئەوەشدا، عێراقییەکان هەستیان بە فشار دەکرد کە دەبێت کاری زیاتر بکەن بۆ گۆڕینی ڕای گشتی، بەڵام پێویستیان بە هەل و دەرفەت هەبوو. ئەم دەرفەتەش لە کۆتایی مانگدا هەڵکەوت، کاتێک بارودۆخی سەربازی لە باکووری عێراقدا بە شێوەیەکی دراماتیکی گۆڕا و بە قازانجی ڕژێم شکایەوە لەگەڵ کەوتنی بارەگای سەرکردایەتیی (ی ن ک) لە ١٩ی مارتدا و تێداچوونی ئەو ژمارە زۆرەی خەڵکی مەدەنییش لە هەڵەبجەدا سێ ڕۆژ لەوەوپێش پەلەی لێ کرد. عێراق خێرا پەلاماری قەبە و بەهێزی ئەنفالی دووی دەست پێ کرد و ناوچەی قەرەداغی کردە ئامانجی خۆی، کە ڕاستەوخۆ دەکەوتە باشووری سلێمانی و ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوای هەڵەبجەوە. ئا لێرەوە بوو کە دکتۆر فایەق گوڵپی و هاوەڵەکانی چاودێریی فڕۆکەکانی عێراقیان دەکرد کە لە بنکەی ئاسمانیی کەرکووکەوە بە ڕاسەری ئەماندا تیژ تێدەپەڕین بەرەو هەڵەبجە لە بناری چیاکانی سەر سنووری ئێران کە لای ئەمانەوە لە حوکمی چاودا بوو. لە یەکەم ڕۆژی ئۆپەراسیۆنەکە، لە ٢٢ی مارتدا، تۆپخانەیەکی عێراق ڕیزێک تۆپی کیمیایی نا بە زنجیرەیەک گوندەوە کە (ی ن ک) و پارتە کوردییەکانی تر وەک بنکەی ناوچەیی خۆیان بە کاریان دەهێنان. نزیکەی سەد کەسی مەدەنی و پێشمەرگە کوژران و ژمارەیەکی لەوە زۆرتریش بریندار بوون. هەفتەیەک دوای ئەوە هێرشێکی تر کرایە سەر شاخی زەردە کە دوا سەنگەر و قایمکاریی یاخیبوون بوو و

کەوتبووە باشووری ناوچەی قەرەداغەوە. پاش ئەوە ئیدی بەرگری هەرەسی هێنا و لە ١ی نیساندا بنکە و بارەگا ناوچەییەکانی پێشمەرگە لە گوندەکانی تەکیە و بەلەکجار کەوتن و پێشمەرگە ناچار بوون بەرەو رۆژئاوا بۆ دەشتی گەرمیان پاشەکشە بکەن و سوپای عێراقیش لە دوایان نەدەبووەوە و ڕاوی دەنان.

هێرشی کیمیایی بۆ سەر شاخی زەردە لە ٣٠ی مارتدا ــ لە کاتێکدا کە بە توندی یاخیبوانیان دەکوتا بۆ دەرپەڕاندنیان لە قەرەداغ ــ ڕەنگە وەک ئاگربڕێک بیری لێ کرابێتەوە، چونکە سەربازەکانی عێراق خۆیان بوون بە داوەوە، بەڵام برینداربییەکەیان سوودێکی باش و یەکلاکەرەوەی بۆ ڕژێم تێدا بوو. چەند ڕۆژێک دوای هێرشەکە تاریق عەزیز ئێرانی تاوانبار کرد بەوەی کە بە فڕۆکە و تۆپ، هێرشی گازی کردووەتە سەر هێزەکانی عێراق "لە کەرتی هەڵەبجە"، لە ٣٠ ـ ٣١ی مارتدا و هەشتاوهەشت سەربازی عێراقیی بریندار کردووە[٥٨]. بەڵام لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا شەڕێکی ئەوتۆ لە دەوروبەری هەڵەبجەدا ڕووی نەدابوو، ئیدیعای لێدانی کیمیایی لێرە لەئارادا نەبوو، لەو کوردانەوە نەبێت کە لە ناوچەی قەرەداغ هەڵاتبوون، بۆیە گریمانەی لۆجیکی ئەوەیە کە هێزەکانی عێراق جارێکی تر سەربازەکانی خۆیانیان بریندار کردووە لە بەکارهێنانێکی نابەجێ و گەوجانەی گازدا ــ هەڵبەت لە قەرەداغ نەک لە هەڵەبجە[٥٩]. وا ئێستا عێراق ئەم سەربازانە نمایش پێ دەکات لە بەردەم تیمە سەردانیکەرەکەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە بەغدا وەک پێشانگەی پلە یەکی پەنابردنی ئێرانییەکان بۆ گازی ژەهراوی، پاش دڵنیابوون لەوەی کە قوربانییان تا بتوانن

کەمترین قسە بکەن و ئەوەشی کە دەیڵێن تەنها ئەو قسانە بن کە فێر کرابوون تووتیئاسا بیڵێنەوە.

کاتێک کە دکتۆر مانوێل دۆمینگۆز کارمۆنای پزیشکی پسپۆڕی نەتەوە یەکگرتووەکان چاوی بە ژمارەیەک لەو برینداڕانە کەوت لە نەخۆشخانەیەکی بەغدا، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئەمانە بەر گازی خەردەل و ئەگەری ئەوەش هەیە بەر توخمێکی دەمارەگازیش کەوتبێتن. ئەو نەیگوتووە عێراق لە بەکارهێنانی دەمارەگازدا تێوەگلاوە، وەک هیچ کەسیش لەو کاتەدا باسی لەوە نەکردووە کە ئێران توانای پەلاماردانی دەمارەگازی هەبووە. بەپێی قسەی برینداڕەکان، ڕووداوەکە بە هێرشی تۆپ و فڕۆکە ئەنجام دراوە بۆ سەر "سەنگەرەکانیان بەسەر شاخەوە لە باکووری هەڵەبجە"، لە ٣٠ ــ ٣١ی مارتدا ــ کە ئەم زانیارییە بە تەواوی لەگەڵ هێرشە کیمیاییە باسکراوەکەی سەر شاخی زەردەدا یەک دەگرێتەوە. هەڵبەت دکتۆر دۆمینگۆز ئەم زانیارییانەی لا نەبووە بۆ ئەوەی ئەنجامگیرییەک بکات لەسەر ئەوەی کە چۆن ئەم سەربازانە بریندار بوون[٦٠].

پسپۆڕەکە سەردانی ناوچە بەرکەوتووەکەی نەکردبوو، ئەمەش خاڵێک بوو کە زیاتر ڕقی ئێرانییەکانی هەڵساندبوو: "مەسەلەکە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە و سەربەخۆ بونیاد نراوە، کە بە هۆی باروزرووفێکی تایبەتی سەربازە عێراقییەکان لە دۆخی پێشتردا بەر چەکی کیمیایی کەوتوون، کە ڕژێمی عێراق خۆی بە کاری هێناوە. بەوپێیە سەردانێکی سادە بۆ لای سەربازە عێراقییەکان لە نەخۆشخانەکانی بەغدا ناتوانێت هیچ تیشکێک بخاتە سەر سەرچاوەی بەرپرسیارێتیی ئەم کارە نامرۆڤانەیە"[٦١]. هەڵسەنگاندنێکی

پاش جەنگ لە لایەن دەزگای هەواڵگریی هێزی ئاسمانیی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە و وێڕای دارشتنی وردی ئەنجامەکان لە راپۆرتەکەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە نەتەوە یەکگرتووەکان "بەڵگەی پزیشکیی دۆزیوەتەوە بۆ پاڵپشتیی ئەو تۆمەتەی عێراق کەوا ئێران گازی خەردەلی بە کار هێناوە دژ بە سەربازە عێراقییەکان لە ناوچەی هەڵەبجەدا". بەڵام دواتر لەسەری دەڕوات و دەڵێت "سەرچاوەیەکی موخابەراتیی سەربەخۆ ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو بەرکەوتن و برینانە لە ئەنجامی هەڵە بەکارهێنانی ئاگری عێراقەوە بووە".[٦٢]

هێرشی گازی ٣٠ی مارت تاقە هێرشی لەو جۆرەیە بۆ سەر "کەرتی هەڵەبجە" لەو سەروبەندەدا کە عێراق سکالای ئەوەی دەکرد گوایە ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێناوە. بەوپێیە ئەم تۆمەتە وا دیارە هەوڵێکی درەنگوەخت بێت بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵە و تێکەوتنی بە بێدەنگی مانەوەی ڕۆژانی دوای ١٦ی مارت بە لێکدانی هەر دوو مێژووەکەی هەڵەبجە لە یەک مێژوودا و ئەمەش کاری خۆی کرد.

بە هەرحاڵ، ڕێگە و شێوازی تر هەن بۆ دیاریکردنی ئەوەی لە هەڵەبجە و قەرەداغدا ڕووی دا. ئەوەی کە عێراقییەکان بە ئاشکرا جاڕی لێ دەدەن یەک شتە و ئەوەی لە ناو خۆیاندا گفتوگۆی لەسەر دەکەن ــ لە ڕێگەی چەند نووسراوێکەوە کە بەسەر دەزگا ئەمنییە جۆراوجۆرەکاندا دابەش کراوە ــ بە تەواوەتی شتێکی ترە. بەڵگەنامەکانی پۆلیسی نهێنی و موخابەراتی عێراق، گەنجینەیەکی دۆزراوەی بەڵگەی خۆتاوانبارکردنە. بۆ نموونە

بروسکەیەکی ١٦ی مارتی پۆلیسی نهێنی، لەسەر بارودۆخی هەڵەبجە، باس لە "زیادکردنی هێز و دڵڕەقیی سەربازی دەکات"[٦٣]. چەند ڕۆژێک دواتر یاداشتێکی ئیستیخباراتی سەربازی باس لەوە دەکات کە "لە ئەنجامی بۆردمانکردنی ناوچەی هەڵەبجە و خورماڵ لە لایەن فڕۆکە و تۆپخانەی خۆمانەوە، نزیکەی دوو هەزار کەس لە هێزەکانی دوژمنی فارسی و کرێگرتەکانی ئێران (ی ن ک) کوژراون"[٦٤]. لە هەمووشی خراپتر، بروسکەیەکی ئیستیخباراتی سەربازی چەندین هەفتە دوای هێرشەکە، نهێنیی ئەوەی ئاشکرا کرد کەوا شریتی ڤیدیۆ (بە نهێنی) لە دوکانەکانی سلێمانیدا فرۆشراون و وەک بروسکەکە باسی دەکات، "هێرشی کیمیایی عێراق بۆ سەر هەڵەبجە" پیشان دەدات"[٦٥].

تەنها وەک دڵنیابوون لە تاوانبارکردنی عێراقییەکان، بروسکەیەکی تری ئیستیخباراتی سەربازی کە بە شێوەیەکی تەفرەدەرانە ئاماژە بە هێرشی کیمیایی هەڵەبجە دەدات و لە بارەی "پەلاماردانی ئێستای هەڵەبجە بە چەکی تایبەتەوە" دەدوێت[٦٦]. وەک پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، نازناوی "تایبەت" بە شێوەیەکی هەماهەنگ لە بەڵگەنامەکانی پۆلیسی نهێنیی عێراقدا بە کار دەهێنرێت بۆ دەسنیشانکردنی چەکی کیمیایی ڕژێم و هەر دوو بەکارهێنانی باو "زەخیرەی تایبەت" (العتاد الخاص) و "لێدانی تایبەت" (الضربات الخاصة) بوون. ئەو لە ڕژێم هەڵگەڕاوە عێراقییانەی زانیاریی شەخسییان لەسەر هێرشە کیمیاییەکانی عێراق هەبوو، کە سەرۆکی پێشووی ئیستیخباراتی سەربازی، فەریق ڕوکن وەفیق سامەڕایی یەکێک بوو لەوانە، (لە چاوپێکەوتنێکی ١٩٩٧دا) و لەم سیاقەدا وشەی "تایبەتیان"

بەوە لێک دەدایەوە کە تەنها واتای "کیمیایی" گەیاندووە. بە هەمان شێوە ڕاپۆرتی پسپۆڕانی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لە ساڵی ١٩٨٦دا قسەی فڕۆکەوانێکی عێراقیی گواستووەتەوە، کە لە فاودا دەسگیر کراوە، کاتێک باسی لە لێدانی کیمیایی کردووە بە فڕۆکە وەک "ئەرکی تایبەت" ناوی هێناوە[٦٧].

سەرەڕای ئەوەش، لە هەژدە تەنی مەتریی بەڵگەنامە گیراوەکانی پۆلیسی نهێنی و موخابەراتدا (کە نزیکەی پێنج ملیۆن لاپەڕەیە)، عێراقییەکان تاقە یەک ئیشارەتیشیان بۆ هیچ هێرشێکی کیمیایی ئێران نەکردووە لە ماوەی جەنگدا و لە هیچ خاڵێکدا، لە کاتێکدا کە بەردەوام و بێ تەمومژ، ئەگەر بە ئاشکراش نەبووبێت، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی خۆیان سەلماندووە[٦٨]. هەروەها بەڵگەنامەکان زۆرێک لە گەڕانەوەیان تێدایە بۆ سکاڵای کورد و ئێرانییەکان کەوا عێراق هێرشی کیمیایی هەڵەبجەی جێبەجێ کردووە، تەنانەت بێ سووکە ئاماژەیەکیش بە هیچ حاشاکردنێک، هەوڵێک بۆ پرسیاری زانیاری، یان هەر گوزارشتێک کە ئێران ئەنجامدەر بووە، بۆ نموونە:

• نووسراوێکی ئیستیخباراتی سەربازی، ڕۆژی ٢٤ی مارت، باس لە کاریگەریی چەکی کیمیایی دەکات بۆ سەر هەڵەبجە و ناوچەکانی دەوروبەری کەوا (١٥٠٠) کەس لە دانیشتوانی کوژراون یان بریندار بوون. نووسراوەکە ئاماژەش بەوە دەکات کە ڕۆژنامەنووسانی ئێران و فەرەنسا و ئیتاڵیا، بە یاوەریی کاربەدەستێکی ئێرانی و فەرماندەیەکی بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان سەردانی هەڵەبجەیان کردووە، پاش ئەوەی بە چەکی کیمیایی لێی درابوو. بێجگە لەوەش دەڵێ کەوا پازدە "تێکدەر"

(پێشمەرگە) کوژراون و بیستیش لە هێرشەکەی هەڵەبجەدا بریندار بوون[٦٩].

• نووسـراوێکی ئیسـتیخباراتی سـەربازی، ڕۆژی ٢٥ی مـارت، ئیشـارەت بەوە دەدات کە ئێرانییەکـان کەلـوپەلی دژەکیمیاییـان داوەتە کوردەکـان، لەگەڵ زیـاد لە بیسـت ئەمبولانسدا[٧٠].

• نووسـراوێکی ئیسـتیخباراتی سـەربازی، ڕۆژی ٢٧ی مارت، باس لەوە دەکات کە ئێران هانی کوردەکان دەدات بۆ خۆپیشـاندان دژ بە حکـومەتی عێـراق لەبەر بەکارهێنـانی چەکی کیمیایی لە ناوچە کوردییەکاندا و سکالای ئەوە بکەن کە هەزاران کەس لە دانیشـتوانی هەڵەبـجە و کـۆمەڵگە نیشتەجێیەکانی چواردەوری کوژراون[٧١].

• نووسراوێکی پۆلیسی نهێنی، ڕۆژی ١٨ی نیسـان، باس لەوە دەکـات کە کوردەکـانی نـاوچەکە بە دوای خـانەدا دەگەڕێن بۆ مندالانی هەتیو و سکالای ئەوە دەکەن کە ئەم منـدالانە دایبابیـان لە دەسـت داوە کاتێـک کە حکـومەتی (عێراق) چەکی کیمیایی دژ بە سوپای ئێران لە هەڵەبجەدا بە کار هێناوە[٧٢].

• نووسـراوێکی ئیسـتیخباراتی سـەربازی، ڕۆژی ١٥ی مـارتی ١٩٨٩، (ڕۆژی پـێش یـادی یەکەم سـاڵڕۆژی هێرشەکەی هەڵەبجە)، ئاماژە بە ڕاپۆرتی هەواڵنێرێک دەدات، کە باس لە هێرشێکی کیمیایی دەکات بۆ سەر هەڵەبجە، کەوا پێـنج هەزار کـوژراو و نـۆ هەزار بریـنداری لـێ کەوتووەتەوە[٧٣].

• نووسراوێک (لە کوردێکی سەر بە ڕژێم)ی مەفرەزەی تـایبەتەوە (مفـرزة خاصـة)، هـاوپێچە لەگەڵ نووسـراوێکی

پۆلیسی نهێنیدا، ڕۆژی ١٦ی مارتی ١٩٨٩، (یەکەم ساڵڕۆژ)، ڕاپۆرتی داوە کەوا هەڵەبجەییەکان یادی کیمیابارانەکە دەکەنەوە و هەڕەشەی خۆپیشاندان دەکەن دژ بە ڕژێم. بەڕێوەبەری پۆلیسی نهێنی تێبینیی ئەوە دەکات ئەگەر هەوڵی خۆپیشاندان بدەن، ئەوە سزای "خیانەتکارانیان" پێ "ڕەوایە".[٧٤]

ئەو تۆمەتبارکردنەی لە لاپەڕەکانی ئەم بەڵگەنامە هەواڵگرییانەی پۆلیسی نهێنیدا دەردەکەون، لە لایەن عێراقییەکانەوە پشتگیری دەکرێن ــــ بەو عەرەبە ناسیۆنالیستە دڵسۆزانەی عێراقیشەوە کە خۆشییان بە چارەی کورددا نایەت. بۆ نموونە، بڕوانە حاڵەتی فڕۆکەوانێکی عێراقیی دەستگیرکراو پاش ئەوەی هێزەکانی ئێران لە ١٧ی مارتدا فڕۆکە سۆخۆی ٢٢ کەیان لە ئۆپەراسیۆنی هەڵەبجەدا خستە خوارەوە. ناوی ئەم فڕۆکەوانە مێجەر ئەحمەد شاکر بوو و پاش چەند ڕۆژێکی گرتنەکەی لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەنووسیدا لە تاران پیشانیان دا و لەوێ ـ هەر چەندە لەژێر باری بەندکردنیشدا بوو (چونکە دیلی جەنگ بوو) ـ ڕاستگۆیانە ڕایگەیاند کە بەغدا بەرپرس بووە لە گازبارانی هەڵەبجە و خودی ئەو خۆی لێدانی کیمیایی جێبەجێ کردووە بۆ سەر مۆڵگەی هێزەکانی ئێران لە بەرەی باشووردا و زەخیرە کیمیاییەکان لە لایەن کەسانی نهێنییەوە کە جلی فڕۆکەوانییان لە بەردا بووە لە ناو فڕۆکە سەربازییەکاندا لە هەر دوو بنکەی ئاسمانیی بەلەد و کەرکووک لە عێراقدا ڕێک دەخران[٧٥]. ئەم وشانە هێزی خۆیان هەبوو و نەدەکرا فەرامۆش بکرێن، چونکە لە زاری کەسێکەوە بوون کە خۆی دانی بە

ئەنجامــدانی کارەکەیــدا دەنــا. بە هەرحــاڵ، ئەو قســانە لە دیلێتیـدا دەکـران، بـۆیە دەکـرا بەرپەرچ بـدرێنەوە و بە هەنـد وەرنەگیـرێن. بەڵام لەگەڵ قسـە و گفتـی ئەو دیـلانەدا یەکیـان دەگـــرتەوە کە لە شـــەڕەکانی پێشـــتردا گیرابـــوون (بە فرۆکەوانەکانیشەوە).

لەوەش بایەخـدارتر، یاسـر ئەلگەیلانـی، کە فڕۆکەوانێکـی عێراقی بوو و پاش جەنگ وڵاتی بەجێ هێشت و هەڵبەت لە ئاوارەییدا بە سەربەستی قسـەی دەکرد، (لە چاوپێکەوتنێکی ســـاڵی ۲۰۰۰دا) بە تەواوی قســـەکانی مـــێجەر شـــاکری دەسەلماند. ئەمیش دەیگوت کەوا فڕۆکەیەکی میگ ۲۱ی پێ بووە، کە فڕۆکەیەکی یەک کوشن بووە و ئەرکی ڕێوشوێن زانـین و ڕێگرتن بە فـڕۆکەی تـری پێ دەسـپێردرا، بە هـۆی درێژیی ماوەی جەنگەوە. وەک دەگێڕێتەوە، لە ساڵی ۱۹۸۸دا و بە هـۆی بـرادەرە فڕۆکەوانەکـانیەوە زانیـویەتی کە فـڕۆکە سـۆخۆیەکانی عێـراق، ئەوانەی کە لە بـنکەی ئاسـمانیی کەرکـووکەوە بە ئەرک دەردەچـوون بە چەکـی کیمیـایی لە هەڵەبجەیــان داوە. ئەوەشـــی دەگــوت کە ئەو فــڕۆکەوانە عێراقییـانەی لە دیلێتیی ئێرانەوە دەگەڕانەوە بۆ وڵات، پاش ئاڵوگۆڕی دیلەکان، لە لایەن ڕژێمەوە ئازار نەدەدران، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە تەلەڤیزیۆندا شایەتییان لەسەر لێدانی کیمیایی دابـوو لە لایەن عێـراقەوە، کە وەک ئەو دەیگـوت ڕاسـتگۆ بـوون لە شـایەتییەکەیاندا. فڕۆکەوانێکـی تـری عێـراق (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۳دا) باس لە پاڵنەر و هۆکارانەی ڕژێم دەکات کە لە پشت هێرشی هەڵەبجەوە بوون و دەڵێت:

"هەڵەبـجە لە سـنوورەوە نـزیکە و ئێـران بە کـارکردن لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا داگیری کرد. ئەوان سەنگەریان لێ

دا و تۆپخانەیـان هێنـا و هەڵەبجەیـان گـرت و بـۆ ئـێمەی عێـراقییش ئەمە خیـانەتێکی گەورە بـوو. هەڵەبـجە لە ڕووی سـتراتیجییەوە دەکەوتە سـەر ڕێـگەی سلێمانی و هەولێـر و ئەمە شۆکێکی گەورە بوو بۆ سەدام حسـێن و پێویسـت بـوو وەڵام بــداتەوە و زۆر زەحـــمەت دەکەوتەوە ئەگەر چەکــی ئاسایی بە کار بهێنایە، بۆیە پەنای بردە بەر 'لێدانی تـایبەت' واتە: دەمارەگـاز و مەرگی دەسـبەجێ. بەڵام هێشـتا بەشـێک لە هێزەکـانی عێـراق هەر لە دەڤەری هەڵەبــجەدا بــوون و دەپـاڕانەوە، 'ئـێمە لە مەودای تـۆپ و بۆردمـانێ ئێـوەداین! نیشانەی بەرکەوتنین!' بەڵام سەدام حسێن و عەلی حەسـەن ئەلمەجید گوێیان نەدانێ و کەوتنە بۆمبباران".

زۆر ڕاســـتەوخۆتر و ڕاشـــکاوانەتر، جەودەت مســـتەفا ئەلنەقیـب، کە لیـوا ڕوکنێکـی هێـزی ئاســمانیی عێـراق و فڕۆکەوانێکـی مەشـقکردووی بەریتانیـا بـوو، بە زانیـارییەکی شەخسی و تەواوەوە لەسـەر چەک و شەڕوشـۆڕی کیمیـایی عێراق چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕادیـۆی عێراقی ئـازاد کرد، کە ئێزگەیەکـی پەخشــی عەرەبــی بــوو لە پــراگ و ئەمەریکـا هاوکاریی دارایی دەکرد، دوابەدوای هەڵاتنی لە عێراق سـاڵی ١٩٨٨ و بەڵــگەی ڕاســتەوخۆی بەرپرســیارێتیی عێراقــی ســەبارەت بە هەڵەبــجە خســتە ڕوو[٧٦] و وای دەربــڕی کە پەرۆشـــیی بــۆ لێــدوانی ئاشــکرا بە هــۆی پەیوەنــدیی ڕاسـتەوخۆیەوەیەتی بە ڕووداوەکـانی ١٦ی مـارتەوە. بەدەر لە هەر ئەگەرێکــی ئــازاری ویــژدان و گومــانی ئەخلاقــی سەبارەت بە گازبارانی خەڵکی مەدەنیی بێتاوان، وا دیار بوو پەلامـاری هەڵەبـجە پـڕی کردبـوو لە تێکەڵەیەکـی گونـاه و تــووڕەیی و کەشــوهەوایەکی تــایبەت و نــامۆی دەدا بە

ڕەگوڕیشـــەی بنەمـــاڵەکەی: بـــاوکی تورکمـــانێکی خەڵکـــی کەرکووک و دایکی کوردێکی هۆزی گەورەی جاف بووە و بە بنەچە لە هەڵەبجەوە هاتووە. لە سەروەختی هێرشەکەدا ئەو بەڕێوەبەری فرۆکەوانیی جەنگی و سەلامەتیی بنکەی هێزی ئاسمانی بووە لە بەغدا.

لە چاوپێکەوتنەکەدا، کە دیسەمبەری ساڵی ٢٠٠٠ پەخش کـــرا، جەنەراڵ جەودەت ئەلنەقیـــب دەیگێـــڕایەوە کە وەک ئەفسـەرێکی پایەبەرز لە ژووری ئۆپەراسـیۆنی سـەربازیدا (غرفة العمليات العسكرية، و) لە ئەرکی کارڕاپەڕاندندا بووە لە کۆشکی کۆماری، کاتێک کە فەرمانی بە چەکی کیمیایی لێـــدانی هەڵەبـــجە گەیشـــتووە. ئەوانەی کە لە ژووری ئۆپەراسـیۆنی ئاسـمانیدان بە ڕێکـوپێکی دوا پێشـهاتی بارودۆخی سەربازییان پێ دەگەیشت و وا ئێستا هەواڵیان زانـی کە "هەڵەبـجە تەواو، چـونکە ئێرانییەکـان بە هاوکـاریی هێزەکانی کورد گرتیان". ئەو دەیگوت کەوا ڕۆژەکەی تەواو بیـر نـایەتەوە، بەڵام "لەو ڕۆژەدا بـوو کە هێزەکـانی عێـراق هەڵەبجەیـان جـێ هێشـت". ئەوجـا دەسـبەجێ جەنەراڵ کەوتـووەتە ئامادەکـاری و فـڕۆکەی جەنگیـی نـاردووە بـۆ بۆردمـانی هەڵەبـجە و ئاگـاداریی داوەتە سـەنتەرەکانی فەرماندەیی لە بنکەکانی هێزی ئاسمانیی کەرکووک، ئەلبەکر، سەدام. بەڵام وەک ئەو دەڵێت "بۆمبی کیمیایی بێ فەرمـان دەرنـاچێتە دەرەوە". فەرمـانی سـەرەکی دەبـوو لە سـەدام حسێن خۆیەوە بێت، یـان هەندێ جـار لە عەدنـان خەیروڵڵا تڵفـاحەوە کە دواتـر بـوو بە وەزیـری بەرگـری. پاشـان بە تەلەفۆن فەرمان درا و بۆمباران دەستی پێ کرد:

"یەکەم جار ئەو بۆمببارانەی کرا، بۆمبی ئاسایی تێدا بە کار هات. پاشان دۆخێکی گونجاو بۆ هێزەکانی ئێران ڕەخسا و هاتنە ناو شارەوە و لێرە بە دواوە بۆمبارانی کیمیایی دەستی پێ کرد. ئێمە کاریگەریی بۆمبی کیمیاییمان دەزانی و لەوێ لە ژووری ئۆپەراسیۆن دانیشتبووین و دەمانزانی کاریگەریی چییە لەسەر خەڵک و دانیشتوانی مەدەنی و سەرجەمی هاووڵاتیان و هیچ ئاگاداركردنەوەیەک نەبوو".

هەروەها دەیگوت نزیکەی چل پەنجا فڕۆکە لە لێدانی کیمیاییەکەدا بەشدار بوون و نەیدەزانی چ جۆرە ماددەیەکی کیمیایی بە کار دەهات و ئەم مەسەلەیە کاری "پسپۆڕان" بوو لە هێزی ئاسمانیدا. بەڵام لەم ساتەوەختەدا درکی پێ کرد "ڕێکوڕەوان... دەزانی چ کاریگەرییەکی هەیە... ئێمە بە ئەزموونی بۆمببارانی کەرتەکانی ئێرانمان دەمانزانی ئەنجامی چی دەبێت". دوو مانگ دوای چاوپێکەوتنەکەی ڕادیۆ و سیازدە ساڵی ڕەبەقی پاش ڕووداوەکان دەکەونە بەر پرسیار و جەنەراڵ ئەلنەقیب (لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفۆنیدا ساڵی ٢٠٠١) هێشتا هەر بە دەنگێکی تێکشکاوەوە دەیگوت: "کارێکی سامناک بوو، چونکە لەو دەمەدا خزم و خوێشم لە هەڵەبجە بوون و هیچم پێ نەدەکرا".

پلەبەرزترین ئەفسەری عێراقی کە لە ساڵانی نەوەدەکاندا لە ڕژێم هەڵگەڕێتەوە جەنەراڵ نزار ئەلخەزرەجی بوو، کە لە ساڵانی ١٩٨٧ ــ ١٩٩٠دا سەرۆکئەرکانی سوپا بوو. ئەم ئەفسەرە نکووڵیی لە هەر ڕۆڵێکی شەخسی دەکرد لەو ستەمکاری و دڕندەییەی دژ بە کوردەکان ئەنجام درا و لۆمەی عەلی حەسەن ئەلمەجیدی دەکرد وەک کەسێکی

تەواو بەرپرسـیار لەو کـردەوانە و نەدەکـرا ملکەچـی فەرمانەکـانی نەبیت. ئەم ئیـدیعای ئەوە دەکـات کەوا کاتێک بیستوویەتی هەڵەبجە گازباران کراوە، تەلەفۆنی بۆ عەدنان خەیـروڵلای وەزیـری بەرگـری کـردووە و وەک ئەم دەڵێـت ئەویش وا دیـار بـوو بە تەواوی پێی تێک چووبوو. ئەوجا خەیروڵلا پاش چەند دەقیقەیەک تەلەفۆنی بۆ کردووەتەوە و بە خەزرەجیی گوتووە کەوا بۆی دەرکەوتووە کە "خۆمانین شارەکەمان بۆمبباران کردووە"[٧٧].

دووەم ئەفسـەری پـایەبەرزی عێـراق کە لە سـاڵانی نەوەفەکانـدا هەڵگەڕایەوە، فەریـق ڕوکـن وەفیـق سـامەڕایی، سـەرۆکی پێشـووی ئیسـتیخباراتی سـەربازیی عێراق بـوو و ئەمـیش شـتێکی کەم بـاس دەکـات لەسـەر ڕۆڵـی خـۆی لەو سـتەمکارییانەی بەرپـا کـران لە لایەن ئەو ڕژێـمەوە کە ئەم زۆر بە دڵسۆزیی خزمەتی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشـدا، هەندێک سـەرنجی بایەخـداری دەربـڕی، وەک ڕاگەیانـدنی دژ بە بەرژەوەنـدی، کە زۆر شـیاوی متمـانە بـوون. سـامەڕایی نەتەوەپەرسـتێکی پابەنـد بوو و لە پاش کارەسـاتی شکسـتی کوەیت لەگەڵ سەدام حسێن تێک چوو و هەڵات بۆ لەندەن. لە کـاتی جەنگـی ئێـران ـــ عێراقـدا ئەو وەک سـەرۆکی ئیستیخباراتی سەربازی خزمەتی دەکرد، کە بەرپرس بوو لە دادگاییکردنی ئەوانەی خۆیان لە جەنگ دەدزییەوە، هەروەها لە کاروبـاری دژەیـاخیبوونی کوردەکـانیش. لە پـاش هەڵـگەڕانەوەی بەلای سـەرکردایەتیکردنی ئۆپۆزسـیۆنی عێراقـدا دایشـکاند، بەڵام کەم لە گرووپەکـانی ئۆپۆزسـیۆن ڕوویـان دایە و گومانیـان لـێ دەکـرد لە سـۆنگەی پێشێلکردنیەوە بۆ مـافی مرۆڤ. وەفیـق بـوو بە نووسـەرێکی

بەرهەمدار و چەندین کتێبی دەرکرد و ژمارەیەکی زۆری ستوون دەنووسی لە ڕۆژنامە عەرەبی زمانەکاندا، بەڵام بە کەمی چاوپێکەوتنی دەکرد. بەوپێیە ئەمە دەرفەتێکی دەگمەن بوو کە بتوانی لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٧دا لە ماڵەکەی خۆیدا لە لەندەن چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ساز بکەیت.

پیاوێکی چوارشانەی تێکسمڕاو، سمێڵێکی ئەستووری پڕ، چاویلکەی لە چاودایە و لە هەندێک ڕووەوە ڕوخساری لە سەدام حسێن دەچێت. بە وردی مامەڵەی لە گفتوگۆدا دەکرد، دوور لە بەرپرسیارێتیی خۆی لە ڕووداوە دیاریکراوەکاندا، کاتێک کە ڕۆڵی بەرپرسی فەرماندەرکردنی هەبووە وەک جێگری سابیر ئەلدووریی بەڕێوەبەری ئیستیخباراتی سەربازی لە سەردەمی جەنگدا. گەلێک لەو بەڵگەنامانەی بە ڕاست لەقەڵەم دەدا کە لە ساڵانی ١٩٩١دا لە لایەن کوردەکانەوە دەستیان بەسەردا گیرابوو، هەروەها ئیمزای ئەوانەی بە وردی دەسنیشان دەکرد کە لەژێر دەستی ئەمدا کاریان کردبوو. لە بارەی چەکی کیمیایی عێراقەوە دەیگوت کەوا تەنها سەدام حسێن و عەلی حەسەن ئەلمەجید دەیانتوانی فەرمانی لێدانی کیمیایی دەربکەن. لە بارەی هێرشکردنە سەر هەڵەبجەوە دەیگوت کەوا نزیکەی پەنجا فڕۆکەی عێراقیی تێدا بەشدار بووە و هەر یەکەیان چوار بۆمبی پێنجسەد کیلۆگرامییان هەڵگرتووە کە پڕ بوون لە ماددەی کیمیایی و نەیدەتوانی سروشت و جۆری ماددەکە دیاری بکات کە تێکڕا دووسەد بۆمبی کیمیایی بوون[٧٨]. لە هەڵسانەوەیەکی سیاسیی سەرسامکەردا، ئەم پیاوە بوو بە ڕاوێژکاری ئەمنیی جەلال تاڵەبانیی سەرکۆماری نوێی عێراق، لە ساڵی ٢٠٠٥دا. ئەو پیاوەی کە

ئیدیعای دەکرد کە "تاقە سەرچاوەی" سەدام حسێن بووە لە سەر ئێران ("هەڵبەت متمانەی تەواوی بە من هەبوو")، هەر ئەمیش جێگری سەرۆکی دەزگایەک بوو کە سەرپەرشتیی ڕۆڵی سوپای دەکرد بۆ گرتنی هەزاران مەدەنیی کورد لە کاتی ئەنفالدا و پێش ئەوەی بدرێنە دەست پۆلیسی نهێنی بۆ ئەوەی بیانکوژێت.

لیوا روکن نەبیل خەلیل سەعید، کە چوار ساڵی لە واشنتۆن وەک مولحەقی سەربازیی وڵاتەکەی لە ساڵانی (١٩٨٧ ــ ١٩٩٠)دا بەسەر برد، لە (چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٤دا) دەڵێت یەکەم جار لە ڕێگەی میدیاوە بە هێرشی گازی هەڵەبجەی زانیوە. پاشان گوتی: "ئەمەریکییەکان پێیان گوتین لێکۆڵینەوەیەکیان وا دەگەیەنێت کە ئەگەری ئەوە هەیە ئێران بەرپرسیاری ئەم کارە بێت. لە واشنتۆندا تاقم و تاقمکارییەکی باش هەبوو، کە هەر تاقمەو وڵاتی ئێران یان عێراقی تۆمەتبار دەکرد. بەو ڕەنگە لە کۆتاییدا نەیانتوانی بڕیار بدەن کەوا کێ کارەکەی کردووە"، هەر هیچ نەبێت بێ ئاشکراکردنیش.

تۆماری ئاشکرا ئەوە دەردەخات کە بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان بە لای کێدا دایشکاندووە: دەبوو ئێران تا ڕادەیەک سەرزەنشت بکرێت لەم هێرشی گازەدا. بەڵام بەڵگەنامەکانی (سی ئای ئەی) و سەربازیی ئەم ماوەیە تەنانەت ئیشارەتیشیان پێ نەداوە. بۆ نموونە کورتەباسی ڕۆژانەی (سی ئای ئەی) لە ٢٢ی مارتدا (یەک ڕۆژ پێش ئەوەی وەزارەتی دەرەوە پەنجە بۆ ئێران ڕابکێشێت)، وای دەگەیەنێت کە عێراق بە تەواوی ناوچەی هەڵەبجەی هەڵنەسەنگاندبوو "بۆ مەترسیی هێرشێکی پێچەوانەی گەورە

که ئەگەری زیانێکی قورسی بە دوادا بێت"، بەڵام لەبری ئەوە "هێزی ئاسمانی و چەکی کیمیایی بە کار هێنا بۆ بەرپاکردنی زیانێکی قورس لە ڕیزی هێزەکانی ئێراندا"[٧٩].
بەو چەشنە (سی ئای ئەی) بە زۆری بەکارهێنانی گازی عێراقی بە کارێکی ڕۆتین لەقەڵەم دا و خودی خۆی هیچ سەرسامییەکی دەرنەبڕی لە کاردانەوەی چاوەڕوانکراوی عێراق.

بەڵگەنامەیەکی ئەرکانی هاوبەشیش لە ڕۆژی ٢٢ی مارتدا، دید و بۆچوونێکی لەو بابەتەی بە کوتوپڕ بڵاو کردووەتەوە. بە گەڕانەوە بۆ لەدەستدانی هەڵەبجە ئەوە دەگەیەنێت کە عێراقییەکان، بە پشتبەستن بە هەمان بنەمای "٤ ـ ٦ساڵی ئەم دواییە" هەوڵ بۆ گێڕانەوەی ناوچەکە نادەن: "بەکارهێنانی عێراق بۆ چەکی هێشوویی و کیمیایی، ڕێگەیەکی نائاسایی نییە بۆ ئەوان لە مامەڵەکردنی ئەم بارودۆخەدا"[٨٠].

**هاوسەنگکردن**

ئایا ئێران چەکی کیمیایی لە دژی هێزەکانی عێراق بە کار هێناوە لە ماوەی جەنگدا؟ وەڵامەکەی بەم جۆرەیە: مەحاڵ نییە، بەڵام ئەگەریکی دوورە. ئەگەر بەکارهێنانێکی لەو جۆرە بووبێت ئەوە، وەک موخابەراتی ویلایەتە یەکگرتووەکان جەختی لەسەر دەکاتەوە، لە ئاستێکی بچووکدایە و ئەوپەڕەکەی ڕووداوێک بووبێت، یان تەنها ئەگەریکی تاقیکردنەوە بووە. بەڵام هەرگیز بەڵگەیەکی قەناعەتبەخش لەئارادا نییە کە ئێران گازی بە کار هێنابێت. بە نەبوونی بەڵگە و سەلماندن، سکاڵای بەکارهێنانی گاز لە لایەن ئێرانییەکانەوە دەبێت وا لێک بدرێتەوە کە بە هۆی یان بە هەڵە خوێندنەوەی ڕووداوەکانی مەیدانی شەڕە (وەک دەرکەوتنی کوژراو و برینداری کیمیایی عێراق) یان خراپ لێکدانەوەیەکی ڕاپۆرتەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانە وەختێک لە بارەی قوربانییانی کیمیایی عێراقەوە دەدوێت و ئەنجامدەر دەسنیشان ناکات. تا ئەو مەودایەی کە خراپ لێکدانەوەیەکی لەو چەشنە بە ئەنقەست بووە، ڕەنگە بەشێک بووبێت لە کۆششێکی حیساب بۆ کراو بۆ سووککردنی فشار لەسەر ڕژێمی عێراق بە هەڵگرتنی بەرپرسیاری لەسەر پەلاماری گاز و هەر هیچ نەبێت بەشێکی بخرێتە سەر شانی عێراق، بە کەڵکوەرگرتن لە دۆخی تەمومژی

جەنگ و نەتوانینی چاودێرانی سەربەخۆ بۆ ئەوەی بگەنە مەیدانەکانی شەڕ و ناحەزی و تووڕەیی خەڵک لە ئێران. لە مەسەلەی هەڵەبجەدا باس لە هەوڵێکی نائاسایی دەکەن بە تەفرە و چاوبەستییەکی ئاشکرا، کە سروشتی نائاسایی ڕووداوەکە دەیخوازێت ـــ ئەویش گازبارانی تەواوی شارێکی عێراق و دەوروپشتی، کە پێشتر هەرگیز لەوانەی نەبووبێت و بە نیازی ئاشکرای بەرپاکردنی گەورەترین زیان لە ناو خەڵکی مەدەنیدا.

بە هەرحاڵ، هۆشیارکردنەوەی بەردەوامی ئێران کە هیچ شتێکی لە بەردەمدا نەماوەتەوە هەمان شێوە کاردانەوە نەبێت بەرانبەر بە هێرشەکانی گازی عێراق، ڕەنگە یارمەتیدەر بووبێت لە خولقاندنی کەشێکی لەباردا کەوا ئێران سەرکەوتوو دەبێت لە جێبەجێکردنی هەڕەشەکانیدا. هەر زوو ئەم تۆمەتبارکردنانە ژیانیان تێکەڕا و ژمارەیەکی کەمی چاودێران پێویستیان بە بەڵگەی کۆنکرێتی بوو لە سەلماندنیدا. تەنها پیشاندانی بریندارانی کیمیایی عێراق ڕژێمی ئێرانی بە شێوەیەک وێنا کرد کە هاوکووفی عێراقە لە مەسەلەی چەکی کیمیاییدا.

ڕەنگە کەسێک ئەوە بکاتە بیانوو کە هەر شتێک لێرەدا دەگوترێت لە بارەی هەوڵەکانی عێراقەوە فێڵ و ساختە بێت، چەشنی ئەو سەربازانەی بوون بە قوربانیی لێچوونی بۆمبی کیمیایی عێراق خۆی یان ئەو گەواڵە هەورە ژەهراوییانەی دەهاتنە دواوە و بەسەر ئێرانییەکانیشیاندا دەهێنا، وەک: تۆبڵێی هیچ کام لەو بریندارانەی پیشانی نەتەوە یەکگرتووەکانیان دەدا بە هۆی خراپ بەکارهێنانی توخمە کیمیاییەکانی خۆیانەوە بووبێت؟ ئایا ئەوانە چەشنە

نادڵسۆزییەکیان تێدا بووە؟ رەنگە وا نەبووبێت. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کەوا کەس بە سکاڵایەکی وا نەهاتە پێشەوە: نە قوربانی و نە شایەتحاڵ و نە هیچ هەڵگەڕاوەیەکی ئێرانی کە ڕقی لە ڕژێم و ڕاییکردنی کاروباری سەردەمی جەنگ بووبێت.

لە دوا شیکاریدا، تاقە بەڵگەیەک بە دەستمانەوە بێت بۆ قەناعەتکردن بەو سکاڵایەی کە ئێران لە کاتی جەنگدا چەکی کیمیایی بە کار هێناوە، ئەوەیە کە حکومەتی ئەمەریکا بە هەموو توانا هەواڵگرییەکانی و قورسایی دیبلۆماسییەوە، وای دەگوت. هەروەها حەزنەکردن لە ئێران لە ئاستێکدا بوو کەوا کەس گوێی بەوە نەدەدا لەو مەسەلەیە بپرسێت.

"پتر لە ساڵێک پاش وتاردانەکەی کۆڵن پاوڵ (شوباتی ٢٠٠٣) و دوای لێکۆڵینەوەیەک کە سێ کیشوەری گرتەوە، (سی ئای ئەی) پێی لەوە نا کە (هەڵگەڕاوەیەکی عێراقی بە ناوی خوازراوی) کێرڤبۆڵەوە کابرایەکی ساختەچی بووە و لە عێراق تەکسیی لێخوڕیوە و زانیاریی ئەندازەی خستووەتە کار بۆ هۆنینەوەی چیرۆکێکی خەیاڵی، بەڵام بە ڕێوجێ، لە بارەی کارگە نهێنیەکانی چەکی بایۆلۆجییەوە لەسەر پێچکە... هەر چەندە هیچ ئەمەریکییەک و بە هیچ کلۆجێک چاوپێکەوتنی لەگەڵ کێرڤبۆڵ نەکردووە، کەچی (لێکۆڵەرەوانی سی ئای ئەی) باوەڕیان بەوە کردووە کە وەسفە تەکنیکییەکانی ئەم هەواڵدەرە ئەوەندە وردەکارییان تێدایە، کەوا لە گومانی هەڵبەستنەوە دوورن (تایلەر درەمهێلەری ئەفسەری پایەبەرزی بیروڕای جیاوازی سی ئای ئەی) دەڵێت 'خەڵک چی دەڵێن با بڵێن، ئەم کەسانە تەواو پابەندی مەسەلەکەن و دەکرێت پێمان بڵێن (خۆ ئێوە زانا نین، لێی تێناگەن)'."

**لۆس ئەنجلس تایمز**

**٢٥ی حوزەیرانی ٢٠٠٦.**

## پێنتاگۆن و هەڵەبجە

ئەمڕۆ، کەم چاودێر هەیە لەو جەختکردنە بپرسێت کەوا عێراق بوو گازبارانی هەڵەبجەی کرد. لەو کاتەشەوە کە عێراق لە ئابی ١٩٩٠دا کوەیتی داگیر کرد، تا ڕادەیەک کەس باسی ئەوە ناکات کە ئێران بەرپرس بووە لەو کارە. لە بەهاری ساڵی ٢٠٠٢دا و لە کاتێکدا کە واشنتۆن دەوروخولی جەنگی بوو، سەرۆک جۆرج دەبلیو بووش بە ئاشکرا سەدام حسێنی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە "ئەو پیاوە بوو گەلەکەی خۆی گازباران کرد" و ئەمەش ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ بوو بۆ ڕووداوەکانی هەڵەبجە.

چەند مانگێک دواتر، ڕزگابوویەک قسەی بۆ ڕۆژنامەنووسان دەکرد لە بارەی سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە و ئەمەی خوارەوەی باس کرد: "ئەوان ساڵی ١٩٨٨ چاوی خۆیان لە ئاست هەڵەبجە نووقاند، چونکە سەدام دوژمنی ئێران بوو. بەڵام ئێستا ئەم دوژمنیانە و ئەوانیش شارەکەی من وەک بەهانە بە کار دێنن. ئێمە هەستێکی تاڵمان لا دروست بووە و قێزمان دێتەوە"[1]. ئەمە خاڵێکی لەبار و شیاوی ئەوەیە لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر بکرێت. لە ئابی ٢٠٠٢دا، بابەتێک لە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزدا بڵاو کرایەوە بە ناونیشانی "ئەفسەرانێک دەڵێن کە ویلایەتە یەکگرتووەکان یارمەتیی عێراقی داوە لە جەنگدا،

سەرباری ئەوەی کە گازی بە کار هێناوە" و پەردە لەسەر "پرۆگرامێکی نهێنیی ئەمەریکا" لا دەدات کەوا "یارمەتیی پلاندانانی مەترسیداری بۆ عێراق دابین کردووە لە کاتێکدا دەزگاکانی موخابەراتی ئەمەریکا زانیویانە کە فەرماندەکانی عێراق چەکی کیمیایی بە کار دێنن بۆ بەرپاکردنی شەڕی یەکلاکەرەوە لە جەنگی ئێران ـ عێراقدا"[٢]. نووسەرەکەی، کە پاتریک تایلەری سەرۆکی بیرۆی واشنتۆنی گۆڤاری تایمزە، ئەفسەرێکی پێشووی پلە بەرزی هەواڵگریی سەربازیی پێشکەش دەکات، کە کۆلۆنێل والتەر "پات" لانگی دەزگای هەواڵگریی بەرگرییە (DIA)، کە بێ ئەوەی پەردە لەسەر وردەکاریی نهێنی لا بدات، بەوە پاساوی پرۆگرامەکەی دا کە گوتی دەستە و تاقمی موخابەراتی ویلایەتە یەکگرتووەکان "نائومێد بوون لەو دڵنیاییەی" کە عێراق شکست ناهێنێت. لانگ ئەوەی ڕوون کردەوە کە DIA "هەرگیز بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژ بە خەڵکی مەدەنیی قبووڵ نەکردووە". بەڵام عێراق بەردەوام خەڵکی مەدەنیی گازباران دەکرد، بۆ ماوەی ساڵێک زیاتر و بە شێوازێک کە DIA دەیزانی و لانیکەم جارێکیشیان بە تەواوی لە بەرچاوی هەموو جیهاندا.

هەروەها تایلەر قسەی کۆلن پاول و ڕیچارد ئەرمیتاجی گواستووەتەوە، کە هەردووکیان کاربەدەستی پایەبەرزی بەڕێوەبەریتیی ڕیگان بوون و (لە ساڵی ٢٠٠٢شدا، بە دوای یەکدا وەزیری دەرەوە و جێگری بوون). ئەوان نکووڵی لەو تۆمەتە دەکەن کە واشنتۆن بووە بە هاوبەشی عێراق لە بەکارهێنانی گازدا و لە هەمان کاتیشدا، قسەی فرانک کارلۆچیی سەرۆکی پێشووی پێنتاگۆن دەگوێزنەوە کاتێک

بانگەشەی ئەوە دەکات کە: "من ڕەزامەندیم دەربڕی لەسەر ئەوەی کە نابێت عێراق جەنگ بدۆڕێنێت، بەڵام ڕاشکاوانە دەیڵێم کەوا زانیاریی پێشوەختم نەبوو لەسەر بەکارهێنانیان بۆ چەکی کیمیایی" ـ ئەمە چوار ساڵ دوای ئەوە بوو کە بۆ یەکەمین جار ئەمەریکا ئیدانەی بەکارهێنانی گازی کرد لە لایەن عێراقەوە. ئەرمیتاج و تایلەر دەنووسن، هەر چەندە زۆر زیاد ڕۆیشتن، کەوا "گوتەبێژێک زۆری وشە ڕیز کرد بۆ ئیشارەتدان بە نکوولیکردنەکەی کەوا ویلایەتە یەکگرتووەکان سەری لەقاندووە بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی".

تایلەر بۆ ماوەیەک گرتبووی بە باسی ئەم چیرۆکەوە و لە مارتی ١٩٨٨دا، کاتێک کەوا هێشتا هەر بۆ واشنتۆن پۆست کاری دەکرد، لەو یەکەم ڕۆژنامەنووسانە بوو کە سەردانی هەڵەبجەیان کرد و وەسفی بینینی "زیاد لە سەد" لاشەی خەڵکی مەدەنیی کردووە کە "قوربانیی ئەوەی کە ئێران بە سەختترین هێرشی کیمیایی لەقەڵەمی دەدات بۆ سەر خەڵکی مەدەنی لە ماوەی زیاد لە حەوت ساڵی جەنگی کەنداودا". لە کاتێکدا کە ئێران متمانە و بڕوای بەرچاوی بە دەست دەهێنا لە سکاڵای تاوانبارکردنی عێراقدا، تایلەر وای بۆ دەچوو کە "هەر ساغکردنەوەیەکی سەربەخۆ... دەبێت ئەو پرسیارە تاوتوێ بکات کە بۆچی هێزەکانی عێراق چەکی لەم چەشنە بۆ دانیشتوانی مەدەنیی هەڵەبجە بە کار دێنن دوای ئەوەی شەڕ لەپێناوی شارەکەدا کۆتایی هاتووە"[٣].

دوو ساڵ دواتر، لە نیسانی ١٩٩٠دا، سەدام حسێن هەڕەشەی پڕ لە دڵەڕاوکێی دەکرد کە لە بەرەنگاربوونەوەی هەر هێرشێکی ئیسرائیلدا، بە چەکی کیمیایی وەڵام دەداتەوە

و فشاری زیادی خسته سەر کوەیت، کە یەکێک بوو لە قەرزدەرە سەرەکییەکانی لە سەردەمی جەنگدا. هەر دەسبەجێ پاش بەینێک واشنتۆن پۆست پەنای بردە بەر چیرۆکێکی تر لەژێر سەردێڕێکی تایلەردا کە تێیدا وەسفی "ڕێکخستنەوەیەکی دوا قۆناغەکانی جەنگی ئێران ــ عێراق" دەکات، کە تازە تەواو بووە و نهێنیی وەزارەتی بەرگریی ویلایەتە یەکگرتووەکانە[٤]. لێکۆڵینەوەکە ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئەو بە هیی شیکارانی ناونەبراوی پێنتاگۆن لێی وەرگرتووە و وەک دەڵێت "کاریکی موخابەراتیی یەکلاکەرەوە و قەناعەتبەخش" گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کەوا کوشتاری مەدەنییەکان لە هەڵەبجەدا "بە هۆی بۆمببارانی کیمیایی بەردەوامەوە بووە لە لایەن هەر دوو سوپای شەڕکەرەوە". تایلەر دەڵێت ئیدیعاکە لە بناغەدا لە سەرچاوەکانی پێنتاگۆنەوە و لە دەمی هێرشەکەدا سەری هەڵداوە، بەڵام "وردەکارییەکانی پاڵپشتی ئەم ئیدیعایە، تەنها لە کاتی تەواوبوونی لێکۆڵینەوە ناوخۆییەکانی پێنتاگۆندا دەردەکەون". تایلەر نەیتوانی دانەران یان لێکۆڵەرەوان لە سەرچاوەکانیان دوور بخاتەوە، بەڵام وەک سەرنجی داوە، ئەوان متمانەیان بە لێکۆڵینەوەکەیان هەبووە و بە دارشتنی تایلەر ئەمانەن:

- "ژمارەیەکی دیارینەکراوی بۆمبی کیمیایی ئێران یان تۆپ کەوتوونەتە هەڵەبجەوە".
- "پێدەچێت ئێران یەکەم لایەن بوو بێت کە گوللەتۆپی پڕ لە گازی سیانیدی کوشندەی گرتبێتە هەڵەبجە، کاتێک فەرماندە ئێرانییەکان بە هەڵە وایان دەزانی هێزەکانی عێراق ناوشاریان گرتووە".

• گریمـانەی سـەرچاوەکانی لێکـۆڵینەوەی نهێنـی، لەوانە "بەرپەرچدانەوەی پەیوەندییەکانی مەیدانی شـەڕ لەگەڵ باس و گێـڕانەوەی بەشـداران و ئەو شـایەتانەی دەگەیشـتنە دەزگاکانی هەواڵگریی ڕۆژئاوا".

• "گەریـلا (جەنگـاوەرە) کوردەکـانی لە ١٦ی مانگـدا دزەیان کردبووە ناو هەڵەبجەوە و ئامادەکارییان کردبوو بۆ هاوپەیمانە ئێرانییەکانیان، کە ڕۆژی دواتر بچنە هەڵەبـجەوە. لە کاتێکـدا کە فەرمانـدە ئێرانییەکـان ڕاپۆرتیـان دابـوو کەوا عێراقییەکان چەکی کیمیاییـان دژ بە شـارەکە بە کار هێنـاوە، سـەرکردەکانی گەریـلا کوردەکـان لە هەڵەبـجە، ئەوەیـان دەسنیشـان کردبـوو کە لە سـەنگەرەکانی ئێـرانەوە لە ڕۆژهەڵات و ئەوانـی عێـراقەوە لە ڕۆژئـاوا، تـۆپی کیمیاییـان تێگیراوە".

• "ڕۆژنامەنووسـە بیانییەکـان (لەوانە بە تـایلەر خۆیشیەوە) و تیمە پزیشکییەکان، کە سـەردانی هەڵەبجەیان کردبـوو پـاش هەفـتەیەک، بەڵـگەی زۆرێـک لە مردنـی سـیانیدیان بینیبـوو (واتە شـینهەڵگەڕانی دەمولێـو)، لە نـاو نزیکەی سەد تا دووسەد لاشەدا".

• "جەختکردنی ئێران... کەوا زۆر لە قوربانییانی هەڵەبجە بە ژەهـری سـیانید مـردوون، بە بەڵـگەی سـەرەکی لەقەڵەم دەدرێـن" و ئێرانـی تێـوەگلاوە، چـونکە هەواڵگریـی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان زانیـویەتی کە ئێـران سـیانید بە کـار دێنێـت نەک عێراق.

ڕاپۆرتی پاش ڕووداوی ساڵی ١٩٩٠ی پێنتـاگۆن لە لایەن دوو لێکـۆڵەرەوە لە کـۆلێجی جەنگـی سـوپای ویـلایەتە یەکگرتووەکـان ئەنجـام دراوە، یەکێکیـان کە سـتێفن

پیڵیتایەرەوە کە جاران لێکۆڵەری (سی ئای ئەی) بوو و چەند مانگێک پێش ڕووداوەکانی هەڵەبجە ئەو دەزگایەی جێ هێشتبوو. پیڵیتایەر زیاد لە هەر کەسێکی تر جەختی لەسەر ئەو ڕایە دەکردەوە کە تا ئەندازەیەک بەرپرس بوو لە هێرشی گازی هەڵەبجە و تەنانەت گەیشتبووە لاپەڕەکانی بیروڕای نیویۆرک تایمز لە پەرەسەندنی خێرای جەنگی عێراقی ساڵی ٢٠٠٣دا[٥]. لە دەقی لێکۆڵینەوەکەدا، پیڵیتایەر و دۆگ جۆنسنی هاوکاری نووسینیدا تەنانەت جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە "ئێرانییەکان ئەم هێرشەیان کردووە"، (بێ ناوهێنانی سەرچاوە)[٦].

بێنەوبەرە لەسەر بابەتەکەی تایلەر و لێکۆڵینەوە هاوبەشەکەی پیڵیتایەر لە نزیکەوە ناوەڕۆکی بەڵگەنامەیەکی ئاشکراکراوی دەزگای هەواڵگریی بەرگری (DIA) لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٨دا دەگەیەنێت[٧]. وەک پاشخانێکی ڕاسپاردە و ئامۆژگاری بۆ سیاسەت داڕێژان، بەڵگەنامەکە چەردە چاوخشاندنەوەیەک بە مێژووی کورددا دەکات، کە پڕە لە هەڵە. لە هەمووشی گرنگتر، مشتومڕی ئەوە دێنێتە پێشەوە کە "لە شەڕی هەڵەبجە و هەندێک گوندی نزیکیدا، عێراق و ئێران گازی ژەهراوییان بە کار هێناوە. بەپێی زانیاریی موخابەراتیی تایبەت، لانیکەم هەندێک لە بریندارانی گاز لە مەدەنییە کوردەکان، کە لە لایەن میدیای دەرەوە تێبینی کراون، بە هۆی هێرشی گازی ئێرانەوە بووە. یەکە سەربازییە کوردەکان سکاڵای ئەوە دەکەن کە لە هەر دوو لاوە گازباران کراون". پات لانگ، وەک سەرۆکی کەرتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دەزگای هەواڵگریی بەرگری لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٨دا ئیمزای ڕاسپاردە و ئامۆژگارییەکەی

کردووه و بەوپێیە پێدەچێت سەرچاوەی بنەڕەتیی تۆمەتی گازبارانی ئێران بێت.

گەوهەری نووسینەکەی تایلەر، ئەو بەشەی لێکۆڵینەوەکەی کۆلێجی جەنگ و یاداشتەکەی لانگ سەبارەت بەوەی کە تۆمەتبارکردنەکەی هەڵەبجە لەسەر چ بنەمایەک بووە، ئەوەیە کە لە تەمومژی جەنگدا، ئێران تۆپ (یان بۆمبی) کیمیایی تەقاندووە، لەوانەش هەندێکیان گازی سیانیدی کوشندەیان تێدا بووە، بە هەڵەی ئەوەی لایان وابووە کە هێزەکانی عێراق لە ناو شاردا بوون و ئەمەش کوشتاری گەلێک لە هاوولاتییانی مەدەنیی لێ کەوتەوە. شیکردنەوەکە پشتی بە سێ سەرچاوە بەستووە: گوێگرتن لە پەیوەندییەکان، سەرکردەکانی گەریلای کورد (پێشمەرگە، و) یان یەکە سەربازییەکانی لە مەیدانی جەنگدا بوون و ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەی پسپۆڕێک، کە دیاردەی شینهەڵگەڕانی دەمولێوی بە هۆکاری بەکارهێنانی سیانید لێک دەدایەوە و ئەمەش بە ڕۆڵی خۆی ئەوەی دەسەلماند کە دەستی ئێرانی تێدایە. ئەم ئەگەرانە هەموو پێویستیان بە تاوتوێکردنێکی تەواو بوو، نەک هەر لەبەر ئەوەی ڕاستییە مێژووییەکە بزانرێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەم دید و بۆچوونانە لە ناو ئیدارەی ڕیگاندا زاڵ بوونایە، ئەوە ڕاستەوخۆ کاریگەرییان دەخستە سەر سیاسەتی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان سەبارەت بە جەنگ و لە کاتێکدا کە شەڕ و پێکدادان چووبووە دوایین قۆناغیەوە.

## هەواڵدەر و گوێگرتن لە پەیوەندییەکان

گــوێگرتن لە پەیوەنــدییەکانی مەیــدانی شــەڕ کە یەکەم سەرچاوەی بەڵگە و سەلماندنە لەسەر هەڵەبجە، شێوازێکە لە هەواڵگریی ئیشارەت، یان "ئیشارەتەهەواڵ". هەوڵدان بۆ شوێنکەوتنی تۆماری ڕێگرتن بە پەیوەندییەکانی مەیدانی شەڕ، تا ڕادەیەک کەڵکێکی ئەوتۆ نابەخشێت. ئەو دەزگایەی ویلایەتە یەکگرتووەکان کە تۆماری پەیوەندییەکان کۆ دەکاتەوە و شی دەکاتەوە و دەیپارێزێت، دەزگای ئاسایشی نەتەوەییــــیە (NSA)، کە بە یەکێــــک لە نهێنیپــــارێزترین دەزگاکانی واشنتۆن دەژمێردرێت.

ئەو بۆچــوونەی کەوا دەزگــای ئاسایشــی نەتەوەیــی زانیاریی تەواو لەسەر هێرشە کیمیاییەکانی شەڕگەکانی میزۆپۆتامیا وەردەگرێت و لە لایەن ئەوانەی ئاشــنان بە تەکنۆلۆجیای ڕێگەپێگرتن و دژەتواناکانی عێراق و ئێران، شیتەڵ دەکرێتەوە. موقەدەم ڕیک فرانکۆنا، کە جێگری پات لانگ بوو لە دەزگای هەواڵگریی بەرگری لە ساڵی ١٩٨٨دا و پێش ئەوەش لە دەزگای ئاسایشی نەتەوەییدا کاری کردووە، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە عێراقییەکان زیاتر ڕێگە بە پەیوەندیی ئەلیکترۆنییان دەگیرا وەک شەپۆلی ڕادار و جۆرەکانی تری ئیشارەت. بۆ نموونە، فرانکۆنا دەڵێت یەکەکانی ڕێگەپێگرتنی ئەلیکترۆنیی ئێران،

شەپۆلی ڕاداریی بەتەرێکانی تۆپخانەی عێراقیان وەردەگرت و بە ڕێگەیەکی ئەلیکترۆنی ئەم زانیارییانەیان دەنارد بۆ بارەگای فەرماندەیی. ویلایەتە یەکگرتووەکان بە هۆی تەکنۆلۆجیای باڵادەستییەوە، ڕێگەی بەم پەیوەندییانە دەگرت و بەم چەشنە ڕەسەدی بۆ تۆپخانەی عێراق دەسنیشان دەکرد.

بە هەرحاڵ، پێدەچێت ڕێگەپێگرتن، زانیاری لەسەر هیچ هێرشێکی کیمیایی بە دەست نەهێنابێت و عێراقییەکان زۆر باش خۆیان دەپاراست دژ بە هەر بەزاندنێکی جۆری ئیشارەتی هەواڵگری یان پەیوەندیی موخابەراتی، وەک فرانکۆنا دەیگوت. ئەمە ئەو فەرمانانەی دەگرتەوە کە بە بێتەل دەدران و بۆ نموونە ئەوەی پەیوەندیی هەبوو بە هێرشی کیمیاییەوە. بەڵام عێراقییەکان بێتەلیان بە کار نەدەهێنا بۆ فەرمانی پەیوەندیدار بە چەکی کیمیاییەوە.

ئەوان هێڵی زەمینی یان فایبەر ئۆپتیکیان لەجیاتیدا بە کار دەهێنا، کە هەر دوو سیستەمی شەپۆلدەر نین. یان ئەگەر بێتەلیان بە کار بهێنایە، ئەوە بە جفرە پەیوەندییان دەکرد. ئەفسەرێکی هەواڵگریی تر (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٦دا) دەڵێت: "ئایا هیچ بەڵگەیەک لەئارادا بوو سەبارەت بە هێرشی کیمیایی دژ بە کوردەکان؟ من بیرم نایەتەوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەگەری ئەوە هەیە. ئێمە توانامان هەبوو ڕێگە بە پەیوەندییەکانیان بگرین، بەڵام عێراقییەکان هەرگیز ئەوەیان بە ڕوونی دەست پێ نەکرد". لە لایەکی ترەوە، یاسر ئەلگەیلانی فرۆکەوان کە لە ساڵانی نەوەدەکاندا لە ڕژێم هەڵگەڕایەوە (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەگێڕێتەوە کەوا عێراقییەکان هێند متمانەیان بە دەستباڵایی

خۆیـــان هەبـــوو لە ئاســـمانی شـــەڕدا، کە لە پەیوەنـــدییە هەواییەکاندا گوێیان نەدەدایە: "یەکێک لەو هەڵانەی کە کران ئەوە بوو کە ئێمە زۆر قسەمان بە ڕادیۆ ــ تەلەفۆن دەکرد (سیسـتەمێکی بێتەلی تەلەفۆن بوو)، لەبەر ئەوە ئێرانییەکـان زۆر بـاش سـوودیان لە گفتوگۆکانمـان وەردەگـرت". گەیلانـی لە هەمـان کاتـدا دەڵێت لەبەر ئەوەی مەسـەلەی بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لەوپەڕی نهێنیـدا بـوو، بـۆیە شـتێکی بـاش نەبـــوو فڕۆکەوانەکـــان لە کـــاتی بەجێهێنـــانی ئەرکـــی دەرچوونیاندا باسی لێوە بکەن و بە ڕاشـکاوی دەیگـوت کە هەرگیـز ئەو کـارەی نەکـردووە. لەگەڵ ئەوەشـدا پاسـاو دەهێنێـتەوە کە "زۆربەی فڕۆکەوانەکـان، نەک هەمـوویـان، بەکارهێنانی چەکی کیمیاییان پێ خۆش نەبوو، بەڵام ئەوان ملکەچی فەرمان بوون و دەترسان لەو بارەیەوە بدوێن".

هەنـــدێک لە پێشـــمەرگە کوردەکـــان لەگەڵ ئەو ڕایەدا نەبوون و (لە چاوپێکەوتنەکانی سـاڵانی ١٩٩٢ ــ ١٩٩٣دا کە بۆ هیومان ڕایتس ووچ ئەنجام دران)، گەلێک لە فەرماندە ناوچەییەکـان ئامـاژە بەوە دەدەن کەوا توانیویـانە بە هـۆی ڕادیـۆی شـــەپۆل کـــورتی بازرگـــانییەوە گـــوێ بگـــرن لە گفتوگـۆی فڕۆکەوانەکـان و لە فـرە بـۆنەدا زانیویـانە کە ئەو فڕۆکانەی بە ڕاسەریانەوەن لە ئەرکی جێبەجێکردنـی لێدانی کیمیاییدان. هێرش بابان، کە پێشمەرگەیەکی (ی. ن. ک) بـوو (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٢دا) ئەم ڕووداوەی خـوارەوە دەگێـڕێتەوە کە لە بەهـاری سـاڵی ١٩٨٧دا لە شـارۆچکەی کۆیسـنجەق: "شـازدە فـڕۆکە بە ڕاســەرمانەوە بـوون و بە ڕادیـــۆ ئێـــف ئێمەکانمـــان FM گوێمـــان لە گفتوگـــۆی فڕۆکەوانەکـــان دەگـــرت لە بـــارەی بەکارهێنـــانی چەکـــی

"تـايبەتەوە" و پاشـان ژمـارە كۆدێكيـان (جفرەيەكيـان) بە ئينگليـزى دەگوت. مـن نەمزانـى مەبەسـتيان چييە و دواتـر زانيم فڕۆكەكان بە چەكى كيميايى هێرشيان كردووەتە سـەر نـاوچەى خۆشـناوەتى". ئەگەر ئەم چيـرۆكە ڕاسـت بێـت، ئەوەى كە پێشـمەرگەكان بينيويـانە و گوێيـان لـێ بـووە، ئامادەباشيى فڕۆكەكان بووە بۆ هێرشكردنە سەر باليسان و شێخ وەسانان (بڕوانە بەشى چوارەم).

ڕێگـرتن بە پەيوەنـدييەكانى ئێـران بە ئاشـكرا زەحمەتتـر بوو. فڕۆكەوانە ئێرانييەكـان ئەوەيـان تـاقى كردبووەوە كەوا گەيلانى بە "الصـمت اللاسـلكي" ئيشـارەتى پێ دەكرد ــ واتە تەواو بێـدەنگكردنى بێـتەل. بەو هـۆيەوە هەلـى ڕێگـرتن بە پەيوەنـدى لە هەر مەزەنـدەيەكى هێرشـى گـازى ئێرانـدا هێجگار كەم بوو. لە هەمووى خراپتر، ئەوەى كە پەيوەنديى بە هێرشـەكەى هەڵەبـجەوە هەيە، فرانكۆنـا (لە پەيوەنـدييەكى ئيمەيڵدا، سـاڵى ٢٠٠٦) دەڵێت:

"ڕاسـتە لەو كـاتەدا ئـێمە واى بـۆ دەچـووين كە ئێرانييەكـانيش زەخيـرەى كيمياييـان لە هەڵەبـجەدا بە كـار هێنـاوە، لە ڕێـگەى تۆپبـارانەوە و... ئەگەر، ئەمەش (ئەگەرێكـى) گەورەيە، پەيوەنـديى ئێرانييەكـان ئيشـارەتيان بەوە دابێـت كە بۆمبى كيميـايى دەتەقێنن، ئەوە ئەگەر هەيە، كە سيسـتەمى ئيشـارەتى ـــ هەواڵگريـى ويـلايەتە يەكگرتووەكـان ڕێگەى پێ گرتبێت، بەڵام... ئۆفيسـەكەى من پێـدەچێت بەوەى زانيبێـت و (مـن) نـايەتەوە يـادم كە هـيچ كاتێك زانياريى دياريكراومـان لەم ڕووەوە دەسـت كەوتبێت. ئەمە شتێك نييە لاى من لە ياد بچێت".

به کورتی، بەڵگەی چەک و شەڕوشۆڕی کیمیایی، کە لە پەیوەندییە ڕێگەپێگیراوەکانی کاتی جەنگی ئێران ـ عێراقەوە سەرچاوەی گرتبێت، بە هۆی بەرامبەر لە یەکتر گرتنی فڕۆکەوانە عێراقی و ئێرانییەکانەوە، بە ڕاشکاوانە عێراقییەکان تێوەدەگلێنێت نەک ئێرانییەکان، با ئێرانییەکان زەخیرەی کیمیاییشیان خستبێتە خوارەوە، ئەوە لانیکەم ئەفسەرێکی پێشووی دەزگای هەواڵگریی بەرگری زانیاری لەو بارەوە ناسەلمێنێت و بە تایبەتیش فرانکۆنا وردیی لێکۆڵینەوەکەی پێڵیتایەر ـ جۆنسن دەخاتە ژێر پرسیارەوە لە نامە ئەلیکترۆنییەکەیدا (ئیمەیلەکەیدا).

سەرچاوەیەکی دووەمی بەڵگەش، شایەتیی "سەرکردەکانی گەریلا کوردەکانە لە هەڵەبجە". ئەمڕۆ، هیچ کەسێک لە سەرکردەکانی گەریلا کوردەکانی عێراق، ئیدیعای ئەوە ناکات کە ئێران هیچ ڕۆڵێکی کیمیایی بینیبێت لە هەڵەبجەدا. لە سالانی ١٩٨٠ ـ ١٩٩٠دا، هەر شایەتییەکی لەو چەشنە تەنها لە لایەن فەرماندە گیراوەکانەوە بووە، چونکە پێشمەرگەیەک نییە بە ئازادی لە شەقامەکانی عێراقدا سووڕابێتەوە و ئامادە بووبێت چاوپێکەوتنی لەگەڵ بکرێت لە لایەن کەسانی موخابەراتی ئەمەریکییەوە. بە هەرحاڵ، ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەیت کە شایەتەکان سەرکردەکانی گەریلا نەبن، بەڵکو کوردی تری هەڵەبجە بووبێتن، دەکرێت سێ ئەگەر ڕەچاو بکەین. یەکەمیان پێشمەرگە نا، بەڵکو خەڵکی مەدەنیی ناوچەکە ئیدیعایان کردبێت کە ڕۆڵێکی ئێرانی لە مەسەلەکەدا بووە. سەلماندنی ئەمە ئاسانە، چونکە ڕاستییەکەی هەندێک لە خەڵکی مەدەنی ئیدیعای ئەمەیان کردبوو، لەبەر ئەوەی کوردەکان ئەنجامی سەرپێچیکردنی

دەسەڵاتداری ملهوڕیان دەزانی و دەبوو تووتیئاسا ئەوە بڵێنەوە کە حکومەت بەلایەوە پەسەندە، کاتێک پرسیاریان لە بارەی هێرشی کیمیاییەوە لێ دەکردیت. جەمال عەزیز ئەمین، کە مامۆستا و لە هەمان کاتیشدا سەرکردەیەکی خەباتی ژێرزەمینیی (ی ن ک) بوو لە سلێمانی لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ١٩٩٩دا) دەگێڕێتەوە کە بە ئاشکرا لەو خەڵکەیان قەدەغە کردبوو باسی هێرشی کیمیایی بکەن و هەڕەشەی سزای سەختیان لێ کردبوون. قوربانییانی ئەو جۆرە هێرشانە نەک هەر تەنها دەبوو بێدەنگی لە هۆکاری برینەکانیان بکەن ــ "کە گەلێکیان لەبەر ئەوەی بە کەسی نزیکی خۆیان گوتبوو کوژرابوون" ــ بەڵکو چارەسەری پزیشکییشیان لێ بڕیبوون کە نائومێدانە پێویستیان پێ بوو.

دکتۆر لەتیف ئەمینی سەرۆکی بەشی تەندروستیی سلێمانی، کە بەرپرس بوو لە هەموو نەخۆشخانەکانی ئەوێ لە ساڵانی هەشتاکاندا، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) دەڵێت کاتێک قوربانییانی هێرشەکانی بالیسان و شێخ وەسانان هەر چۆنێک بووە گەیشتبوونە نەخۆشخانە لە سلێمانی: "ئێمە وای بۆ چووین ئێرانە و چونکە یەکەم جار بوو هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات ڕژێمی عێراق شتی وا بکات". بە هەرحاڵ، پاش ئەوەی بریندارەکانیان هێنابوو، "ئێمە ڕاسپاردەی ئاشکرامان لە شێخ جەعفەر بەرزنجیی پارێزگاری سلێمانییەوە پێ گەیشت، کە چارەسەری ئەو خەڵکە نەکەین لە بالیسانەوە هاتوون و سێ جار پێی گوتم ئەگەر ئێمە هەر کارێکی لەو چەشنە بکەین، ئەوە بە فەرمانی عەلی حەسەن ئەلمەجید دەکوژرێم و پاشان تێگەیشتین کە

عێــراق ئەم هێرشـــەی ئەنجــام داوە". لەتیــف گــوتی کەوا پێشنیاری بۆ دکتۆرەکان کردووە نەخۆشەکان بنێرنە ماڵە خزمەکانیــان و لەوێ ڕۆژانە بیــانبینن ـــ بە واتــایەکی تــر بیــانکەنە نەخۆشــی دەرەکــی و وەک دەیگــوت منداڵیشــیان لەگەڵدا بوو:

"بەم جۆرە لەوێ هێشتماننەوە و تەبەڵەکانیانمان گۆڕی و وامان بۆ نووسین کە نەخۆشیی جۆراوجۆری تریان هەیە و ئەمە بڕیارێکی ترسناک و مەترسییەکی گەورەش بوو بۆ مـن. بەڵام ئـێمە وەک دکتـۆر ئەم نەخۆشـانەمان فەرامـۆش نەکـرد و لە نەخۆشـخانەی فێرکـاری شانبەشـانی دکتـۆرە سەربازییەکان، کە عەرەب بوون، تیمارمـان دەکردن. کاتێک کە لێکۆڵەرەوەکانی موخابەرات لە بەغداوە هاتن، ئێمە پێمـان گـوتن ئەمـانە قوربـانیی ژەهراویبـوونی ژیـنگەن و هاوکـارە عەرەبەکانیشـمان ڕێـک هەمـان شـتیان گـوت، چـونکە دکتـۆر هەر دکتۆرە!"

لە پــاش هەڵەبــجە، زیــاتر لەوە ڕۆیشـــتن کە خەڵــکە مەدەنییەکە ناچار بکەن بێدەنگ بن و لەجیاتیدا لە بەردەم ڕۆژنامەنووســـانی بیانیـــدا نمایشـــیان پـــێ دەکـــرا بـــۆ بانگەشـــەکردنی ئەوەی کە ئێـران بـووە گازبـارانی کـوردی کردووە. ئەمە لە دۆسێ و فایلەکانی پۆلیسی نهێنیی عێراق (ئەمن، و) خۆیەوە دەردەکەوێت، بۆ نموونە وەک: ڕاپۆرتێکی پـۆلیس لە کـانوونی دووەمــی ١٩٨٩دا، بـاس لە ســەردانی تیمێکی تەلەڤیزیۆنی فەرەنسی دەکات بۆ لێکۆڵینەوە لەسـەر هێرشەکەی هەڵەبجە. ئەو خەڵکەی هەڵەبجە کە لە سلێمانی نیشتەجێ بووبوون، باسی ئەوەیان بۆ کردبوون کە چۆن ئێرانییەکـان بە چەکـی کیمیـایی هێرشـیان کـردووەتە ســەر

شارەکە[٨]. بە هەرحاڵ، لە پاش ساڵی ١٩٩١ و ئازادبوونی خەڵک لە ستەمی دەسەڵاتی عێراق، هەرگیز جارێکی تر هیچ کوردێکی عێراق ئیدیعای ئەوەی نەکردەوە کە ئێران گازبارانی هەڵەبجەی کردووە و لەبری ئەوە ڕوون و ئاشکرا باسیان دەکرد کە ئەوە کاری عێراق بووە و تەنها عێراق ئەوەی لێ دەوەشایەوە.

ئەگەری دووەمیش لەئارادایە کە پێدەچێت سەرکردەکانی گەریلا کوردەکان پێشمەرگە نەبووبێتن، بەڵکو فەرماندەی میلیشیا (جاش)ی سەر بە ڕژێم بووبێتن. لە کاتی هێرشی ئێران و پێشمەرگەدا بۆ سەر هەڵەبجە، جاشەکان بووبوونە دوو بەشەوە و فەرماندە بەرزەکانیان ـ کە بە تەواوی ڕژێم بە کاری هێنابوون و بەوپێیەش سوودیان لێ وەرگرتبوو ـ لەگەڵ هێزە کشاوەکانی عێراقدا هەڵاتن. ئەوانە لە کاتی هێرشە کیمیاییەکەدا لە هەڵەبجە نەبوون و لەبەر ئەوە نەیاندەتوانی وەک شایەتحاڵ بدوێن. فەرماندەکانی تر و گەلێک لە سەرباز و پلەدارەکان، هەڵویستیان گۆڕی و چوونە پاڵ پێشمەرگە لە کاتی بەزینی هێزەکانی عێراقدا. هەر کە هێرشی کیمیایی دەستی پێ کرد، ئەمانیش لەگەڵ هەڵەبجەییەکانی تردا هەڵاتن بۆ ئێران و گەلێکیان دواتر گەڕانەوە، پاش ئەوەی کە ڕژێم لە ئەیلوولی ١٩٨٨دا لێبوردنێکی گشتیی ڕاگەیاند "بۆ هەموو کوردە عێراقییەکان" و لەگەڵ خێزان و کەسوکاریاندا لە کۆمەڵگەکانی نیشتەجێبووندا یەکیان گرتەوە، لەمبەری دەریاچەی سیروان و شوێنانی تردا (مەبەست دەریاچەی دەربەندیخانە، و). ئەمانە ئەگەر "چاوپێکەوتنیان" لەگەڵ بکرایە لە لایەن کەسانی عێراقی یان هەواڵگریی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە،

شایەتیەکانیان هەمان شایەتیی ئەو کوردانە دەبوو کە لەژێر ڕکێفی ڕژێمدا دەژیان و هەمووی "نەخێر" دەبوو.

ئەگەرێکی سێیەمیش هەیە و لە هەمووی سەیرترە. چۆنە ئەگەر سەرکردەکانی گەریلا کوردی عێراق نەبووبن و کوردی ئێران بووبێتن؟ ڕاستییەکەی لە مارتی ١٩٨٨دا جەنگاوەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا) و کۆمەڵە، لە شاخەکانی سەرووی هەڵەبجەوە بوون و لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە دەپارێزران. ئەوان ئەگەر هۆکاری سەرەکیی داگیرکردنەکەی ئێران نەبووبن، ئەوە بە دڵنیاییەوە یەک لە ئامانجە سەرەکییەکان بوون. هەر کە هێزەکانی ئێران هاتنە ناو عێراقەوە، هێزێکی تایبەت یەکڕاست چووە سەر ئەم دوو گرووپە. بەڵام (ی ن ک)، کە پەیوەندییەکی باشی هەبوو، لانیکەم لەگەڵ حدکادا، هەر دوو حیزبەکەی ئاگادار کردەوە لەو پەلامارەی بەڕێوە بوو، وەک هەوڵێک بۆ دەربازبوونیان. هەموو فەرماندەکانی (ی ن ک) لەسەر ئەمە کۆک بوون و بۆ نموونە، شەوکەتی حاجی موشیر (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) گوتی کەوا ئەو ویستوویەتی دۆستەکانی لە حدکادا ڕازی بکات بەوەی ئەو ناوە بە جێ بێڵن، چونکە بنکە و بارەگایان لە گوندەکانی هاوار و دەرەتفێ بوو لە نزیک جەنگاوەرانی (ی ن ک)وە، "من چوار کۆبوونەوەم لەگەڵ کردن و نەمدەتوانی بڵێم کەوا ئۆپەراسیۆن لە کات و ساتدایە. هەموو ئەوەی کە توانیم پێیان بڵێم ئەوەبوو کە عێراق پلانی بۆ ڕووخاندنی هەڵەبجە داناوە و ڕەنگە شەڕ بەرپا ببێت. ئەوان باوەڕیان پێ نەکردین و بێجگە لەوەش لەژێر فشاری عێراقدا بوون بۆ مانەوە". جەنگاوەرەکانی کۆمەڵە، کە دۆستی (ی ن ک)

نەبوون و لە بیارە بوون، شەوکەت دەڵێت لەگەڵ ئەوەشدا ئاگاداری کردوونەتەوە کەوا کێشەیان دێتە ڕێ.

بە هەرحاڵ، هیچ لایەکیان گوێیان بەم ئاگادارکردنەوەیە نەدا و (ی ن ک) وازی لە گرووپی کۆمەڵە هێنا چیی بەسەر دێت با بێت. ئێرانییەکان پەلاماری تاقمێکیان دان کە لە سەد جەنگاوەرێک کەمتر بوون و ئەنجام بەرە و دامێنی چیاکە هەڵاتن و بە قەراغ دەریاچەکەی سیرواندا ڕۆیشتن، بە لای گوندی (ڕووخاوی) ئیمامی زامندا و ماوەی سێ ڕۆژ مانەوە و لە ناو بێشەڵان و ژاژ و گژوگیادا خۆیان حەشار دا و چاوەڕێی یارمەتی و هێز ناردنی عێراق بوون. بەڵام پێش ئەوەی ئەو یارمەتییە چاوەڕوانکراوە بگات، دەورییەکی ئێرانی زۆربەی ئەو گرووپە بچووکەی لە ناو برد و تەنها پێشمەرگەیەکی کچ بە برینداری دەرباز بوو. شەوکەت دەیگوت من دکتۆرم بۆ پەیدا کرد و جلی مەدەنیم لە بەر کرد و دواتر بە سەلامەتی گەیاندمەوە هێزە سەرەکییەکەی کۆمەڵە لە سەرووی قەڵادزێوە لە بەری عێراقی نزیک سنوور.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان زیاتر یارمەتیدەر بوو بۆ حدکا و شەوکەت سەرزەنشت کرا لەسەر ئەو ڕۆڵەی لە ڕزگارکردنیاندا گێڕای و لەکەداربوونی پەیوەندیی دواتری لەگەڵ ئێرانییەکاندا. کوردە ئێرانییەکان دوو ڕۆژ شەڕیان کرد لەگەڵ ئەوانەی پەلاماریان دان و تەنها سێ پیاویان لە دەست دا و دواجار بەرەو خورماڵ پاشەکشەیان کرد. لەوێوە مەفرەزەیەکی (ی ن ک) کەوتنە تەک جەنگاوەرەکان و خێزانەکانیان بۆ پارێزگارییان لە گەشتێکی مەترسیداردا و ماوەی سێ ڕۆژ بەڕێوە بوون و تەنها بە شەو ڕێیان

دەکرد، بە درێژایی زنجیرە شاخ و بە دەوروپشتی ڕەبایەی تازە دامەزراوی ئێرانیدا و بەسەر هێڵی بەرەدا، لە نزیک شارۆچکەی سەیدسادقەوە. گوزەرکردن بە ناوچەکەدا زۆر سەخت و دژوار بوو، چونکە بە خەستی مینرێژ کرابوو. پێشمەرگەکانی (ی ن ک) بەو هۆیەوە کە چەند ساڵ بوو نەچووبوونە ئەو ناوچەیە، شارەزای ئەو شوێنانەی نەبوون کە مەترسیدار بوو. هەر چۆنێک بوو سێ جەنگاوەری حدکا بە مین بریندار بوون لە کاتی کشانەوەیاندا، بەڵام پێش ئەوەی بپەڕنەوە بۆ بەری عێراق، بە بێتەل سەرکردایەتیی خۆیان لە بۆڵێ، بە چیای قەندیلەوە، ئاگادار کرد و داوایان لە سەرکردەکانیان کرد بە فەرماندەکانی عێراق بڵێن لە سەیدسادق لە کاتی تێپەڕینی ئەماندا تەقە نەکەن.

ئەگەری ئەوە هەیە کە حدکا بە دۆستە عێراقییەکان یان ئەمەریکییەکانیان گوتبێت کەوا ئێرانیش چەکی کیمیایی لە هەڵەبجەدا بە کار هێناوە. دەزگای هەواڵگریی بەرگری پەیوەندیی باشی هەبوو لەگەڵ بەڕێوەبەرێتیی ئیستیخباراتی سەربازیی عێراقدا کە پشتگیریی ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی دەکرد. دیپلۆماتەکانی ئەمەریکاش لە بەغدا پەیوەندی و هاتوچۆی باشیان هەبوو لەگەڵ ئەم تاقمەدا و فرەجار لەگەڵ نوێنەرە سیاسییەکانیان کۆ دەبوونەوە. بۆ نموونە، کاربەدەستێکی سیاسیی باڵیۆزخانە لە نیسانی ١٩٨٨دا سەردانی 'بەرپرسێکی کوردی ئێرانی' کردبوو لە ئۆفیسی حدکای بەغدا، بەپێی بروسکەیەکی قەدەغە لەسەرهەڵگیراو کە ناوی کوردەکەی تێدا سڕابووەوە. لەوێ قسەیان لەسەر ڕووداوەکانی هەڵەبجە کردبوو، بەڵام بەرپرسەکە، بەپێی قسەی دیپلۆماتە ئەمەریکییەکە 'بەڵگەیەکی وای پێ نەبوو

ئەو ئیدیعایە بسەلمێنێت کە ئێرانییەکان چەکی کیمیاییان بە کار هێناوە". ئەمە بایەخێکی زۆری هەبوو، چونکە ئەنجامگیریی بەرپرسەکە ڕاگەیاندنێکی پراکتیکی بوو دژ بە بەرژەوەندی. لەگەڵ ئەوەشدا (وەک کاربەدەستە سیاسییەکە لە هەڵسەنگاندنێکی دوای کۆبوونەوەکەدا باسی کرد) حدکا "دید و بۆچوونێکی پڕ لە کینەی هەبوو بۆ ئێران"[٩]. ئەم حیزبە ئۆپۆزسیۆنانە لە دووی دەرفەتێک دەگەڕان بۆ تاوانبارکردنی ئێرانییەکان، بەڵام وا ئێستا لەوەدا شکستیان هێنا، هەر چەندە ئەمەریکییەکان بە دوای بیانووی ڕۆڵێکی ئێراندا دەگەڕان لە گازبارانی هەڵەبجەدا.

ئەمڕۆ لانیکەم سەرکردەیەکی پێشووی حدکا وای لەقەڵەم دەدا کە ئێران گازی لە ناوچەی هەڵەبجەدا بە کار هێناوە. ئەو سەرکردەیە، کە ئێستا پەنابەرە لە هەندەران، لە مارتی ١٩٨٨دا لەگەڵ هێزێکی بچووکدا بووە و لە لایەن یەکێتییەوە ڕزگار کراوە و (لە پەیوەندییەکی ئیمەیڵدا ساڵی ٢٠٠٢) دەڵێت گوایە بە چاوی خۆی بۆردمانێکی فڕۆکەی ئێرانی بینیوە بۆ سەر پێگە سەربازییەکانی عێراق لە ١٦ی مارتدا لە نزیک خورماڵ و دوجەیلە/سیروانەوە و ئەم دوو شارۆچکەیە وەک کوردەکانی عێراق دەڵێن، لەو ڕۆژەدا عێراق بە کیمیایی دایگرتبوونەوە و لە "خەڵکی مەدەنی و هێزەکانی عێراق و ئاژەڵ و ماڵاتی دەدا". فڕۆکەکان لە قوڵی ئێرانەوە دەهاتن و لە هێزەکانی ئێرانیان نەدەدا. پاش ماوەیەک و کاتێک کە جەنگاوەرانی حدکا بە سەلامەتی گەیشتنەوە لای عێراق "ڕاپۆرتماندا بە سەرکردەکانی حیزب کە فڕۆکەکانی ئێرانیش بنکەکانی عێراقیان بۆمباران کرد و (بە چەکی کیمیایی) خەڵکی مەدەنییان کوشت، بەڵام ئەوان

گوێیـان لەمە نەگـرت و پێشـنیازی ئەوەیـان کـرد کە باسـی نەکەیـن، چـونکە کەس بڕوامـان پـێ ناکـات و هەمـوو کەس چـاوی خسـتووەتە سـەر ئەوەی کە هەڵەبـجە لە لایەن عێراقەوە بۆردمان کراوە".

جێـی بـڕوایە کە ئەم جەنگـاوەرانەی حـدکا، پـاش ئەوەی گەیشتبوونە پەناگەی ئارامی عێراق، بووبێتن بە سـەرچاوەی ئیـدیعاکردنی ئەوەی کە ئێـرانیش بە کیمیـایی هێرشـی کـردووەتە سـەر نـاوچەکە، بەڵام شـایەتیی فەرمانـدە پەنـابەرەکە لە لایەن گەلێـک کاربەدەسـتی تـرەوە بەرپەرچ درایەوە. بـۆ نمـوونە، هاشـمی کەریمـی، کە سـەرکردەیەکی حدکایە و ئێسـتا لە لەنـدەن دەژی (لە چاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٣دا) کە دەسبەجێ سکاڵای هێرشێکی کیمیایی جیاوازی کرد لە شـوێنێکی تـر (بـڕوانە بەشـی حەوتەم)، بـێ دوودڵـی حاشـای لەوە کـرد کە فڕۆکەکـانی ئێران گازیـان لە نـاوچەی هەڵەبجە بە کار هێنابێت: "ئێران چەکی کیمیـایی لە هەڵەبـجە بە کـار نەهێنـاوە و بـاوەڕ نـاکەم کەس بڵێـت ئەمە وا نیـیە. ئێـران دوژمنـی ئـێمەیە، وەلـێ ئەمە هەڵەیە". بەڵام بینینـی فـڕۆکەی ئێرانـی لە دەوروبەری هەڵەبـجە، لە لایەن ڕاوێژکارێکی کوردی پایەبەرزی پێشووی سـەدام حسـێنەوە، کە مـوکەرەم تاڵەبـانی بـوو، ڕەت کـرایەوە و (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٣دا) پێـی لەسـەر ئەوە دادەگـرت کەوا لە سـاڵی ١٩٨٨دا فـڕۆکەی هێـزی ئاسـمانیی ئێـران "نەیانـدەتوانی بگەنە خـاکی عێـراق" لەبەر باڵادەسـتیی هێزی ئاسـمانیی عێـراق. فڕۆکەوانێکـی جەنگـاوەری عێراقـی کە لە ناوچەکـانی سـنووردا بە ئەرکـی دیـدەوانیی دەردەچـوو (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا) بە هەمان شێوە ئەوەی باس

کرد که "له ڕووی تیۆرییەوە، فڕۆکەیەکی ئێرانی لە ١٦ی مارتدا چووەتە ناوچەی هەڵەبجە، بەڵام ئەگەر بێتو گرەوی لەسەر بکەم، ئەوە لە دژی دەوەستمەوە". دەربازبوویەکی هێرشە کیمیاییەکەی خورماڵ (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٥دا) دەگێڕێتەوە کە دوو فڕۆکەی ئێرانی بە حاڵ و نەحاڵ بەسەر شاخە دوورەکانەوە دەرکەوتوون، بەڵام وەک دەڵێت فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق شوێنیان کەوتن و ڕاویانناون و ئەوجا ئەوەشی دەخاتە سەر کە بە دڵنیاییەوە هیچ کامێکیان چەکی کیمیاییان بە کار نەهێناوە، نە لە ناو هەڵەبجە و نە لە دەوروپشتیدا.

ڕەنگە لە هەمووی گرنگتر ئەوە بێت، ئەگەر پێنتاگۆن پشتی بە هەر کەس بەستبێت لە نێو "سەرکردە گەریلاکانی کورددا لە هەڵەبجە"، وەک شایەت و بەڵگەیەک کەوا ئێران جێی لۆمەیە لە گریمانەی دوا پێکەوەگرێدانی لایەنەکانی شەڕەکەدا، ئەوە ئەو کەسە فەرماندەکەی حدکا نەبووە لە هەڵەبجە. نووسەرانی لێکۆڵینەوەکە، بەپێی واشنتۆن پۆست، دەڵێن کە سەرچاوەکانیان لە ناو هەڵەبجەدا بوون لە سەروبەندی هێرشی گازی ئێراندا (نەک لە شاخەکانی سەروویدا)، کە بۆردمانەکە ڕاستەوخۆ بۆ سەر هەڵەبجە بوو (وەک لەوەی بۆ سەر خورماڵ و سیروان/دوجەیلە بێت) و سەرچاوەکان خۆیان بەر ئەو بۆردمانە کەوتوون (وەک لەوەی لە دوورەوە تەماشای هێرشەکە بکەن) کە تۆپی کیمیایی بووە و لە بنکەکانی تۆپخانەی ئێرانەوە تەقێنراوە، نەک بۆمبی کیمیایی بووبێت و لە ئاسمانەوە خرابێتە خوارەوە.

**لێو شین لە بەرانبەر لێو سووردا**

باشە سەبارەت بە بنەمای سێیەمی ئیدیعای واشنتۆن چی بڵێین، کەوا ئێران بەلای کەمەوە تا ڕادەیەک دەبێت جێی لۆمە بێت لەسەر کوشتاری هەڵەبجە بە گازباران؟ ئەمە پەیوەندیی بە سەرنجدانی ڕۆژنامەنووسە بیانییەکان و ئەو پسپۆڕە پزیشکییانەوە هەیە لە گەرماوگەرمی دوای هێرشەکەدا، وەختێک تەماشایان کردووە دەست و قاچی مردووەکان ڕەنگیان شین هەڵگەڕاوە و بە تایبەتی لێویان و سەری پەنجەیان. پێنتاگۆن دیاردەکەی وا لێکدایەوە کە بەڵگەبێت بە ژەهراوی بوون بە سیانید و لە بەرانبەردا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئەم ئەنجامە ئەوە دەسەلمێنێت ئێران تاوانباری سەرەکی بووە، چونکە وا زانرابوو کە ئێران گازی سیانیدی بە کار هێناوە نەک عێراق. تاقە شتێک بە ڕاستی سەلمابێت لەم ئیدیعایەدا، ئەوەیە کە هەندێک لە لاشەکان ڕوخسارێکی شینباویان دەنواند. ئەوەی دوای ئیدیعاکە هەر مەزەندە و ڕەمڵ لێدانە و بنەمایەکی زانستیی لاوازی هەیە، یان هەر لە بناغەدا نییەتی.

ڕاپۆرتە سەرەتاییەکانی هەڵەبجە لە ڕاستیدا ئەوە دەگەیەنن کە عێراقییەکان سیانیدیان کردووە بەسەر شارەکەدا. لە ٢١ی مارتدا ئاژانسی هەواڵی کۆماری ئیسلامیی ئێران پێی لەسەر ئەمە داگرت، بەلام بێ

وردەکـاری[١٠]. پێـدەچێت سـەرچاوەی ئاژانسـەکەی هەواڵ، عەبـاس فروتـانی دکتـۆری سـەربازیی هێڵـی بەرەی ئێـران بووبێـت، کە لە هەڵەبـجە بـووە و ڕۆژنـامەی گاردیـان قسـەکانی ئەوی گواسـتووەتەوە، کە گوتـوویەتی دیمەنـی مەرگـی کوتـوپڕ بەڵـگەی بەکارهێنـانی سـیانید بـووە[١١]. دەسنیشانکردنەکەی فروتان خێرا لە لایەن جاک دی میلیانۆ و ڕێجینالـد مـۆریلەوە پەسـەند کـرا، کە دوو دکتـۆری ڕۆژئـاوایی بـوون و یەکەمیـان سـەرۆکی بەشـی ئەڵمـانی و ئەوی تـر بەشـی فەڕەنسـی بـوو لە ڕێکخـراوی نـاحکومیی پزیشـکانی بێسـنووردا (MSF) و دەسـبەجێ پـاش زانینـی هەواڵەکە، پەڕینە کۆڵی فرۆکەیەک کە بۆ ئێران دەچوو. لە کۆنفرانسـێکی ڕۆژنامەنووسـیدا ڕۆژی ٢٦ی مـارت و لەگەڵ گەڕانەوەیانـدا لە سـەردانێکی کوتـوپڕی بـۆ شـارە کارەسـاتبارەکە، باسـی هەنـدێک لەو ئەنجـامە کلینیکییانەیـان کـرد کە بە دەسـتیان هێنـابوو: "ڕوومەتـی شـین هەڵـگەڕاو، پەنجەکان و نینۆکی پەنجە گەورەی قاچ شـین هەڵگەڕابوون و پێسـتی هەنـدێک منـداڵ تلـۆقی کردبـوو". ئەمە و ئەو ڕاسـتییەی کە ئەوەی دەگەیاند خەڵکەکە کوتـوپڕ مردبـوون، وای لە دکتۆرەکان کرد بگەنە ئەو ئەنجامەی کەوا "گازێکی کیمیـایی زۆر ژەهـراوی و کوشـندەی خێرا" بە کـار هـاتووە. بێجگە لەوەش، وەک دەیانگوت "لەگەڵ ڕەچاوکردنی هەندێک ڕوخسـاری دیاریکراویشـدا و لەگەڵ ئاسـتێکی زۆر بەرزی ئەگەردا، دەتـوانین بگەیـنە ئەو ئەنجـامەی کە تـوخمە کیمیـاییەکە سـیانید بـووە". هەروەهـا بەڵـگەی گـازی خەردەلیشیان لەو قوربانییانەدا دۆزییەوە کە پێستیان بڵق و تلۆقی کردبوو[١٢].

هەر دوو دکتۆرەکە، چەندین نموونە شانەی لاشەی مردووەکان و باڵندەیەکی مردارەوەبووشیان لەگەڵ خۆیان بردەوە بۆ ئۆبن هایندریکس، سەرۆکی بەشی تۆکسیکۆلۆجی (لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر ژەهراویبوون، و) لە زانکۆی غێنت Ghent لە بەلجیکا. هایندریکس، کە ساڵانێکی زۆر چاودێریی بەکارهێنانی کیمیایی دەکرد لە جەنگی ئێران ـــ عێراقدا، کەسایەتییەکی بەمشتومڕە لە ناوەندی زانستیدا. ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی (کە هەندێک پشتگیریی حکومەتی ئەمەریکیی بە دەست هێنا) سەبارەت بە ژەهراویبوون بە مایکۆتۆکسین (بارانی زەرد) لە لایەن سۆڤییەتەوە لە کەمبۆدیا، لە لایەن زانا ناوادارە سەربەخۆکانەوە ڕەت کرایەوە(١٣). هەروەها ئەنجامگیرییەکانیشی لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە ئەنگۆلا، ساڵانی هەشتاکان بە هەمان شێوە درایە دواوە و بە "کاریکی زانستیی لاواز و ناتەواو" لەقەڵەم درا(١٤). بە هەمان شێوەش مەزەندەکەی کەوا عێراق توخمی بایۆلۆجیی ئەفلاتۆکسینی (کە لە خێزانی مایکۆتۆکسینە) دژ بە هێزەکانی ئێران لە شەڕی دوورگەی مەجنوون لە مارتی ١٩٨٤دا بە کار هێناوە، لە لایەن هاوکارەکانیەوە پشتگیری نەکرا(١٥).

لە نیسانی ١٩٨٨دا و سێ هەفتە لە دوای هێرشەکەی هەڵەبجە، هایندریکس بە شەخسی سەردانی هەڵەبجەی کرد کە بووبوو بە شارێکی خێونشین و باس لەوە دەکات کە: "ئێمە گەیشتینە شارێکی تەواو وێران و مردوو، هیچ شتێکی زیندووی تێدا نەمابوو". ئەو، هۆکاری مردنە دەسبەجێیەکان دەگێڕێتەوە بۆ سیانید و پێی وایە شینبوونەوەی ڕوومەت و

نینــۆکی پەنجەکــان لە وێــنەی مردووەکانــدا پاڵپشــتیی ئەم لێکــدانەوە و بۆچــوونە دەکەن[١٦]. ئەم پیــاوە نمــوونەیەکی زۆری لە هەڵەبجەدا کۆ کردەوە بۆ لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە ـ چەشنی ئـاو لە دەفرێکی سـەربەتاڵدا، پارچە بۆمب، چەند بەردێـک لە شـوێنێکدا کە بۆمـب لێـی دابـوو، فەرشـێک، لـقە ســووتاوی دار و دەوەن، قــژی ژنێــک. دوو هەفــتە دواتــر ڕاپۆرتێکی بڵاو کردەوە کە تێیدا ئەوەی ڕوون کردەوە کەوا قوربانییــانی هەڵەبــجە لە ئەنجــامی کۆکتێلێــک (تێکەڵەیەکــی) گازدا مردوون، لەوانە گازی خەردەل و سـیانید، توخمەکـانی دەمـار وەک تـابوون، سـارین، سـۆمان و پێدەچێت تەنـانەت فۆسجین و مایکۆتۆکسینیش بە کار هاتبێت[١٧]. باسوخواسـی سـیانید لە واشـنتۆن دەنگــی دایەوە. وەک ڕێـک فرانکۆنـای ئەفسەری پەیوەندیی دەزگای موخـابەراتی پەیوەندیی لەگەڵ ئیســـتیخباراتی ســـەربازیی عێراقـــدا، ســـاڵی ١٩٨٨، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەگێڕێتەوە:

"ئێمە چەندی توانیمان بەڵگەی وێنەییمـان کۆ کردەوە، لە سەرچاوەکانی تـایبەتی کورد و کاربەدەسـتە ئێرانییەکـانەوە. لە وێنەکانـدا کە تەماشــامان دەکــردن، شــارەزایانی چەکــی کیمیایی ئەمەریکی (لەسـەر بنەمای سەلماندنی فت دیتریک و ئەبەردیــن) ئەو ئەنجامەیـان گەلاڵە کــرد کە ژمــارەیەک لە قوربانییـــــان نیشـــــانەی ژەهراویبـــــوون بە ســـــیانیدی هایدرۆجینیان پێوە دیـار بـوو ــ ئەمەش تواناسـازییەک بـوو دەمانگێڕایەوە بۆ ئێران نەک عێراق. شارەزاکانی فت دیتریک ڕەچاوی ڕوخساری قوربانییانیان کرد و گەیشـتنە ئەنجـامی ژەهراویبــوون بە سـیانیدی هایـدرۆجین و دەمارەگـاز یــان خەردەلیـــان لە هەنـــدێک قوربانیـــدا نەســـەلماند و دایـــانە

دواوه[١٨]. ئـێمه لەو بـڕوایەدا نەبـووین عێـراق سـیانیدی هایـدرۆجینی هەبێـت لە عەمبارەکانیـدا، بەڵکـو لە بنەڕەتـدا زۆربەمـان لە پێنتاگۆنـدا باوەڕمـان وابـوو کە هەر دوو لا چەند جۆرێک چەکی کیمیاییان لە هەڵەبجەدا بە کار هێناوە".

پێنتاگۆن هەرگیز سەلماندنی تەواوی ئیدیعای سیانیدی نەداوە بە دەسـتەوە و بە هەمـان شـێوەش نەیتوانیـوە ئەو تۆمەتە بەسەر ئێراندا ساغ بکاتەوە کە بە ئاشکرا ئەم جۆرە گـازەی بە کـار هێنابێـت. شـارەزا پزیشـکییەکەی نەتەوە یەکگرتووەکـان، کە لێکـۆڵینەوەی لەسـەر پشـکنینی ئەو نەخۆشانەی هەڵەبجە ئەنجام دا کە لە نەخۆشخانە کەتبوون، وەک قوربانییـانی گـازی خەردەل و توخمەدەمـارێکی دیـارینەکراو. سـەبارەت بە سـیانیدیش دەیگـوت کەوا "نەیتوانیـوە هـیچ زانیـارییەکی کۆتـایی بە دەست بێنێـت لە بـارەی بەکارهێنـانی، وەک بـاس دەکرێـت، گـازی هایدرۆسیانیک وەک ماددەیەکی کیمیایی ترسناک"[١٩].

بـێجگە لەوەش، ئەو بۆچـوونەی کەوا دەسـت و قـاچ و شـوێنی تـری شـینهەڵگەڕاو بە نیشـانەی بە سـیانید مـردن دادەنێـت، لە لایەن پسـپۆڕانەوە بەرپەرچ دراوەتەوە. ڕەنـگ گۆڕان و شینهەڵگەڕانی پێست و دەست و قاچی تەرمەکان ــ بە تـایبەتی لێـو و سـەری پەنجەکـان ــ پێـی دەگوترێـت "سیانۆسـیس cyanosis" (کە لە کیانۆسیسـی گـریکییەوە هاتووە بە واتا شینی تێر) و هۆکاری ڕوودانـی ئەم حـاڵەتە کەمبـوونەوەی ئۆکسـجینە لە خوێنـدا. بەدەر لە بنـاغەیەکی ئێتیمۆلۆجیی هاوبەش (واتە ڕەگ و مێژووی وشـە، و)، هـیچ پەیوەنـدییەکی ڕاسـتەوخۆ لە نێوان سیانۆسـیس و سـیانیددا نییە. ڕەنگە شینبوون بەڵگەیەک بێت بۆ سـیانید، بەڵام بەپێی

بۆچـــوونی شـــارەزایان ســـووک و ئاســـان بەکارهێنـــانی توخمەدەمـــارێکیش دەگەیەنێـــت. دکتـــۆر ئەڵســـتێر هەی، کە پرۆفیسۆرێکی تۆکسیکۆلۆجیی ژینگەیە لە زانکۆی لیدز، لە ئیمەیلێکدا (ساڵی ٢٠٠٢) دەنووسێت: "سیانۆسیس لەسەر رووکاری دەرەوەی جەستە Peripheries بە ئاسانی بە هۆی کەمیی تێربوونەوە بە ئۆکسجین دروست دەبێت. بەوپێیە ئەگەر دڵت یان سییەکانت بە باشی کاریان نەکرد، ئەوە تووشی سیانۆسیس بوویت و ئەوە بە ژەهراویبوون بە سیانید دەستنیشان ناکرێت و توخمەکانی دەمارەگاز دەشێت کاریگەرییان هەبێت لەسەر کارکردنی دڵ و ببنە هۆی سیانۆسیس".

دکتـۆر فرێدریک سـیدێل، سـەرۆکی پێشـووی ئۆفیسـی چاودێریی بریندارانی کیمیایی لە ئینیستیتیگوتی لێکۆڵینەوەی پزیشکیی سوپای ئەمەریکا بۆ بەرگریی کیمیایی لە دەزگای ئەبەردین (Aberdeen Proving Ground) لە مێریلاند، هاوڕایە لەم مەسەلەیەدا. کاتێک کە پرسیاری لێ کرا وێنەی ئەو خەڵـکە مـردووەی کە لێویـان شـین هەڵـگەڕاوە چـی دەگەیەنێت، ئەویش (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) بەم جـۆرە وەڵام دەداتەوە: "ئەمە تەنهـا ئەوە دەگەیەنێـت کە ئەوانە مردوون و ناتوانی هیچ شتێک بڵێی لە بارەی لێوی شینەوە. ڕەنگە هەندێک کەس بە دڵەکوتە بمرن و لێویان شـین ببێـتەوە. هەروەهـا دەمارەگـازیش لێـو شـین هەڵدەگەڕێنێت، چونکە سییەکان و ڕاڕەوەکانی هەوا دەگرێت و ناهێڵێت ئۆکسجینی بۆ بڕوات و بەم حاڵەتەش دەگوترێت سیانۆسیس". لە پرسیارێکدا کە ئایا گازی سیانید دەبێتە هۆی شینبوونی لێو؟ ئەویش گوتی، سیانید "بە شێوەیەکی

ئاسـايی دەبێـتە هـۆی سـووربوونەوەی پێسـت و سـووربوونەوەی لێـو ــ لە ڕاسـتیدا سـوورێکی گێلاسـییش، بەڵام نەک هەموو حاڵەتەکان".

دکتـۆر سـیدێڵ، وەک پسـپۆڕانی تـری چەکـی کیمیـایی، گـاڵتەی بەو بۆچـوونە دەهـات کە دەکرێـت لە وێنەکـانەوە جـۆری گـازەکە بزانرێـت و بە پێـداگرتنەوە دەیگـوت: "وێـنە ڕێگەیەکی هەژارە بۆ دەسنیشانکردنی هۆکاری مـردن". بەڵام ئۆبن هایندریکس لەسەر ئەو ڕایە نییە و (لە چاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٣دا) دەڵێـت: "دەسنیشـانکردن بە چـاو لە وێـنە ڕەنگاوڕەنگەکـانەوە و لەو حـاڵەتەدا کە تەرمەکـانی تێـدایە، بەڵگەی زۆر چاکە بۆ دیاریکردنی جۆری ئەو گازەی بە کـار هـاتووە". ئەگەر ئەو (سیانۆسیسـەی) لە قوربانییەکـانی هەڵەبـجەدا دەرکەوت، بەڵـگە بووبێـت بـۆ دەمارەگـاز نەک سـیانید، ئەوە ئەنجامـدەری ئاشـکرای گازبـارانەکە دەکرێـت عێراق بێت، کە بەردەوام توخمە دەماری بە کار دەهێنا، نەک ئێـران، کە بەوە تۆمەتبـار نەدەکرا. لە کۆتاییـدا ڕەنگگـۆڕانی قوربانییـان لە مردنـدا مەسـەلەیەکی تەواو هەڵەیە. تەنـانەت ئەگەر بەکارهێنـانی گـازی سـیانیدیش لە هەڵەبـجە بسـەلمێت، ئەوە مانـای تێـوەگلانی ئێـران ناگەیەنێت. بەوپێـیە بێـت خـۆ عێـراقیش تۆمەتبـاری بەکارهێنـانی گـازی سـیانیدە لە شەڕەکانی پێشتردا و ئەم ئیدیعایەش هەر بە نەسەلمێنراوی مـاوەتەوە. هەڵـبەت بەو لـۆجیکە بێـت دەکرێـت عێـراقیش بە تێـوەگلاو دابنرێـت بـۆ هەر حـاڵەتێکی مـردن بە سـیانید لە هەڵەبجەدا. عەباس فروتان ژمـارەیەک لەو حاڵەتـانەی تۆمـار کـردووە کە ئەو بە هێرشـی گـازی سـیانیدی عێراقی دانـاوە، یەکەمیـان لە هێرشـی بەدری ئێرانـدا بـوو لە سـاڵی ١٩٨٥دا

کاتێک سەرنجی کاریگەریی گازێکی دا کە بە خێرایی دەبووە هۆی کوشتن و لەوانەی پێشتر نەدەچوو کە بینیبوونی. بۆ ساڵی ئایندە، کاتێک ئێران فاوی گرت، عەباس ڕاپۆرتێکی بەرز کردەوە سەبارەت بە چاکبوونەوەی نەخۆشێکی بێهۆش، کاتێ کە بە ئەمیل نیتریت چارەسەر کراوە. ئەم دەرمانە سیرەمێکە بە تایبەتی بە کار دێت بۆ تیمارکردنی حاڵەتی ژەهراویبوون بە سیانید. کاتێک فروتان چەندین حاڵەتی لەو چەشنەی بینی لەمیانەی هێرشەکانی زۆنگاوەکانی باشووردا، لە ئاخروئۆخریی ساڵی ١٩٨٦ و سەرەتای ساڵی ١٩٨٧دا، "بانگەشەی سەلماندنی ژەهراویبوون بە سیانیدی ڕاگەیاند لە ناوچەیەکی جەنگدا، کە حاڵەتێکی زۆر قورسە بەوپێیەی ئەم تۆخمە زۆر بە خێرایی دەبێتە هەڵم و کەرەستەکانی دەسنیشانکردن ناتوانن بیدۆزنەوە. بەڵام لە دیدێکی کلینیکییەوە لە ماوەی جەنگدا، ئێمە گەلێک نەخۆشی نموونەی سیانیدمان بینیوە، بەڵام لە کاتی سنووردارادا"[٢٠]. ئەم ئەنجامە لای ئێرانییەکان جێی ڕەزامەندی بوو و دەستیان کرد بە دابینکردنی دەرمانی ئەمیل نیتریت بۆ یەکە پزیشکییەکانی هێزەکانیان. بۆ نموونە، ئەو جەنگاوەرانەی سەر بە گرووپی نەیاری ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامیی عێراق بوون (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٢دا) باسیان لەوە دەکرد کە لە شەڕی شاخی شەمێرانی ڕاسەری بەنداوی دەربەندیخاندا، سێ ڕۆژ دوای ڕووداوەکانی هەڵەبجە، لە درەنگانێکی ئێوارەدا هێلیکۆپتەر هێرشێکی کیمیایی کردووەتە سەریان و ئەمانیش خێرا دەستیان کردووەتە ئیجرائاتی خۆپاراستن وەک

لەسەرکردنی ماسکی گاز و بەکارهێنانی دەرزیی ئەترۆپین و ئەمیل نیتریت.

بە هەرحاڵ، پسپۆڕانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئیدیعای سیانیدیان داوەتە دواوە. دکتۆرێکی ئێرانیی ناونەبراویش کە ئیدیعاکەی کردووە (وەک پسپۆڕان لە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٨٧یاندا دەڵێن)، "ڕای خۆی لەسەر بنەمای مایۆسیس (بچووکبوونەوەی بیلبیلەی چاو) و چارەسەری سەرکەوتوو بە هەڵمژینی ئەمیل نیتریت و دەرزیی سایۆسولفات بونیاد ناوە. بە چاودێری و سەرنجی ئێمە ناتوانین بیسەلمێنین کەوا ئەم گازە بە کار هاتووە و لە ڕاستیدا بەکارهێنانی دەکرێت لە ڕێی پزیشکییەوە بسەلمێنرێت و تەنها لە کات و ساتی هێرشەکە خۆیدا"[٢١].

بەڵگەی سیانید نەیتوانی بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئێران تێوەبگلێنێت لەبەر هۆکاری دووەم، کە ئەوەیە سیانید یەکێکە لە پێکهاتە بنچینەییەکانی تابوون و ئەمیش ناتوانرێت بێ سیانید بەرهەم بهێنرێت و بەوپێیە عێراق دەبێت سیانیدی هەبێت و بەمەش پاساوەکەی پێنتاگۆن ناتوانێت بەرگری بکات. گۆردن بورکی پسپۆڕی چەکی کیمیایی (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەڵێت "ئەقڵ نایگرێت و مەحاڵە مشتومڕ لەسەر ئەوە بکرێت کە عێراق سیانیدی نەبووە و ئەوان لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکانەوە کارگەیەکیان دروست کردبوو دەیتوانی ئەو ماددەیە بەرهەم بێنێت. بێجگە لەوەش ئەم سیانیدە ماددەیەکی کیمیایی زۆر باوە و سیانیدی سۆدیۆم کەرەستەیەکی کیمیایی ستانداردە بۆ پاککردنەوەی حەوزی مەلەکردن".

لەبەر پەیوەندیی بە تابوونەوە، ئەگەر هایدرۆسیانید لە ژینگەیەکی تایبەتدا هەبێت، ئەوە دەبێت بە هۆی کاریگەریی پاشماوەی تابوونی خراپ بەرهەمهێنراوەوە بێت یان توخمێکی شیکراوە بێت، کاتێک تابوون لەبەریەک هەڵدەوەشێت و شیتەڵ دەبێتەوە. پسپۆڕەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٨٦یاندا تێبینیی ئەمەیان کردووە[٢٢]. لە بەرانبەر بەردەوامبوونی سکاڵاکان لە ساڵی ١٩٨٨دا، بڕیاریان دا بە شێوەیەکی وردتر و تۆکمەتر لە مەسەلەکە بکۆڵنەوە: "هەر کاتێک سکاڵای بەکارهێنانی گازی هایدرۆسیانیک بکرێت، ئەوە توخمەکانی ئۆرگانۆ فۆسفۆرەسی (چەشنی تابوون) هەمیشە لەو کاتەدا بە کار هاتووە و ئەگەری ئەوە هەیە تابوون، کەوا گەردیلەیەکی هەیە CNی تێدایە، لە کاتی تەقینەوەی گوللە تۆپ یان بۆمبەکەدا شی دەبێتەوە و کاریگەریی تایبەتی هایدرۆسیانیک بەرپا دەکات"[٢٣]. ڕاپۆرتێکی (سی ئای ئەی) لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە جەنگی ئێران — عێراقدا بە هەمان شێوە تێبینیی ئەوە دەکات کە: "پاکژکردنەوەی ئەو شوێنەی ئاڵوودەی تابوون بووە، دەبێتە هۆی دەرهاوێشتنی پێکهاتە مەترسیدارەکانی سیانید"[٢٤]. لە حاڵەتی دەرهاوێشتنی لەو چەشنەی سیانیددا، ئەوە دەبێتە هۆی خوڵقاندنی ئەو جۆرە نیشانانەی لە هەڵەبجەدا تێبینی کراوە و ئەمەش مەسەلەیەکی جێی مشتومڕە. شارەزایانی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ئاشکرا وای دەبینن کە ئەوە ئەگەرێکی بەجێیە، بەڵام شارەزایانی وەک دکتۆر سیدێل وای بۆ ناچێت، چونکە تەنها ڕێژەیەکی کەمی سیانید لە

تابووندا هەیە و دەڵێت کەوا هیچ نیشانەیەکی پەیوەست بە سیانیدەوە دروست نابێت، ئەگەر تابوون بە کار هێنرا.

دواجار ئەو ئیدیعایەش کە دەزگای هەواڵگریی بەرگری وێنەی مردووەکانی هەڵەبجەی پیشانی پسپۆڕانی چەکی کیمیایی دابێت لە ئەبەردین، دیسانەوە لە لایەن دکتۆر سیدێڵەوە بەرپەرچ درایەوە، کە سەرۆکی ئۆفیسی چاودێریی بەرکەوتوانی کیمیایی بوو لەو دەزگایە ساڵی ١٩٨٨دا و جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە "وەک بزانم لە من بەولاوە هیچ کەسێک لە ئەبەردیندا هەڵسەنگاندن و خەمڵێکی جیای نەکردووە بۆ شینبوونەوەی لێو. لەبەر ئەوە دەزانم ئەبەردین ئەو کارەی نەکردووە".

باشە تۆبڵێی سیانید لە هەڵەبجەدا بە کار هاتبێت؟ پێدەچێت وەڵامەکە نەخێر بێت. تەنانەت ئەگەر ئێران گازی سیانیدیشی شک بردبێت، بە زۆری ڕێی تێناچێت کە توانیبێتی گازەکە بکاتە چەک و پەرەی بەو توانایەی دابێت، کەوا بە شێوەیەکی کاریگەر بیکات بەسەر مەیدانی شەڕدا. سێس کارۆس، کە پسپۆڕێکی چەکی کیمیاییە لە زانکۆی بەرگریی نەتەوەیی لە واشنتۆن دی سی، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەڵێت سیانیدی هایدرۆجین: "هێجگار قورسە بۆ بەکارهاتن. پێش هەموو شتێک، ئەم ماددەیە لە هەوا سووکترە و بەوپێیە زۆر زەحمەتە چڕییەک دروست بکات کە ژەهراوی بێت. دووەمیش، توخمێکە کەوا لەش نایهێڵێت لە خۆیدا و لێی ڕزگار دەبێت و تەنها لە چڕییەکی تەواودا دەبێتە هۆی کوشتن". لە ماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا، سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکان ویستی ئەو کێشە تەکنیکییانە چارەسەر بکات و بە دوای ڕێگەیەکدا دەگەڕا بۆ

بڵاوکردنەوەی گازەکە، نەک بە گوللەتۆپ، بەڵکو بە بۆمب و لە ڕێگەی خستنەخوارەوەیەوە بە فڕۆکە، بۆ دابینکردنی بڵاوبوونەوەیەکی بەرین و مەودا فراوان، بەڵام ئەم تەقەلایە سەری نەگرت و لە هیچ حاڵەتێکدا چەکی کیمیایی لە ماوەی جەنگدا بە کار نەهات. کارۆس دەڵێت "ڕاوبۆچوون وابوو کە ئێرانییەکان ئەو کێشە تەکنیکییانەیان چارەسەر کردبێت، کە سوپای ئەمەریکا نەیتوانی بیکات و لە قۆناغە بەراییەکانی بەرنامەیەکی چەکی کیمیاییدا، من زۆر بە جێی بڕوا و متمانەی نازانم". سەبارەت بە ئەگەری بەکارهێنانی گازی سیانید لە لایەن عێراقەوە، کارۆس جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەوا کاتێک یونسکۆم UNSCOM لە سالانی ١٩٩٠کاندا کۆگا و عەمباری قەبە و بەرفراوانی چەکی کیمیایی عێراقی دامالی، هیچ چەکێکی بناغە سیانیدی نەدۆزییەوە و بە واتا عێراق ئەو چەکەی بە کار نەهێناوە. بەمەدا دەبێت باسوخواسێکی ئەڵتەرناتیڤ هەبێت بۆ ئەو نیشانانەی ئێرانییەکان و دکتۆرە بیانییەکان لە هەڵەبجەدا تێبینییان کردبوو.

گونجاوترین ڕوونکردنەوە ئەوەیە کە دکتۆرەکان لە شوێنی ڕووداودا هەڵەیان لە دیاریکردنی نیشانەکاندا کردووە، کە لە ئەنجامی سارینەوە بوون و دەمارەگازێکی تازەبەکارهاتوو بووە و دکتۆرەکان هێشتا پێی ئاشنا نەبووبوون. سارینیش وەک گازی سیانید زۆر بە خێرایی دەبێتە هەڵم و دەستبەجێ دەبێتە هۆی مردن (بە ڕەچاوکردنی بڕی کاریگەر) و زووش دەڕەوێتەوە. عێراق گازی سارینی هەبوو و لە ماوەی جەنگدا بە کاری هێنا، لەوانە دژ بە کوردیش (یونسکۆم بڕی هەڵگیراوی عێراقی

دەستنیشان کرد و لە ناوی برد). سارین لەو نموونە گلاَنەدا هەبوو کە سالَی ١٩٩٢ چالَە بۆمبێک لە باکووری عێراق وەرگیرا و پشکنینی بۆ کرا. چالَەکە لە ئەنجامی ڕووداوێکی بۆمبارانەوە بووە و بەپێی قسەی گوندنشینانی ناوچەکە لە ڕۆژی ٢٥ی ئابی ١٩٨٨دا بووە، کە یەکەم ڕۆژی ئەنفالی کۆتایی بوو[٢٥] (نموونەی ئەم گلە لە چالَە بۆمبێکی کیمیایی وەرگیراوە لە گوندی برجینی ناوچەی بادینان و لە بەریتانیا شیکاریی بۆ کراوە، وەرگێڕ) هیچ کەس و تەنانەت پێنتاگۆنیش دوور و نزیک وای بۆ ناچێت کە ئێران لە سالَی ١٩٨٨دا توانای بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی سارینی بووبێت لە مەیدانی شەڕدا.

لە سالاَنی هێرشەکەی دوای هەڵەبجەدا، دکتۆر فروتان بە خەملاَندن و هەلَسەنگاندنی پێشوویدا چووەوە و دەیگوت کەوا ئەو نیشانانەی چاودێریی کردوون، دەشێت بە هۆی توخمەدەمارێکی کاریگەر و خێراوە پەیدا بووبێت[٢٦]. لە سالَی ٢٠٠٢دا فروتان بە یەکجاری سیانیدی خستە لاوە و لە چاوپێکەوتنێکدا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە قوربانییانی هەلَەبجە پێدەچێت "حالَەتی پەلاماردانی کوتوپڕی سارین بن" ـ واتە بووبنە قوربانیی گازێک کە نیشانەی سەخت و لەناکاوی دروست کردبێت. هەر دوو دکتۆرەکەی پزیشکانی بێسنووریش (MSF) بە درێژایی وەخت دوودلَییان زیادی دەکرد. جاک دی میلیانۆ (لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفۆنیدا، سالَی ٢٠٠٠) هەندێک لە سەرنج و تێبینیەکانی لەسەر هەلَەبجە دەگێڕێتەوە:

"... پاشان قوربانییانی سیانیدمان بینی، لێویان شین هەلَگەڕابوو. بۆ نموونە، پاسێکی قوتابخانە بە منداڵەوە

لەولاوە بـوو..." ئەوجـا لەناکـاو وەسـتا و لەو قسـانەی کە تۆزێک لەوەوپێش کردی پاشـگەز بـووەوە: "سـیانید دەبێتە هۆی لێوسووربوونەوە. لێوی شین ئیشارەت بوو بۆ ئەوەی کەوا خەڵکەکە خنکابوون". بە هەرحاڵ، وەک دەیگوت گەلێک حاڵەتی "مەرگی کوتوپڕ هەبوو، بۆ نموونە، پیاوێک لە کاتی ڕیشتاشیندا ڕەق بووبوو. مەرگی کوتوپڕ مانای بەکارهێنانی سـیانید دەگەیەنێـت". ڕێجینالـد مۆریـڵ (لە چـاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠١دا) ئەولاتـر دەڕوات و دەڵێت: "سـیانید هەناسـە دەبڕێـت و لە ٦٠ ـــ ٩٠ چـرکەدا دەیکوژێـت. لەو حـاڵەتەدا قوربـانیی تەنـانەت کـاتی ئەوەی نابێـت کە شـین هەڵگەڕێـت (سـیانۆتیک cyanotic). ئەم خەڵـکە ڕەنگیـان شـین نەبـوو. ئەوە شتێکی هێجگار نائاسـایی و سـەرنجڕاکێش بـوو، ئەوان ژێـــر نینۆکیـــان ســـوور بووبـــوو، هەروەهـــا کـــوڵم و ڕوومەتیشیان سوور هەڵگەڕابوو ــ کە بە تەواوی لە ڕەنگی مردن جیاواز بوو". بەڵام وا ئێسـتا ڕەنگی سووریان لەگەڵ سـیانید یەک دەگرێتەوە، لەگەڵ دژوارییەکـی ڕاسـتەوخۆ بـۆ سـەرنجە تۆمارکراوەکـانی ئەو کـاتەی ("دەموچـاو (کـوڵمی) شـین، نینـۆکی پەنجەکـانی دەسـت و نینـۆکی پەنـجە گەورەی قـاچیش شـین")، کەواتە وازی لە تیـۆریی سـیانید هێنـاوە و بـاس لەوە دەکـات: "کە ڕەنـگە لە ئەنجـامی دەمارەگازیشـەوە بێـت" و دەسنیشـانکردنی سـیانیدی دەگەڕانـدەوە بـۆ ئـۆبن هایندریکس.

دکتۆر هایندریکس ئێسـتا خانەنشـینە و لە غێنت دەژی و هـــۆدەی دانیشـــتنەکەی وەک مۆزەخـــانەیەکی بچـــووک ڕازاوەتەوە. ســـــــندووقە پزیشـــــــکییە گەورەکەی کە بە چواردەوری دنیادا بەکێشی دەکرد بۆ بەدواداچوونی چەکی

کیمیایی و بایۆلۆجی، بووە بە مایەی شکۆ و شانازیی شوێنەکە. پیاوێکی ڕووخۆش و بەڕێز، وا دیار بوو تووشی کەمێک بیرچوونەوە بووبوو، وەک خۆی باسی دەکرد، لە ڕێکخستن و باسکردنی کرۆنۆلۆجیای ڕووداوەکاندا، هەندێک لە گەشتەکانی بۆ ئێران، تێکەڵکردنی ڕووداوە جۆراوجۆرەکان (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٣دا). بەڵام لە سکالاَ وَ ئیدیعا سەرەکییەکاندا بیر و هۆشی تەواو لە جێی خۆیدا بوو. عێراق کۆکتێلێکی گازی جۆراوجۆری بە کار دەهێنا، یەک لەوی تر خراپتر لە کاریگەریدا: سیانۆسیس ــ واتە شینبوونەوە ــ بەڵگەی سیانید بوو، بەڵام سووربوونەوە بەکارهێنانی مایکۆتۆکسینی دەگەیاند. عێراق یەکەم جار مایکۆتۆکسینی بە کار دەهێنا، پێش ئەوەی بیگۆڕێتە سەر گازی سیانید بۆ خێراکردنی مەرگی بەپەلە. خوێنپالاوتن ــ Hemo Perfusion ، کە کارێکی پڕ مشتومڕە و "شۆردنی خوێن" دەگرێتەوە (کە زیاتر لە کاری گورچیلە دەچێت) و چارەسەری کاریگەریی ئەو حاڵەتە مەترسیدارانە بوو کە بە هۆی مایکۆتۆکسینەوە دروست دەبوو.

ئەمڕۆ هایندریکس لە ناو ئەم هەموو هەڵاوبگرەدا بە تەنها ڕاوەستاوە. زانا سەربەخۆکان کە دەیانویست ئەنجامەکانی تاقیگەکەی دووبارە بکەنەوە بە دەستی بەتاڵ هاتنە دەرەوە. دکتۆر جان ولیەم، کە دکتۆرێکی سەربازی و دەرمانسازە، ئەویش لە غێنت دەژیا و بەشێکی گەورەی لێکۆڵینەوە زانستی و ئەزموونییەکەی بۆ ڕەتکردنەوەی بۆچوونەکانی هایندریکس تەرخان کردبوو، پاش بەرەنگاربوونەوەی بە تیرمی "دەسنیشانکردنی خەیاڵی و

چارەسەری خەیاڵی" (واتە خوێنپالاوتن)ی بۆ بە کار هێنابوو (چاوپێکەوتنی ساڵی ٢٠٠٣). ئەم پیاوە پاش توێژینەوەیەکی چڕوپڕ لەسەر بریندارە ئێرانییەکانی چەکی کیمیایی لە ئەورووپا لە ساڵی ١٩٨٥دا، گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە ئەمانە هەموو قوربانیی گازی خەردەلن و هیچ بەڵگەیەکی توخمەدەمار و مایکۆتۆکسین لەئارادا نییە و ئەو خوێنپالاوتنە کاریکی پزیشکی بووە، "بێ کاریگەریی چارەسەر"، بەڵام چارەسەریکە "کەوا گەلێک کاریگەریی لاوەکیی دروست کردووە و دەبێت خۆمانی لێ بپارێزین و بە تایبەتی لەم نەخۆشە بەرگری کەمانەدا"[٢٧]. ئەو دەڵێت دکتۆر هایندریکس نموونەیەکە لەوەی کە چۆن زانستی خراپ دەتوانێت بەرەو دەرەنجامی هەڵەت ببات، کە دواتر بەردەوام دەبێت لە وەگەڕخستنی بڕیارەکانی داڕشتنی ڕێباز و سیاسەتدا.

**له ناو پێنتاگۆندا**

بەڵــگەی بەردەســـت ئەوە دەگەیەنێـــت کەوا ئـــۆبن هایندریکس و دکتۆرە ئێرانییەکانی لەژێر کاریگەریی ئەودا بـوون، سـەرچاوەی بنەڕەتیـی ئیـدیعای سـیانیدی هەڵەبـجە بــوون، تەنهــا لەبەر ئەوەی ئەو ئیــدیعای ئەفلاتۆکســین و سیانیدی دەکرد لە ناوەڕاستی سـاڵانی ١٩٨٠کان بە دواوە. ئەو وەک تـاقە دکتۆرێکی ڕۆژئـاوایی کە بەردەوام سـەردانی ئێرانــی دەکـرد لە مـاوەی جەنگـدا و ئێرانییەکـان پێشـوازیی گەرمیـان لێ دەکرد و باوەشیان بۆ کردبووەوە، لە کاتێکدا هەسـتیان دەکــرد کەوا کــۆمەڵی نێـودەوڵەتی دەرگــای بە ڕوویانــدا داخســتووە. بــۆ بەدبەختــی، ئەوان ڕاوبۆچــوونی پسپۆڕییان زۆر بە بایەخەوە هەڵسەنگاندبوو و کەسیان لەو پێ باشتر نەبوو و وەک هاوکارێک دەیگوت "لەسـەر دەست هەڵیاندەگرت".

لە مـــارتی ١٩٨٨دا، دەزگـــای هەواڵگریـــی بەرگـــری بە ئیـدیعای سـیانیدەوە گرتبوویـان (پـاش ئەوەی تـا ئەو کـاتە پشتگوێیان خستبوو، هەر چەندە هایندریکس هەوڵی دەدا بۆ بڵاوکردنەوەی) وەک بەڵگەی ئەوەی کە ئێرانیش تا ڕادەیەک دەبێــت ســەرکۆنە بکرێــت لەو ســتەمکارییەی دەرهەق بە هەڵەبـجە کرا. لە خەمڵ و هەڵسـەنگاندنێکی ٢٣ی مارتـدا، کە چـارڵس ڕێـدمانی وتەبێـژی وەزارەتـی دەرەوە پێـدەچێت بە

کاری هێنابێت وەک بنەمایەک بۆ ئیدیعاکردنی ئەوەی کە "ئێرانیش تۆپی کیمیایی بە کار هێناوە لەم شەڕەدا" (بڕوانە پێشەکی) و دەزگای هەواڵگریی بەرگری جەخت لەوە دەکاتەوە کە "زۆربەی زیانە گیانییەکانی هەڵەبجە، وەک باس دەکرێت، بە هۆی کلۆریدی سیانۆجینەوە بووە. ئەم تۆخمە کیمیاییە هەرگیز لە عێراقدا بە کار نەهاتووە، بەڵکو ئێران پەرۆشیی بۆ بەکارهێنانی نواندووە"[٢٨].

ئەمڕۆ ئەوانەی ئیدیعای سیانیدیان بە کار هێناوە بۆ تۆمەتبارکردنی ئێران، خۆیان لە پشتی شارەزا ناونەبراوەکانی چەکی کیمیایی سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە شاردووەتەوە. بەڵام بێ دۆکیومێنتی تەواو سەلمێنراو یان ڕوونکردنەوەی دژەبەرژەوەندی لە لایەن یەکێک لە پسپۆڕانەوە، ناتوانرێت زانیاریی پێچەوانە بسەلمێنرێت، چونکە ڕەنگە پسپۆڕان خۆیشیان بووبێتنە قوربانیی زانستی خراپ. بەڵام ئەمە پرسیارێک بە دوای خۆیدا ڕادەکێشێت کە ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، بۆچی زانستی خراپ ڕێگەی پێ دراوە لێکۆڵینەوە و شیکاریی هێمنانە و بێلایەنانەی ڕووداوەکان لەکەدار بکات لە سەردەمی جەنگی ئێران ـــ عێراقدا؟ ئەی بۆچی کاربەدەستانی دەزگای هەواڵگریی بەرگری (DIA) هێند پەرۆش بوون باوەش بکەنەوە بۆ ڕستەی "ئەوە ـ سیانید ـ بوو ـ و ـ بەوپێیە ـ دەبا ـ هیی ـ ئێرانییەکان ـ بووبێت"؟ ئەی چۆن ئەم کارە خراپ و ناڕەوایەیان کرد و وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون؟

هەڵبەت وەڵام ئەوەیە کە شیکردنەوەی زانیاری و لێکۆڵینەوەکە، هەرگیز پاک و بێگەرد نەبووە، چونکە دەستە

و تـاقمە بەهێزەکـانی نـاو ئیـدارەی ڕیگـان و بە تـایبەتی دەزگـای هەواڵگریـی بەرگـری، بە توندی لە پشتی کۆششـی جەنگیی عێراقەوە بوون، تەنانەت لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەگەر گەلێـک کەس وایـان پـێ بـاش بـوایە خـۆ بەدوور بگـرن لە ڕژێمی عێراق. زانیاری لەسەر هەر ڕووداوێک کە لە توانایدا بوویێت هەر سەرکەوتنێکی عێراق تێک بشکێنێت یان دوای بخات، یان پاڵپشتیی ئێران بکات، دەبوو سـەرکوت بکرایە. تراجیـدیای هەڵەبـجە شکسـتێک بـوو بـۆ لـۆبیی دژەئێـران، چـــونکە پەردەی لەســـەر لایەنـــی ژێربەژێـــر و پیســـیی سیاسـەتێک هەڵماڵی کە بە پێچەوانەوە دەبـوو بەرگریـی لـێ بکردایە ـ چونکە لەژێر کاریگەریی بیروبۆچوونی پێویستیی ستراتیجیدا بـوو، هەروەهـا ئەوەشـی پیشـان دا کە "بەڵـێن و پەیمان" بە هیچ شێوەیەک ڕەفتاری دیکتاتۆری نەرم نەکرد. کاتێک هێرشـی هەڵەبـجە ڕووی دا، کـاردانەوەی بەپەلە ئەوە بـوو کە بەرپرسیارێتییەکەی دابەش بکرێت و بە شـێوەیەکی سـەرەکی ڕەخـنە و ڕەخنەکـاریی نـاو ئیـدارەی ئەمریکـی بخنکێنرێـت، بە هەمـان شـێوە (ئەوانەی بێزکردنەوەیـان لە ڕژێـمەکەی سـەدام حسـێن زیـاتر بـوو لە بێمتمانەییـان بە شۆڕشـــی ئیســـلامی) و بەدوای کرانەوەیەکـدا دەگەڕان بە ڕووی ئێراندا، بەڵام دیسانیش داکۆکیکەران لە مافی مرۆڤ و ئەوانەی مەسـەلەی تەشـەنەکردنی چەکـی کۆکـوژ جێـی نیگەرانییـان بـوو. شـەڕێکی بیرۆکراتـی بەردەوام بـوو، لەبەر ئەوە ئەوانەی بەلای عێراقدا دایاندەشکاند، چەقۆکانیـان تیـژ کردبوو و ئەوەیان کرد کە دەبوو بکرێت.

ئەم شـەڕە، کە لە گەرمـاوگەرمی پـاش جەنگـی ئێـران ـــ عێراقـدا کـپ بووبـووەوە، دوای مـاوەیەکی کەم و لە کـاتی

داگیرکردنی کوەیتدا تەقییەوە (˚کێ کوەیتی لە دەست دا؟ کێ دیکتاتۆری عێراقی بەهێز کرد بە دڵڕاگرتن و پشی پشی؟˚) هەروەها لە خۆئامادەکردندا بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیی ساڵی ١٩٩٢ (˚باشە ڕۆڵی جۆرج بوش چی بوو لە هەواخوایی و داشکاندن بەلای عێراقدا، لە لایەن ئیدارەی ڕیگانەوە؟˚) بەڵام لەو دەمەدا بە سەرکراوی مابووەوە. هەواخواکان پێدەچێت دید و بۆچوونی خۆیان ڕێک خستبێت لە ماوەی دەیەیەکی بەشەیتانکردنی سەدام حسێندا، بەڵام لە بواری ئیدیعاکەی هەڵەبجەدا هەر بە پێداگریی خۆیان مانەوە و لێی پەشیمان نەبوونەوە. ئەوانە ئێستا لە کۆلێجی جەنگیی سوپا و دەزگای هەواڵگریی بەرگریی ئەمەریکا خانەنشین بوون و ــ ئەو پێگانەی کە ئەوان ئیدیعای بێبەڵگە و بێبنەمایان لێوە دەکرد و لە لایەن میدیاوە گەورە دەکرایەوە، هێزێکی هێجگار گەورەیان هەبوو لەو کاتەدا.

دوو بەرچاوترین پشتیوانی تێزی ئێران/هەڵەبجە، ستیڤن پێلێتایەر و کۆلۆنێل واڵتەر ˚پات˚ لانگ. پێلێتایەر ڕۆژنامەوانێکە بە ڕاهێنان (بە بڕوانامەی دکتۆرا PHD لە زانستە سیاسییەکاندا لە زانکۆی کالیفۆرنیا ــ بێرکلەی) و لێکۆڵەرەوەیەکی (سی ئای ئەی)ە بە پیشە و خەریکی کاروباری عێراق بوو بۆ دەزگاکە، تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٧، پێش ئەوەی بگوێزرێتەوە بۆ کۆلێجی جەنگیی سوپا و بە ماوەیەکی زۆر کەم بەر لە ڕووداوی هەڵەبجە. پێلێتایەر پیاوێکی نامۆ و دوورەپەرێز و ˚ناڕازییەکی بەردەوام˚ بوو، بەپێی قسەی پات لانگ، کە ڕێزێکی گەورەی بۆ تواناکانی دەردەبڕی (لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفۆنیدا، ساڵی ٢٠٠٠) کەوا ˚CIA وەک وەزارەتی دەرەوە، بە لای کورددا دایدەشکاند˚

و ئەمە ڕاگەیاندنێکە دەبێت جێی سەرسووڕمان بێت بۆ کوردەکان و بۆ (CIA)یش. بەڵام "پێڵیتایەر وا نەبوو"، بەڵکو وا خۆی پیشان دەدا کە سەرسامە بە لانگ و (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) دەڵێت: DIA" باشترین شیکاری و لێکۆڵینەوەی لە بارەی جەنگەوە هەبوو، زۆر باشتر لەوەی CIA و پات لانگیش باشترین لێکۆڵەر بوو لەو بوارەدا".

پێڵیتایەر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە لەو بانگەشەیەدا "زانیاریی هاوبەش" هەبووە، کەوا ئێران چەکی کیمیایی لە هەڵەبجەدا بە کار هێناوە، بەڵام بەڵگەکان لە پاشکۆیەکی کلاسیفایدا بوون، بۆ کتێبەکەی کە لەگەڵ کەسێکی تردا ساڵی ١٩٩٠ داینابوو، کەوا بە ڕۆڵی خۆی پشتی بە لێکۆڵینەوە نهێنییەکەی کۆلێجی جەنگ بەستبوو. (کلاسیفاید Classified: کار یان لێکۆڵینەوەیەکە نابێت خەڵک بیبینێت لەبەر پاراستنی سەلامەتیی نیشتمانی یان نەتەوەیی، وەرگێڕ). ناوەڕۆکی ئەو لێکۆڵینەوەیە دزەی کردبوو بۆ پاتریک تایلەر لە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست "لە ڕێگەی هەندێک کەسەوە لە پێنتاگۆندا"، وەک پێڵیتایەر مەزەندەی دەکرد و ئەوەشی بۆ زیاد کرد کە "پات لانگ هەموو دەم لەگەڵ پات تایلەر قسەی دەکرد".

مەبەستی لێکۆڵینەوەکەی کۆلێجی جەنگ، دیاریکردن و هەڵسەنگاندنی ئەوە بوو کەوا عێراقییەکان چۆن شەڕیان کردووە و لەژێر چ باروزرووفێکدا گازیان بە کار هێناوە، بەپێی بنەمای کار و ڕەفتاریان لە مەیدانی شەڕدا. ئەمە بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە گرنگ بوو، چونکە سوپای ئەمەریکا خۆی ئامادە دەکرد بۆ دەرپەڕاندنی هێزەکانی عێراق لە

کوەیت. پێلیتایەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە عێراقییەکان گازیان بە کار هێناوە، بەلام "تەنها کاتێک کە پێویستیان پێ بووە و لە حالەتی ئەوپەڕی زەروورەتدا، نەک بە شێوەیەکی دەستبلاوانە، ڕووکەشانە، یان هەر وا لەخۆڕایی". پێلیتایەر و دۆگ جۆنسنی هاوکاری لە دانانی کتێبەکەدا پێکەوە سەردانی دەزگای هەوالگریی بەرگرییان کردووە و ئەم بابەتانەیان لەگەل هاوبەشەکانیان باس کردووە. ئەنجامگیرییەکانی دەزگای هەوالگریی بەرگری لە بارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن ئێرانەوە ڕاست بوون، وەک پێلیتایەر حوکمی لەسەر دەدا و دۆگ جۆنسنی شیکاری سەربازیی سەرەکیی تیمەکە "پشتگیریی تەواوی لێکۆلینەوەکە دەکات". بە هەرحال، پێلیتایەر پێی لەوە نا کە (سی ئای ئەی) لەو ڕۆژگارەدا لە ڕەشنووس یان درافتی کۆتایی مەسەلەکە کشایەوە و نەیسەلماند. چاوخشاندنەوەیەکی خێرا بە ڕاپۆرتە ڕۆژانەکانی (ناشنال ئینتیلیجانس)ی CIA لەو سەردەمەدا زانیاریی خەتابارکردنی عێراق لە لایەن ئێرانەوە دەخاتە ڕوو لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، کە نووسەران پرسیاریان لەسەر نەکردووە[٢٩]. ڕاپۆرتەکان تەنانەت باس لە چاوەڕوانیی بەکارهێنانی گازی عێراق دەکەن وەک ئەوەی کە ئاساییترین شت بێت لە دنیادا. بۆ نموونە، ڕاپۆرتێکی ٢٢ی مارت، بە گەڕانەوە بۆ ڕووداوەکانی هەلەبجە، باس لەوە دەکات کە:

"ڕەنگە بەغداد گەیشتبێتە ئەو بڕیارەی کەوا ئەو ناوچەیەی لە وەلفەجر/١٠دا لەدەستی داوە، ئەوەندە بایەخی نەبێت هێرشێکی پێچەوانەی گەورەی بۆ ئەنجام بدات، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە زیانی قورسی لێ بکەوێت و

خاكی زۆریشی چنگ نەكەوێتەوە. ئەگەر وا بوو، ڕەنگە عێراق تەنها هێزە زەمینییەكانی پابەند بكات بە كۆششێكەوە بۆ بەربەستكردنی دەسكەوتی ئێرانیی زیاتر و هێزی ئاسمانی و چەكی كیمیایی بە كار بێنێت بۆ بەرپاكردنی زیانی گەورە لە هێزەكانی ئێراندا"[٣٠].

سەرچاوەی بنچینەیی ئیدیعاكانی پێلێتایەر، پات لانگ بوو، كە جەنگاوەرێكی دێرینی ڤێتنام و سەرۆكی هەواڵگریی پێنتاگۆن بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری ئاسیا لە سالانی ١٩٨٥ ـ ١٩٩٢دا و كاربەدەستی "ناونەبراوی" پەسەند بوو، كەوا گەلێك لە ڕۆژنامەنووسان پشتیان بە سەرنجەكانی دەبەست. لانگ هەر بەردەوامە لەسەر ئیدیعاكەی هەڵەبجە (چاوپێكەوتنی ساڵی ٢٠٠١)، بەلام لە هەمان كاتدا نكووڵی لەوە ناكات كە عێراق بەردەوام لە شوێنانی تر چەكی كیمیایی بە كار هێناوە، لەوانە فاو لە نیسانی ١٩٨٨دا. ئەو پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت كە "نیاز لە چەكی كیمیایی لاوازكردنە نەك كوشتن، كەوابوو هێزێكی سامناك و تۆقێنەرە و لەبەر ئەوە هێزەكانی دوژمن دەبێت پۆشاكێك لە بەر بكەن كە بە ئاسانی نەتوانن بجوولێن". ئەو بەكارهێنانی گاز دژ بە خەڵكی مەدەنی سەركۆنە دەكات و بە پێشێلكردنی هەر دوو یاسای مرۆڤدۆستیی نێودەوڵەتی و سەربازیی كۆنی دەزانێت، بەلام پرسیاری ئەوە دەكات كە "لە مەیدانی شەڕدا بۆچی چەكی كیمیایی لە چەكی تر خراپترە؟" وەك دەشڵێ، لە حاڵەتی عێراقدا "ئێمە نەماندەزانی عێراقییەكان كەی چەكی كیمیایی بە كار دێنن. بێجگە لەوەش لە ڕاستیدا ئێمە نەماندەویست ئەوە بزانین و نەشماندەویست لەوەدا بەشدار بین".

لانــگ ئیــدیعای ئەوە دەکــات کە ئێــران لە هەڵەبــجەدا دەرمــانپرژێنی بەروبــوومی کشــتوکاڵیی بە کــار هێنــاوە بــۆ ڕشـتنی گـازی کیمیـایی و تـانکیی بە فـڕۆکەوە بەسـتووە بـۆ پرژانـدنی گــاز وەک پـرژە، بەڵام ددانــی بەوەدا نــا کە ئەمە "لێکدانەوە و مەزەنـدەی خۆمـان بـووە و ئـێمە نەمانـدیوە" و وەک ئەو دەیگوت، بەڵگەی قورس ئاشـکرا نەکراوە. لانگ لە چاوپێکەوتنەکەدا هیچ باسێکی لە تۆپی کیمیـایی نەکردووە و لە وەڵامــی ســەرنجێکدا کەوا ئێـران لەســەر هەڵەبـجە لـۆمە کراوە، گوتی "ئەوە بە هۆی سـووربوونی مـنەوە بـوو لەسـەر ئەم خـاڵە". لە چـاوپێکەوتنێکی پێشتریشـدا بە تەلەفـۆن لانـگ ئەوەی بـاس کـرد کە شـەڕێکی بیرۆکراتیـی قورسـی لەسـەر ئەمە کــردووە: "لەو کــاتەدا کەس نەیدەویســت گــوێ لەمە بگرێــت (واتە لە بەکارهێنــانی چەکــی کیمیــایی لە لایەن ئێـرانەوە). ئیسـرائیلییەکان ڕۆڵێکـی بەرچاویـان لەم بـوارەدا گێڕا... کاتێک کە ئەم ڕاپۆرتانەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن ئێــــران و پرۆگرامەکــــانی بــــڵاو بــــوونەوە، ئیســــرائیلییەکان لە ڕێــگەی هاوپەیمانەکانیــانەوە لە نــاو حکـومەتی ویـلایەتە یەکگرتووەکانـدا بێنرخیـان کـرد و دایـانە بەر لاقرتـێ". هەروەهـا سەرزەنشـتی لـۆبیی سـەر بە ئێرانـی کـرد کە لە نـاو بیرۆکراسـیی ویـلایەتە یەکگرتووەکانـدا کـڕ بووبــوون و دەنگیــان کــز بــوو. پێلێتــایەر هەمــان ڕای سـۆزئامێزی هەبـوو لەســەر لـۆبییە دژەکـان و پاشـان بەم پرسیارە زەقە کۆتـایی پێ هێنا: "بەڵام ئەی کێ بەرگریـی لە عێراقییەکان کرد؟ من کردم، پـات لانـگ کردی و کەسـی تـر نەیکرد".

هیچ بەڵگەیەک لەئارادا نییە کە دید و بۆچوونی لانگ لەسەر هەڵەبجە لە ناو بەڕێوەبەرێتیی ڕیگاندا دەستباڵا بووبێت. ڕاستییەکەی بەڵگەی باش هەیە، وەک خودی خۆی، بە داخەوە سەرنجی دابوو، کە بۆچوونەکەی خرابووە لاوە پاش ئەوەی جارێکی تر عێراق لە ئابی ١٩٨٨دا خەڵکی مەدەنیی کوردی گازباران کردبوو. بەڵام ئەو لێکدانەوەیە بۆ ڕووداوەکان کە خۆی و هاوکارەکانی خستبوویانە بەردەم کۆبوونەوەکانی دامودەزگا جیاوازەکان، لە ڕێگەی وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە لە ٢٣ی مارتدا و چاوپێکەوتنەکانیان لەگەڵ ڕۆژنامەنووسان لە نیسان و مایسی ١٩٨٨دا، تێکەڵوپێکەڵییەکی کورتخایەنی دروست کرد سەبارەت بە لێپرسراوێتیی وردی هێرشەکە. کاریگەرییەکە بەو شەرعیەتە بەهێز بوو کە ڕەزامەندیی دەزگای موخابەراتی بەرگریی دەگەیاند. بەمپێیە پاش ئیدانەیەکی سەرەتایی ئەمەریکا بۆ تاوانەکەی عێراق، ئەم مانۆڕانە فشاریان دابەش کرد بۆ کاری زیاتر. لەبری ئەوە واشنتۆن کەوتە تاوتوێکردنی ئەوەی کێ هێرشەکەی جێبەجێ کردووە و بە چالاکی کاری کرد بۆ بەرهەڵستیی تاوانبارکردنێکی بەهێز و ئاشکرای ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ هاوپەیمانە عێراقییەکانیان.

بەم ڕەنگە، بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان توانیی هەناسەیەکی ئاسوودە بدات وەختێک هاتە کۆتایی یارییەکە لە کەنداودا. مانگێک پاش هەڵەبجە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز ڕاپۆرتێکی بڵاو کردەوە و تێیدا هاتبوو کە "دیپلۆماتە ڕۆژئاواییەکان و وەزارەتی دەرەوە کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەر چەندە عێراق یەکەم لایەن بوو لە بەکارهێنانی چەکی کیمیاییدا، کە

له ساڵی ١٩٨٤دا دەستی پێ کرد، بەڵام ئێران ئێستا بە هەمان ئەو چەکە تۆڵە دەکاتەوە"[٣١].

ڕیڤیژنیزمی مێژوویی دەستباڵایی خۆیی نواند و بیری ڕۆژنامەنووسانی دەهێنایەوە کە هێرشە کیمیاییە ئیدیعاکراوەکانی ئێران، ئەو هێرشانەی کە پێشتر کرابوون و بە جۆرێک لە جۆرەکان لە دەست سەرنج و تێبینی دەرچووبوون[٣٢]. پڕۆپاگەندەی درۆ چووبووە ناو ئەدەبیاتی جەنگەوە و پاش ئەوە تەنانەت ئەوانەی بەڵگەی بێقەناعەتیان دەبینی کە ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێناوە، ناچار دەکران مل بدەن بەوەی پێدەچێت وا بێت. بۆ نموونە، گاری سیک، کە لێکۆڵەرێکی بەناوبانگە لەسەر ئێران و پسپۆڕێکی کاروباری ئێران بوو لە وەزارەتی دەرەوەی سەردەمی سەرۆک کارتەردا، لە هاوینی ١٩٨٨ و لە نیویۆرک تایمزدا قسەیەکی لێ وەرگیراوە کەوا ئێرانییەکان "چەندین جار" تۆپی کیمیاییان بە کار هێناوە[٣٣]. گاری سیک دواتر (لە پەیوەندییەکی ئیمەیڵدا، ساڵی ٢٠٠٠) ڕوونی دەکاتەوە کەوا:

"لە ساڵی ١٩٨٨ و لە دوا قۆناغەکانی جەنگدا، دەنگۆیەکی بەربڵاو هاتبووە ئاراوە کە ئێران چەکی کیمیایی بە کار هێناوە. من هەمیشە بەگومان بووم لەو ڕاپۆرتانە، بەڵام لەو دەمەدا زانیاریی تەواو پشتڕاست و جێمتمانە لە بەردەستی لێکۆڵەرەواندا نەبوو... دواتر و پشت بەو زانیارییانەی تر کە دەست دەکەوتن، دید و بۆچوونم زیاتر چەسپی کەوا پێدەچێت ئێران چەکی لەو چەشنەی بە کار نەهێنابێت".

بۆ بەدبەختیی زیاتر و لە دەوروبەری ئەو کاتەدا، ڕۆژنامەی کریستیان ساینس مۆنیتەر قسەی کاربەدەستانێکی ئەمەریکیی دیارینەکراویان گواستبووەوە،

وەک باسکردنی بەڵگەی ئەوەی کە ئێران گوللەتۆپی پڕ لە سیانیدی گرتووەتە هەڵەبجە و "ئەو سوودی پرۆپاگەندەیەی تێک شکاندووە کە ئێران هەوڵی داوە دەستی بخات بە ئاشکراکردنی ئەو هێرشانەی عێراق کە گازی تێدا بە کار هێناوە".[٣٤]

لە کاتێکدا کە پێویستییەکی تەواو هەبوو بە ڕێگرتن لە هەرەسهێنانی عێراق لە مەیدانی شەڕدا، بۆ پیتەر گالبرەیس (کە ئەندامێکی ئەنجوومەنی پیران (سەنات) بوو و چاودێریی ڕووداوەکانی دەکرد لە کوردستانی عێراقدا)، ئەم فێڵ و چاوبەستییەی ئیدارەی ڕیگان زۆر ناپەسەند بوو. گالبرەیس (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەیگوت بە لێڵکردنی ئاوەکان واشنتۆن کارێکی ناشیرینی ئەنجام دا و ئەگەر وا نەبوایە ڕەنگە بەری لە عێراق بگرتایە ئەو شالاوە مەرگچێنەی دژەیاخیبوونی بەرپا نەکردایە دژ بە کوردەکان، شالاوێک کە تێیدا سەدان گوند لەو دەمەدا خاپوور کران و خەڵکەکەشیان ڕاگوێزران و ڕاپێچی چارەنووسێکی نادیار کران ــ شالاوێک کە دواجار بە جینۆساید وەسف کرا. ئەوانە، وەک گالبرەیس تێبینیی دەکات "بوون بە قوربانیی لابەلا لەگەڵ ڕووداودا و یەک شت هەیە، ناتوانیت پێی بڵێیت چەواشەکردنی بە ئەنقەست. بەڵام بەو جۆرە ڕاستییەکان وەرچەرخێنی کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆتدا بگونجێن، وەک ئەوەی بەڕێوەبەرێتیی ڕیگان کردی، ئەوەیان بەدڕەوشتییە".

"مـن جـارێکی تـر عێـراق بە یەکێـک لەو
دەوڵەتە دوژمنـــانە دادەنـێم لە بەرانــبەر
کۆمەڵگەی جیهانیی بەرپرسیاردا."
وەزیـری دەرەوەی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان،
جۆرج شوولز
پشێوی و خۆشیی سەرکەوتن
١٩٩٣، ل٢٤٣

**"قەدەغەکردنی" جینۆساید**

لە مـــانگی ئـــابی ١٩٨٨دا جەنــگ تەواو بــوو، بەڵام نەک یـــاخیبوونی کـــورد، کە ئەویــش لەســـەر قـــاچێکی لەرزۆک وەســـتابوو. عێراقییەکـــان تەنهـــا یەک پاڵیـــان مـــابوو بـــۆ گـرتنەوەی دوا پـارچەی خـاکی کـوردی هاوسـنوور لەگەڵ تورکیـــادا، پـــێش ئەوەی هـــاواری ســـەرکەوتن بـــکەن و ئاوەدانکردنەوە دەست پێ بکەن. بە هەرحاڵ، کۆتـایی جەنـگ پەیوەندیی بەغدای لەگەڵ بەڕێوەبەرێتیی ڕیگاندا لە شـەو و ڕۆژێکدا گۆڕی و لەگەڵ خۆیشیدا یاسا و ڕێسـاکانی گەمەکە گۆڕان. سـەرکردایەتیی عێراق درکی بەمە نەکرد کاتێک لە ٢٥ی ئابدا، هێزی ئاسمانی و سوپای نارد بۆ کۆتاییپێهێنـانی یـاخیبوون لە ئۆپەراسـیۆنێکدا کە بە نهێنـی نـاوی ئەنفـالی کۆتـایی پـێ درابـوو (عمليـات خاتمـة الأنفـال). لەو ڕۆژەدا فڕۆکەکـانی عێـراق چەنــدین بــۆمبی کیمیاییـــان بەســـەر

زنجیرەگوندێکدا بەردایەوە لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی (پ د ک)دا، کە هاوسنووری تورکیایە و پێی دەگوترێت ناوچەی بادینان[١]. لەمیانەی چەند ڕۆژێکدا و کاتێک کە گوندنشینە تۆقیوەکان ڕژانە ناو خاکی تورکیاوە، جیهان لە دوا کردەوەی دڕندانەی عێراق بەئاگا هات و ئەم جارە ئەوانەی واشنتۆن زۆر نیگەران و پەشیمان بوون لە نزیکیی پێویستیان بە ڕژێمی عێراق، لەبەر ئەوە بڕیاریان دا با ئیتر بەس بێت و بڕایەوە. یەکەم جار تێگەیشتنی ئیدارە لە بارەی ئەو ئۆپەراسیۆنە سەربازییەوە ئەوە بوو کەوا کارێکی ئاساییە. چونکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەر بە سیفەتی دژەیاخیبوونی عێراق ناسرابوو. شیکردنەوەیەکی نموونەیی بەم شێوەیە دەستی پێ دەکرد: "هەر کە جەنگ لەگەڵ ئێران تەواو بوو، عێراق جاڕی لە بڕیاری خۆی دا بە تێکشکاندنی یاخیبوونی چەکداریی کورد" (لێکۆڵەرەوانی کۆلێجی جەنگ)، تەنانەت ئەگەر عێراق جاڕنامەیەکی لەو جۆرەشی دەرنەکردایە[٢]، یان "لە پاش ئاگربەست عێراق دەستی کرد بە کەمپینی گەورە بۆ لەناوبردنی یاخیبوونی کورد بە چۆڵکردنی دێهات لە دانیشتوانی و لەوانە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، ڕاگواستن/کوشتنی بەکۆمەڵ" (یاداشتی وەزارەتی دەرەوە)[٣]. یان "کەمپینی ئەم دواییە پێدەچێت دەستکردنەوەی بەغدا بێت بە هەوڵێکی چڕوپڕی پاش جەنگ، بۆ ئەوەی بە یەکجاری و هەتاهەتایە کوردەکان ملکەچ بکات، لە کاتێکدا کەوا سوپای عێراق لە تەواوی هێز و گوڕی سەردەمی جەنگدایە" (یاداشتی وەزارەتی دەرەوە)[٤]. ئەم بروسکە بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

"عێراق پلانی داناوە بۆ بەدواداچوونی ئەم ئۆپەراسیۆنە و کارکردن لە دژی هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی سەر بە تاڵەبانی بۆ دوورترین خاڵی باشوور لە گرد و چیاکانی ناوچەی سلێمانیدا. ئاشکرا نییە ئاخۆ ئۆپەراسیۆنەکانی دامرکاندنەوەی تەواو هێشتا هەر لە بەرنامەدایە بۆ ئەم کەرتە یاخود "لێبووردنی گشتی" بۆ کوردەکان جێی پلانە سەربازییەکانی گرتووەتەوە، کە بەغدا لە وەڵامی نیگەرانیی تورکیادا ڕایگەیاند سەبارەت بە لێشاوی پەنابردنی کوردە عێراقییەکان بۆ ئەو وڵاتە"[٥٠].

ملیۆنان کەس لە خەڵکی عێراق (کە لە مانگی مارتەوە و لە ڕێگەی کەناڵەکانی میدیای حکومەتەوە دەنگوباسیان بە گوێدا دەدرا)، زۆر باش دەیانزانی کە شاڵاوی ئەنفال لە ڕۆژانی کۆتاییدایە نەک سەرەتا، بۆیە هەر کەس گوێی لە میدیای عێراق بگرتایە، هەمان ئەو شتەی دەزانی. کتێبخانەی کۆنگرێسی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەردەوام ڕۆژنامە سەرەکییەکانی عێراقی وەردەگرت و دەزگای خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی بیانیی FBI سەر بە (سی ئای ئەی)، بە شێوەیەکی ڕۆتینی کورتەی هەواڵەکانی عێراقی بە زمانی ئینگلیزی لێ گەڵاڵە دەکرد، بە هەواڵ و باسوخواسی ئەنفالیشەوە.

هۆکاری ئەم بە هەڵە لێکدانەوە قووڵ و زەحمەتەی ئەنفال، ئەگەری نەزعەیەکی دوولایەنەی هەیە: یەکەم، ڕەنگدانەوەی پەیوەندیی حیزبە کوردییەکان، لای ئیدارەی ئەمەریکا، لەگەڵ دوژمنی ئێرانیدا، بوو بە هۆی تەڵخکردنی ئەجێندای سروشتی یاخیبوونی کورد و جیاوازیی دینامیکی و قووڵ لە نێوان یاخیبوان و هاوپەیمانە ئێرانییەکانیاندا.

دووەم، واشنتۆن بەئاگا بوو لە شۆڕشی سالانی ١٩٧٠کانی مستەفا بارزانی، کە ویلایەتە یەکگرتووەکان پشتگیریی دەکرد، بەلام لەوە بەدوا زۆر بە کەمی (بارزانی سالی ١٩٧٩ لە ئاوارەییدا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کۆچی دوایی کرد). نموونەیەکی شێوازی ئەم خوێندنەوە ئینتیقائییە بۆ پێشهات و پەرەسەندنەکان لە کوردستاندا، لە بروسکەیەکی وەزارەتی دەرەوەدا تێبینی دەکرێت، کە مەسعود بارزانیی سەرکردەی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەل جەلال تالەبانیی سەرکردەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، لە لێبوردنە گشتییەکەی عێراق لە ٦ی ئەیلوولدا دەرکرابوون، کەوا کۆتایی بە ئەنفال هێنا[٦]. ڕاستییەکەی بارزانی، نەک تالەبانی، هەرگیز لە مەرسوومی لێبوردنەکەدا ناوی نەهاتبوو، چونکە ئەو ماوەی سیازدە سال بوو تەنانەت لە عێراقیش نەبوو، ناوچەکەشی بوو بە تەنها قۆناغێک لە هەشت قۆناغەکەی ئەنفال.

هەر چەندە تێکەیشتنیان بۆ یاخیبوونی کورد ڕەنگە جۆرە شێواندنێکی تێکەوتبێت، بەلام هەندێک سەرکردە لە واشنتۆن گومانیان لەوە نەبوو کە عێراق جارێکی تر گازی کردووەتەوە بەسەر کورددا. مەکتەبی زانیاری و لێکۆلینەوەی وەزارەتی دەرەوە لە یاداشتێکی ڕۆژی ٢ی ئەیلوولدا، جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە عێراق، پاش ئەوەی هێزەکانی بە هۆی ئاگربەستەوە دەستیان والا بوو، "وادیارە هاوسەنگیی خۆیان وەرگرتووەتەوە بۆ ئاڕاستەکردنی لێدانێکی یەکلاکەرەوە دژ بەو بەشە نەیارەی دانیشتوانی کورد لە باکووری عێراقدا". یاداشتەکە لەسەری دەڕوات و دەلێت: "پێدەچێت بەغدا هەست بە کۆسپ و تەگەرەیەکی

ئەوتۆ نەکات بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژ بە یاخیبووەکان و دژ بەو گوندنشینانەش کە بەردوامن لە پشتگیریکردنی ئەواندا. ڕاستییەکەی ئێمە ئێستا بەڵگەی سەلمێنراومان بە دەستەوەیە کە عێراقییەکان چەکی کیمیاییان دژ بە یاخییە کوردەکان بە کار هێناوە لە ڕۆژی ٢٥ی ئابدا"[٧].

عێراقییەکان، پاش ئەوەی زاتیان خرایە بەر و ڕێگەیان پێ درا بە خوایشتی خۆیان گازباران بکەن، نەیانویست بوەستنەوە و کۆڵ لەو کارەیان بدەن، چونکە یاخیبوون هێشتا هەر لەئارادا بوو، هەر چەندە جەنگیش کۆتایی پێ هاتبوو. ئەمە ڕەنگە هەڵەیەک بووبێت، چونکە لەگەڵ تەواوبوونی جەنگدا بەرژەوەندیی ستراتیجیی ویلایەتە یەککگرتووەکان گۆڕا و لەو کاتەدا جموجووڵی عێراقییەکان چاودێرییەکی وردتر دەکرا. هەر لەو سەروبەندەدا، لێشاوێک باس و ڕاپۆرتی میدیا لەسەر هورووژمی ئاوارە کوردەکان بۆ ناو تورکیا فشاری دەخستە سەر بەڕێوەبەرێتی.

جۆرج شوولز ئیشارەتی گفتوگۆکردنی توندی نارد بۆ ئەپریل گلاسپیی باڵیۆزی تازە دامەزراو لە بەغدا کەوا بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە و ئەو ڕاگواستنانەی لەئارادان "دەبنە هۆی بەرپابوونی نارەزاییەکی توندی نێودەوڵەتی" و ئامۆژگاریی کردبوو نیگەرانیی واشنتۆن بگەیەنێتە حکومەتی عێراق: "ئێمە لەوە تێدەگەین کە بارودۆخەکە ئاڵۆزە و ڕەگێکی مێژوویی قووڵی هەیە و ئەوە بووەتە مایەی پەیدابوونی یاخیبوونێکی چەکداریی وا کە کوردەکان تێیدا خۆیان کردووە بە هاوپەیمانی ئێران. ئێمە وای دەبینین کە عێراقییەکان چەند

دەرسیان دابدرێت شتێکی ئەوتۆی لێ سەوز نابێت، بەڵام دەمانەوێت ئەوەیان بۆ ڕوون بکەینەوە کە بێدەنگ نابین لە بەرامبەر پێشێلکردنی لەو چەشنەی مافی مرۆڤدا و بێگومان ئەمە کاریگەرییەکی پێچەوانەی دەبێت لەسەر توانای ئێمە بۆ پەرەپێدانی پەیوەندییەکی دووقۆڵیی توندتری نێوانمان".[8] لە ٨ی ئەیلوولدا، وەزارەتی دەرەوە مەسەلەکەی بە تەواوی ئاشکرا کرد و گوتەبێژەکەی ڕایگەیاند کە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان "قەناعەتی هێناوە بەوەی کە عێراق چەکی کیمیایی بە کار هێناوە لە هەڵمەتە سەربازییەکەیدا دژ بە گەریلا کوردەکان".[9]

لێرە بە دواوە ڕۆژنامەنووسان لە یەک کاتدا کەوتنە پرسیاری دیاریکراو لە کاربەدەستە عێراقییەکان و داوای ئەوەیان لێ کردن بگەنە باکووری عێراق. پاشان ژمارەیەکی کەم لە پەیامنێران ڕۆیشتن و لەوێ لە لایەن عێراقییەکانەوە بانگهێشت کران و "پاسەوانانی" موخابەرات لە نزیکەوە یاوەریی دەکردن لە سەردانی خێرا و کورتدا بۆ شارە کوردییەکان ـ نەک بۆ دێهات ـ و بە سواری هێلیکۆپتەری عێراقی. لە پاش گەڕانەوەیان، هەندێک لە پەیامنێرانی وەک میلتن ڤیۆرست و پاتریک تایلەر، بە ئاشکرا گومانیان لە بەڵگەی هێرشی گاز دەربڕی[10].

هەمان ڕۆژ، واتە ٨ی ئەیلوول، جۆرج شوڵز، سەعدوون حەممادیی وەزیری دەوڵەتی بۆ کاروباری دەرەوەی بانگ کرد و بە قسەی خۆی "کارێکی پێ کردووە نەبێتەوە".[11] بەپێی تێبینییەکانی کۆبوونەوەکە، بە حەممادیی گوتووە کەوا "ناڕەزایی نێودەوڵەتی دوابەدوای بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا بۆ ماوەیەکی

دووردرێژ خستیه (سندووقەوە و دایخست)، کەچی وا ئێستا سەرهەڵدەداتەوە و دەبێت خەفە بکرێت". پاشان جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە واشنتۆن "بەڵگەی حاشاهەڵنەگری هەیە" کە عێراق کوردەکانی گازباران کردووە و ئاگاداری دەکاتەوە کە "لە کاتێکدا ئێمە پێمان خۆشە پەیوەندیی دووقۆڵیمان بە شێوەیەکی بونیادنەر پەرە بسێنێت و ئەوەش جێبەجێ نابێت ئەگەر عێراق بەردەوام بێت لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە کوردستان یان شوێنانی تردا". هەر چەندە حەممادی بە پێداگرتنەوە تۆمەتەکەی ڕەت کردەوە، بەڵام شوولتز ناچاری کرد مل بدات کەوا جارێکی تر عێراق چەکی کیمیایی بە کار ناهێنێت[١٢].

کاتێکیش کە مشتومڕ لەسەر ئابڵووقە گەرم بوو، بێ گوێدانە ملدانی عێراق، تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوە ناچاری ملکەچیی زیاتر کرا و بە ئاشکرا و بە تەواوی پێی لێ نا کە عێراق پەیوەستی پابەندییە نێودەوڵەتییەکان دەبێت، بە پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤیشەوە. لە بەرانبەریشدا واشنتۆن دڵنیاکردنەوەی تاریق عەزیزی بە "جێی ڕەزامەندی" و "بەڵێنێکی زۆر بایەخدار و چەسپاو" وەسف کرد[١٣]. لەگەڵ ئەوەشدا، وەک ڕێگرتن لە هەر کەلەبەرێک، واشنتۆن داوای ڕوونکردنەوەیەکی لە بەغدا کرد کە بەڵێنەکەی کوردەکانیش دەگرێتەوە، چونکە پرۆتۆکۆڵەکە ململانێی چەکداریی ناوخۆ ناگرێتەوە. تاریق عەزیز لە ٣ی ئۆکتۆبەردا ملی دا، لە کاتێکدا کە گفتوگۆ لەسەر ئابڵووقە گەرم و بەردەوام بوو. بە هەرحاڵ، ئەو ددانی بەوەدا نەنا کە عێراق گازی بە کار هێنابێت و داوایەکی پشتگیریکراوی

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ڕەت کردەوە سەبارەت بە لێکۆڵینەوەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکان و بە پێشێلکردنێکی نابەجێی سەروەریی عێراقی لەقەڵەم دا[١٤].

لێرەدا بۆ یەکەم جار، زمانی زبر بە کار هات و گاڵتەجاڕیی ئەم مەسەلەیەش لەوەدا بوو کە لە کاتێکدا ئیدارەی ڕیگان هەستیاریی زیادی لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی پیشان دەدا، کەوا جەنگ تەواو بووبوو، گازبارانی عێراق لە بادینانەدا کوشتاری کەمتر بوو لە قۆناغەکانی پێشتری ئەنفال، بە تایبەتی ئەنفالی یەک (دۆڵی جافەتی) و ئەنفالی چوار (کۆمەڵکوژییەکەی گۆپتەپە/عەسکەر، یان هێرشە گەورەکەی گازباران بۆ سەر دۆڵی بالیسان لە نیسانی ١٩٨٧دا و بێگومان هەڵەبجەش). ڕاستییەکەی نەبوونی ئاشکرای کوشتاری بەرچاو لە هێرشەکانی ئەم دواییەدا، جگە لە ڕاپۆرتگەلێکی بێشومار لەسەر خەڵکی ئاوارە، وای لە هەندێک کرد ئیدیعای ئەوە بکەن کە هەر ڕوویان نەداوە.

هەر چۆنێک بێت، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە بە وێکهاتنەوە لەگەڵ کاریگەریدا، جارێکی تر بووەوە بە مەسەلەیەکی بەرچاو و کەوتە سەر زاران. ئەم جارەش وەک قۆناغەکانی پێشووی ئەنفال، فڕۆکە لە یەکەم ڕۆژی ئۆپەراسیۆنەکەدا بۆمبی کیمیاییان بەردایەوە و بنکە و بارەگاکانی فەرماندەیی (پ د ک) و گوندەکانیان وەک یەک کردە ئامانج. هەر چەندە تا ڕادەیەک کوژراو و برینداری ڕاستەوخۆی ئەم هێرشانە کەم بوون، بەڵام کاریگەریی ترس و تۆقاندنیان هێجگار گەورە بوو ـ هیومان ڕایتس وۆچ ئەوپەڕەکەی بە ٢٠ ــ ٢٥ کەسێک مەزەندەی

دەکات[15]. بەرگریی (پ د ک) لە ماوەی چەند سەعاتێکدا شکستی هێنا و گوندنشینانی زارەترەک و تۆقیو لە سەرانسەری ناوچەکەدا چییان پێ هەڵدەگیرا لەگەڵ خۆیان دەیانبرد و بەرەو باکوور هەڵدەهاتن بۆ سنووری تورکیا. پاشان نزیکەی هەشتا هەزار کەس چوونە ناو تورکیاوە، هەر چەندە گەلێکیشیان لێ گەڕایەوە، پاش ئەوەی ڕژێمی عێراق لێووردنێکی گشتیی ٣٠ ڕۆژەی بۆ هەموو کوردەکان ڕاگەیاند.

قەیرانی ئاوارەکان گەلێک کێشەی بۆ تورکیا دروست کرد. وەک یاداشتێک لە ریچارد مێرفیی یاریدەدەری وەزیری دەرەوە ڕایدەگەیەنێت: "شالاوی دژ بە خەڵکی مەدەنی ـ کە هەزاران کەسی ناچاری ڕاگوێزان کردووە و باس لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دەکرێت ـ وادیارە پێشێلکاریی جیددیی لە خۆ گرتووە پەیوەست بە پێوەرەکانی نێودەوڵەتیی مافی مرۆڤ و تورکیای هاوپەیمانمانی خستووەتە دۆخێکی قورسەوە"[16]. هەڵبەت تورکیا هاوپەیمانێکی گرنگ بوو، لەوەش دەترسا کە شالاوی دڕندانەی عێراق بۆ چارەسەری کێشەی کوردەکەی خۆی، کێشە و گرفت بورووژێنێت لە هەرێمی کوردنشینی تورکیا خۆیدا. نکووڵیکردنی تورکیا لە مافی زمان و فەرهەنگی کەمینە کوردییە گەورەکەی و سەرکوتکردنی توند، بە زەبری چەک بۆ هەر دەربڕینێکی نەیاری و بەرهەڵستی، بووەتە هۆکاری بەرپابوونی شۆڕشێکی کورد کە لە ساڵی ١٩٨٤ەوە پارتی کرێکارانی کورد (پەکەکە)، ڕابەریی دەکات، کەوا گرووپێکە وەزارەتی دەرەوە بە تیرۆریست دایناون و مل بە تورکیای هاوپەیمانی نادەن.

حکــومەتی تورکیــا، لە بەرانــبەر شــەپۆلی ئاوارەکانــدا ویستی ڕاستی بشارێتەوە، بە نکوولّیکردن لەوەی کە عێراق چەکــی کیمیــایی بە کــار هێنابێــت. بە هەرحــاڵ، لە ئاگــادارکردنەوەی حکــومەتی ئەمەریکــادا تورکیــا "هــیچ بەڵگەیەکی نەبینیوە لە بەکارهێنانی عێراق بۆ چەکی کیمیایی (کوشندە) لە باکووری عێراقدا"، لێرەدا تورکیا یاریی بە وشە دەکــرد. دکتۆرەکــان باســیان لە حاڵەتەکــانی هێڵێنجــدان و چاوســوورب‌وونەوە دەکــرد ــ کە بەڵـگە بـوون بـۆ گـاز، بـا کوشندەش نەبووبێت[17]. قوربانییانی گازی کوشندە دەشێت بەدەم ڕێگەوە مردبێتن، پێش ئەوەی بگەنە سنوور. قسەی شــــایەتحاڵەکان و ئەو نمــــوونە خــــۆڵانەی کە لە لایەن ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤەوە ساڵانی پاشتر وەرگیراون، بە ئاشکرا ئەوە پیشان دەدەن کە عێراق چەکی کیمیایی بە کار هێناوە، لەوانە سارینی توخمەدەماری هێجگار کوشندە، کە زۆربەی زۆری ئەوانەی کاری تێکردن هەرگیز بە سەلامەتی نەگەیشتن[18].

هەروەهــا تورکیــا هەوڵــی دەدا ڕێــگە لە چــاودێرانی ســـەربەخۆ بگرێــت بــۆ ئەوەی نەگەنە ئاوارەکــان. بەڵام نەیــدەتوانی ڕێــگە لە ســەردانی دیپلۆمــاتە ئەمەریکییەکــان بگرێت و یەکێکیـان پیتەر گالبرەیس بـوو، کە یاریـدەدەرێکی کلەیبۆرن پێڵی سەرۆکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ســەنات (ئەنجــوومەنی پیــران) بــوو. گــالبرەیس لە ســاڵانی ١٩٨٤ ــ ١٩٨٧دا سـەردانی عێراقـی کردبـوو (بـڕوانە بەشـی چــوارەم) و ڕاپــۆرتێکی خراپــی لەســـەر کەمپینــی گونــد ڕووخانـدن نووسـیبوو. ئەم پیـاوە لەگەڵ کریسـتۆفەر ڤـان هـۆڵنی هاوکاریـدا لە ١٠ی ئەیلوولـدا چـوون بـۆ سـنوور بـۆ

چـــاوپێکەوتن لەگەڵ ئـــاوارە کوردەکـــان و کـــۆکردنەوەی بەڵـگەی تـر لەســـەر چەکـی کیمیـایی. ئەو ڕاپـۆرتەی کە هەردووکیـان نووسـییان، پڕ بـوو لە هەڵە و زیـادەڕۆیی کە باسوخواسی ئاسایی ئاوارەکانی دەگەیاند، کەوا بەدەم ترس و پەشـــۆکانەوە ماڵوحـــاڵی خۆیـــان جـێ هێشـــتبوو، زۆر کاریگەرانە بە گوێی جیهانیاندا دەدا کەوا عێراق جارێکی تر پەنـای بـردووەتەوە بەر گـاز، بەڵام لەمەیانـدا بێ هەڕەشـە و مەترســـیی ئێـــران، وەک پێشـــتر بەوە پاســـاوی دەدا[١٩]. گاڵبرەیس لە لایەن ڕیچارد شیفتەرەوە بە پەلە داوا کرا، کە کاربەدەسـتی بەرپرسـی مەکتەبـی مـافی مرۆڤـی وەزارەتـی دەرەوە بـوو. (لە چاوپێکەوتنێکی سـاڵی ٢٠٠٠دا)، گـاڵبرەیس وەک دەڵێت بـۆ شـیفتەری گێڕاوەتەوە کە عێراق لەگەڵ ئەو دەسنیشـانکردنەدا یەک دەگـرێتەوە بـۆ "بەرپـاکردنی ئەو شـێوازە تونـدە پێشـێلکارییە زۆر گەورەیەی مـافی مـرۆڤ"، بەو ســـتانداردەی کەوا پێویســـت دەکـــات لە کـــۆنگرێس یارمەتیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی لێ ببڕێت.

بـێجگە لە تـووڕەیی ئەوانەی نیگەرانـی مـافی مـرۆڤن، هێرشە کیمیاییەکانی عێراق و (پەرەسەندنی نائاسایی لە توانـــای هێرشـــەکاندا) لە دواجـــاردا زەنگـــی ئاگادارکردنەوەیـــان زیـــاد کـــرد ســـەبارەت بە ئەگەری تەشـــەنەکردنیان. یاداشـتێکی وەزارەتـی دەرەوە دەڵێـت "بە تایبەتی هێرشـە قورسـەکانی (گـازی) عێراق لەم هەفتانەدا و هاوزەمان لێشاوی ئاوارە/قوربانییەکان بۆ ناو خاکی تورکیا، وێنەیەکی زیاتر بەرچاوی ستانداردی پیادەکردنی عێراقیان گەیاند"[٢٠].

وا ئێستا قورسایی بیروکراتیی دژ بە عێراق وەرچەرخاوە. ئیدارەی ڕیگان دەیزانی کەوا باری بە سەر عێراقییەکاندا تلاندووەتەوە، کە دەمێکە دەستیان لە ئەمەریکا شۆردووە و لە هاوکاریی ئابووریی نائومێد بوون بۆ یارمەتیدانی ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەیان کە جەنگ لاوازی کردبوو. بەڵام ئیدارە کەیفی بەوە نەدەهات زۆر پێ داگرێت لە مەسەلەی تۆمەت و تۆمەتکاریدا، چونکە بەرژەوەندییە ئابووری و بازرگانییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکەوتنە مەترسییەوە.

ماوەی دوو مانگ بوو واشنتۆن مشتومڕی ئابڵووقەی دەهێنا و دەبرد. ئاخۆ سزادانی عێراق ئەنجامی باشی لێ دەکەوێتەوە ـ وەک وەستاندنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی؟ یان تووڕەبوونی عێراقییەکان دەگەیەنێتە ئاستی پەیوەندیی پچڕاندن؟ ئاخۆ "خەرجی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بۆ عێراق زیاد ناکات" (وەک کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوە باسی کردبوو)." چەشنی ئەوەی عێراق بکرێتە نموونەیەک کە کۆسپ بۆ ئەگەری بەکارهێنەری تر دروست بکرێت، وەک لیبیا، بۆ ئەوەی ڕاستگۆییەکی گەورەتر بداتە هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکان"[٢١]؟ باشە دەبوو کاردانەوەی سزائامێز و لووتشکاندن ببەسترێتەوە بە تەنها گازبارانی کورد لە لایەن عێراقەوە (کە کارێکی ئەوپەڕی بەد و مایەی کاردانەوەی نەک هەڕەشەیەکی ترسناک، بەڵکو هەڕەشەیەکی لەوە "کەمتر" بوو ـــ لەو جۆرەی کە یاداشتێکی وەزارەتی دەرەوە وەک "بەکارهێنانێکی گونجاو" ئیشارەتی پێ دەکات ئەگەر بە هۆکاری تری سەربازی کارەکە ئەنجام بدرایە)[٢٢]؟ یان ئاخۆ لەپێناوی بەرژەوەندیی

جیهانــدا، دەبــوو زمــانی ســزای ویــلایەتە یەکگرتووەکــان ئیشــارەتکردن بێــت بــۆ ســتانداردە نێودەوڵەتییەکــان و بە ئاشـکرا نـاوبردنی بەکارهێنـانی گـاز لە لایەن عێـراقەوە نەک تەنهــا دژ بە کــورد (چــونکە پێشــێلکردنێکی بەنــدی ســێی ڕێککەوتننامەی جنێڤە، کە حوکم بەسەر ململانێی چەکداریی نـاوخۆدا دەدات)، بەڵکـو دژ بە ئێـرانیش[٢٣]؟ بە گەڕانەوە بـۆ پرۆژەیاســای ســزای ئــابڵووقەدان کە خرابــووە بەردەمــی کۆنگرێس، یاداشتێکی وەزارەتی دەرەوە بەم ڕەنگە مشـتومڕ لەسەر مەسەلەکە دەکات:

"ســەبارەت بە تــاوتوێکردنی پــڕۆژەی یاســاکە، ئــێمە باوەڕمــان وایە کە دەبێــت ئیشــارەت بــدەینە بەکارهێنــانی چەکـی کیمیـایی عێـراق لە جەنگـی ئێرانـدا، کە پێشـێلکردنی پرۆتۆکـۆڵی ســاڵی ١٩٢٥ی جنــێڤە. چەنــدین تیمــی نەتەوە یەکگرتووەکــــان ئەم بەکارهێنــــانەی چەکــــی کیمیاییــــان ســــەلماندووە و ویــــلایەتە یەکگرتووەکــــان بەردەوام بە ناوهێنــان عێراقــی تاوانبــار کــردووە لەســەر بەکارهێنــانی نایاسـایی و نـاڕەوای چەکـی کیمیـایی. بە لابردنـی ئامـاژەی بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی عێـراق لە جەنگـی ئێـران ــ عێراقــدا، ڕەنــگە پرۆژەیاســـاکە وا بگەیەنێــت کە ئــێمە بەکارهێنانیمــان دژ بە ئێــران بە کەمبــایەختر زانیبێــت لە بەکارهێنـانی دژ بە کوردەکان. جیاکـارییەکی ئاوهـا خزمەتـی بەرژەوەندییە جیهانییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان ناکات لە دانـانی بەربەسـتدا دژ بە چەکـی کیمیـایی و بەکارهێنـانی و تەئکیـدکردنەوەی سەپاندنی پرۆتۆکۆڵی جنێڤی سـاڵی ١٩٢٥ بەســـەر جەنگـــی ئێـــران ـــ عێراقـــدا. ســـەرەڕای ئەوەش پرۆژەیاسـاکە پێویسـتە ئەوە ڕوون بکـاتەوە کە بەکارهێنـانی

چەكی كیمیایی دژ بە خەڵكی مەدەنیی كورد، پێشێلكردنێكی بەندی سێی ڕێككەوتننامەی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩یە سەبارەت بە پاراستنی قوربانییانی جەنگ.

ئاخۆ دەبوو چ جۆرە كارێك ئەنجامی باشی لێ بكەوێتەوە؟ باشە، وەك باڵیۆزی ئەمەریكا بۆ ڕاوێژكاریی دەگێڕێتەوە، دەبوو واشنتۆن پەیوەندیی دیبلۆماسی ببڕێت و ئەوە ڕابگەیەنێت كە باڵیۆزی عێراق كەسێكی پەسەند نییە و ئاستی نوێنەرایەتیی دیبلۆماسی دابەزێنێت؟ ئایا دەبوو ئیدارە ڕازی بێت كۆبوونەوە لەگەڵ نوێنەرانی كورددا بكات (كە ئەوە قەدەغەی نافەرمی كۆتایی پێ دێنێت لەسەر كۆبوونەوەی لەو چەشنە)؟ باشە دەبوو جارێكی تر واشنتۆن عێراق بە وڵاتێكی پاڵپشتی تیرۆریزم دابنێت؟ ئاخۆ دەبوو ویلایەتە یەكگرتووەكان بازرگانی و قەرز و بەرژەوەندیی ئابووریی تر ڕابگرێت؟ ئەی دەبوو ئابڵووقە بخاتە سەر هەناردەی نەوتی خاوی عێراق؟ یان دەبوو ئابڵووقەیەكی توندی چەك بسەپێنێت، بەو كاڵایانەشەوە كە بەكارهێنانی دوولایەنەیان هەیە؟ هەروەها ئایا دەكرا ئەمەریكا كاری سزائامێزی تەنها ببەستایەتە بەكارهێنانی چەكی كیمیایی یان بەرهەمهێنانی چەكی كیمیایی و بایۆلۆجییشەوە؟ بێجگە لەمانەش لیستی هەڵبژاردنەكان كاری فرەلایەنی لە خۆ گرتبوو وەك قەدەغەكردنێكی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ بەرهەم و كەرەستەكانی كیمیایی بۆ عێراق و (ئێران) و فراوانكردنی كۆششی گرووپی ئوسترالی، كە كۆمكارێكی وڵاتانی ڕۆژئاوایە و بە دوای سنوورداركردنی بازرگانیی ماددە كیمیاییە مەترسیدارەكاندا دەگەڕێن[٢٤].

له ٩ی سێپتەمبەردا و بە سرەواندنی زللەیەک بۆ عێراق، سەنات "یاسای قەدەغەکردنی جینۆسایدی" قبوول کرد. پرۆژەیاسایەکی هاوشێوەش لە ئەنجوومەنی نوێنەران خرایە بەر باس و ئەگەر ئەو پرۆژەیاسا هاوبەشە ڕەزامەندیی هەر دوو ئەنجوومەنی پیران و نوێنەرانی وەربگرتایە، ئەوە دەبوو ویلایەتە یەکگرتووەکان قەدەغەی بخستایەتە سەر هەناردە، قەرز، گەرەنتی و شێوەکانی تری یارمەتی و هاوردەی نەوتی عێراقیشی قەدەغە بکردایە. هەروەها پێویستیش بوو ئەمەریکا بەرهەڵستیی ئەو قەرزانەی بکردایە کە لە دەزگا داراییە نێودەوڵەتییەکانەوە دەدرانە عێراق. بەڵام وشەی "جینۆساید" وەک ئالای سوور کاری پرمەترسیی خۆی کرد و خاوەخاوکردنی ئاشکرا لە زانیارییە بەردەستەکاندا پشتگیریی پرۆژەیاساکەی هەڵوەشاندەوە و هێز و گوڕی دا بە ڕەخنەگرانی[٢٥]. گالبرەیس داکۆکیی لە مافی ڕەوای ڕاپۆرتەکە کرد و (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) بەم شێوەیەی خوارەوە فشار دەکات: "ئێمە ئاگامان لە وێرانکردنی سیستماتیکیی گوندە کوردنشینەکانە، بە ئامانجکردنی دەزگا فەرهەنگییەکان و ڕەز و باخەکانە، هێرشەکانی چەکی کیمیایی دژ بە کوردەکانە، کوشت و کوشتارە (چ بە کیمیایی یان بە ئیعدامکردن) و لێشاوی هەڵاتنی ئاوارەیە بۆ تورکیا بە شێوەیەک کە لەوەدەچوو کردارێکی جینۆساید بێت". بە هەرحاڵ، تاوتوێ و هەڵسەنگاندنەکەی عێراق بە بنەمای چەند بەڵگەیەک ئەنجام درا کە جینۆسایدیان نەسەلماند. بەڵگەی ڕاستەقینەی جینۆساید ــ کەوا کۆمەڵکوژیی کوردەکان بوو ــ تەنها پاش ساڵی ١٩٩١ کەوتە بەردەست، کاتێک لێکۆڵەرەوانی

سەربەخۆ توانییان بە ئازادی سەر لە کوردستان بدەن و تەنها لە ساڵی ١٩٩٥دا ڕاوێژکاری یاسایی وەزارەتی دەرەوە گەیشتە ئەو ڕاستییەی کە ئەوەی لە ماوەی ئەنفالدا ڕووی دا، بە جینۆساید دادەنرێت[٢٦].

لە ٢١ی ئۆکتۆبەردا، پڕۆژەیاساکە شکستی هێنا، پاش ئەوەی ئیدارە بە توندی لە دژی وەستایەوە و گەلێک سیناتۆر، کە لە بنەڕەتدا پشتگیریی پڕۆژەکەیان کردبوو، ڕایان گۆڕی[٢٧]. وەزارەتی دەرەوە ڕوونی کردەوە کە "وەک پرنسیپێکی گشتی"[٢٨] لە دژی ئابلۆوقەکە دەوەستێت و ئەوەیان دەگوت کە پڕۆژەیاساکە "لە ناوەڕۆکدا هەموو شتێکی ڕاماڵیوە و هیچی تێدا نەهێشتووەتەوە". لەبری ئەوە، کاربەدەستان پێشنیازی بڕیارێکی ناپابەندیان کرد بۆ ئیدانەکردنی عێراق و لە کۆتاییدا، هیچ شتێک ڕووی نەدا[٢٩]. گالبرەیس، کەوا گەلێک لە کاربەدەستانی واشنتۆنی تووڕە کردبوو بە کەمپینەکەی کە تا ڕادەیەک و (لانیکەم لە شێوازدا) دۆنکیشۆتانە بوو، دواتر (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) بە داخ و خەفەتێکی زۆرەوە ڕایگەیاند کەوا: "شتێکی پڕشوورەیی ڕووی دا و جێی گومان بوو، چونکە کاردانەوەی واشنتۆن نەک هەر هیچی نەکرد، بەڵکو ڕێگری لە هەوڵ و کۆششی خەڵکی تریش کرد بۆ ئەوەی هیچ نەکرێت، بەو پاساوەی کە سزا یەکلایەنەکان کاریگەرییان نییە".

لێرەدا گاڵتەجاڕیی دووەم دێتە پێشەوە و لە پایزی ١٩٨٨دا، واشنتۆن بۆ دواجار بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراقی سەرکۆنە کرد، بەڵام لە پاش تەواوبوونی جەنگ ئەم سەرکۆنەیەی کرد. شایانی باسە بەم وریاکردنەوە گشتی و

لاوازە، عێراقییەکـان ناچـاری ملکەچکردنێـک بـوون، بەڵام چ جـۆرە ملکەچکردنێـک؟ لە یەکەم هەفتەیـدا، کە نەک تەنهـا جەنگ، بەڵکو دژەیاخیبوونیش تەواو بووبوو، هەروەها هیچ هەڕەشـەیەکی سـەربازیی بەرچـاویش لە ئاسـۆی عێراقـدا بەدی نەدەکـرا و ئەمەش وای کـرد بەکارهێنـانی چەکـی کیمیایی شـتێکی زیـادە بێت، کەچـی هێشـتا ئیدارەی ڕیگـان هەر ئیدیعای ڕاستگۆیی و شـانازیی بەم وەسـتانە دەکرد. لە ١٠ی ئەیلوولـدا و پاش ئەوەی خـانمی بـاڵیۆزی ئەمەریکا لە عێراق دڵنیا کرا کە عێراق چەکی کیمیـایی لە باکوور بە کـار نەهێنـاوە و ئۆپەراسـیۆنە سـەربازییەکان "لە چەنـد ڕۆژێکـی کەمدا" تەواو دەبن[٣٠]، باڵیۆز گلاسپی بروسکەیەک دەنێرێت بـۆ واشـنتۆن و تێیـدا دەڵێـت: "عێـراق نە چەکـی کوشـندەی کیمیـایی بە کـار هێنـاوە و نە بە کاریشـی دێنێـت دژ بە کوردەکان". پاشـانیش لەسـەری دەڕوات و دەڵێت: "شـێوازی لەسەرخۆ و ئارامیی خۆنواندنی عێراق دەمانهێنێتە سـەر ئەو بـاوەڕەی کە سـەدام حسـێن لە پەیـامەکە گەیشـتووە و بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لە کوردسـتان وەسـتاندووە"[٣١]. بە هەرحـاڵ ئەمە چـوار ڕۆژی تەواو دوای ئەوە هـات کە لێبوردنی گشتی دەرگای لەسەر ئەنفال داخستبوو، هەروەها زیـاد لە دوو هەفـتەش پـاش دوا بەکارهێنـانی گـاز لە لایەن عێراقەوە و بەوپێیە بەڵێنەکـانی عێراق بـۆ واشـنتۆن هیچـی تێنەچوو.

سەرەڕای ئەوەش، تەنانەت ئەگەر بەڕێوەبەرێتیی ڕیگـان و کۆنگرێس پەنایان ببردایەتە بەر کاردانەوەی توندتر، ئەوە دەیـانتوانی نەهـێڵن کـارە دڕنـدانەکانی دواتـر ڕوو بـدات ــ هەڵـبەت نەک شـتێکی بێبـایەخ ــ چـونکە ئەگەر مەبەسـت

نەهێشتنی بەرپابوونی جینۆسایدبوایە، وەک گالبرەیس دەیویست و (لە سەرەتای ئەیلوولدا بۆ ئەو مەبەستە سەفەری تورکیای کرد)، ئەوە کاردانەوەیان رێک دوای ئەوە دەهات کە ئەنفال تەواو بوو و لە بەرانبەر کێلگەکانی کوشتاری رژێمدا قرووقەپی لێ نەدەکرا.

## بەرژەوەندییەکی باڵاتر

ئەوەی کە بە سەرسووڕمانەوە درکی پێ دەکرێت، کەوا عێراق هیچ شتێکی نەکرد لە بەڵێنێکی پووچ بەولاوە کە ئیتر واز لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دێنێت. بۆ تێگەیشتن لەمە، دەبێت چاو بە دۆخی گفتوگۆدا بگێڕین لە بارەی سزاکانەوە و لە کەشوهەوای داتاشین بەلای عێراقدا. پێش هەموو شتێک، با بزانین جۆرج شوولز خۆی چۆن شتەکان دەبینێت؟ لە نووسینێکیدا لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەکاندا و ڕێک دوای داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە، کە واشنتۆنی ڕاچڵەکاند و هەواداریی عێراقی لە پەنجەرەوە تووڕ هەڵدا دەرەوە، شوولز دەڵێت بیری دێتەوە کەوا "ماوەی دوازدە تا هەژدە مانگ لە ناوەڕاستی ساڵانی هەشتاکاندا، من و سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا پاکانەمان بۆ ڕژێمی عێراقی سەدام حسێن دەکرد". کەچی هەر زوو دەرکەوت ڕژێم بەو شێوەیە چاک نەدەبوو کە شوولز هیوای بۆ دەخواست: "کاتێک لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٥دا ئەبوعەباس ڕێگەی پێ درا ئیتاڵیا بە جێ بێڵێت، پاش فڕاندنی کەشتیی ئەخیلی لاورۆ، یەکسەر بەرەو بەغدا بەڕێ کەوت. ئەمە دوابەدوای بەکارهێنانی چەکی کیمیایی هات لە لایەن عێراقەوە و ئاگادارکردنەوەی زیادی ئێمە کەوا سەدام حسێن نەک هەر تەنها هەوڵی "کارێکی سەربازی" دەدا دژ بە ئیسرائیل، بەڵکو بە دوای بونیادنانی مەکینەیەکی سەربازیی زاڵ و باڵادەستی ناوچەکەدا دەگەڕا، کە

به تەنها ترسی لە ئێران لێک نەدەدرایەوە. من هاتم جارێکی تر عێراقم بە یەکێک لە دەوڵەتە دوژمنەکان لەقەڵەم دا لە بەرانبەر بەرپرسیارێتیی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا. ئەمە ئەو ڕەوشە بوو کە ئێمە بۆی دەگەڕاین، لە کتێبێکی قۆناغی گواستنەوەدا کە بۆ وەزارەتی دەرەوە ئامادەمان دەکرد وەک دەسپێکی کاری بەڕێوەبەرێتیی بوش و بۆ ئەوەی سیاسەتێکی نوێ و توندتر لە ئاست عێراقی سەدام حسێندا پەیڕەوی بکات کە لەو دەمەدا لەبار و گونجاو بوو.(٣٢)

باس و گێڕانەوەی شوولز مۆرکێکی ڕیڤیژنیزمی پێوەیە (هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری، و). خوێندنەوەیەکی جیاواز دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە بێت: شوولز و هاوکارەکانی لە ماوەی جەنگی عێراق ـ ئێراندا پاکانەیان بۆ عێراق دەکرد و پاساویان بۆ دەهێنایەوە، نەک لەبەر ئەوەی پێدەچوو چاک بێت و ڕیفۆرم بکات، چونکە هەرگیز ئەو بەڵگەیەی نەداوە بە دەستەوە ــ بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە عێراق ڕۆڵێکی بەکەڵکی دەبینی بۆ بەردەوامیپێدانی هاوسەنگیی هێز لە کەنداودا. لای کەمەکەی شوولز لە پایزی ساڵی ١٩٨٣وە دەیزانی کە عێراق چەکی کیمیایی بە کار دێنێت ــ نەک دوو ساڵ دواتر وەک لە کتێبەکەیدا ئیدیعای دەکات ــ کاتێک کە تیشک دەخاتە سەر گرنگیی چەکی کیمیایی لە بەرەنگاربوونەوەی هێرشەکانی شەپۆلە مرۆڤی ئێراندا. ئیدارەی ڕیگان هەر چەندە نیگەران بوو لە پەرەسەندن و تەشەنەکردنی چەکی کیمیایی، بەڵام بە هەڕەشەیەکی کەمتری دادەنا لەچاو سیاسەتی فراوانخوازیی ئێراندا و بەوپێیە چاوی خستبووە سەر بەکارهێنانی بەردەوامی گاز لە لایەن عێراقەوە، چونکە بە تایبەتی

تەمـاداری قەنـاعەتپێکردنی ئێران بـوو تـاوەکو بە ئاگربەسـت قایل بێت. کاتێک کە جەنگ تەواو بوو، شوولْز دەیتوانی ئەوە بڵێت کە ڕەنگە بە درێژایی وەخـت بیـری لـێ کـردبێتەوە کەوا گازبـارانی کوردەکـان کـارێکی "قێـزەون و بێپاسـاو بـوو... هەروەها بیرخستنەوەیەکی ترسـناکی ئەو هەڕەشـانەش بـوو کە تەشەنەکردنی چەکی کیمیایی دەیکەیاند"[٣٣].

ئەمـانە وشـەگەلێکی بەهێـز بـوون، ئەگەرچـی تەنهـا لە یاداشتێکی ناوخۆدا گوزارشتیان لێوە کرابوو. بەڵام خۆ دوو مانگێک پێشـتر واشـنتۆن لەو بـڕوایەدا بـوو کە بەکارهێنـانی چەکی کیمیایی عێراق پاساوی هەبوو (نەک قێزەون بێت) و بواری بەردەوامبوونیشی پێ دابوو. پاشـان شـتەکان گۆڕان و ئێسـتا ڕێـگە بە عێـراق دراوە ئەوە بسـەلمێنێت کە بەکـارهێنەران و پەرەپێـدەرانی گـازی ژەهـراوی چ چەکێکـی بەهێز و ترسـناک بێننە ئاراوە. وەک لێکۆڵەرێکی (سـی ئـای ئەی) بـۆی دەچێـت کەوا "عێراقییەکـان کـاریگەریی چەکـی کیمیاییـان لە مەیـدانی شـەڕدا سـەلماندووە، بە تـایبەتی ئەو کـاریگەرییە نەگەتـیڤەی لەسـەر ورەی دوژمـن... بەکـاربردنی سـەرکەوتنی عێـراق بە خسـتنەگەڕی چەکـی کیمیـایی لە مەیـدانی شـەڕی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا لە مەودا و بـازنەی ئەو نـاوچەیە دەرچـوو بەرەو ئەودوای شـوێنەکانی دنیـا"[٣٤].

کەواتە چـۆن کـاریگەرییەکی سـەلمێنراو دەگێـڕێتە دواوە و جڵەوی دەکەیت؟ وەڵامەکەی ڕوون نەبوو، ئەگەرچی شوولْز لەم کاتەدا بانگەشەی ئەوەی بۆ دەکرد کە "بەرژەوەندییەکی بـاڵاتری" تێدایە ئەگەر وا بکرێت[٣٥]، بەڵام تـا ڕادەیەک ڕێگە لە زیانگەیانـدن بگیرێـت بە پەیوەنـدییەکانی ویـلایەتە یەککگرتووەکـان لەگەڵ عێراق و ئەودوای جیهـانی عەرەبدا و

تـا ڕادەیەکـیش لەبەر ئەوەیە کە چاوپۆشـی و نەرمیـی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان زیـانی ڕاسـتەقینەی بـۆ بەرژەوەندییەکانی خـۆی پێـک هێنـاوە. لە کۆبـوونەوەیەکی هەفـتەی سـێیەمی ئەیلوولـدا، لەگەڵ بـاڵیۆزانی کۆمکـاری عەرەبـدا (کە پێـدەچوو واقیـان وڕمابێـت)، گەورە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە ئەم دۆخە نوێیە لەناکاوەی واشنتۆنیان ڕوون کردەوە:

"ویلایەتە یەکگرتووەکان دەمێکە بە گەرمی کار دەکات بۆ ئیحتیـواکردنی چەکـی ئەتـۆمی، بەڵام... ئەگەر لە هەنـدێک سـەرەوە چەکـی کیمیـایی بگریـت ترسـناکترە، چـونکە ژمـارەیەکی هێجگـار زۆری خەڵـک لە نـاو دەبـات و بە هەرزانیش بەرهەم دەهێنرێت و دەتوانرێت بشاردرێتەوە و لە لایەن تیرۆریسـتانەوە بە دەسـت بهێنرێت. بەم چەشـنە ئەمەریکـا پـێگە و هەڵوێسـتێکی تونـد وەردەگرێـت بـۆ بەکارهێنـانی قەنـاعەتی ئەخلاقـی لە بەربەسـتدانانی تەشەنەکردنیدا و پێویستە جیهان وا بڕوانێتە چەکی کیمیایی کە جێی ئیدانە و نەفرەتلێکردنە".[٣٦]

بەوپێیە ئیدارەی ڕیگـان، لە ڕۆژانـی بەرەو کۆتـایی چوونیدا، بڕیاری دا هەوڵ و کۆششی دووجاران بکاتەوە بۆ ئەنجامدانی قەدەغەیەکی نێودەوڵەتی لەسەر چەکی کیمیایی. ئەنجـامێکی ئەوە کۆنفرانسـی پـاریس بـوو لەسـەر قەدەغەکردنـی چەکـی کیمیـایی، سـازدانی سـەکۆیەکی بەرفراوان بۆ گفتوگۆکردن لە بارەی تەشـەنەکردنی چەکی کیمیاییەوە لە کانوونی دووەمـی سـاڵی ١٩٨٩دا. ئەنجامێکی تـر پەیماننـامەی چەکـی کیمیـایی بـوو، کە قەدەغەکردنێکـی گشـتگیر بـوو لەسـەر بەرهەمهێنـان و هەڵگرتن و بازرگـانی

پێوەکردن و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کە لە لایەن ئیدارە یەک لە دوای یەکەکانی ئەمەریکاوە گفتوگۆی لەسەر دەکرا و لە ساڵی ١٩٩٣دا تەواو بوو. هیچ کام لەم هەوڵ و تەقەلایانە بە تەواوی عێراقی نەوەستاند و ئەوەی کە کۆتایی بە پەرەپێدانی کیمیایی و چەکی تری کوشندەی ئەو وڵاتە هێنا، بڕیارە گەوجانەکەی داگیرکردنی کوەیت بوو، کە دەرپەڕاندنی لەوێ بە دوادا هات و ئەنجام تێکشکاندنی عەمباری کیمیایی و بایۆلۆجی و ئەتۆمیی لێ کەوتەوە، شانبەشانی مووشەکە بالستیکیەکانیشی. تەنانەت لە مارتی ١٩٩٠دا (سی ئای ئەی) هەڵسەنگاندنێکی شێنەیی و تۆکمەی کرد و گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەوا "ڕێککەوتننامەکانی چەشنی پرۆتۆکۆڵی جنێڤ، کە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی قەدەغە دەکەن، زەمانەتی ئەوە ناکەن دوژمنێک چەکی کیمیایی بە کار نەهێنێت" و زلهێزەکان "ناخوازن یان ناتوانن لێشاوی پێویستی یارمەتیی تەکنیکی و ئەو مەتریالانەی کیمیایی لێ دروست دەکرێت و کەرەستەی پرۆسێسەکردن بوەستێنن، یان ڕێگە لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بگرن لە جەنگدا یاخود بیوەستێنن".[٣٧]

لە دوادوایی ساڵی ١٩٨٨دا، واشنتۆن سەرباری ئەوەی کە شالاوی گەرموگوڕی نوێی دژ بە چەکی کیمیایی گەیاندبووە ئاستێکی جیهانی، بەڵام هێشتا هەر لەگەڵ ڕژێمی عێراقدا دەیکێڵا کە توانایەکی سەربازیی بەرچاوی هەبوو (بە توانای تەواوی چەکی کیمیایی، مووشەکی بالستیی مەودا ناوەنجی، پرۆگرامێکی چەکی بایۆلۆجیی پەرەپێدراو، لەگەڵ پرۆگرامێکی ئەتۆمی کە گومانی ئەوەی لەسەر بوو لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا بێت) و هیچ شتێک هاوسەنگیی

ڕانەدەگرت. لە هەمان کاتدا عێراق قەرزێکی هێجگار قەبەی سەردەمی جەنگی کەوتبووە سەر و دەمێک بوو نەخشەی بۆ ناوچەکانی کەنداو دەکێشا، نەک تەنها دوورگەکانی وەربە و بۆبیان، بەڵکو کوەیتیش ـ کە لە تێڕوانینی عێراقەوە پەلێکی تەواوکەری وڵاتی عێراق بوو و بە ناڕەوا لە لایەن هێزی کۆلۆنیالیی بەریتانیاوە لە عێراق دابڕا، پاش ڕووخانی ئیمپراتۆریێتی عوسمانی.

بە واتایەکی تر، عێراق ئەگەری مەترسیی پێک دەهێنا. کەواتە چاکتر نەبوو بۆ ئەمەریکا کە عێراقییەکان بکاتە لایەنگری خۆی؟ وەڵامەکەش "پەیماننامەیەکی بونیادنەر" بوو، کە ناونیشانێکی نوێ بوو بۆ هەمان هەوادارییە کۆنەکەی لە لایەن ئیدارەی ڕیگانەوە خرابووە گەڕ، کاتێ کە بێنەوبەرەی یاسای سزاکان کپ بووبووەوە و لە لایەن ئیدارەی بوشەوە لە ڕاسپاردەی ژمارە ٢٦ی بڕیاری ئاسایشی نەتەوەیی، لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٩دا بایەخی پێ درایەوە. سەرۆک جۆرج دەبلیو بوش و برێنت سکۆکرۆفتی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، دواتر نووسیبوویان ئەمە نەک تەنها "هەوڵێک بوو بۆ هاندانی ڕەفتاری نەرم و قبووڵکراو لە لایەن سەدام حسێنەوە، بەڵکو هیوایەکیش بوو بۆ زەمانەتکردنی ڕۆڵێکی بەرچاوی بیزنێسی ئەمەریکا لەوەی کە ئێمە وامان دانا ببێتە کۆششێکی بنەڕەتیی بونیادنانەوەی عێراق"[٣٨]. یاداشتێکی وەزارەتی دەرەوە لە ئەیلوولی ١٩٨٨دا وەبیرمان دێنێتەوە کە "ئەگەر مافی مرۆڤ و چەکی کیمیایی بخەینە لاوە، لە گەلێک ڕووەوە بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانمان هاوتەریبن لەگەڵ ئەوانەی عێراقدا". باشە ئەم بەرژەوەندییانە چی بوون؟

گەیشتنی بیزنێسی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ بازاڕی عێراق و بەکارهێنانێکی "بونیادنەرانەی" کاریگەریی عێراق لەسەر جیهانی عەرەب بە هاوکاریی میسر و ئوردن و سعودیە دژ بە سووریا و لیبیا لە کێشەی فەلەستین و مەسەلەکانی تردا. بە پێچەوانەوە، یاداشتەکە چەندین هۆکار دەخاتە ڕوو، لەوانە سزاکان "کەوا کاریگەرییەکی زۆر نێگەتیڤی هەیە لەسەر توانای کارکردنمان لە ڕژێمی عێراق و خستنەگەڕی کار و کاردانەوەیەکی سەرەولێژ کە لەوانەیە نە پێشبینیکراو بێت و نە کۆنترۆڵکراو". هەر چۆنێک بێت، یاداشتەکە دەپرسێت ئاخۆ سزاکان لە ئێستادا چ کارێکی باشی وا دەکات کە یاخیبوونی کورد کپ کرابێتەوە و بەوپێیە عێراق پێویستی بە پەنابردنی زیاتر نەبێت بۆ چەکی کیمیایی؟"[٣٩]

"پەیماننامەی بونیادنەر" ئەو کاتە کەوتە گەڕ کە پرۆژەیاسای سزاکان، ناوەڕاستی ئۆکتۆبەر، لە کۆنگرێسدا هەرەسی هێنا. لەمیانەی چەند ڕۆژێکدا باڵیۆز گلاسپی ڕاپۆرتی خۆی دا لەسەر خۆشحاڵیی عێراقییەکان بە کۆتایی ئەو سەرشۆڕییە ئاشکرایە و پێشنیازی ئەو ڕێگەیانەی کرد کە بە خێرایی "ڕووشاندنی ئەو پەیوەندییانەمان چاک دەکاتەوە کە بە هۆی پرۆژەیاسای سزاکانەوە دروست بووبوو،" لە گشتیشی گرنگتر بەرفراوانبوونی یارمەتیی دارایی هەناردە ــ هاوردە export – import"[٤٠]. بە واتایەکی تر بێجگە لە کەمکردنەوەی هەواداری و گریمانەی مامەڵەکردنێکی یەکسان بە حوکمی ئەوەی کە ئێستا جەنگ تەواو بووە و پەیماننامەی بونیادنەر هەواداریی بگۆڕێتە لایەنگرییەکی تەواو، وەک لە یارمەتیی مووشەکی زەمین بە زەمینی ئەمەریکادا دەرکەوت لە شێوەی قەرزی گەرەنتیی

یەک ملیـــار دۆلاردا، فرۆشـــتنی کـــاڵای دوو مەبەســـت لە بەکارهێنانـــدا (کە یـــارمەتیی عێراقـــی دا لە پەرەپێـــدانی بەرنامەکـــانی چەکـــی کیمیـــایی، بـــایۆلۆجی و ئەتۆمیـــدا) و هـاوردەی نەوتـی خـاوی عێراق بۆ ئەوەی لە سـاڵی ١٩٩٠دا بگـاتە ١,١ ملیـۆن بەرمیـل ڕۆژانە، واتە زیـاد لە چـواریەکی هەنـاردەی عێراق، کە بـایی ٣ ملیـار دۆلار بـوو. بەم داهـاتە زۆرەی پـارە، کە بەسـەریدا ڕژا، سـەدام تـوانیی عەمبـارێکی گەورە و گـران دروسـت بکـات ـــ بە بەرنـامەی چەکـی کیمیـــایی، بـــایۆلۆجی و ئەتـــۆمییەوە ـــ کە ویـــلایەتە یەکگرتووەکان ناچار بوو لە ساڵی ١٩٩١دا تێکی بشکێنێت و بە دوایدا کۆمیسیۆنی تـایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکانیش بۆ عێـــراق (یونســـکۆم UNSCOM) مانـــدێتی درایە بـــۆ لەناوبردنی.

جەختکردنەوەی شـوولز (لە سـەرەوە بـاس کـراوە) کەوا ئامۆژگـاریی ئیـدارەی بوشـی کـردووە (لە دەسـپێکی کـاری ئیدارەکەدا) بـۆ تونـدکردنی هەڵوێسـتی خـۆی لە دژی ڕژێـم زۆر بە توندی وەرناگیرێت. زەڵمـای خەلیلزاد، کە ئەندامێکی دەســـتەی پلانـــدانانی سیاســـەتی وەزارەتـــی دەرەوەیە و پشـتگیریی داشـکاندنی بەلای عێراقـدا دەکـرد لە سـەردەمی جەنگدا، لە پـایزی ١٩٨٨دا یاداشـتێکی نـاوخۆیی نووسـیوە و تێیـدا هۆشـداریی داوە کە عێـراق وەک هێزێکـی باڵادەسـتی سـەربازی لە کەنـداودا دەرکەوتـووە و دژ بە بەردەوامیـی داتاشینە بەلای عێراقدا ئاگاداری دەدات، لە بەرانبەر لاوازیی ئێرانـی دراوسـێدا. لە سـاڵی ١٩٩٣دا شـوولز لە کتێبەکەیـدا ڕاسـتیی ئەم یاداشـتە دەسـەلمێنێت، بەڵام بەپێـی قسـەی خەلیلـــزاد (لە چـــاوپێکەوتنێکی ســـاڵی ٢٠٠١دا)، لە ســـاڵی

١٩٨٨دا و کاتێک یاداشتەکە دزەی کردبوو بۆ میدیا، وەک کارێکی دەسپێشخەریی سەر بە ئێران، شوولْز خەلیلزادی بانگ کردبوو بۆ ئۆفیسەکەی و یاداشتەکەی بۆ خوێندبووەوە، پاشان وشەی "نەخێری" بە پیتی درشت دابوو بەسەریدا.

سەرەڕای درککردن بە مەترسیی عێراق لە ڕووی باڵادەستیی سەربازی، نائومێدیی ئابووری و چاوتێبڕینی ئاشکرای لە ناوچەکە، شوولْز بەرگری لە بەردەوامبوونی مەیلداری بەلای عێراقدا دەکرد. وەک خەلیلزاد دەگێڕێتەوە کەوا کاربەدەستە سەرەکییەکانی وەزارەتی دەرەوە، وەک ڕیچارد هاس، ڕیچارد ئەرمیتاج و ڕیچارد مێرفی باسیان لەوە کردووە کە سەدام حسێن گۆڕاوە و پاش هەشت ساڵی جەنگ ئیتر جارێکی تر پەلاماری دراوسێکانی نادات و بە دڵنیاییەوە هیچ شتێک لەگەڵ ئەو دۆستانەیدا ناکات کە بە درێژایی ماوەی جەنگ پشتگیرییان لێ کردووە. لەبری ئەوە دەبوو سەدام بچوایە بەلای بیناکردنەوەی وڵاتەکەیەوە و ویلایەتە یەکگرتووەکانیش پارچەیەکی گرنگی کێکەکەی دەست بکەوتایە. ئەگەر عێراق بە ڕاستی وەک هێزێکی باڵادەست لە کەنداودا دەرکەوتبوو، ئەوە واشنتۆن دەبوو کاری لەگەڵ بکردایە و بە دوای کاریگەریی ئەودا بگەڕایە. "یاداشتەکەی من ڕەت کرایەوە و ویلایەتە یەکگرتووەکان بەردەوام بوو لەسەر داتاشینی بەلای سەدام حسێندا"، ئەمە خەلیلزاد دەیڵێت، کە لەگەڵ تەواوبوونی ئیدارەی ڕیگاندا حکومەتی بە جێ هێشت، بەڵام بیست مانگ دوای ئەوە و کاتێک عێراق کوەیتی داگیر کرد، بە پەلە هێنایانەوە وەک داکۆکیکار و پاکانەیەکی شەخسی.

## میراتی کیمیایی

عێراقییەکان بە ناچاری سەرشۆڕیی ئاشکرایان قووت دا و هەڕەشەی سزادانی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان کەوتە سەر بۆ ئەو کار و کردەوەیەی واشنتۆن چاوپۆشیی لێ دەکردن، ئەگەر نەڵێین هانیشی دەدان و بەمە ڕەنگە بەهانەیەکیان هەبێت کەوا هەست بکەن خیانەتیان لەگەڵ کراوە. لە چاوپێکەوتنێکی ئۆکتۆبەری ١٩٨٨دا، تاریق عەزیز جەخت لە ڕاگەیاندنێک دەکاتەوە کە پێشتر دەربڕیوە کەوا عێراق چەکی کیمیایی لە دژی ئێران بە کار هێناوە، بەڵام بە پێداگیرییەوە حاشا لە بەکارهێنانی گاز دەکات دژ بە کوردەکان و لەم ڕووەوە دەڵێت کەس تەنانەت "بچووکترین بەڵگەی بە دەستەوە نییە پشتگیریی ئەم ئیدیعایە بکات و ناتوانن تەنانەت کوشتنی چۆلەکەیەکیش بە گاز بسەلمێنن". پاشان، لە قسەکردنێکدا لەسەر دابینکەرە ئەورووپاییەکانی گەنجینەی کیمیایی عێراق (ڕەنگە لێرەدا نەیویستبێت زیاتر ئەمەریکییەکان توورە بکات)، دەڵێت: "ئەوان ئەم چەکانەیان پێ فرۆشتین و ئێستاش فرمێسکی تیمساحی بۆ دەڕێژن. بێگومان ئەورووپاییەکان دووڕوون و هەر چەکێکت گەرەک بێت، پێت دەفرۆشن".[٤١]

عەدنان خێروڵڵای وەزیری بەرگری، تەنانەت لەوە زیاتریش ڕۆیشت و یەکەم جار وێنەی هاوشێوەیەکی

لــۆجیکیی کێشــا لە نێــوان ئەو هەڕەشـــەیەی کە عێــراق بەرەوڕووی بووبووەوە بە هۆی هێرشەکانی شـەپۆلەمرۆڤی ئێرانەوە و هەڕەشـە و مەترسیی زیانی گیانیی بەکۆمەڵ لە مــاوەی جەنگــی جیهــانیی دووەمــدا کاتێــک کە ویــلایەتە یەکگرتووەکـان بڕیـاری دا بـۆمبی ئەتـۆمی بە کـار بێنێت و دەیپرسی:

"بــۆچی ســـیناتۆری ئەمەریکـــی (کلەیبــۆرن پێــڵ) لە حکـومەتەکەی ناپرسـێت ئـاخۆ لەبەرچـی بـۆمبی ئەتـۆمی بەردایەوە بەسـەر دوو شـاری بێتاوانـدا بە ژن و منـداڵ و پیریەوە؟" پاشان لە بارەی ڤیێتنامەوە دەیگوت "پێش ئەوەی سیناتۆری ئەمەریکی عێراق تاوانبار بکات و هاتوهاوارێکی میدیای لە دژ بەرپا بکات، بێ هیچ بەڵگەیەک، ئایا تۆ لەگەڵ من نایسـەلمێنیت کە ویلایەتە یەکگرتووەکان یەکەم دەوڵەت بـــووە کەوا گـــازی زۆر بەرفراوانـــی بە کـــار هێنـــاوە لە ڤیێتنامدا؟"[٤٢].

ئەو متمانەیە هەر چییەک بووبێت، کە حوکمی پەیوەندیی واشنتۆنی بە بەغداوە کردووە ــ بە گەڕانەوە بۆ دیپلۆماتە ئەمەریکییەکـان و ئەفســەرانی سـوپا و موخـابەرات لە پـاش یەکەم خیـانەت کە ئێـران ــ کۆنترا بـوو، ئێسـتا وادیـارە بە تەواوی تێکچووە. سەرکردایەتیی عێراق خۆی وا دەبینی کە هاوبەشێکی بچووکە لە پەیوەندییەکی سارد و گەرمدا و بە کەیف و ئارەزووی زلهێزان کێشمانکێشی پێ دەکرێت و تـا ڕادەیەکـی زۆر کەرامەتـی ڕووشـاوە و وەک خـودی سـەدام حســێن خــۆی دوو ســـاڵ لەوەودوا بــۆ خــانمی گلاســـپیی بـاڵیۆزی دەربـڕی کەوا عێـراق بەرژەوەنـدییەکانی ویـلایەتە یەکگرتووەکـــانی لە کەنـــداودا پاراســـتووە و نەیهێشـــتووە

ڕەوەفارســـی شــیعەمەزهەب ســـعودیە و وڵاتــانی کەنــداو ڕابماڵێـت و قوربـانییەکی بێئامـانی لەو پێنـاوەدا داوە ("ئـێمە چەنـدین ڕووبـاری خوێنمـان داوە"). ئەوجـا بیـری گلاسـپیی خستەوە کەوا "ئێـوە ئەوە نین لە سـەردەمی جەنگی ئێرانـدا دۆســـتەکانتان پاراســـتبێت، مـــن دڵنیـــات دەکەمەوە، ئەگەر ئێرانییەکان ناوچەکەیان ڕاماڵیبـایە، ئەوە هێزەکـانی ئەمەریکـا نەیاندەوەستاندن، مەگەر چەکی ئەتۆمییان بە کار بهێنایە"[٤٣]. وەک خەلاتیش کێشـایان بە مەچەکی عێراقدا و (هەڕەشـەی خراپتریشـــی لــێ کــرا) لەســـەر سیاســەتێک کە تەواوکەری سەرکەوتنی بوو لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکادا. ئەوە گرنـگ نەبـوو بەلای عێراقییەکـانەوە کەوا کــێ ئەمەی بەوپەڕی دزێوی و ناڕەوایی دەبینی.

ئــا لێــرەوە تــۆوی نــاکۆکی و ململانێــی دواتــر کەوتە مەسەلەکەوە. ڕاستییەکەی دەتوانی هێڵی نێوان دروستبوونی بێمتمانەیی لە پەیوەندیی نێوان ئەمەریکا ــ عێراق، لە ساڵی ١٩٨٦ەوە و لە کێشــەی ئێـران ــ کۆنترادا بـدۆزیتەوە، کە لە ســـاڵی ١٩٨٨یشـــدا بە (ڕەخـــنە و سەرزەنشـــتی ئاشـــکرا و یاسـای سـزاکانی ئـابلۆوقە) پاڵپشـتی کـرا، هاوزەمـان لەگەڵ بڕیـــارەکەی ســـەدام حســـێندا بە داگیرکردنـــی کوەیـــت. لە تەمووزی ١٩٩٠دا، ڕژێم واچووبووە ئەقڵیەوە کە ئەمەریکا بە شێوەیەک لە شێوەکان جەنگ لەدژی عێراق بەرپا دەکات، بەلام بریکارەکانی خۆی لە کەنداودا بەکاردێنێت و بەتایبەتی کوەیت و ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی. ئەم دەوڵەتانە نرخی نەوتیـان لە کاتێکدا هێنـابووە خـوارەوە کە عێـراق دەیویست بێـتەوە ســەرخۆی و چارەســەری زامەکـانی دوای جەنگــی بکات و قەرزارییەکی هێجگار قەبەی ئەم دەوڵەتە چونیەکانە

رووی تێکردبوو، لەولاشەوە ئەمەریکا نەیدەوەستاندن. سەرۆکی عێراق بە گلاسپیی گوتبوو "ئێمە لەوە دەگەین کە ئەمەریکا دەڵێت کەوا لە دۆستایەتیی دەوڵەتانی ناوچەکە دەگەڕێت و پشتگیریی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان دەکات، بەڵام ناتوانین لەو هەوڵ و تەقەلایە بگەین کە لە هاندانی هەندێک لایەندا دەی دات بۆ ئەوەی زیان بگەیەنە بەرژەوەندییەکانی عێراق".

کاتێ گلاسپی نیگەرانیی ئەوەی دەربڕی کە عێراق خەریکە خۆی کۆ دەکاتەوە بۆ داگیرکردنی کوەیت، سەدام زۆر بە ڕاشکاوانە وەڵامی دایەوە و ویلایەتە یەکگرتووەکانی بەوە تۆمەتبار کرد کە هانی کوەیتییەکان دەدەن: "ئەوەی ئێمە پرسیاری دەکەین دەربڕینی ڕاوبۆچوونت نییە (لە بارەی پەرەسەندنی گەرمی دۆخەکەوە لە کەنداودا) بە شێوەیەک کە وا لە دەسدرێژیکارێک بکات (کوەیت بۆ نموونە) باوەڕ بێنێت بەوەی کە پشتگیریی بە دەست دێنێت لە دەستدرێژیکارییەکەیدا". ئیتر ئەوەی دوای مەسەلەکە مێژووە و گلاسپی بە سەرۆکی عێراقی گوتبوو کەوا گرژی و ئاڵۆزی لە نێوان عێراق و کوەیتدا مەسەلەی ئەوان و دەوڵەتە عەرەبییەکانی ترە و چارەسەری بکەن ("ئێمە هیچ پەیوەندییەکمان نییە بە ناکۆکی و ململانێی عەرەب خۆیانەوە، وەک ڕێکنەکەوتنی ئێوە و کوەیت لەسەر سنوور"). کاتێک عێراق دەستی لە بنی هەمانەکەوە دەرچوو و نەیتوانی ئەو ئیمتیازە ئابوورییەی لە وڵاتانی کەنداوی دەویست بهێنێتە دی، هێزەکانی پەلاماری ئەو شێخنشینەی کەنداویان دا و یەکەم قەیرانی نێودەوڵەتییان بەرپا کرد لە دوای جەنگی ساردی جیهانییەوە. بە ئاوڕدانەوەیەک بۆ

تۆمـاری واشـنتۆن، سـەدام حسـێن پێـدەچێت متمـانەی بە ویـلایەتە یەکگرتووەکـان نەکردبێـت کاتێـک بێتـاوانیی خـۆی دەربڕی (گلاسـپی: "سـەرۆک بـوش پیـاوێکی وریـا و ئـاقڵە و ناچێـت جەنگێکـی ئـابووری لە دژی عێـراق ڕابگەیەنێـت") و تەنـانەت ئارەزووشـی پیشـان دا کە پەیوەنـدییەکی بەهێزتـر لەگەڵ عیراقییەکانـدا دابڕێژێـت (گلاسـپی: "مـن ڕاسـپاردەی ڕاستەوخۆم لە سـەرۆکەوە پێیە بۆ گەلاڵەکردنی پەیوەندیی باشـــتر"). ئەگەر واشـــنتۆن بە ئەنقەســـت عێراقییەکـــانی نەگوشـــیبێت، لەبەر ئەو هۆیـــانە بـــوو کە ڕاســـتەوخۆ پەیوەندییان بە سیاسەتی ڕابردوویەوە هەبوو.

مەسـەلەی کیمیـایی کە مـاوەی دوو سـاڵ بـوو لە بیـر چووبـــووەوە، لە دوای داگیرکردنـــی کوەیـــت بەرۆکـــی واشـنتۆنی گـرتەوە، کاتێـک کە پلانـدانەرانی جەنـگ لەناکـاو درکیـان بەوە کـرد ڕەنگە کێشـەیەکیان تـووش بێت، ئەویـش ئەوە بـوو کە لەوانەیە عێـراق گـازی ژەهـراوی و (پێـدەچێت تەنانەت شەڕی میکرۆبیش بێنێتە ئـاراوە) و دژ بە هێزەکانی ئەمەریکـای بە کـار بێنێـت کە بـۆ ڕزگـارکردنی کوەیـت هـاتبوون. لێکـۆڵەرەوان بە کـارکردنی سـەرومڕ کۆمەڵێـک مەزەندە و هەڵسەنگاندنیان گەلاڵە کردبوو لەسـەر تواناکانی عێـراق و سـەبارەت بە چەکـی کۆکـوژ و ئەمەی خـوارەوە دەرەنجامی کارکردنیان بوو:

((• "لە کۆتـایی جەنگدا (لەگەڵ ئێـران) عێـراق توانـایەکی چەکی کیمیـایی گەورە و بەهێز و ئـاڵۆزی پەرە پێ داوە کە بە تەواوی لەگەڵ سیستەمە سـەربازییەکەیدا یەکـانگیر بـووە. چەکـی کیمیـایی عێـراق ڕۆڵێکـی بایەخـدار، (ئەگەر نەشـڵێین یەکلایـیکەرەوەی) گێـڕاوە لە شـــەڕە لوتکەکـــانی بەهـــاری

١٩٨٨دا كە لە كۆتاييدا ئێرانی ناچار كرد بە ئاگربەست قايل بێت. هەروەها عێراق بەرنامەيەكی پەرەپێدانی چەكی بايۆلۆجيی دوژمنكارانەی هەيە و برێكی زۆر و بەرفراوان هۆكاری تەكنيكيی بڵاوكردنەوەی چەكی كيميايی پەرەپێدراو و تاقيكراوەی مەيدانی شەڕی هەيە، بە شێوەيەكی سەرەكی تۆپ و ڕۆكێت و بۆمب. هەروەها ژمارەيەك كڵاوەی مووشەكی بالستيكی بەرهەم هێناوە كە پڕ كراون لە توخمی كيميايی و پێدەچێت بايۆلۆجييش، بەڵام ئەم سيستەمە ستراتيجييانەی بڵاوكردنەوە لە شەڕدا تاقی نەكراونەتەوە"[٤٤].

• ئەو ماددە كيمياييانەی لە كۆگا و عەمبارەكانی عێراقدان ئەمانەن: گازی خەردەل، سارين، تابوون، سايكلۆسارين (GF) و پێدەچێت سيانيدی هايدرۆجين و فۆسجينيش. هەروەها "ئەگەری" ئەوەش هەيە كە عێراق برێكی كەم ڤی ئێكسی VX[٤٥] بەرهەم هێنابێت و كردبێتی بە چەك. لە كۆتايی جەنگدا عێراق "توانای بەرهەمهێنانی ساڵانە نزيكەی هەزار تەن توخمی كيميايی دەمار و بلَق دروستكەری بووە لە هەر يەكێكيان"[٤٦]. بە هەمان شێوە چەكی كيميايی "دوو توخم ــ مزدوج"يشی بەرهەم هێناوە، كە توخمە كيمياييەكان لە ناو تەقەمەنيدا جيا دەكاتەوە و بەمە كێشەی لێچوونی ژەهراوی لە كاتی هەڵگرتندا چارەسەر دەكات. بێجگە لەوەش عێراق بنەمای پەرەپێدانی ئەو مەتيرياڵە كيمياييەی دارشتووە كە ماددەی تری كيميايی لێ دروست دەكرێت و بەمەش پشتبەستن بە دابينكاری بيانی كەم دەكاتەوە[٤٧].

• عێراق ژمارەیەک هۆکاری ڕشتن و بڵاوکردنەوەی چەکی کیمیایی هەیە، لەوانە لانیکەم ئەمانەن:

ـ فڕۆکەی باڵ چەسپ، (بۆمبی ٢٥٠ کیلۆگرام و ٥٠٠ کیلۆگرام، بەرمیلی ٥٥ گالۆنی).

ـ هێلیکۆپتەر، (تانکیی پرژاندن یان بە سپرای کردنی ١٠٠٠ لیتری، ڕۆکێتی ٩٠ ملیمی ئاسمان بۆ زەوی).

ـ تۆپی هاوەنی ٨٢ ملیم و ١٢٠ ملیم (هەر یەکەیان بە گوللەی ١ ـ ٣ کیلۆگرامەوە).

ـ تۆپی هویتزەر (دیتۆ)ی ١٢٢ ملیم، ١٣٠ ملیم، ١٥٢ ملیم، ١٥٥ ملیم.

ـ ڕۆکێتی ١٢٢ ملیم (بە کڵاوەی جەنگیی ٨ کیلۆگرامەوە)[٤٨].

لە بارەی چەکی بایۆلۆجییشەوە: "باوەڕمان وایە عێراق ئێستا چەکی بایۆلۆجیی پەرە پێ داوە و وەک یەدەک هەڵی گرتووە" و دوو تۆخمی بایۆلۆجیی بەرهەم هێناوە: بۆتیولینەم botulinum (ژەهرێکە هێرش دەباتە سەر کۆئەندامی دەمار) و ئەنتراکس anthrax (کە دەبێتە هۆی لەکارکەوتنی سییەکان)[٤٩].

• هەروەها باوەڕ وایە کە عێراق بەرنامەیەکی لێکۆڵینەوە و پەرەپێدانی ئەتۆمیی هەبێت[٥٠])).

ئەو لێکۆڵینەوە سەربەخۆیانەی پاش ئابی ١٩٩٠ ئەنجام دران، ئەوە پیشان دەدەن کەوا حکومەت و کۆمپانیاکانی ڕۆژئاوا، بە ویلایەتە یەکگرتووەکانیشەوە، بووبوون بە یارمەتیدەر و ئاسانکاری پەیداکردنی پارە و مەتیریاڵ بۆ بەرنامەکانی پەرەپێدانی چەکی کۆکوژی عێراق بە درێژایی ساڵانی هەشتاکان و تا داگیرکردنی کوەیت. ئەوەی لەم

لێکۆڵینەوانە دەرکەوتووە، کە پیشانی ژمارەیەکی بەرفراوانی ئامادەبوو دراون لە کۆمەڵە نووسینێکی چڕوپڕدا[٥١]، وێنەیەکی ترسناکی وڵاتێکە کە تا بیناقاقا، خۆی پڕچەک کردووە لەبەر ئەوەی بە ئاسانی توانیویەتی لەسەر خوایشتی خۆی هەقەکەی بدات. ناوەڕۆکی سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵانی هەشتاکاندا، ئەوەیە کە یارمەتیدەر بووە لە دروستکردنی زلەحۆرتەیەک لە ناوچەکەدا و لە وڵاتێکدا کە دیکتاتۆرێکی کەمبایەخ لە زەمانێکدا حوکمی دەکرد، لە دەوڵەتێکدا کە تواناکانی سامناک و تۆقێنەر بوون، خولیاکانی سەرشێتانە بوون، پێویستییەکانی دڵگەرمانە بوون و سەرکردەیەک کە تێگەیشتنی بۆ ئەمەریکا و چۆنێتیی کارکردنی سنووردار بێت. ئەو تێگەیشتنەش هێند سنووردار بوو، کە لە ڕاستیدا، سەدام نەیتوانی پەی بە کاردانەوەی واشنتۆن ببات لە ئاست بڕیاری گرتنی کوەیتدا.

کاتێک عێراق و ویلایەتە یەکگرتووەکان لە مانگەکانی دوای گرتنی کوەیتدا بەرانبەر بە یەکتر وەستانەوە، سوپای ئەمەریکا تەواوی ئامادەباشیی پێویستی بەرگریی کیمیایی وەرگرت. جەنەراڵ بێرنارد ترێنەر، کە فەرماندەیەکی خانەنشینی فەیلەقی مارینز و لە جەنگی کەنداودا بەشداربوو، بۆ تەلەڤیزیۆنی ABC باس دەکات (بەپێی پەیوەندییەکی ئیمێڵ لە ساڵی ٢٠٠٠دا) "ئاخۆ تۆپخانەی عێراق (کە ژمارەیەکی زۆری تۆپخانە هەبوو) چەکی کیمیاییان هاوێشتووە، کە لە لای سەرەوەی لیستی ئامانجەکانی هاوپەیمانان بوو". دواجار واشنتۆن هەڕەشەیەکی تایبەتی گەیاند کەوا ڕەنگە چەکی ئەتۆمی

بەکاربانێت، ئەگەر هات و عێراق پەنای بردە بەر چەکی کیمیایی یان بایۆلۆجی بە شێوەیەکی کاریگەرانە، بەڵام هیچ بەڵگەیەک نەبوو کە عێراق ئەو چەکانەی بە کار هێنابێت و خۆشبەختانە ئەمە ڕووی نەدا. هەڵوەشاندن و لەناوبردنی یەک لە دوای یەکی پرۆگرامەکانی چەکی کۆکوژی عێراق، زۆر دروست و سوودبەخش بوون و ئەوەی دەدا بە دەستەوە کە عێراقییەکان نەک ئەو چەکانەیان هەبوو، بەڵکو بە تەواوی و دوور لە پەشیمانی و ئازاری ویژدان ئەوەیان پیشان دەدا کە چۆن عەمباری تۆقێنەری کیمیاییان بە کار دەهێنا، لەوانە دژ بە خەڵکی مەدەنییش(٥٢).

ئەگەر و نەگەری توانای کیمیایی عێراق ڕۆڵی خۆی بینی، تەنانەت تا دوادوایی ساڵی ٢٠٠٣یش. لە ئامادەکاریدا بۆ داگیرکردنی عێراق لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە، مشتومڕی سەرەکیی ئەوە بوو کەوا کاربەدەستانی ئەمەریکا پێیان لەسەر لابردنی ڕژێم دادەگرت و بەپێی قسەی کاربەدەستێک لەم دانیشتنانەدا بووە (چاوپێکەوتنی ساڵی ٢٠٠٦)، ئەوە بوو کە سەدام حسێن نەک هەر چەکی کۆکوژی هەبوو، (کەوا کاربەدەستان بە ئاشکرا جاڕیان دەدا کە چەکی ئەتۆمە، بەڵام زۆر باش دەیانزانی تەنها چەکی کیمیاییە و ڕەنگە چەکی بایۆلۆجییش بووبێت)، بەڵکو کارامەش بوو لە بەکارهێنانیاندا، وەک لە سەروەختی جەنگی ئێران ـــ عێراقدا سەلمێنرا. ئەو خاڵەی ئەوان لەسەری وەستان ئەوە بوو کە عێراق بکەرێکی نادەوڵەتی نەبوو، چەشنی گرووپە ژاپۆنییەکەی ئۆن شیریکیۆ Aun Shirikyo کەوا گازی سارینیان کردە میترۆکەی تۆکیۆوە، بەڵکو دەوڵەتێکی نیشتمانییە کە زانیاری و توانا و ئەزموونی

ئەنجامــدانی بەرفراوانــی ئەو کــارەی هەیە. لە پشــتگیریی جەنگ بەڕێوەبردنی ئیدارە نوێیەکەی بوشدا، ئەم مشتومڕە بە تـایبەتی کـاریگەریی خـۆی سـەلماند بـۆ هۆشـکردنەوەی ئەوانەی لە گوماندا مابوونەوە.

"ئـێمە چەکە کۆکوژەکانمـان دۆزیـیەوە و تـاقیگە بایۆلۆجییەکانیشـمان دۆزیـیەوە. ئەمـانە نایاسـایی بـوون و دژ بە بڕیارەکـانی نەتەوە یەکگرتووەکـان بوون و ئێمە هەردووکیمان دۆزییەوە."

**سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان، جۆرج دەبلیو بوش**
**تەلەڤیزیۆنی پۆلەندی/CBS نیوز**
**٣١ی مایسی ٢٠٠٣**

"ئەوانە چەکـی کۆکـوژن. ئەوانە زیانبەخشـن بە مرۆڤایەتی و دۆزرانەوە."

(ئیشـارەتدان بە ٥٠٠ گـوللە و بـۆمبی کیمیـایی لە عێراق، کە تازە دۆزرابـوونەوە و هەڵوەشـێنرابوون و لە کار کەوتبوون.)

**دۆناڵد ڕامسفێلد، وەزیری بەرگریی ئەمەریکا**
**ئەسۆشیەیتد پرێس**
**٢٣ی حوزەیرانی ٢٠٠٦**

"ئـێمە دەزانـین کە ئەو چەکە کۆکـوژانەی هەیە و پسوولەکانیانمان دەست کەوتووە."

**مارک ڕەسڵی کلۆمیدی**
**ڕۆژنامەی ئینتەرناشناڵ هیراڵد تریبیۆن**
**٣١ی دیسەمبەری ٢٠٠٢**

## کورد و بووژانەوەی ناسیۆنالیزم

•

چەندین ساڵ دوای هەڵەبجە، ژیانی خەڵکی ئاسایی کورد ترس دایگرتبوو ـ ترس لە حکومەتێکی سەرکوتکەر کە بە توندی سزای هەر کەسێکی دەدا ملکەچی دەسەڵات و فەرمانەکانی نەبوایە (چونکە زۆر لە کوردەکان ملکەچ نەدەبوون). بە شێوەیەکی زۆر قووڵتریش ئەو ترسە هێند ڕاچڵەکێن بوو کە تەنها بە ناوبردنی تاقە دوو وشەی وەک: پەلاماری گاز! تەواوی شارەکان چۆڵیان دەکرد. بۆمببارانی کیمیایی هەڵەبجە بەو خەستییە، تۆقینێکی بەکۆمەڵی وای بەرپا کرد کەوا کەمە لێدانێکی کیمیایی لە ڕۆژانی دوای ئەوەدا بەس بوو بۆ ئەوەی دەسبەجێ ناوچەیەکی گەورە چۆڵ بکات، تەنانەت ئەگەر چەند کەسێکی کەمی دانیشتوانیش بەو گازە بمردنایە. ڕژێم بەم جۆرە کاری دەکرد و لە کاریگەریی تۆقاندنی چەکەکەی تێگەیشتبوو، بۆیە هەموو قۆناغێکی شالاوی ئەنفالی بەوە دەست پێ دەکرد. دەیان هەزار کەس بەم تاکتیکە لە ناو چوون و ئەمڕۆ بە پەرشوبڵاوی لە گۆڕی بەکۆمەڵدا و لە ژێر لمی بیابانەکانی ڕۆژئاوای عێراقدا ڕاکشاون، چاوەڕێی دۆزینەوە و گەڕانەوەن بۆ نیشتمانی خۆیان، بۆ ناسینەوەیان و بەخاکسپاردنی گونجاویان، بۆ ئەوەی مەسەلەکە بە تەواوی یەکلا ببێتەوە.

هێرشی هەڵەبجە ترسێکی بەردەوامی وای لە ناخی خەڵکدا چاند، کەوا کوردەکان نەیاندەزانی بە ڕاستی چۆن خۆیانی لێ ڕزگار بکەن. لە نیسانی ١٩٩١دا، پاش ئەوەی عێراقییەکان ڕاپەڕین و نارەزاییەکی سەرتاپاگیریان دژ بە ڕژێم بەرپا کرد، کە شکستخواردنی لە کوەیتدا لاوازی کردبوو و واتەواتی ئەوەی کە هێزەکانی عێراق ڕەنگە گازبارانی شارە کوردەکان بکەن، بوو بە هۆی بەکۆمەڵ هەڵاتنی خەڵک بۆ ئێران و تورکیا. سێ مانگ لەوەوپێش خەڵک لە سلێمانی باسیان لەوە دەکرد کە گوێیان لێ بووە عیزەت ئیبراهیم ئەلدوری، کەسی ژمارە دووی ڕژێم، ڕایگەیاندووە کە "ئەگەر ئێوە هەڵەبجەتان لە بیر چووە، من دەمەوێت ئەوەتان بیر بێنمەوە کە وادیارە ئامادەن بۆ دووبارەکردنەوەی ئۆپەراسیۆنەکە"[1]. لە ڕاستیدا ئەلدووری ئەم وشە تۆقێنەرانەی لە دەم دەرچووبێت یان نا، مەسەلەیەک نییە. جەمال عەزیز ئەمین، کە سەرکردەیەکی خەباتی نهێنیی (ی ن ک) بوو لە سلێمانی (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ١٩٩٩دا) دەیگوت "لە کاتی ڕاپەڕینەکەدا، هەموو ڕۆژێک من چاوەڕێی ئەوەم دەکرد عێراقییەکان بە چەکی کیمیایی هێرشمان بکەنە سەر". کاتێک کە هەڵچوونی خەڵک دامرکایەوە و تانک و زرێپۆش کەوتنە هاڕوهووڕ بەرەو باکوور و هێلیکۆپتەر دەسرێژی لە هەموو ئەوانە دەکرد کە دەجووڵان، یەکسەر هەڵەبجە وەک ئەگەرێک هاتە پێشەوە، کە ڕاستییەک بوو هاکا دووبارە بووەوە. ڕاپەڕینی کوردەکان بێ ئەوەی چاوەڕێ بکرێت لەناکاو هەرەسی هێنا و ڕەوکردنێکی بەکۆمەڵی بێوێنەی لێ کەوتەوە. وەک کۆمیسیۆنی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری

ئاوارەکـان لێکـی دەدایەوە، کەوا هەرگیـز پێشـتر جیهـان ئەم ژمـارە گەورەیەی خەڵکـی بە خـۆوە نەدیـوە ــ کە نـزیکەی ملیۆن و نیوێک خەڵک ـ لە چەند ڕۆژێکدا وڵاتەکەیـان بەجێ بێڵن.

دیسانەوە لە مارتی ٢٠٠٣دا، کە جەنگ لەوەدا بوو بەرپا بێت، کوردەکـان خێـرا شـارەکانیان چـۆڵ کـرد، لە ترسـی ئەوەی ڕژێـم چـی مـاوە لە عەمبـاری کیمیاییـدا دەیکـات بەسـەریاندا ــ پـاش دە سـاڵی چەکـداماڵین و سـەپاندنی سزاکان ـ لە تۆڵەی پشـتگیریی خیانەتکـارانەی داگیرکەراندا. وەک خەمـڵ و مەزەنـدەیەکی موخـابەراتی کە "دەنگوباسـی هێرشـی چەکی کیمیـایی بە فۆسـفۆری سـپی لەئـارادایە و بە خێرایـی بە نـاو خەڵکـی کـورددا لە هەولێـر و سـلێمانی بـڵاو بـووەتەوە. لە ئەنجـامی ئەوەشـدا سـەدان هەزار کـورد لەم دوو نـاوچەیە هەڵاتـوون و لە سـنووری عێراق پەڕیـونەتەوە بۆ تورکیا".[٢]

تەنهـا خۆدەربـازکردن دەیتـوانی ئەم تـرس و سـامە بەردەوامە بڕەوێنێتەوە. بەڵام تەنـانەت ئێسـتاش لە قـووڵایی نـاخ و نەسـتی کـورددا، ئەم ترسـە خـۆی مەڵاس داوە و یەکسانە لەگەڵ قەنـاعەتێکی نەگۆڕدا، کەوا هیـچ حکومەتێکی سێنترال یان ناوەندی هەرگیـز متمـانەی پێ ناکرێت کـارێکی ئاوهـا قێـزەون دووبـارە نەکـاتەوە. ئەمە یەک لەو هۆکـارانە بوو کە بۆچی سەرکردە کوردەکان هەر چی وزەیەکی پاش جەنگیـان هەبـوو خسـتیانە گەڕ لەپێنـاوی دروسـتکردنی پارێزگـارییەکی درێژخایەندا بـۆ گەلەکەیـان و لە ئەنجامـدانی ئەم کـارەدا هەوڵیـان دەدا تراجیـدیاکانی هەڵەبـجە و ئەنفـال بقۆزنەوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتـی ئاواتەخوازیـان. لە ڕووی

تەلارسازییەوە، مۆنۆمێنتی قوربانییانی هەڵەبجە لە دیوارە ڕەشەکانی ناوەوە دەردەکەوێت و ناوی کوژراوەکانی هەڵگرتووە و بەسەریەکەوە تاوەرێکی سەرکەوتنی لێ پێک هاتووە و ئاڵای کوردی لەسەر بەرز کراوەتەوە. (ئەمە وا بوو تا لە ١٦ی مارتی ٢٠٠٦دا، کە یادەوەریی ساڵانەی بوو، لە لایەن هەڵەبجەییەکان خۆیانەوە ئاگری تێبەردرا، چونکە خەڵکەکە لە کەمتەرخەمیی کاربەدەستان تووڕە بوون، هەروەها لە قۆستنەوە و بەکارهێنانی حیزبەکان بۆ ئەم کارەساتە نەتەوەییە لەپێناوی پەیداکردنی لایەنگردا و خەڵکی پایەبەرزی ولاتانیان لە گۆڕستانەکانەوە بۆ یادگارییەکە دەگواستەوە، بەڵام نەیاندەهێشت بچنە ناو شارەکە خۆی، یاخود نەخۆشخانەکانی یان خەڵکەکەیەوە و ژمارەیەکی زۆری ئەو کەسانەیان پەست و نیگەران دەکرد کە دیار بوو بە دەست ئەو نەخۆشییانەوە دەتلانەوە، کەوا دکتۆرەکان هۆکارەکەیان دەگێڕایەوە بۆ کاریگەریی درەنگوەختی گازی خەردەل).

بە هۆی قورسایی کوردەکانەوە لە نووسینەوەی ڕەشنووسی دەستوری هەمیشەیی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٥دا، هەڵەبجە و ئەنفال شوێنێکی شکۆداریان گرت لە فەرهەنگی دڕندەیی و ستەمکاریی ڕژێمی ڕووخاودا و لە دیباجەکەیدا ئیشارەتیان پێ دراوە و بەم جۆرە باس کراون: "کوشتارەکانی هەڵەبجە و بارزان و ئەنفال و کوردە فەیلییەکان". کوردەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەم کوشتارانە بۆ پەکخستنی هەوڵ و تەقەلای کۆڵنەدەرانەیان لەپێناوی ولاتەکەیاندا بەرپا کران[٣]. کەواتە ناتوانرێت لۆمەی کوردەکان بکرێت لەسەر ئەو خواستەیان بۆ دانانی

بەربەستێک لە پشت میراتی سەدەی بیستەمەوە ـــ کە چەرخێکی پڕ کارەساتی نەتەوەیی و نیشتمانی و خیانەتی چەندبارە بوو ـــ بۆ شوێنکەوتنی چارەسەرێکی یەکلاکەرەوەی کێشە و گرفتەکانی بارودۆخیان وەک میللەت. کوردەکان، لە ئەنجامی سەرنەگرتنی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییانْ لە پاش هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بوون بە ئامرازی دەستی زیاد لە گەمەکەرێکی بەهێز و گرفتاری زنجیرەیەک هەوڵ و ئەزموونی شکستخواردووی بەڵێن و ڕێککەوتننامە بوونەتەوە. دواترین زامنکاری ماف و سەلامەتیی کورد، کە ویلایەتە یەککگرتووەکانە، بەرەوڕووی هەمان ڕەخنە بووەتەوە کە بەرژەوەندیی کوردی بە هەند هەڵنەگرتووە، بەڵکو شوێن ئامانج و بەرژەوەندیی خۆی کەوتووە لەسەر حیسابی کورد، لە پاشخانی کۆمەڵێک پەیمان و بەڵێندا کە زۆر جار شکاون و نەبراونەتە سەر.

خیانەتە هەستپێکراوەکان ئەو سووکایەتییەن کە دەکرێنە زامەکانی شکست و تراجیدیا چەندبارەکانەوە و وەک ویرد و دۆعای بێنەوایان بەردەوام لەسەر زاری کوردەکانن، بەڵام لە دەرەوەی کوردستان شتێکی کەمیان لە بارەوە دەزانرێت. بەم ڕەنگە هەڵەبجە و ئەنفال تەنها لای شارەزا و پسپۆڕانی ناوچەکە بە باشی زانراوە و تەنانەت مێژووەکانیشیان بە زۆری لە بەرهەمی نووسراوەی خاو گەشەکردوودا شێوێنراوە و مەودا و قەبارەی ئازار و دەردەکانیان بە تەواوی جێی خۆیان نەگرتووە. نەتوانایی کۆمەڵی نێودەوڵەتی لە پەیبردن بە بایەخی ئەنفال و هەڵەبجە بۆ کورد بە شێوەیەک لە شێوەکان هاوتای

کورتهێنانە لە تێگەیشتنی ئەوەی کە چۆن ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر کاریان کردە سەر ئەقڵ و هۆشی ئەمەریکییەکان، یان هەر یەک لە جینۆسایدەکانی سەدەی بیستەم چەند وێرانکەر و ناخهەڵتەکێن بوو بۆ ئەوانەی کە لێی دەرباز بوون. شتێکی ئاسان نییە کە ئەنفال لە بیر بکەیت، پشتگوێی بخەیت یان نکووڵی لەوە بکەیت کە لە ڕاستیدا جینۆساید پێک دێنێت.

مەسەلەکە لە سۆزی قووڵی لەو چەشنە و تراومای نەتەوییەوە سەرچاوەی گرتووە، کەوا شوناسی تێدا دادەڕێژرێت و بەهێز دەبێت و هەندێک جاریش دەوڵەتی تێدا لە دایک دەبێت. ئەمانە بە دڵنیاییەوە ئەو فاکتەرانەن کە هەست و هۆشی کوردیان بەو ئاراستەیەدا بووژاندووەتەوە کە ئەمڕۆ بۆیان لەبارە. بەڵام بە دەسەڵاتی نوێی سیاسی و سەربازییان لە عێراقی دوای سەدام حسێندا، دەستیان کردووەتە فشاربردن بۆ بەدەستهێنانی (یان لە دیدی ئەوانەوە گێڕانەوەی) ئەو ناوچانەی وای لەقەڵەم دەدەن کە لە ڕووی مێژووییەوە هی کوردن و لەم کارەیاندا کەوتوونەتە پەلەقاژەیەکی زۆر و هاوبەشە سیاسییەکانیان دەڕەنجێنن و کۆمەڵگەکانی تر تووڕە و نیگەران دەکەن، کە لەم ناوچانەدا دەژین و هەوڵ و تەقەلایان زۆر بەرفراوان کردووە لە دۆخێکدا کە لە ڕووی ئابورییەوە بەردەوام پشتیان بە عێراق و دەوڵەتە دراوسێکان بەستووە. ئەوان بە شێوەیەکی تایبەتی چاویان بڕیوەتە کەرکووک و لە گرنگیی سامانە نەوتییەکەی گەیشتوون (کە نزیکەی ١٢%ی یەدەگی نەوتی عێراقی تێدایە)، لە داواکاریی سەربەخۆییاندا. ڕەتکردنەوەی سەرسەختانەیان بۆ چارەسەرێک کە مایەی

ڕەزامەنـدیی هەمـوو لایەک بێـت لە ڕێـگەی دانوسـتانەوە، یادەوەریی تراوماکانی جاران و پێویستبوون بە دابینکردنی پاشـەڕۆژێکی سـەلامەتتر بـۆ منداڵەکانیان هێناویێتیە ئاراوە. وەک ئەنجامێک، ململانێی مەدەنی و دەستتێوەردانی دەرەکی لە کەرکووکدا، بە تەمومژ کـار دەکـات و ئاسـۆیەکی تەڵخـی لێوە دەبینرێت و ڕەوتـی پەرەسـەندنی پێشـهاتەکان پێدەچێت هەموو دەسکەوتەکانی دەیەی ڕابردوو لەبار ببات و کـار بـۆ تەشەنەکردنی نائارامی و شەڕی ناوخۆ بکات لە عێراقدا.

ئەمڕۆ کوردستانی عێراق، پاش دابڕانێکی زۆر، خۆی بە جیهـانەوە گـرێ دەدات و گەلێـک لە لاوەکـانی زانیـاری و ئەزموون بە دەست دێنن و دەچنە سـەر بیروباوەڕی وا کە نـامۆیە بە نەوەی کـۆنی سـەردەمی شـەڕ و بەرگـری، کە هێشتا مایەی هەڕەشەیەکی ئەوتۆ نین. ئێمە هیواخـوازین بە هۆکار و ئامرازی دیموکراسی سەربکەون بۆ دروستبوون و گەلاڵەبـوونی سـەرکردایەتییەکی نـوێی وا بتوانێـت ئەو چارەسـەرانە بێنێتە ئـاراوە کەوا کۆمەڵگەی کورد پێویستی پێیـانە بـۆ مـانەوە و دەربـازبوون لە بـارودۆخی سـەخت و دژواری نـاوچەکە، بێ ئەوەی پارێزگـاری و گەرەنتـی بـخەنە لاوە، کەوا ئەنفـال و هەڵەبـجە کوردیـان فێـر کـرد بـێ ئەوە هیچیان پێ ناکرێت.

## ئێران و هەوڵ و تەقەللای ئەتۆم

ئەگەر ڕووداوەکانی سالانی هەشتاکان بۆ کورد گەیشتبنە تراجیدیایەک کەوا لە کۆتاییدا بوو بە هۆی گەشەکردن و بووژانەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی، ئەوە ئەزموونی ئێران جیاواز بوو و کاریگەری و ئەنجامێکی جیای لێ کەوتەوە. جەنگی 'داسەپاو' وای لە ئێرانییەکان کرد کە لە ناخەوە بتۆقن ـــ بەڵام ڕەنگە لە تۆقینی عێراقییەکان زیاتر نەبووبێت. ئەم جەنگە ئەو جەختکردنەوەیەی لەگەڵ خۆیدا هێنایە ئاراوە کەوا لە هەلومەرجی پێشێلکاری و دڕندەییدا هەر دوو وڵات وەک یەک بوون. ئێران ناتوانێت لافی مۆراڵێکی بەرز لێ بدات، بە تایبەتی دوای ساڵی ١٩٨٢، کاتێک کە داگیرکەرانی دەرپەڕاند و ئاگربەستی ڕەت کردەوە و بێمانا شەش ساڵ جەنگی درێژ کردەوە. بەڵام بە پێچەوانەی عێراقییەکانەوە، ئێرانییەکان هەستێکی قووڵیان لا دروست بوو کە هەڵەیان کردووە، لانیکەم لە مەسەلەی چەکی کیمیاییدا، بێجگە لەوەی کە بە ناهەق تەریک کران و بێزران، ئەگەر نەشڵێین خیانەتیان دەرهەق کرا، لە لایەن کۆمەڵگەیەکی نێودەوڵەتییەوە کە شانازیی بە پێوەر و بنەمای گشتگیر و جیهانیی خۆیەوە دەکرد، بەڵام کاتێک کە قوربانیی پێشێلکردنی سیستماتیکیی ئەم پێوەرانە لایەنە ناحەز و

دوژمنەکەی ئەم بوو، قڕوقەپی لێ کرد و بێدەنگ مایەوە. ئێران بە گازی ژەهراوی هەزاران کەسی لێ کوژرا، زۆری تریش ڕزگاری بوو، بەڵام تا دەهات تووشی نەخۆشی و بێهێزی دەبوو. لە کانوونی دووەمی ١٩٨٩دا، عەلی ئەکبەر ویلایەتیی وەزیری دەرەوەی ئێران لێدوانێکی سەرەکیی تەرخان کرد بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق و بە دەربڕینێکی تاڵەوە گوتی: "زیاد لە پەنجا هەزار ئێرانی تووشی برینی سەخت و مامناوەند بوون و نزیکەی لە سەدا دەی زامدارە ئێرانییەکان مردوون و ١٠ ـــ ٢٠%یان بە گازی خەردەل بووە و ١٠% بە هۆی سیانیدەوە و تۆخمە کیمیاییەکانی دەمارەگازەوە بووە و زیاد لە نیوەی مردووەکانیش خەڵکی سڤیل بوون"[٤]. ئامارێکی پزیشکیی ئێرانیی دواتر، سیوچوار هەزار دەربازبووی هێرشەکانی گازی خەردەلی دەسنیشان کردوە[٥]. ئێران دوو پەندی گرنگی لەم زنجیرە ڕووداوانە وەرگرت کە هەرگیز جارێکی تر ڕێگە بە خۆی نەدات لە ڕووی ستراتیجییەوە ئاوها لاواز بێت و بڕوا بە هیچ ڕێککەوتننامەیەکی فرەلایەن نەکات، تەنانەت ئەوانەشی کە خۆی تێیاندا بەشدارە. ئەو میراتەی کە بۆ ئەمڕۆ ماوەتەوە تۆڵەکردنەوەیەکە و یارمەتیدەرە لە هەڵگەڕانەوەی سیستەمی فرەلایەنی کۆنترۆڵی چەکدا.

کێشەی ئەتۆمیی ئیسرائیل ڕەنگە پریشکی بنەڕەتی بێت بۆ تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی چەکی کۆکوژ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڵام بەکارهێنانی گاز لە لایەن عێراقەوە لە سەردەمی جەنگدا، پاڵنەرێکی بەگوڕ و دینامیکیەتێکی نوێی دابە تەشەنەکردن و فراوانبوون. چەکی کیمیایی وەک کارێکی سوودبەخش و کاریگەر تەماشا دەکرا

و به تایبەتی کاتێک کە نەیارێک بەربەستێکی باڵادەست شکنابات چەشنی چەکی ئەتۆم، کە بتوانێت مەترسی لە خۆی دوور بخاتەوە یان ئەگەر بە هۆی بەکارهێنان یان هەڕەشەی تۆقاندنەوە شکستی هێنا. لە ساڵی ١٩٩٠دا، شەش وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گومانی ئەوەیان لێ دەکرا یان سەلمێنرابوو کە توانای شەڕ و چەکی کیمیاییان هەیە وەک: ئیسرائیل، میسر، عێراق، ئێران، سووریا و لیبیا[٦]. بێجگە لەوەش، ئێران دەستی کردووە بە بەرنامەیەکی ئەتۆمی کەوا ئەمڕۆ، بە هەموو ڕوخسارێکیەوە، سروشتی سەربازیی وەرگرتووە. "ئێوە دەبێت لەمەدا لۆمەی عێراقییەکان بکەن" ئەمە تێبینییەکی گیدیۆن گێرا بوو، کە سەرۆکی لێکۆڵینەوە بوو لە دەزگای هەواڵگریی مۆساددا ساڵانی ١٩٨٧ ـــ ١٩٨٨ (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا)، کە دەڵێت "پاش ئەوەی یونسکۆم بەرنامەی ئەتۆمیی عێراقی ئاشکرا کرد، ئێران دەستی کردە پەرەپێدانی چەکی ئەتۆمیی خۆی و نەیدەتوانی ئەوە قبووڵ بکات کە لایەنێکی لاواز بێت لە کەنداودا".

ڕێک وەک چۆن ئەزموونی جەنگی جیهانیی یەکەم، بوو بە هۆی ئەوەی پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێڤ بێتە ئاراوە، بەو جۆرە بەکارهێنانی گاز دژ بە سەربازانی مەیدانی شەڕ و خەڵکی مەدەنیی بێتاوان بە شێوەیەکی یەکسان هەوڵ و کۆششێکی پڕ جۆشوخرۆشی بەرپا کرد، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم کێشەیەدا کە ڕوو لە هەڵکشان بوو. هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانیش بە درەنگوەختەوە ئەم پێویستییەی سەلماند. لە ئەیلوولی ١٩٨٨دا، کاتێک کە عێراق بەرەوڕووی ئەگەری سزای ئابڵووقە بووەوە، کە لە

لایەن کۆنگریسەوە ڕەزامەندیی لەسەر دەربڕابوو، شیکردنەوەیەکی سەرەکیی وەزارەتی دەرەوە گەیشتە ئەم ئەنجامە:

"بەکارهێنانی عێراق بۆ چەکی کیمیایی لە ماوەی جەنگدا و شکستی کۆمەڵی نێودەوڵەتی لە خستنەگەڕی کاردانەوەیەکی کاریگەردا، مەسەلەی جڵەوگیریی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لاواز کرد و ڕەنگە ئاستێکی ڕەوایەتییشی بەخشیبێتە بەکارهێنانی ئەم چەکانە، چ لە ناوچەکەدا و چ لە شوێنانی تریش. هەروەها دەوڵەتانی تریشی هان دا بۆ بەدەستهێنانی توانای چەکی کیمیایی. بەم ڕەنگە تەشەنەکردنی تواناسازیی چەکی کیمیایی لە جیهاندا بوو بە مایەی هەڕەشەیەکی توند لە ئاسایشی جیهانی و بە تایبەتی بۆ دۆستەکانی ئەمەریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، وەک ئیسرائیل و عەرەبستانی سعودی و دەوڵەتە بچووکەکانی کەنداوی عەرەب. بە کورتی و لە ئەنجامی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە ماوەی جەنگی ئێران ــ عێراقدا، ڕاستگۆیی و کاریگەریی سیاسەتی جیهانیمان سەبارەت بە چەکی کیمیایی تووشی لاوازی بووە. کەوابوو پێویستە لەسەرمان پشتگیریی تەواوی سیاسەتی تەشەنەنەکردنی چەکی کیمیایی بکەین".[٧]

ئەگەر ئەم وشانە تەنها پێنج ساڵ لەمەوبەر بنووسرانایە، ئەوا دەیانتوانی کارێک بکەن بۆ خوڵقاندنی جیاوازییەکی ڕاستەقینە لە ژیانی عێراقی و ئێرانییەکاندا. یەکەم دەسپێشخەریی فرەلایەن بۆ کۆنترۆڵکردنی بڵاوبوونەوەی چەکی کیمیایی لە ساڵی ١٩٨٥دا لە لایەن حکومەتی ئوستralیاوە دەستی پێ کرد، کە دامەزراندنی دەزگایەکی

خۆبەخش بوو و بە گرووپی ئوستراليا دەناسرا بۆ ڕێکخستنی هەناردەی کیمیایی وڵاتە پیشەسازییەکان و قەدەغەکردنی فرۆشتنیان بە ئێران و عێراق. لە کاتێکدا کە ئەمە دەسپێشخەرییەکی گرنگ بوو، بەڵام کاریگەریی گرووپەکە بەرەوڕووی کێشەی توند بووەوە، وەک ئەوەی کە هەندێک باری کیمیایی بە هۆی گەندەڵی و کەمتەرخەمییەوە دیار نەماون. بێجگە لەوەش وڵاتانی دەرەوەی گرووپەکە وەک یەک پابەندی ئابلۆوقە نەدەبوون لەسەر هەر دوو لایەنی جەنگەکە.

زیاد لە ساڵێکی پاش جەنگ و لە کانوونی دووەمی ١٩٨٩دا، ئیدارەی ڕیگان و حکومەتی فرانسۆ میتیرانی فەڕەنسا (کۆنفرانسی پاریس بۆ قەدەغەکردنی چەکی کیمیاییان) ڕێک خست، بۆ ئەوەی بە ئاشکرا پاڵپشتی قەدەغەکردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بن، کەوا بە سەختی پێشێل کرابوو لە تۆماری پێنج ساڵی عێراقدا. سەد و چلونۆ حکومەت بە ڕێز و حورمەتەوە جەختیان لەسەر پابەندبوونیان بە پرۆتۆکۆڵی جنێڤ کردەوە و ڕەزامەندییان پیشان دا بۆ بەهێزکردنی ڕۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بواری لێکۆڵینەوەی پێشێلکارییەکاندا و کۆششە هەنگاو بە هەنگاوەکانیان سەلماند بۆ بەئەنجامگەیشتنی قەدەغەیەکی بەرفراوان لەسەر چەکی کیمیایی. بەڵام ڕاستییەکەی ناوی عێراق تەنانەت بۆ جارێکیش لە مەسەلەکەدا نەهاتبوو، کە ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر بەردەوامیی داشکاندنی وڵاتانی ڕۆژئاوا بەلای عێراقدا.

دانوستان بۆ قەدەغەیەکی بەرفراوان لەسەر چەکی کیمیایی، لە ساڵانی شەستەکانەوە دەستی پێ کردووە و بە

درێژایـی ســاڵانی هەشـتاکان بەردەوام بـوو، بە چـاودێریی کۆنفرانســی چەکـداماڵینی نەتەوە یەکگرتووەکـان. ویـلایەتە یەکگرتووەکـان پشـتگیریی ئەم گفتوگۆیـانەی دەکـرد، وەک ڕێگەیەک بـۆ قەنـاعەتپێکردنی یەکێتیی سـۆڤییەت و چـین، بـۆ ڕزگـاربوون لە چەکە کیمیاییەکانیـان. ڕێککەوتننـامەی چەکـی کیمیـایی وەک ڕێککەوتننــامەی چەکــی بــایۆلۆجیی ســاڵی ١٩٧٢ی هاومەبەسـتی، لەو تێـڕوانینەوە سـەری هەڵـدا کە لە جیهانێکی ئەتۆمیدا کەوا دوو زلهێز حوکمیـان دەکرد، چەکـی نائاسـایی ئـایەختر، بەهـایەکی ئەوتـۆی پێـک نەدەهێنـا، بەڵام بووبـووە مـایەی تەشـەنەکردنی ئەو توخمـانەی کە بە هـۆی پارادایمی "ئاڵوگۆڕی وێرانکردنەوە" ڕێگەیان لێ نەگیراوە.

وەک جولیان پێری ڕۆبنسنی پسپۆڕی چەکی کیمیایی (لە چــاوپێکەوتنێکی ســاڵی ٢٠٠١دا) دەڵــێ، تەنــانەت ئەگەر ئێرانییەکــان هــیچ کەسێکیشــیان نەدۆزیبــایەتەوە گــوێ لە داواکارییەکانیـان بگرێـت، لەگەڵ ئەوەشـدا جەنگـی ئێـران ـ عێراق هەر هەڵاوبگرێکی مەترسیداری نـابووەوە. ئەمە نەک تەنهـا لەبەر هەڵکشـانی بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی، کە هەڕەشەیەکی نوێی پێک هێنابوو و (هەڵەبجە تێیدا سیمبۆڵی وەرچەرخانێک بوو)، بەڵکو بە هۆی ئەوەوە بوو کە ویلایەتە یەکگرتووەکـان درکـی بەوە کردبـوو کە عێـراق بە تەواوی لەوە دەرچووبوو تەنها پشت بە یەکێتیی سۆڤییت ببەستێت، بەڵکـو کەرەسـتەی کیمیـایی و کەلـوپەل و تفـاقی لە کۆمپانیـا تایبەتەکانی ڕۆژئـاواوە بە دەسـت هێنـابوو بـۆ دروسـتکردنی بەرنــامەی بەرهەمهێنــانی نیشــتمانیی خــۆی. بەوپێــیە ئەو ڕێککەوتننــامەیەی قەدەغەی خســتە ســەر بەرهەمهێنــان و بازرگــانی پێــوەکردن و هەڵگــرتن و بەکارهێنــانی چەکــی

کیمیـایی، لە سـاڵی ١٩٩٢دا مـۆر کـرا و چـوار سـاڵ دواتـر چـــووە بـــواری کـــارپێکردنەوە. ئێـــران یەکێـــک بـــوو لەو دەوڵەتـانەی لە سـەرەتاوە ئیمزایـان کـرد و بە هەمـان شـێوە پابەنـدی ڕێککەوتننـامەی چەکـی بـایۆلۆجی و پەیماننـامەی تەشەنەنەکردنی ئەتۆم بوو.

باشـــە لە کەیەوە پابەنـــدیی چـــالاک و تـــا ڕادەیەک سەرسامکەری ئێران بە کۆتوپێوەندی فرەلایەنەوە، هاتووەتە ئاراوە؟ لە بناغەدا شای ئێران، دەستی کردووەتە بەرنامەی لێکۆڵینەوە، بە مەبەستی پەرەپێدانی چەکی کۆکوژ، بەڵام لە سـاڵی ١٩٧٩دا، شۆڕشـی ئیسـلامی ئەم هەوڵ و کۆششـانەی ئەوی بچڕی. بەوپێیە کاتێک عێراق، لە سـاڵی ١٩٨٣دا هـیچ شـــتێکی بە دەســـتەوە نەمـــا و کەوتە بەکارهێنـــانی چەکـــی کیمیـایی لە بەرەی شـــەڕدا، دەبـوو ئێـران بە پەلەپـڕووزێ دەسـت بکـاتە بەرنـامەی خـۆی. ئێسـتا بە گشـتی کـارێکی پەسـەندە کە ئێران توانـای بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی بە دەسـت هێنـاوە بە نزیکبـوونەوەی کۆتـایی جەنـگ. سـەرۆکی پەرلەمـان، عەلـی ئەکـبەر هاشـمی ڕەفســەنجانی دوای دوو مانـگ لە شەڕەوەســتان ئەوەی ڕوون کـردەوە کەوا "بـۆمبی کیمیایی و چەکی بـایۆلۆجی، بۆمبی ئەتۆمیی پیـاوی هەژارە و بە ئاسـانی بەرهەم دەهێنـرێن. ئـێمە هـیچ نەبێت لە کـاتی بەرگریـــدا ڕەچـــاوی ئەو چەکـــانە دەکەیـــن. هەر چەنـــدە بەکارهێنـانی چەکـی لەم چەشـنە نامرۆڤـانەیە، بەڵام جەنـگ فێری کـردووین کەوا یاسـا نێودەوڵەتییەکـان تەنهـا مرەکەبـی سـەر کـاغەزن"[٨]. ئەمە زیـاتر وەک بەردەوامبـوونی شـەڕ وا بـوو، هەروەهـا ئێـرانیش پێـدەچێت پەنـای بـردبێتە بەر ئەم چەکە.

لە ئیمزاکردنـی ڕێککەوتنـامەی چەکـی کیمیاییـدا، ئێـران داینـــابوو بە تەواوی پابەنـــدی ئاشـــکراکردنی هەمــــوو زانیـــارییەک بێـــت و پاشـــان کیمیـــایی عەمبـــارکراو و دامودەزگای بەرهەمهێنانی لە ناو ببات. لە کاتی خۆیدا ئێران ڕاپۆرتی لەسـەر تـوخمە کیمیـاییە (دیارینەکراوەکـان) دەدا و ئەو دەزگـــــایەی بەرپـــــرس بـــــوو لە جێبەجێکردنـــــی ڕێککەوتننـامەی چەکی کیمیـایی ــ ڕێکخـراوی قەدەغەکردنـی چەکی کیمیـایی ــ یەک لە دوای یەک چـاودێریی لەنـاوبردنی دەکـرد. لەگەڵ ئەوەدا هەنـدێک لە حکومەتەکـان و پسـپۆڕانی چەکــی کیمیــایی، بەردەوام گومانیــان لە ئێـران دەکــرد کە پرۆگرامێکی چالاکی چەکی کیمیایی شاردووەتەوە.

ئەمە ئەگەر ڕاســت بووبێــت، ئەوە بێگومــان میراتێکـی جەنگی ئێران ـ عێراق بوو، هەروەهـا بووبووە هـۆی ئەوەی کەوا کـۆمەڵی نێـودەوڵەتی حەز نەکـات بەکارهێنـانی گـاز لە لایەن عێراقەوە بوەستێت. بێجگە لەوەش توانـای جیهـان بـۆ بەرەنگاربوونەوەی ئێران بە شـێوەیەکی دراماتیکی هـاتبووە خــوارەوە، بە هـۆی درکپێکـرن و دووربینیـی ئێـرانەوە، بەو بنەمایەی کە لە مـاوەی جەنگدا فەرامـۆش کراوە و کەس بە هانایەوە نەهات لە چەکی کۆکوژ بیپارێزێت، بێجگە لەوەش کە جڵەوگیریـی چەکـی کۆکـوژی ئەمیشـیان کـرد. سـێس کـارۆس، کە پسـپۆڕێکی چەکی کیمیـاییە (لە چـاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەڵێت "ئەوان بە جارێک تووشی شۆک بوون لە هەر دوو بەکارهێنـــانی چەکـــی کیمیـــایی و نەبـــوونی کـــاردانەوەیەکی نێـــودەوڵەتی و نەیانـــدەزانی تـــا چ مەودا و ئاسـتێک بەرگـی شـەیتانیان بە بـاڵادا بڕیـون، بـۆیە ئێسـتا هەمـوو هەوڵێـک دەدەن بـۆ ململانـێ و چنگـدانێکی چالاکـانە

لەگەڵ کۆمەڵی نێودەوڵەتیدا. ئەوان وای مەزەندە دەکەن کە دەتوانن بە شێوازی خۆیان بدوێن، دوور لە کێشە و گرفت لە حاڵەتی بەرەنگاربوونەوەی پشکنیندا، بەپێی ڕێککەوتننامەی چەکی کیمیایی".

هەر چەندە ئێران بەرەوڕووی پشکنینی لەو جۆرە نەبووبووەوە، بەڵام مانۆڕکردنی لەسەر مەسەلەی ئەتۆم، پێدەچێت هێمایەک بێت بۆ هەڵوەستەکردنی لەسەر چەکی کۆکوژ بە شێوەیەکی بەرفراوانتر. بە دوای ئاشکرابوونی لێکۆڵینەوەی نهێنی لەسەر ئەتۆم لە ساڵی ٢٠٠٢دا، ئێران بە شێوەیەکی سەرەتایی بەڵێنی دا هاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمدا International Atomic Energy Agency (IAEA) بکات وەک بەشێک لە پابەندبوونی بە پەیماننامەی قەدەغەکردنی ئەتۆمەوە Non - Proliferation Treaty (NPT)، پاشان نزیکبوونەوەی ئاژانسەکەی لە شوێنە ئاشکرانەکراوەکان ڕەت کردەوە. لە پاش هەڵپەساردنی پیتاندنی یۆرانیۆم، ماوەی زیاد لە ساڵێک و لە ئەنجامی دانوستانێکی ئاست بەرز لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیادا، ئێران لە ساڵی ٢٠٠٦دا سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە پیتاندن و پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە نیازی ئاشتیخوازانەیە و بە تەمایە وزەی ئەتۆمی دروست بکات، نەک بۆمبی ئەتۆمی. لەم ئیدیعایەدا، کاربەدەستە ئێرانییەکان وای بۆ دەچن کەوا ئێران بە هۆی تاقیکردنەوەی جەنگەوە لەگەڵ عێراقدا: "تاقە قوربانیی بەکارهێنانی چەکی کۆکوژە لە مێژووی نوێدا"، وەک جەواد زەریفی باڵیۆزی ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکان ڕوونی دەکاتەوە کەوا "ئێرانییەکان پەرەپێدان و بەکارهێنانی

ئەم هەموو چەکە نامرۆڤانەیەی بەپێی بنەمای ئایدیۆلۆجی و ستراتیجی ڕەت دەکردەوە"[٩]. بە هەرحاڵ، ئێران خۆی لە ساڵانی ١٩٩٠کاندا، پێ لەوە دەنێت کەوا پەرەی بە چەکی کیمیایی داوە.

کاربەدەستە ئێرانییەکان دەڵێن کەوا وڵاتەکەیان دەیەوێت پەیڕەوی مۆدێلی ژاپۆنی بکات. ژاپۆن کۆنترۆڵی تەواوی سووڕی سووتەمەنیی کردووە وەک بەشێک لە بەرنامە ئاشتییانەکەی ئەتۆمی، بەڵام ئەو کارە بە شێوازێکی تەواو ڕوون و کراوە دەکات، بە هەماهەنگی لەگەڵ ئاژانسی وزەی ئەتۆمیی نێودەوڵەتیی IAEA. بە پێچەوانەوە، بە چاوبەستی و نیوەڕاست و نیوەدرۆ و نیمچە ملپێدانەوە، ئێران وا دێتە بەرچاو کە لە پەیجۆرێکی لاسارانەدایە بۆ چەکی ئەتۆمی لە بەرگی گەمەکردنێکی گوێڕایەڵیدا. ئەمە ئەو پەندە بوو کە لە ساڵانی هەشتاکاندا فێری بوو، پاشانیش بە ڕێگەیەکی جیاواز، لە ماوەی دە ساڵی سزاکانی ئابلووقەدا، کاتێک کە بەرنامەکانی چەکی کۆکوژی عێراق تێک شکان و هەڵوەشان، بە هۆی چڕترین و پڕکێشترین سیستمی چەکداماڵینەوە لە مێژوودا، کە تێکڕا شاردنەوە و خۆلادان و چاوبەستی بوو بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە ستراتیجییەکان. بەڵام ئێستا ئێران بە ڕابەریی ڕژێمێکی تیۆکراتی کە چەند لە ناو وڵاتدا خۆی قایم کردووە و سەنگەری بەرگریی گرتووە، ئەوەندە جێی ڕق و بێز و بێمتمانەییە لە دەرەوە. ئەم ڕژێمە لەسەر نرخی بەرزی نەوت و توانای کێشە و گرفت دروستکردن بۆ بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەککگرتووەکان لە عێراق و شوێنانی تردا، گەشە دەکات و بەهێز دەبێت. هەروەها پشت بەو کۆسپە نوێیانە دەبەستێت، ڕاست بن یان

جێی گومـان، بـۆ بەربەسـتی کردنـی دووبـارەبوونەوەیەکی جەنگی پڕ لە شۆک و ترۆما لەگەڵ عێراقدا و ڕەنگە پێگەی خـۆی بە دەسـت بێنێـتەوە وەک هێزێکـی باڵادەسـت لە کەنداودا.

## ویلایەتە یەکگرتووەکان و سەرنەکەوتن لە زوو دەستتێوەرداندا

پاش ئەوەی هەموو شتێک گوترا و کرا، پێویستە ئەو پرسیارە بکرێت: ئاخۆ شتەکان بە شێوەیەکی جیاواز کران؟ ئاخۆ سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەو جۆرە رێکخراوە کەوا کاردانەوەی هەبێت بۆ رووداوە چاوەڕواننەکراو و نەخوازراوەکان ــ وەک پەنابردنی عێراق بۆ چەک و تفاقی جێی بێزلێکردنەوەی مرۆڤایەتی و ئەگەری زیانبەخشینیش بە بەرژەوەندییە مەودا دوورەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان ـ لە کاتێکدا کە ئامانجە لەپێشەکانی ئەمەریکا دەپارێزێت، وەک هێشتنەوەی ئێران بە بێزلێکراوی، دابینکردنی رۆیشتنی نەوت بە نرخێکی پەسەند و پاراستنی سەلامەتیی ئیسرائیل، کە سەرچاوەی هێزی ستراتیجیی ئەمەریکایە؟

هەواداری و داشکاندن بەلای عێراقدا بە هۆی رووخانی شاوە دروست بوو، کە وەک پاسەوانێکی رۆژئاوا بۆ سەروەت و سامانی کەنداو کاری دەکرد. شا دوو خاسیەتی زیندووی لێک دابوو: یەکێکیان تێگەیشتنێکی هاوبەش بۆ "سروشتی هەڕەشەی سۆڤێت و پێویستیی پارێزگاریکردن لە بارودۆخی سیاسیی سەروەخت لە کەنداودا و گرنگیی ئاسایشی ئیسرائیل". دووەمیان، توانای سەربازی بۆ پاراستنی کەنداو لە هەر دوو دەسەڵات بەسەرداشکانی

سۆڤییەت و ڕادیکالیزمی عەرەب[١٠]. هەروەها عێراقیش توانایەکی سەربازیی بەرچاوی هەبوو، بەڵام لەگەڵ تێڕوانینی واشنتۆن نەبوو سەبارەت بە هاوسەنگیی هێزەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و بوو بە دەمبەهاوارترین نەیاری ڕێککەوتننامەی ئاشتیی کامپ دێڤید. وەلێ بە پێچەوانەوە، عەرەبستانی سعودی و کوەیت بەرژەوەندیی هاوبەشی زۆریان هەبوو لەگەڵ ڕۆژئاوادا، کە پێداویستیی وزەیان بۆ جێبەجێ دەکردن بە نرخێکی گونجاو. ئەمانە بە هۆی لاوازیی ناوخۆییانەوە وەک دەوڵەتی خاوەن داهات، خۆیشیان پێویستیان بە پارێزگاری هەبوو.

بە ڕۆیشتنی شا، واشنتۆن نەک هەر پۆلیسەکەی کەنداوی لە دەست دا، بەڵکو ڕژێمێکی میلیتارییشی لێ پەیدا بوو بە نەوتێکی زۆر و ئارەزوویەکی تەواوەوە بۆ ڕووخاندنی ڕژێمە پادشاییە چەقبەستووەکانی کەنداو. پاشان ئامانجی سەرەکیی ڕۆژئاوا، بوو بە ئیحتیواکردنی شۆڕشی ئیسلامی. ئەمە پێویستی بە جووڵاندنی هەموو ئەوانە بوو کە لە توانایاندا بێت ناوچەکە بپارێزن، با بە تەواوی ئایدیا و بۆچوونیشیان وەک واشنتۆن نەبێت. عێراق یەکەم جار بە ئارامی ڕووی دایە و پاشان لە ساڵی ١٩٨٤دا وەک هاوبەشێک چووە ژێر ڕکێفییەوە و پێدەچێت هاوپەیمانێکی زۆر جێمتمانە و شیاو نەبووبێت، بەڵام واشنتۆن دەیویست زیاتر ڕایبکێشێت و کۆمەڵێک هاندەر و دەمچەورکردنی بۆ بە کار هێنا، بۆ ئەوەی زیاتر و توندتر عێراق بێنێتە بندەستی خۆی. لەگەڵ هەر هێرش و دەسدرێژییەکدا لە لوبنان، وەک (بۆردمانی سەربازگەکانی مارینزی ئەمەریکا و باڵیۆزخانەکانی ئەمەریکا و فەڕەنسا و

بەبــارمتەگرتنی ڕۆژئاواییەکــان) و لەگەڵ هەر وەســتان و پەککەوتنێکــی عێــراق لە جەنگــدا، دەســتلەملانەکە گەرمتــر دەبوو.

شــلبوونی عێــراق لە ململانێــی ئیســرائیل ـــ عەرەبــدا، یارمەتیدەر بــوو، وەک پابەنــدبوونێک بە مــامەڵەکردن لەگەڵ یــارمەتیی ئــابووری و دارایــی ویــلایەتە یەکگرتووەکانــدا بە شــێوەیەکی بەرپرســیارانە. عێراقییەکــان وەک دێڤیــد نیــوتنی یەکەم باڵیۆزی ئەمەریکا لە بەغدا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠١دا) دەڵێــت "باشــترین ڕەفتاریــان دەکــرد، چــونکە ئەوە سیســتەمێکی فەرمانــدەییە کە تــۆ ئیشــارەتێک دەنێریــت و وەڵامێکی خێرا وەردەگریتەوە". هەروەها عێراقییەکان خۆیان لە ئەبو نیزال (أبو نضــال)ی ســەرکردەی تیرۆریست ڕزگــار کــــرد و وەزارەتـــــی کشـــــتوکاڵ (هیـــــی ئەمەریکـــــا، و) "ئەســتۆپاکییەکی تەندروســتی خــاوێنی دانــی ســەبارەت بە شێوازی ئەوەی چۆن پارەکە بە کار هــاتووە، چونکە ئەگەر گەنـــدەڵیی زۆر بکرابـــایە، دەبـــوو بەرنـــامەی قەرزەکـــان دابخەیــن"، بەپێــی قســـەی نیــوتن. بــێجگە لەوەش ئەگەر نــارەزایی ناسیۆنالیســتە عەرەبەکــانی بەغــدا ڕێــگەی بە نێوانخۆشییەکی نزیکی نەدایە لەگەڵ واشنتۆندا، ئەوە هەمان ناســیۆنالیزم دیســان خــۆی لە یەکێتیــی ســۆڤییێت زۆر نزیــک نەدەکــردەوە. لە کۆتاییــدا، زۆر کەس لە واشــنتۆندا بەهیــوا بوون ڕژێمی عێراق بە تێپەڕبوونی کات چاک بێت و هەموو پشــتگیرییەکی خــۆی لە تیرۆریــزم ببڕێــت و بپەرژێــتە ســەر دیمــوکراتیزەکردنێکی ســنووردار ـــ بە واتــا ببێــتە وڵاتێکــی عەرەبیــی "میــانڕەو". وەک نیــوتن دەڵێــت: "کــارێکی بەجێــیە ئەگەر هەوڵــی ئەوە بــدەین ڕایەڵــی هــاوبەش لەگەڵ عێــراق

دروست بکەین تا چەند بتوانین، بۆ زیادکردنی کاری هاندەرانە لەپێناو ڕەفتارکردنی بەرپرسیارانە و پەکخستنی ڕەفتارە نابەرپرسیارەکان". بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە وەک بەهانەیەکی یاسای جەنگ دژ بە سەربازە پیادە دەمارگرژەکانی ڕژێمێک کە مەحاڵ بوو بگۆڕێت، فەرامۆش کرابوو، کەوا ڕێک هێندەی ڕژێمی عێراق دڕندە بوو، ئەگەر زیاتر نەبووبێت. هەروەها نیوتن دەڵێت: "ئێمە هەموو شتێکی گونجاومان کرد بۆ دڵنیابوون لەوەی کە عێراق نەکەوێت و بە هەمان شێوەش بۆ پاراستنی عەرەبستانی سعودیە و کوەیت".

جێی خۆیەتی بپرسین کە چی ڕووی دەدا ئەگەر عێراق لە کاتی جەنگدا پەکی بکەوتایە و وەک ئەنجامێکیش ئەگەر ئێران سەربکەوتایە لە ڕامالینی سەنگەرەکانی بەرگریی عێراقدا و بەسەرەی بگرتایە و بە خێرایی ڕژێم برووخایە. ئەو دەمە لەوانەبوو ئێران عێراقی داگیر بکردایە و حکومەتێکی شیعەی سەر بە ئێرانی دامەزراندایە لەسەر مۆدێلی ڕژێمەکەی خۆی و کۆنترۆڵی کێڵگە نەوتییەکانی عێراقی بکردایە و (بەو ڕەنگە نرخی نەوتی بەرز بکردایەتەوە) و شێخنشینە دراوسێکانی خاوەن نەوتی بخستایەتە حاڵەتی بەرگریی سەربازی و ئابوورییەوە و هاتوهاواری دژەئیسرائیلی بەرەو ئاقارێکی بەرز و نوێ هەڵکشاندایە... تۆبڵێی ئەم بارودۆخە باشتر بوایە؟

ئەم پرسیارە بەو شێوەیە بکرێت، پرسیارێکی ناڕاستە. ویلایەتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی دوو ئامانجی ستراتیجییان هەبوو: بەربەستکردنی فراوانخوازیی ئێران و لە هەمان کاتیشدا، ڕێگرتن لە دەرکەوتنی عێراقێکی

سەرکەوتووی پشتبەخۆبەستوو وەک زلهێزێکی نوێی ناوچەکە ـ بە واتایەکی تر سیاسەتێکی ئیحتیوای دوولایەنە، کە لە سالانی ١٩٩٠کاندا بالی کێشابوو بەسەر سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. هەر چۆنێک بێت، مەرامی واشنتۆن لە دژایەتیکردنی ئێراندا بەو چەشنە بوو کە تای تەرازووی بەلای عێراقدا بشکێتەوە.

کاربەدەستێکی خانەنشینی سی ئای ئەی (لە چاوپێکەوتنێکی سالی ٢٠٠٠دا) دەلێت ڕووداوەکانی کەنداو "حکومەتیان بە تەواوی وا لێ کرد هەناسەی لەبەر ببڕێت. ئەوان لە ئوسوولیەتی ئیسلامی نەگەیشتبوون و نەیاندەویست گوێ لە ئامۆژگاریی کەس بگرن و لەوەدا کورتیان کردبووەوە کە (هەر قسەیەک خومەینی بیکات مەبەستێکی تێدایە). ئەمە گۆڕانێکی شێواز بوو. هەموو کەس وای دادەنا کە مۆدێرنیزم و هەلبژاردەیەکی ڕۆژئاوا ڕابەریی ئەم بەشەی جیهان دەکەن. بڕیاری سیاسەت و ڕێبازی ئەمانە ڕەنگدانەوەی ئەم بیروبۆچوونەیە. ئەمە وا دەگەیەنێت کە ئێمە هاوسەنگیی خۆمان لە دەست دابێت، کاتێک کە شا ڕووخا".

بەمپێیە بەڕێوەبەرێتیی ڕێگان کاردانەوەکەی زیاد لە پێویست بووە. نوشوستیهێنانی جیاوازیکردن لە نێوان پراگماتی و ڕادیکالەکانی ئێراندا، وای کرد کە ئیدارە دەرفەتێک لە دەست بدات، کە بە دلنیاییەوە ڕەخسابوو، بۆ بەهێزکردنی ئەوی پێشوو لەسەر حیسابی ئەمی دواییان. لەبری ئەوە سیاسەتەکانی پالی بە هەر دوو تاقمەکەوە نا کە باوەش بە یەکتردا بکەن و لە ململانێی بیرۆکراتەکانی واشنتۆندا، ئەوانەی کە سوور بوون لەسەر ئەو ڕایەی کەوا

ڕژێمی ئێران دەکرێت چاک ببێت، خرانە پەراوێزەوە و شکستی تەواوی ئێران ـــ کۆنترا دەرەنجامەکەی بوو. لەوەش زیاتر پشتگیریکردنی عێراق بەرهەڵستکاریی بەرچاوی لێ نەکەوتەوە، بە تایبەتی لە دوای ئێران ـ کۆنترا. بەم جۆرە پرسیارێکی گرنگ نەکرا، ئەویش ئەوەیە: ئاخۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوەندە هاوکاریی عێراقی کردووە کە خۆی لە بەزین و ڕامالّین بپارێزێت، بێجگە لە ڕێگەپێدانی بۆ بەکارهێنانی چەکێک کە هێند تۆقێنەر بێت لە کاریگەریدا و هێند مەترسیدار بێت لە ناواخنیدا چەشنی گازی ژەهراوی ـــ یاخود ئەگەر بە شێوەیەکی تر بیڵێین، ئایا عێراق بێ بەکارهێنانی گاز دەرباز دەبوو؟

وەڵامەکەی شتێکە دەچێتە خانەی مەزەندە و تێڕامانەوە. پێدەچێت شارەزایانی سەربازی، کۆک نەبن لەسەر توانا و کاریگەریی چەکی کیمیایی لە مەیداندا. بەڵام مەسەلەیەک هەیە کەوا کاردانەوەیەکی نێودەوڵەتیی توندتر بۆ جەنگ (کە بنەماکانی لە ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٤٩ی جنێڤدا دانراوە، لەگەڵ ڕێککەوتننامە مرۆڤدۆستە پەیوەندیدارەکاندا ـــ کە چاودێریی گوێڕایەڵی و پێشێلکاریی سزا لەسەر دانراوی هەر لایەک دەکرێت) توانای بە دانوستان داوە بۆ کۆتاییپێهێنانی ناکۆکی و ململانێ لە بارودۆخێکدا کەوا هەر دوو لا ئێران و عێراق پەسەندی بکەن، بێ ئەوەی هیچ لایەکیان پەنا ببەنە بەر چەکی کیمیایی.

فشار خستنەسەر عێراق، بۆ گۆڕین و چاککردنی هەڵسوکەوتی پێویستی بەوە نەدەکرد ببەسترێت بە گۆڕانێک لە مەسەلەی داشکاندن بەلای عێراقدا، بەڵکو نەبوونی متمانەی واشنتۆن بە هێزی پەیوەندییەکە، ڕەنگە کاریگەریی

هەبوونێت دژ بە ئیدانەیەکی ئاشکرای ئەوەی کە عێراق بەرپای کردووە. بە درێژایی ئەم ماوەیە، ئیدارەی ڕیگان سێ دەرفەتی جیاوازی لە بەردەمدا بوو بۆ دەستتێوەردان و بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە پابەندییەکی عێراق بە دەست بێنێت بۆ گەڕانەوە و کۆڵدان لە بەکارهێنانی زیاتری چەکی کیمیایی، لە سالآنی ١٩٨٣ ــ ١٩٨٤دا، کاتێک عێراقییەکان دەستیان دایە تاقیکردنەوەی گاز، دەسبەجێ لە دوای هەڵەبجە لە مارتی ١٩٨٨دا و بە دوای ئەویشدا هێرشەکانی بادینان لە ئابی ١٩٨٨دا. لە هەر حاڵەتێکدا، پەردەلادانی ئاشکرا لەسەر بەکارهێنانی گاز لە لایەن عێراقەوە، هانی وردبوونەوەی لەو پەیوەندییە دەدا و ئاشکرابوونی چەندباره کاریگەرییەکی کەڵەکەبووی هەبوو، کە بە تێپەڕبوونی کات فشاری لەسەر واشنتۆن زیاد دەکرد بۆ گۆڕینی مامەڵەکردنی لەگەڵ عێراقدا. بەڵام ئەو یەکەم دەرفەتەی ساڵی ١٩٨٣ بایەخدارترین دەرفەت بوو، کاتێ ئەمەریکا زانیاریی هەبوو لە سەر رەفتار و هەڵسوکەوتی عێراق و کاتێ مەسەلەی کیمیایی عێراق هێشتا هەر لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا بوو و بەو چەشنە لاواز و فشەڵ بوو لە ئاست فشاری نێودەوڵەتیدا. تێگەیشتن لەوەی چ هەڵەیەک لەو کاتەدا کرا، یەکلاکەرەوەیە لە تێگەیشتنی ئەوەی دواتر چی ڕووی دا.

لە دوادوایی ساڵی ١٩٨٣دا، سیاسەت داڕێژانی ئەمەریکا چاک ئاگادار بوون لە پێشهات و پەرەسەندنەکانی مەیدانی شەڕ. ئەو دەمە (سی ئای ئەی) ئاگای لە هەر دوو بەکارهێنانی عێراق بۆ چەکی کیمیایی و تاقیکردنەوەی تۆخمە کیمیاییەکان لەسەر ئاژەڵ بوو. هەروەها ئەوەشی

دەزانــی کە عێراقییەکــان، لە ڕێــگەی کۆمپانیــای لەبــار و دروستکردنی چیرۆکێک بۆ داپۆشینی مەسەلەکە، ماددەی کیمیایی و کەلوپەلی لە ئەڵمانیا و وڵاتانی تری ئەورووپا دەکڕی و بە هەمان دەستوور لە ویلایەتە یەکگرتووەکانیش. ئیدارەی ئەمەریکا بە هۆی پابەندبوونیەوە نەیدەتوانی زانیاریی هەواڵگری بدرکێنێت و تەنها ئەو کاتە کەوتە کار کە سەدام حسێن لە شوباتی ١٩٨٤دا ئاپ و ئاشکرا هەڕەشەی بەکارهێنانی "دەرمانی مێرووکوژی" کرد دژ بە ئێرانییەکان. ئەو پاساوەی کە وەزارەتی دەرەوە دای بە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، هەلومەرجی بەرژەوەندیی زاڵ بوو بەسەریدا نەک پەندی ئەخلاقی، کە بەم جۆرە بوو: بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە دژ بە ئامانجەکانی ئەمەریکا وەستاوەتەوە، چونکە پێدەچێت هەڵکشانێکی مەترسیدار بەرپا بکات و ڕێگەی دانوستان لە ئێرانییەکان بگرێت و "چەکێکی کاریگەری پرۆپاگەندە" بداتە دەستیان(١١).

واشنتۆن لەگەڵ ئەو تێگەیشتنەی عێراق نەبوو کە تەنها چەکی کیمیایی، لەگەڵ کاریگەریی هەمەلایەنە و بەهێزیشی، بتوانێت قەرەبووی زیانەکانی بکاتەوە لە ژمارەدا. جیم پلاکی کاربەدەستی وەزارەتی دەرەوە (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەوا "پێویستی بە چەکی کیمیایی نەدەکرد بۆ ڕێگرتن لە سەرکەوتنێکی ئێرانی و بەوپێیە من دڵنیا نیم هیچ کاتێک ئەو جۆرە لێکدانەوەیەمان کردبێت". دۆکیومێنتێکی ساڵی ١٩٨٦ی (سی ئای ئەی)، گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کەوا کاریگەریی هێرشە کیمیاییەکانی عێراق داویەتیە کزی، بە هۆی تەکتیکە

نەکاراکـــانی بڵاوکـــردنەوەی و کەمبـــوونەوەی لەناکـــاو پەلامــــاردان و زیـــادکردنی ئامادەکــــاریی ئێرانییەکـــان و زنجیرەیەک کێشە و گرفتی تەکنیکی[١٢]. هەروەها پات لانگی دەزگای هەواڵگریی بەرگری DIA کە ئێرانی تۆمەتبار دەکرد لە بەشـــێکی بەرپرســـیاریی هێرشـــەکەی هەڵەبـــجەدا، (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠)دا و لە بارەی کەمپینی (توکلنا علی الله)ی ساڵی ١٩٨٨ی عێراقەوە، سەرنجی ئەوە دەدا کە تەنـانەت "ئەگەر چەکـی کیمیاییشـت لە ئـاگری شـەڕەکە دەربکردایە، عێراق ئەو شەڕەی هەر دەبردەوە". بە هەرحاڵ، لەدیدی ئەوەوە ئەمە لێکدانەوەیەکی سەربازی نەبوو، بەڵکو "فەرماندە زیاد لە پێویست خۆی سەغڵەت کردبوو".

جیاوازیی تێگەیشتن لە نێوان ئەمەریکا و عێراقدا، ڕەنگە هۆکـاری ئەوە بێت کە بـۆچی واشـنتۆن شکسـتی هێنـا لە گەیاندنی پەیامەکەیدا. لە پایزی ساڵی ١٩٨٦دا، تاریق عەزیز هۆشـــداریی دا بە خـــافییر پێرێـــز دیکـــۆیلار ســـەبارەت بە ئەگەری تێکشـکانی عێـراق و باشـووری شـیعەش بکەوێـتە ژێردەسـتی ئێـرانەوە: "ئەگەر ئەمە مانـای وا بێـت کە ئـێمە دەبێـت هەمـوو جـۆرە چەکێـک بە کـار بێنـین و مەبەسـتم هەمـوویەتی ـــ ئەوە بە کاریـان دێنـین، بـێ گوێـدانە هـیچ ڕێککەوتننامەیەک یان هەر کەسێک هەر چییەک بڵێت، چونکە ئـێمە لەم جەنـگەدا شـەڕ بـۆ ئێـوەش دەکەیـن"[١٣]. پێـدەچێت تەنهـــا لە ئەیلـــوولی ١٩٨٨دا وەزارەتـــی دەرەوە دیـــد و بۆچـوونی عێراقـی سـەلماندبێت و سـەرنجی ئەوەی داوە کە "سـووربوونی عێـراق لەسـەر ئەوەی کەوا چەکـی کیمیـایی پێویسـت بـوو بـۆ مـانەوەی وەک وڵات و نیشـتمان، ئەوە دەگەیەنێـت کە بـۆچی هەوڵـی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان و

(ئەنجـــوومەنی ئاسایشـــی نەتەوە یەکگرتووەکـــان) بـــۆ وەستاندنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق، لە ڕەوشی بەردەوامبوونی جەنگدا، کاریگەر نەبوو".[14]

ئەو سزایەی واشنتۆن لە ساڵی ١٩٨٤دا بۆ عێراقی هەڵبژارد، ئابلووقەدانێکی ڕۆیشتنی ماددە و کەرەستەی کیمیایی بوو بۆ هەر دوو ئێران و عێراق، هەوڵدان لەگەڵ پایتەختەکانی ئەورووپادا بۆ سەپاندنی هەمان شت و ناردنی پەیامێکی دیبلۆماسی بۆ عێراقییەکان بۆ وەستاندنی بەکارهێنانی گاز. ئەمە بە کاریگەر لەقەڵەم درا، چونکە پیشەسازیی کیمیایی عێراق هێشتا بە شێوەیەکی سەرەکی هەر پشتی بە هاوردەی کەرەستەی کیمیایی دەبەست. بە هەرحاڵ، چاوپێکەوتن و بەڵگەنامەکان ئەوە پیشان دەدەن کە مەودای سنووردار و سروشتی ئارەزوومەندانەی ئابلووقەکە، وای لێ کرد زۆر سەرکەوتوو نەبێت. کەواتە هەوڵ و تەقەلـلا دیبلۆماسییەکان بوون بە کارێکی گاڵتەجاڕی (لە دەقە ئینگلیزییەکەدا بە پارچە شیرینییەک یان کاندییەکی بێتام دەشوبهێنرێت کە لە کوردیدا بەرانبەری نییە، و). هاوردەی عێراق بەردەوام بوو لە ئەورووپا و بلۆکی ڕۆژهەڵاتەوە و پەیامە دیبلۆماسییەکە لە لایەن عێراقییەکانەوە پشتگوێ خرا، کە ئیدیعای ئەوەیان دەکرد گوایە مانەوەیان لە مەترسیدایە. هەمان مەزەندە و تاوتوێکردنی (سی ئای ئەی) لە ساڵی ١٩٨٦دا دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەوا:

"لەبەر ئەوەی باجی سیاسی لەسەر بەردەوامبوونی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی زۆر کەم بووەتەوە، ئێمە بەگومانین لەوەی عێراق واز لە بەکارهێنانی ئەو چەکە

بێنێت لە داهاتوویەکی نزیکدا. بێجگە لەوەش، ئەگەری ئەوە هەیە کە ئێستا عێراق بە تەواوی پەرەی بە بەرنامەی چەکی کیمیایی خۆی دابێت و وای لێ کردبێت تا ڕادەیەک قەدەغەکردنی بازرگانیی دەرەوە کاری تێنەکات. هەوڵ و کۆششی ویلایەتە یەکگرتووەکان و وڵاتانی ڕۆژئاوا بۆ ئابڵووقە خستنەسەر ماددە و کەرەستە کیمیاییەکانی ڕۆژئاوا، پێشکەوتنی چەکی کیمیایی عێراق پەک ناخات"[١٥].

بە واتایەکی تر، چارەسەری واشنتۆن لە ساڵی ١٩٨٤دا، تەگەرە خستنەڕێی پێشێلکردنی ئاشکرای یاسا بوو بە ئیدانەکردنی پێشوەختی عێراق و بەرلەوەی میدیا مەسەلەکە بقۆزێتەوە و بەشداربوونی ئیدارە لە کارەکەدا دەربخات. هەر چۆنێک بێت، ئەمە وا دەگەیەنێت کە ئیدارە فشارەکەی سووک کردووە لە پێش دروستکردنیدا. وەک ئەنجامێک کارەکانی دواتری پێدەچوو لاوازتر بن وەک لەوەی کە دەبوو بکرێن. بۆ نموونە، واشنتۆن هەڕەشەی ئەوەی دەکرد کەوا بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق، ببەستێتەوە بە گەڕانەوە بۆ پەیوەندییە دیبلۆماسییەکان، کە بەهێزترین ئامرازی بوو. لەبری ئەوە دیپلۆماتەکانی ئەمەریکا دواجار ئەو قەناعەتەیان دەربڕی کەوا سەرباری ئەو هاتوهاوارە لەسەر بەکارهێنانی گاز لە لایەن عێراقەوە، کەچی ئەمان توانییان ئەوە جێبەجێ بکەن کە بە گرنگترین بەرژەوەندیی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان لەقەڵەم دا.

هەروەها ئیدارەی ڕیگان پشتگیریی ئەو بنەما و پێوەرانەشی دەکرد کە دژی بەکارهێنانی گاز بوون. سێس کارۆس کە ساڵی ١٩٩١ لە بەردەمی کۆنگرێسدا شایەتیی لەسەر توانای چەکی کیمیایی عێراق دا و ڕۆڵی ویلایەتە

یەکگرتووەکـــان لە بەهێزکردنیـــدا و جەختـــی لەســـەر ئەوە دەکـردەوە کە پەیـامێکی سیاسـی پشـتگیریی بنەمـا و پێـوەر بکــات، دەتوانێــت ئەنجــامی گەورە بە دەســـتەوە بـــدات. عێراقییەکـــان خۆیـــان گەیانـــدبووە ژمـــارەیەکی زۆری کۆمپانیاکانی کیمیایی لە ئەمەریکادا و زۆرێکیان بەدەمیانەوە نەچـوون و هەنـدێک پاشەکشـێیان کـرد. ئەو دەیگـوت کەوا بنەمایەکی بەهێزتر دەکرا زیاتر کاریگەر بێت و عێراقییەکان، لەژێر فشاردا "دەستیان لێ هەڵدەگرت و کۆڵیان دەدا".

ســـزا ســـنووردارەکان و ئیشـــارەتە دیبلۆماســـییە نەرمونیانەکـان قەناعەتیـان بە عێراقییەکـان هێنـا کە لەبـری ئەوانە، هەمـوو شـتێک بـاش دەڕوات و هەمـوو ئەوەی کە ئەمەریکییەکـان دەیکەن، تەنهـا دانـانی ڤۆلیـۆم کۆنترۆڵە (بـۆ نمـوونە هاوشـێوەی بەرز یـان نزمکـردنەوەی دەنگـی ڕادیـۆ یـان تەلەڤیزیـۆن بە ئـامرازێکی تـایبەت بەوە، و). هەر دوو سەردانەکەی دۆناڵد ڕامسفێلد بۆ بەغدا، تەنها پشـتگیریی ئەم پەیـامە بـوو. کاتێـک واشـنتۆن بە دوای ئەوەدا قایـل بـوو بە پەنابردنە بەر پەیوەندییە دیبلۆماسییەکان، لەوە زیاتر بە چی لێک دەدرێتەوە ئەگەر خەڵاتکردنی قوربانیـدانی عێراقییەکـان نەبێـت، لە بەرگرتنـی پێشـڕەویی ئـۆردووی ئیسـلامەکاندا؟ بەمپێـــیە، لە ســـاڵی ١٩٨٤دا، دەرفەتێکـــی هێجگـــار گرنـــگ پشـتگوێ خـرا. ئەمە قۆنـاغی هەڵکشـانی بەکارهێنـانی چەکـی کیمیایی هێنـایە پێشـەوە، کە چوار سـاڵ لەوەوپـاش گەیشـتە لوتکە، لە تراجیدیای هەڵەبجەدا.

هەراوزەنای هێرشی کیمیایی بۆ سـەر هەڵەبـجە، لەوانەیە سیاسەتی ئەمەریکای ناچاری گۆڕانێک کردبێت. ڕووداوەکە هێند دراماتیکی بوو وەک پاساوێک بۆ ئەمە، بەڵام خشـتەی

کاتەکەی نارێک و نالەبار کەوتەوە، چونکە لە پاش ئێران ـ کۆنترا، واشنتۆن بەڵێنی دابوو کە یارمەتیی عێراقییەکان دەدا بۆ گەیشتنە ئەو ئاگربەستەی کە زۆریان پێویست پێ بوو، بەلام لێی نائومێد بووبوون و لە مارتی ١٩٨٨دا وا دەهاتە بەرچاو کە عێراقییەکان سەردەکەون، ئەگەر بهاتایە و ئەو هێرشانەی کە بۆ گێڕانەوەی ناوچە لەدەستچووەکانیان دەکرد، بەپێی پلان جێبەجێ بکرانایە.

گومانی تێدا نییە کە ئیدارەی ڕیگان زانیاریی کاتی ڕاستەقینەی پێویستی لە بەردەستدا بوو بۆ ئەوەی بە شێنەیی بڕیار لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بدات لە لایەن عێراقەوە. بۆ نموونە، بەڵگەنامەکان ئەوە دەردەخەن کەوا (سی ئای ئەی) پێشتر هۆشداریی ئەوەی دابوو کە بەرپابوونی هێرشێکی ئاسمانی بە چەکی کیمیاییشەوە نزیکە ڕوو بدات. ڕاپۆرتێک لە تەمووزی ١٩٨٨دا ئەم زانیارییە هەواڵگرییەی تێدایە، کە جێی سەرنجە، لەبەر ئەو وردەکارییانەی تێیدا هاتووە:

"هێزەکانی عێراق بەردەوام لە کەرتی ناوەڕاستی شەڕەکە دەکشێنەوە، لە کاتێکدا کە هێرشی پێچەوانەی ئێران لە شەڕێکی قورسدایە لە کەرتی کوشتاری باکووردا. بێجگە لەوەش ئامادەکاریی بەردەوامە لە بنکەی هێزی ئاسمانیی تەلیل لە عێراق بۆ ئەگەری بەکارهێنانی کیمیایی و ڕشتنی بە فڕۆکە. ترێلەیەکی گەورەی پەیوەندیدار بە کاروباری چەکی کیمیایی عێراقەوە لە کۆگا و عەمباری پەیوەندیدار بە هەڵگرتنی چەکی کیمیایی ماوەتەوە و بەلای کەمەوە پێنج ترێلەی تر لە دەرەوەی عەمبارەکە (مستەودەع) بوون. هەروەها دوو فڕۆکەی (سۆخۆی ـ ٢٢) لە کۆی سیازدە

فڕۆکەی شەڕکەر ــ بۆمبهاوێژ ئامادە بوون بۆ هەڵسان و تەقەمەنییان بار کردبوو"[١٦].

مەسەلەکە لێرەدایە، باشە مانگێک لەوەوپێش موخابەرات ئامادەکاریی بۆ هێرشەکەی هەڵەبجەش نەبینی، ئەو هێرشەی کە پەنجا فڕۆکەی لە خۆ گرتبوو و لە بنکەیەکی ئاسمانیی ناسراوەوە دەفڕین؟ بێجگە لەمەش ئەفسەرێکی سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی لەدایکبووی کوەیت (لە چاوپێکەوتنێکی سالّی ٢٠٠٠دا) دەگێڕێتەوە کەوا لە لایەن ئەفسەرانی موخابەراتی ئەمەریکییەوە، کە موقەدەمێکیان تێدا بووە، پێیان ڕاگەیەنراوە کە دەبێت لە نیسانی ١٩٨٨دا، لە ژووری ئۆپەراسیۆنی سەربازیی عێراقدا لە فاو ئامادە بن و لەوێ دیمەنێکی تایبەت و پڕمەترسیی مەیدانی شەڕیان بینی، کاتێک کە بە هاوبەشیی هاوپەیمانە عێراقییەکانیان تەماشای وێنەی سەتەلایتیی موخابەراتی ئەمەریکییان دەکرد. بەم ڕەنگە ئەوان ئاگاداری بەکارهێنانی گاز بوون، نەک تەنها لە پاش شەڕ ــ بە سەرنجدانی نەمانی ئاژەڵ و گیانەوەر و زۆریی دەرزیی ئەترۆپینی بەجێماو، کە لیوتنانت کۆلۆنێل ڕیک فرانکۆنای سەر بە دەزگای هەواڵگریی بەرگری باسی کردبوو ــ بەڵکو وەک ئەوەی کە ڕووی دابوو. "هەواڵگریی ویلایەتە یەکگرتووەکان شوێنپێی ئەو شتانەیان هەڵدەگرت کە دەهاتنە ناوەوە (وەک هاوردە) و ئەوەی لە دامودەزگای بەرهەمهێنانەوە دروست دەبوو، هەروەها زۆر لە نزیکەوە چاودێریی شەڕگەکانیان دەکرد"، ئەمە قسەی سێس کارۆس بوو، کە ڕوخسەتی فەرمیی ئاستبەرزی هەبوو.

دەسبەجێ دوای ئەوەی کارەساتە دڕندانەکەی هەڵەبجە گەیشتە سەر شاشەی تەلەڤیزیۆنەکان، تێد کۆپێڵی پێشکەشکاری بەرنامەی نایتلاین پرسیاری لە ئەلەستێر هەی کرد، کە پسپۆڕێکی بەرچاوی چەکی کیمیایی بوو، ئاخۆ هیچ ڕێگەیەک شک دەبات "بۆ ئەوەی ئەم عەزیایە بگێڕێتەوە ناو کووپەڵەکەی خۆی، هەر ڕێگەیەک بۆ قەدەغەکردنی بەکارهێنانی (چەکە کیمیاییەکەیان)؟" هەی لە وەڵامدا گوتی: "پێم وایە بە ڕاستی ئێمە پێویستمان بە سزا و ئابلووقەی توندتر لە لایەن وڵاتانی ترەوە. پێم وایە ئێمە پێویستمان بەوەیە کەوا کۆمەڵی نێودەوڵەتی بە تێڕوانینێکی خەتابارکردنەوە هەڵوێست لە خەتابارکردنی بەکارهێنانی توخمەکانی چەکی کیمیایی وەربگرن و پێویستە ئەو هەڵوێستە بە ڕوونی بپارێزن و ئەگەر وا نەکرێت چیتر کاریگەر نابێت".[١٧]

ئەمە نەکرا و نەدەبوو بیشکرێت. ئەو ئیشارەتەی کەوا بەکارهێنانی گاز بە تەواوی ڕێگە پێنەدراو و تابووە لە کاتێکدا کە بەڵێنیش وا بوو ببێتە هۆکارێک بۆ زەمانەتکردنی پاشەکشەی ئێرانییەکان، نەگەتیڤانە کاری کردە سەر ورەی عێراقییەکان. هەر چەندە هەڵەبجە دەرەنجامی ڕاچڵەکێنی چاوپۆشیی بەکارهاتنی گازی بە وڵاتدا هێنا، بەڵام بەرژەوەندییەکان ئەو دەمە هێند گەورە بوون کەوا پشتگیرییە بێسنوورەکانی واشنتۆن دەبوو بەردەوام بن ــ وەک دەڵێن بە چاوی نوقاو و توند دەستگرتن بە لووتەوە.

بێگومان کاربەدەستانی ئیدارەی ڕیگان نیگەران بوون لە ئەگەری ئەنجام و لێکەوتەی هێرشەکەی هەڵەبجە. وەک

ئەفسەرێکی خانەنشینی موخابەراتی ئەمەریکا (لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ٢٠٠٠دا) دەگێڕێتەوە کەوا:

"کاتێک هێرشەکەی هەڵەبجە، بە هۆی جێبەجێکردنی کەمپینێکی باشی پەیوەندییە گشتییەکانی ئێرانییەکانەوە ئاشکرا بوو، هەر دوو وۆلفۆویتز و ئەرمیتاج ویستیان یارمەتی و پشتگیریی خۆمان ڕابگرین، وەک مەترسییەک لە ئەگەری ئەو کاردانەوە توند و کوتوپڕەی دروست دەبێت، ئەگەر هات و زانرا کەوا ئەمەریکا زانیاریی موخابەراتیی داوە بە عێراق، لە کاتێکدا کە ئەوان گازی کیمیاییان کردووە بە سەر گەلی خۆیاندا. دواجار، لە کۆبوونەوەیەکی دەزگاکانی ناوخۆدا ـ کە پێم وایە کۆبوونەوەیەکی "جێگران" بوو، واتە کۆبوونەوەی جێگری وەزارەتەکان و (جێگری بەڕێوەبەری سی ئای ئەی) ـ بڕیاریان دا کەوا زۆر گرنگە ئێران جەنگەکە نەباتەوە".

بەڵگەکان دەیسەلمێنن کەوا ویلایەتە یەککگرتووەکان بە تەواوی ئاگادارە کە عێراق بووە گازبارانی هەڵەبجەی کردووە، کەچی ئێرانی بەوە تاوانبار کردووە کە لانیکەم بەشێکی بەرپرسیارێتیی لە ئەستۆیە و پاشان دیپلۆماتەکانی خۆی ڕاسپارد کە ئەو پشکە تاوانبارکردنەی ئێران بڵاو بکەنەوە و جاڕی لێ بدەن. بە واتایەکی تر، کاردانەوە لە ئاست هەڵەبجەدا، خەتابارکردنی ئیستیباقیی نەبوو وەک لە ساڵی ١٩٨٤دا کردی، بەڵکو زانیاریی هەڵە بوو و وا داڕێژرابوو کە بەرپرسیارێتیی تاوانەکە دابەش بکرێت، بۆ ڕێگرتن لە سزای بەکۆمەڵ.

ئەم دەهۆ و پلانە، سەرکەوتوانە کاری خۆی کرد کە عێراق بە قولاپەکەوە نەبێت و دەرەنجامێکی گرنگیشی لێ

کەوتەوە، ئەویــش ئەوەبــوو کە: عێراقییەکــان تیشــکێکی ســەوزی تریــان بەدی کــرد و دەســبەجێ ســوودیان لــێ وەرگرت. بەکارهێنانی تاکتیکییانەی گاز لە یەکەم ڕۆژی هەر قۆنــاغێکی ئەنفالــدا وای کــرد کە بتــوانن دەیــان هەزار کــۆ بکەنەوە و پاشـان بە پلانـی داڕێژرا و بیـانکوژن. هەڵبەت بە دڵنیاییەوە ئەمە سیاسەت و ئامانجی ویلایەتە یەکگرتووەکان نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا ڕاسـتەوخۆ ئەم ئەنجامەی لـێ کەوتەوە، بە هــۆی ئەوەوە کە نەیــانتوانی ئەو کــارەی عێراقییەکان بوەستێنن.

لە ئەیلــوولی ١٩٨٨دا، ئیــدارەی ڕیگــان، بە هەنــدێک دواکەوتنەوە، بۆ دواجار دەستی کێشایە مەسـەلەکەوە، بەڵام لەم خـاڵەدا زۆر درەنگوەخـت بـوو. چـونکە جەنـگ کۆتـایی هــاتبوو، یــاخیبوونی کــوردیش تێــک شــکێنرابوو و سـەرکردایەتیی عێراق قەنـاعەتی تەواویـان پەیدا کردبـوو کە هێـزی سـەربازیی نوێیـان دەتوانێـت چارەسـەری هەنـدێک مەسەلەی هەڵپەسێردراو بکات و کوەیت نۆرەی هاتبوو.

شەش مانگ پاش ڕووخانی ڕژێمی عێراق، دۆناڵد ڕامسفیڵدی وەزیری بەرگریی ئەمەریکا، لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣دا و لە نووسینی بابەتێکدا کە دەربڕینی بیروڕای شەخسیی خۆی بوو، هانا و هاوارێکی بڵاو کردەوە سەبارەت بە جەنگی واشنتۆن دژ بە تیرۆریزم و هێزەکانی ئەمەریکا بەرەوڕووی یاخیبوونێکی پەرەسەندوو بوونەوە لە عێراقدا و ئێستا دەیەوێت یادەوەرییەکی گرنگ بێنێتەوە بیری ئەمەریکییەکان. ڕامسفیڵد دەنووسێت کەوا بیست ساڵ لەمەوپێش، سەردانی بەیرووتی کردووە، وەک نوێنەرێکی شەخسیی ڕۆناڵد ریگان، بە ماوەیەکی کەم پاش ئۆپەراسیۆنەکەی حیزبوڵڵا کە ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگری لە سەربازگەی مارینزەکانی ئەمەریکادا تەقاندەوە و ٢٤١ سەربازی خزمەتی کوشت. ئەزموونی لوبنان دوو پەندی فێر کردووە، یەکەمیان کشانەوەی هێزەکانی ئەمەریکا، شەش مانگ دواتر زاتی خستە بەر تیرۆریستان لە سەرانسەری جیهاندا بۆ چاوەڕێکردنی هێرشی ڕووخێنەرتر دژ بە ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەوپێیە دەبێت ئەمەریکا شەڕی تیرۆریستان بکات و دەریانپەڕێنێت و نەهێڵێت پەنا ببەنە بەر هیچ شوێنێک و بۆ هەموو وڵاتانی ڕوون بکاتەوە کە لەخۆگرتن و داڵدەدانیان و کاری لەو چەشنە، ئەنجامی

خراپی لێ دەکەوێتەوە". لەوەش زیاتر لە نووسینەکەیدا ئەوە دەردەبڕێت کە جیهان پەرەسەندنی چەکی لەوە ترسناکتری بینیوە و ئەم چەکانە دەکرێت لە لایەن تیرۆریستانەوە دژ بە ئەمەریکا بە کار بهێنرێن و ئەمەش پێویستی بە کاردانەوەی بەهێز هەیە، پاساویش بۆ ئەوە "ئەگەر جیهان کار نەکات لەسەر ئەو زنجیرە پەیوەندییانەی لە نێوان تۆڕە تیرۆریستەکان و دەوڵەتە تیرۆریستەکان و چەکە کۆکوژەکاندا دەردەکەون، ئەوە ڕۆژێک دێت کە تیرۆریستان نەک زیاد لە ٢٤٠ کەس دەکوژن، وەک لە بەیرووتدا ڕووی دا، یان زیاد لە سێ هەزار کەس وەک لە ١١ی سێپتەمبەردا، بەڵکو دەیان هەزار کەس و بگرە زیاتر دەکوژن"[١٨].

گێڕانەوەکەی چیرۆکی لوبنان لە لایەن ڕامسفێڵدەوە، خۆدزینەوەبوو لە دوو شت، کە بریتی بوو لە هەر دوو ڕاستییەکی ناخۆش و ڕۆڵی ئەو خۆی لەو پەرەسەندنانەدا کە بوون بە مەترسییەکی گەورەتر بۆ جیهان. پێش هەموو شتێک، ئەوە گرنگە بێنیتەوە یادی خۆت کە بۆچی سەربازەکانی ئەمەریکا لە لوبنان بوون و بۆچی جەنگاوەرانی بزووتنەوەی حیزبوڵڵای تازە فریشککگرتوو لەبار بوون بۆ ئەوەی بە شێوەی نائاسایی بیانکەنە ئامانجی خۆیان. مانگێک پێش ئەوە، واتە لە ئەیلوولی ١٩٨٣دا، سەربازەکانی ئەمەریکا کە بەشێک بوون لە هێزێکی ئاشتیپارێزی فرەڕەگەز، کەوا سەربازانی فەڕەنسا و بەریتانیا و ئیتالیاشی لە خۆ گرتبوو، لە شەڕی ناوخۆدا بێلایەنیی خۆیان لە دەست دا و قورسایی پشتگیریی خۆیان بە لای کەتیبەکانی میلیشیا مەسیحییەکان و حکومەتی ئەمین جومەییلدا خست، دژ بە هاوپەیمانییەکی فەلەستینییەکان و

دوورزییەکـان و گرووپەکـانی تـری سـەر بە سـووریا. ئەمە هێڵەکانی بەرەی دوورزییەکانی لە زنجیرە چیای شۆف خستە بەر بۆردمانی هێزی دەریایی، کە تێیدا بێ بواردن چەندین گوند لێدران. جووتە هێرشـە خۆکوژیەکەی حیزبوڵلا دژ بە سەربازگەی مارینز و بارەگای فەوجی فەڕەنسییەکان، وەک کـاردانەوەیەکی ڕاسـتەوخۆ هـات بـۆ دەسـتتێوەردانی ئەمەریکـی و فەڕەنسـییەکان لە بەرژەوەنـدیی ڕژێـم لە بەیروت کە نە میللی و نە نوێنەری خەڵک بوو. ڕێکخراوەکە هەر دوو ئامـانجەکەی خـۆی هەڵبژاردبـوو، (کە هەر دوو سـەربازی بـوون و مەدەنـی نەبـوون) و شـێوەی جێبەجێکردنیشیان (کە خۆکوژی بۆمبە ئوتۆمبیل بوون)، بە هـونەرێکی کەم و کـاریگەرییەکی زیـادەوە. ئەگەر ئەم ئـامرازانە نائاسـایی بـوون، ئەوە لە کەشـتییە جەنگیـیەکەی نیوجێرسـیی ئەمەریکـا کوشـندەتر نەبـوون، کە بـۆمبی یەک تەنیـی دەگـرتە نـاوچە مەدەنییەکـان لە شـۆف[١٩]. بەرانـبەر گرتن لە هێزی قەبە و پڕچەکی ئاسایی بە تاکتیکی نائاسایی، نەریتپـارێزییەکی ئاسـایی گەریـلایە، کە "هەڕەشـەی نابەرابەریان" هێزێکی چەندبارە پێک دێنێت و ـ جۆرێکە لە یەکسـانی ڕاگـرتن کەوا بە دروسـتکردنی هاوسـەنگییەک لە ترس، هەستێکی ڕەوایی دەگەیەنێت لە چاوی ئەو لایەنەوە کە لە ڕووی سەربازییەوە لاوازترە[٢٠].

هەروەهـا ڕامسـفیلد نەیتـوانی باسـی سـەردانەکەی تـری بکـات لە گەشـتەکەی سـاڵی ١٩٨٣یـدا، بـۆ ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاست. چونکە تەنها سەردانی بەیروت و قودسی نەکرد، بەڵکـو یەکەم سـەردانی بـۆ لای سـەدام حسـێن بـوو وەک گەورە کاربەدەستێکی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە پلەوپایەی

ڕامسفیڵددا. لە ڕێخۆشکردندا بۆ گێڕانەوەی پەیوەندییە دیبلۆماسییەکان (وەک خەلاتکردنێکی عێراق بۆ شەڕکردنی لەگەڵ ئێراندا) و چاوداخستن لە ئاست چەکی کیمیایی عێراقدا، ڕامسفیلد تیشکی سەوزی بۆ عێراقییەکان هەڵکرد بۆ چڕکردنەوەی بەکارهێنانی گازیان. پشتگیریی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ دیکتاتۆری ملهوڕ، لە بەرانبەردا پیسترین ڕژێمی تیرۆریستیی لێ کەوتەوە و تارمایی تەشەنەکردنی چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی و ئەتۆمیی لێ پەیدا بوو کە وای لە ڕامسفیلد کرد بیست ساڵ دواتر ڕەخنەی زۆر توندی لێ بگرێت. جۆرج شوولْز لە پایزی ١٩٨٨دا، ددانی بەمەدا نا، ئەگەرچی بە درەنگیشەوە بوو، کاتێک تێبینیی کرد کەوا کۆبوونەوەی مووشەکی بالستی و چەکی کیمیایی لە ناودەستی ولاتێکدا، کە مێژوویەکی تیرۆریستیی هەبێت، خراپترین مۆتەکە بوو بۆی[٢١]. بێجگە لەوەش، شەش مانگ لەوەوپێش عێراق هەڕەشەی کرد کە هێرش دەکاتە سەر تاران و شارەکانی تری ئێران بە مووشەکی کلاوە کیمیایی و ئەمە دەبێت ئاگاداریی پێشوەختی دابێتە شوولْز. تەنها سێ ساڵ دواتر و لە کانوونی دووەمی ١٩٩١دا، عێراق مووشەکی سکۆدی نا بە ئیسرائیلەوە لە کەشوهەوای ترسێکی بەربلاودا، کەوا کلاوەی جەنگیی پڕ لە توخمی کیمیایی پێوەیە. هەر چەندە ئەمە ڕووی نەدا، بەلام عێراق توانای هەبوو. وا پێدەچێت تەنها هەڕەشەکردن بە کاردانەوەیەکی ئەتۆمی، تەگەرەی خستە بەردەمی سەدام حسێن.

وا ئێستا ئێمە گەیشتووینە چەرخی تیرۆر، کە زەمانێکە خەڵکی خۆکوژ و خۆتەقێنەوە لە لایەن ئەو کەسە

دڵڕەقانەوە ئاڕاستە دەکرێن، کە لە ڕێکخراوی سێبەردا کار دەکەن. نەبینینی کار و کردەوەی پێشکەوتووی، ڕەنگە ببێتە هەڵەیەکی جیددی و هەموو هەوڵێک پەک بخات بۆ گەلاڵەکردنی کاردانەوەیەکی کاریگەر. کارێکی ئاسانە سەرکۆنەی گرووپەکانی گەریلا بکەین، لەبەر ئەوەی ناتوانن پابەندی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان ببن، چونکە بەشێک نین لەو ڕێککەوتننامانە. ڕاستە دەبێت نۆرمە بنەڕەتییەکانی مرۆڤایەتی بەسەر هەمواندا جێبەجێ بکرێت، بەدەر لە ئیمزاکردن، بەڵام ئەوە حکومەتەکانی دنیایە بە هەموو سەرچاوە و کۆمەڵەی ڕێکخراوییانەوە، بە ستانداردی مۆراڵی و حوکمی یاسایانەوە، دەبوو نموونەی پەیڕەویکردن بن. ئێستا دەوڵەتە سەرەکییەکانن کە بوون بە پێشێلکاری گەورەی زۆربەی ئەو ڕێککەوتننامانەی خۆیان لە پێشی پێشەوەی دانوستان و ئیمزاکردنیاندا بوون و بەو کارەیان مەترسیدارترین پەیامیان گەیاند.

بۆ نموونە، ڕێککەوتننامەی چەکی کیمیایی وەرگرە، کە پەیماننامەیەکە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە لایەن سەرکردایەتییەکی دیبلۆماسیی بەهێزەوە بەئەنجام گەیشتووە، لە سەردەمی ئیدارە یەک لە دوای یەکەکانی ئەمەریکادا و لە ساڵی ١٩٩٧دا سەرۆک کلینتۆن ڕەزامەندیی لەسەر دەربڕیوە. بە تێپەڕبوون بە قەوارەی یاسایی پێویستی جێبەجێکردن لە ساڵی ١٩٩٨دا، کۆنگرێسی ئەمەریکی ـــ بەسەر بەرهەڵستیی ئیدارەی کلینتۆندا ـــ هەندێک تەحەفوزی خستە سەر، کە ڕاستەوخۆ پەیماننامەکەی پێشێل دەکرد و ڕێگەی بە دەوڵەتە ئیمزاکردووەکان نەدەدا حاڵەتەکان تاوتوێ بکەن. ئەم

تەحەفوزانە ــ وەک مافی سەرۆک بۆ ڕەتکردنەوەی تەحەدای پشکنین، قەدەغەکردنی ناردنە دەرەوەی ئەو نموونانەی لە کاتی پشکنیندا کۆ کراونەتەوە، سنووردانان لەسەر ژمارەی دامودەزگای پیشەسازی کە پێویستە ئەو چالاکییانەیان ڕوون بکرێتەوە، کە پەیوەستە بە قەدەغەکردنی ماددە کیمیاییەکانەوە ــ بە شێوازێک کراون پابەندبوونی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە ڕێککەوتننامەکەوە، بێمانا بێت.

پێشێلکردنی ڕێککەوتننامە فرەلایەنەکانی وەک پرۆتۆکۆڵی جنێڤ، ڕێککەوتننامەی جنێڤ، ڕێککەوتننامەی چەکی کیمیایی و لاوازکردنی دەزگا و دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانی وەک نەتەوە یەکگرتووەکان، دەرەنجامی ڕاستەقینەی هەیە. ئەمە زۆربەی ئەو بنەما و پێوەرانە تووشی خۆرە دەکات کە ئەم ڕێککەوتننامە و دەزگایانەیان لەسەر دامەزراوە و پشتی پێ دەبەستن و تەواو بنەڕەتین لە قەدەغە لەسەردانانی بەئامانجکردنی خەڵکی مەدەنی لە جەنگدا. هەر چەندە ئەمانە بە زۆری ئەکتەری نادەوڵەتین (وەک یاخیبوانی عێراق و شەڕکردنی فەلەستینییەکان لەگەڵ سوپای داگیرکەری ئیسرائیلدا و تیرۆرستانی قاعیدە)، کەوا قورساییەکی زۆری ئیدانەی ئەخلاقییان لەسەرە، هەروەها دەوڵەتیشن (وەک ئیسرائیل لە فەلەستین و لوبناندا و ئەمەریکا لە عێراقدا) کە نموونەی بالادەستی بەکارهێنانی چەک و تەقەمەنین لە ناوچەکانی نیشتەجێی خەڵکدا و پاشان خۆحەشاردان لە پشت بیانووی حازربەدەستی "دەسنیشانکردنی بکوژان" و "کاردانەوەی گونجاو" و "زیانی لاوەکییەوە". سوپای بە باشی دیسپلینکراو و پرۆفێشناڵ و

خاوەن چەک و تفاقی تۆکمە و توندوتۆڵ و شەلم کوێرم خەڵکی مەدەنی داناگرێتەوە، بەڵام ئەگەر لە ئەنجامی چەندبارەبوونەوەی ئەم کارەیاندا، خەڵکی مەدەنیی زۆر کوژرابێتن، ئەوە بنەمای ئەخلاقیی گیانفیدایی لە دەست دەدەن.

ئەگەر ویلایەتە یەککرتووەکان متمانە و باوەڕی خۆی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا لە دەست نەدایە بە بۆردمانی دێهاتی لوبنان لە ساڵی ١٩٨٣دا، بە تاوانبارکردنی سەدام حسێن بەوەی کە "ئەو پیاوە بوو کەوا گەلەکەی خۆی گازباران کرد" پاش ئەوەی تیشکی سەوزیان بۆ هەڵکرد، بە دەرپەڕاندنی هێزەکانی عێراق لە کوەیت لە کاتێکدا پارەی بە ئیسرائیل دەدا و بە شێوەیەک لە شێوەکان پشتگیریی داگیرکردنی ستەمکارانە و دڕندانەی ئەو وڵاتە دەکات بۆ فەلەستین لە ڕووی سەربازییەوە، یان بە هۆی پشتگیری و دەسگرۆیی ڕژێمە فاشیست و تاکڕەوەکان، لە کاتێکدا کە ئەوانە دژی بەهاکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤن و پاشان بە دڵنیاییەوە ڕاگەیاندنێک لە لایەن مادلین ئۆلبرایتی باڵیۆزی کلینتۆن لە نەتەوە یەککرتووەکان و (دواتر وەزیری دەرەوە) بە توندی دەیگرێت. ساڵی ١٩٩٦ لیسلی ستال لە بەرنامەی "٦٠ دەقیقە"ی تەلەڤیزیۆنی CBSدا لە ئۆلبرایتی پرسی ئاخۆ زەرەروزیانی مرۆڤ لە ئەنجامی سزا نێودەوڵەتییەکانی سەر عێراق هیچ پاساوێکیان هەیە، چونکە "ئێمە بیستوومانە کە نیو ملیۆن منداڵ مردوون و پێم وایە ئەوە لە ژمارەی ئەوانەی لە هیرۆشیمادا مردن زیاترە... باشە ئەمە ئەوە دەهێنێت؟" ستاڵ ئەم پرسیارەی کرد و ئۆلبرایتیش لە

وەڵامدا گوتی "پێم وایە ئەمە بەراوردێکی زۆر سەختە، بەڵام بۆ نرخەکەی، ئێمە پێمان وایە بەڵێ دەیهێنێت".

نموونەیەکی سەرەکیی پێشتر لە بارەی ئەوەوە کە چۆن بنەما و پێوەرە گشتییەکان بە شێوەیەکی ترسناک لاواز کراون لەم کتێبەدا باسی لێوە کراوە و دیسان عێراقی گرتووەتەوە. شکستخواردنی کارکردن دژی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق، لە سالانی ١٩٨٣ ـــ ١٩٨٤دا کەشوهەوایەکی پارێزبەندیی خوڵقاند، کەشوهەوایەک کەوا ڕژێم بە ئاشکرا پێی لێ دەنێت. ئەم پارێزبەندییە بۆ دواتر نوقلانەلێدەری ستەم و پێشێلکارییەکی خراپتر بوو، تا گەیاندیە تاوانی نێودەوڵەتیی چەشنی: تاوانی جەنگ (وەک بەئامانجکردنی خەڵکی مەدەنی لە جەنگدا)، تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی (وەک گازبارانی هەڵەبجە) و جینۆساید (وەک کوشتنی سیستماتیکیی خەڵکی سڤیلی کورد لەو ناوچانەی دیاریکرابوو بۆ بەعەرەبکردن). لەم بارودۆخەدا، سیاسەتی سەرلەقاندن و چاوپۆشی کردنی واشنتۆن، کاری گەیاندە بەشداربوون لە تاواندا. لە کۆتایی سالانی نەوەدەکاندا، وەزارەتی دەرەوە نیگەرانییەکی درەنگوەخت پیشان دەدا بە تێوەگلان لەم سیاسەتەدا، کاتێک پارێزەرەکانی داوای پێداچوونەوەی بەڵگەنامەکانیان لێ کرا، وەک بەشێک لەو بێنەوبەرەیەی ئاخۆ سیاسەتی ئەمەریکای سالانی هەشتاکان، سەبارەت بە عێراق و بە تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندیدار بوو بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاییەوە، دەبوو ئەو مافە لە ئەمەریکا بسێنێتەوە و بە شیاوی ئەوەی دانەنێت بەشداری بکات لەو هەوڵ و کۆششانەدا کە دەدرێت بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی عێراق بخرێتە قەفەزی تاوانەوە. لە

کۆتاییدا، پلاتفۆرمێکی داکۆکیی نێودەوڵەتی یان مینبەرێکی هاوبەشی پسپۆڕانی عێراق و نێودەوڵەتی نەبوو، بەڵکو پلاتفۆرمێکی تەواو عێراقی بوو بە پشتگیریی دارایی و هەڵسووڕانی واشنتۆن، بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبێت ڕێگری لە هەندێک ڕووداوی چاوەڕواننەکراوی ناخۆش بکات. هەروەها بە هۆی ئەم مێژووەوە یەکێک لە کارە دەسپێکەکانی ئیدارەی تازە دەستبەکاربووی بوش لە ساڵی ٢٠٠١دا، هەڵوەشاندنەوەی ئیمزای سەرۆک کلینتۆن بوو بۆ ڕێککەوتننامەی ڕۆما لەمەڕ دامەزراندنی دادگای تاوانە نێودەوڵەتییەکان، چونکە ئەمڕۆ تاکلایەنی و سزا نەگرتنەوە یان پارێزبەندیی سیستەمی باوی ڕۆژن.

سەرکردە پایە بەرزەکانی عێراق لە ساڵانی ٢٠٠٥ و ٢٠٠٦ەوە، لە بەردەم دادگایەکی عێراقیدا دادگایی دەکرێن. سەدام حسێن لەسەر کۆمەڵکوژییەکی ساڵی ١٩٨٢ی شارۆچکەی دوجەیلی شیعەنشین بە سزای ئیعدام حوکم درا و لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٦دا هەڵواسرا. لە ساڵی ٢٠٠٧دا، دادگاییکردنی ئەوانەی تێوەگلابوون لەو تاوانانەی لە شالاوی ئەنفالدا بەرپا کران بەردەوامە و عەلی حەسەن ئەلمەجید و سابیر ئەلدووری و کەسانی تریش بەرەوڕووی یاسا کراونەتەوە، بەڵام سەدام حسێنی تێدا نەماوە و (لەبەر چەند هۆیەکیش وەفیق سامەڕایی تێدا نییە). دادگاییکردنی گازبارانی هەڵەبجەش لە ئامادەکردندایە. بە هەرحاڵ، ئەم دادگاییکردنانە زۆر دوا کەوتوون لەوەی جۆرە پەیامێکی وا بگەیەنن کە دەبوو لە قۆناغە سەرەتاییەکانی بەکارهێنانی چەکی کیمیاییدا نەیانهێشتایە خراپتر ڕوو بدات. بێجگە لەوەش ئەوانەی کە بەشدار بوون لەم تاوانانەدا، بە

دابینکردنی کەرەستە و ئامراز و هەڵکردنی تیشکی سەوز و داپۆشینی کاری خۆیان بە فێڵ و چاوبەستی، هەرگیز ناچنە بەردەمی دادگا. بە پێچەوانەوە ئەمڕۆ ئەوانە ئەندازیاری جەنگی عێراق و کاری هەمەلایەنەی ئیدارەی بوشن.

ئەمە ئەو ترس و سامە دێنێتەوە یاد کە جەنگی جیهانیی دووەم بەرپای کرد و پاڵنەرێکە بۆ نوێکردنەوە و بەرفراوانکردنی سیستەمێکی رێککەوتن بۆ دارشتنی ئەو بنەمایانەی پشت بە یاسا و پێوەرە بنچینەییەکان دەبەستن، بۆ ئەوەی رێگە بگرێت لە گەڕانەوە بۆ بارێکی شێرازە تێکچووی لەو چەشنە. بەبێ نوێکردنەوەی پابەندیی بۆ ئەم پەیماننامانە و ئەو بەهایانەی بەرجەستەی دەکەن دەبێت لەوە دڵنیا بین کەوا ئەم جیهانەی ئێمە و منداڵەکانمانی تێداین، بەرەو ئاقارێکی ترسناکتر دەڕوات.

**ویلایەتە یەکگرتووەکان، ئابی ٢٠٠٦**

لە ژوورێکی دانیشتنی شارۆچکەیەک لەسەر قەنەفەیەک دانیشتووم و ژمارەیەک ژن و پیاو و منداڵ، بە خێزانی خۆیشمەوە، دەوریان داوم. دەمەتەقێ لە نێوان دانیشتواندا لە ئینگلیزییەوە (کە زمانی منداڵەکان و زیاتریش هی گەورەکانە) بۆ عەرەبی (کە دەتوانم لەگەڵ دۆستەکانمدا قسەی پێ بکەم) و بۆ کوردی (کە ناتوانم قسەی پێ بکەم، بەڵام هەموانی لەم ژوورەدا پێکەوە بەستووە)، ئەمسەر و ئەوسەر دەکات. قسە و گفتوگۆی ئێمە لە سەر عێراق، خواردنی کوردی، وردە نەخۆشییەکان و ژیان لە کوردستاندا بوو. منیش گەڕابوومەوە بۆ ئەو ڕۆژەی کە دە ساڵ لەمەوبەر لە ئۆتۆمبیلێکی سەربازیی ئەمەریکیدا دانیشتبووم، کە لە پردێکی سەر ڕووباری خابووری سنووری نێوان تورکیا و عێراق دەپەڕییەوە، هەتاو بە ڕاسەرەوە لێی دەداین و چاوەڕوانییش زۆری کێشا و منیش دڵنیا نەبووم ئەو تاقمەی چاوپێکەوتنم لەگەڵ ڕێک خستبوون لە سلێمانییەوە دەگەنە سەر سنوور، کە خاڵی دەستپێکردنیان بوو.

ئەو دەمە نۆڤەمبەری ١٩٩٦ بوو، سێ مانگ پێشتر هێزەکانی عێراق ڕژانە هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردەوە، بە هاوکاریی (پ د ک)، کە بە شێوەیەکی کاتی،

دایه پاڵ ئەو هێزانە بۆ شکستپێهێنانی (ی ن ک)ی دوژمنی هاوبەش، کە چوار ساڵ بوو کەوتبوونە شەڕ و ناکۆکییەکی ناوخۆیی سەخت و کوشندەوە. ئۆپەراسیۆنەکە لەناوچوونی ژمارەیەک جەنگاوەری ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لێ کەوتەوە، کە خۆیان بۆ ڕووخاندنی ڕژێم ئامادە دەکرد (ئەمە دەسپێشخەرییەک بوو نەیتوانی پشتگیریی ویلایەتە یەککگرتوەکان بە دەست بێنێت و بەوپێیە هەر لە سەرەتاوە لە شوێنی خۆیدا پووکایەوە). هەروەها کۆتایی بە چوار ساڵی کاری باشی حکومەتی ئەمەریکا و ئەو ڕێکخراوە ناحکومییانە هێنا، کە ویلایەتە یەککگرتووەکان یارمەتیی دارایی دەدان بۆ بووژانەوەی کوردستان، لە ئەنجامی کاولکاریی پێش و پاش و کاتی ئەنفالدا. لە ماوەی مانگێکدا ئیدارەی کلینتۆن بە فڕۆکە هەواڵگرە کاریگەرەکانی و هاوولاتییانی خۆی لە ناوچەکە بردە دەرەوە. فرەی پێ نەچوو، ئیدارە بڕیاری دا هەموو ئەوانەش بگوێزێتەوە کە پەیوەندییان هەبوو بەو پرۆژانەوە کە ئەمەریکا یارمەتیی دارایی بۆ دابین دەکردن. ئەمە هەزاران کوردی گرتەوە، کە هەڵبژاردەی خوێندەوار و کادری قاڵبووی کاروبار بوون و سەرتۆپی شارەزایانی کۆمەڵگەی خۆیان بوون و پالاوتەیەکی ڕاستەقینەی داچۆڕاندنی ئەقڵ بوون. لە نۆڤەمبەردا ئۆپەراسیۆنەکە خێراییەکی تەواوی بە خۆوە بینی[(١)].

بێجگە لەم کۆششە ئاشکرا و جاڕلێدراوە، دەسپێشخەرییەکی هاوتەریب ژێربەژێر ڕێک دەخرا. بە کارکردن لەسەر داواکارییەکی هیومان ڕایتس ووچ و لەسەر ڕاسپاردەی کۆشکی سپیی لەمەڕ کلینتۆن و سوپای

ئەمەریکــا بە کــارکردن و هەمــاهەنگییەکی نزیــک لەگەڵ حکـومەتی تورکیـا ڕازی بـوون بە گواسـتنەوەی گرووپێکـی بچـووکی کـوردی عێـراق و خێزانەکانیـان لە کوردسـتانی عێراقەوە بـۆ ئەمەریکـا بە مەبەسـتی سـەلامەتیی شـایەتحاڵە سـەرەکییەکان بـۆ هەر دادگـاییکردنێکی داهـاتووی سـەدام حسێن و ڕژێمەکەی ـ شـایەتحاڵنی کوشـتارە بنەڕەتیەکـانی ئەنفال. ئەمانە پێنج پیاو و کوڕێک بوون. لە لوتکەی شالاوی ئەنفالدا، سـاڵی ١٩٨٨، پۆلیسـی ئاسایشـی عێراق، بە جیاجیـا لەگەڵ هــاوەڵ و کەســوکاریاندا ترنجانــدبوونیانە پاســی بچووکەوە و ڕەوانەی بیابانی ڕۆژئاوای عێراق کرابـوون بـۆ کوشــتن. ئەوجــا لێـرە دایانبەزانــدبوون و خســتبوونیانە خەنەکـی تـازە هەڵکەنـدراوەوە و کۆمەڵکوژیـان کردبـوون. بەڵام بە شـێوەیەکی موعجیزەئاســا ئەم پێـنج پیـاوە لەگەڵ کــوڕە مێرمنــداڵەکەدا، هەر یەکە و بە جۆرێــک، ڕزگاریــان بووبــوو لەژێــر پەردەی شــەودا و لە زۆر ڕووەوە بەخــت یاوەریان بووە و ئەقڵ و زیرەکیی خۆیـان بە کار هێنـاوە و دواجــار توانیویــانە بــگەنەوە کوردســـتان و لەوێ خـــۆ بشـارنەوە تـا ئەو دەمەی لە ئۆکتـۆبەری ١٩٩١دا، هێزەکـانی عێراقی لێ کشایەوە.

یەکتربینینەوە لە ناوەڕاستی پردەکەدا خۆشـییەکی زۆری پێ بەخشین، بەڵام کورتخـایەن بوو. بەپێی دەسنیشـانکردنی ناسـنامە، سـێ پیـاو و کـوڕە مێرمنـداڵەکە ڕێگەیـان پـێ درا لەگەڵ خێزانەکانیـان بپەڕنەوە و دەسـبەجێ سـواری فڕۆکە کـران و بـۆ دوورگەی گوامیـان بـردن و لەوێ چـوونە پـاڵ ژمارەیەکی زۆری تری کوردی گوێزراوە، بۆ ئەوەی مـاوەی چەنـد مانگێـک تێیـدا ڕابـێن و ڕاهێنـانی زمـان بـکەن، پـێش

ئەوەی لە ئەمەریکادا نیشتەجێ بکرێن. دوو ڕزگاربووەکەی تری ئەنفال دوو ساڵ دواتر هێنران بۆ ئەمەریکا.

گواستنەوە لە دێهاتی کوردستانەوە بۆ شێوە ژیانێکی مەدەنی لە ئەمەریکادا، بەرەنگاربوونەوەیەک بوو بۆ ئەم کوردانە، کە تەنها خوێندنێکی سەرەتایی و خزمەتی سەربازیی لێ بترازێت لە سوپای عێراقدا و لە بەرەی جەنگدا، لە گەرمیان بەولاوە کە تێیدا گەورە بووبوون، شتێکی ئەوتۆیان لە دنیای دەرەوەی خۆیان نەدەزانی. بەڵام ئەمڕۆ، کە دەکاتە دە ساڵ دوای ئەوە، ئەوان گەشەیان کردووە و لە کاتێکدا کە پیاوەکان کاری کرێ نزم دەکەن لە شوێنەکانی فاست فوود و ئوتومبیل شۆردندا، منداڵەکانیان شارەزایی پەیدا دەکەن لە پێداویستییە بنەڕەتییەکانی ژیانی مۆدێرندا، وەک ئینتەرنێت و خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکەن و دەچنە کۆلێج. دواجار ئەوانە لە ئارامیدا دەژین و هیوایان بە دواڕۆژە.

## پەراوێزەکان

### دەسپێک

١- "گازی ژەهراوی، تاوانی عێراق" سەروتاری نیویۆرک *تایمز*، ٢٦ی مارتی ١٩٨٨.

٢- جولیان پێری ڕۆبنسن و جۆزێف گۆڵدبلات "شەڕوشۆڕی کیمیایی لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا". (ئینستیتیوتی ستۆکهۆڵم بۆ توێژینەوەی ئاشتیی نێودەوڵەتیی SIPRI ــ ١٩٨٤)، ل٣.

٣- هیومان رایتس وۆچ، *"تاوانی جینۆسایدی عێراق: پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد"* (نیوهاڤن و لەندەن: چاپی زانکۆی یاڵ، ١٩٩٥)، بەشی ٩ "دەستەی گوللەباران".

### پێشەکی: مشتومڕ لەسەر هەڵەبجە

١- لە دوو باری جیادا لە مایسی ١٩٩٢و ئابی ١٩٩٣دا، سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکان هەژدە تەنی مەتریی بەڵگەنامەی پۆلیسی نهێنیی عێراقی گواستەوە بۆ ئەمەریکا، لەوانەی کە لە لایەن حیزبە کوردییە یاخیبووەکانەوە دەستیان بەسەردا گیرا، لە ماوەی ڕاپەڕینە کورتخایەنەکەی ساڵی ١٩٩١دا، بۆ پاراستن و شیکردنەوەیان. ئەمانە سپێردرانە دەزگایەکی ئەرشیفی نەتەوەیی ئەمەریکا، بە سەرپەرشتیی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سەناتی ئەمەریکا (ئەنجوومەنی پیران، و). ڕێکخراوی ناحکومیی هیومان رایتس

وۆچ، له سـالآنی ١٩٩٢ ــ ١٩٩٤دا، ئیمتیـازی تـاوتوێکردنی ئەم بەڵگەنامـانەی وەرگـرت بـۆ لێکـۆڵینەوە و وردەکـاریکردن له بەڵگەی تاوانەکانی مـافی مرۆڤدا. نووسـەر سەرپەرشتیی ئەم پـرۆژەیەی هیومـان ڕایـتس وۆچـی دەکـرد لەم مـاوەیەدا و (یـاوەریی دووەم جاریشـی کـرد له ئـابی ١٩٩٣دا). ئەنجـامە بنەڕەتییەکـان له دووتـوێی دوو بلاوکـراوەی میـدڵ ئیسـت وۆچدان: *"جینۆسـاید له عێراقدا و پەلامـاری ئەنفال بۆ سـەر کـورد"*، (سـاڵی ١٩٩٣) و *"بیرۆکراسیی داپڵۆسین: حکـومەتی عێراق له ڕوانگەی قسەکانی خـۆیەوە"*، (سـاڵی ١٩٩٤) و لەم دوو ماڵپەڕەدان:

www.hrw.org/reports/1993/Iraqanfal
www.hrw.org/reports/1994/iraq

دواتر ئەم دوانه له کتێبێکدا لێک دران و له لایەن هیومـان ڕایتس وۆچەوە بـلاو کـرایەوە به نـاوی، *"تـاوانی جینۆسـایدی عێراق: پەلامـاری ئەنفال بۆ سـەر کـورد"* (نیوهـاڤن و لەنـدەن: چاپی زانکۆی یاڵ، ١٩٩٥).

٢- پزیشـکانی مـافی مـرۆڤ PHR و هیومـان ڕایـتس وۆچ HRW *"کـارێکی زانسـتی بـۆ یەکەم جـار: نمـوونەی ئەو خـۆڵانەی له چاڵە بۆمبەکـانی بـاکووری عێـراق وەرگیـراون، دەمارەگـاز پیشـان دەدەن، تەنـانەت چـوار سـالیش دواتـر"*. ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەنووسی (٢٩ی نیسـانی ١٩٩٣)، لەم سـایتەدا بیخوێنەوە: www.phrusa.org

٣- ئەو بەڵگەنامـانەی حکـومەتی ئەمەریکا و هەواڵگری، که لەم کتێبەدا هـاتوون، یـان به داواکـاریی دانەری ئەم کتێبە به دەسـت هـاتوون، بەپێـی یاسـای ئـازادیی زانیـاری، ئەرشـیڤی ئاسایشـی نەتەوەیـی نـاحکومی که له واشـنتۆنه (www.nsa.org) یـان گاڵفلینـک (www.gulflink.osd.mil)،

که دەسپێشخەرییەکە لە لایەن جەنگاوەرانی دێرینی جەنگی کەنداوی ساڵی ١٩٩١ەوە، بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەسەر توانای پێشووی چەکی کۆکوژی عێراق لە بەدواداچوونی نیشانە ڕوونەکراوەکانی جەنگی کەنداودا. بەوپێیە سەرچاوەی بەڵگەنامە فەرمییەکانی ئەمەریکا، لێرەدا بەم شێوەیە ئیشارەتیان بۆ دەکرێت: دانەر ـ FOIA (واتە یاسای ئازادی زانیاری)، NSA ـــ FOIA (واتە ئەرشیڤی نەتەوەیی)، یان FOIA ـ Gulflink گاڵفلینک.

٤- لەمە وەرگیراوە: "تاران بەغدا تۆمەتبار دەکات کەوا چەکی کیمیایی دژ بە شارێکی کوردنشینی عێراق بە کار هێناوە"، بە فەڕەنسی، ئاژانسی فرانس پرێس، ١٦ی مارتی ١٩٨٨.

٥- بێرنارد ی. تریێنەر "لێدانەکانی ئێران هێرشە ترسناکەکەی زستان نییە"، *نیویۆرک تایمز*، ٢٧ی مارتی ١٩٨٨.

٦- ئالان کۆوێڵ، "تاکتیکەکانی ئێران ـ عێراق: جەنگکردن دوور لە بەرە"، ڕۆژنامەی *ئینتەرناشنال هێراڵد تریبیۆن*، ٢٤ی مارتی ١٩٨٨.

٧- "پتر لە ٢٠٠٠ کورد لە بۆردمانی کیمیاییدا کوژراون، بەپێی سەرچاوە کوردییەکان"، بە فەڕەنسی، ئاژانسی فرانس پرێس، ١٨ی مارتی ١٩٨٨.

٨- ئاژانسی دەنگوباسی عێراق، ١٧ی مارتی ١٩٨٨، لە FBIS – NES – 88 - 052, P. 31دا، بڵاو کراوەتەوە.

٩- چەند نامەیەکی محەمەد محەللاتی، زنجیرە / ١٩٦٣٧ (١٧ی مارتی ١٩٨٨)، زنجیرە / ١٩٦٣٩ (١٧ی مارتی ١٩٨٨)، زنجیرە / ١٩٦٤٧ (١٨ی مارتی ١٩٨٨).

١٠- لەمە وەرگیراوە: "ئێران دەڵێت عێراق دەمارەگازی بە کار هێناوە و وەک تاران بە نەتەوە یەکگرتووەکانی گوتووە،

٥٠٠٠ کـورد کـوژراون"، ئەسۆشـیەیتد پـرێس، ٢١ی مـارتی ١٩٨٨و نامەکـانی محەللاتـی زنجیـرە / ١٩٦٦٤، ٢١ی مـارتی ١٩٨٨.

١١- پۆڵ کۆرینـگ، "قوربانییـانی گـازی ژەهـراوی تـرس و تۆقینی بۆمبباران دەگێڕنەوە"، *گلۆب ئەند مەیل Globe and Mail*، ٢٢ی مارتی ١٩٨٨.

١٢- نـامەیەک لە محەللاتیـیەوە، زنجیـرە / ١٩٦٦٩، ٢٢ی مارتی ١٩٨٨.

١٣- دیڤیـد هێرسـت "ئێـران کوژراوەکـانی پەلامـاری گـاز نمایش دەکات"، ڕۆژنامەی *گاردیان*، ٢٢ی مارتی ١٩٨٨.

١٤- ڕۆژنـامەی *جیرۆسـەلیم پۆسـت*، ٢٣ی مـارتی ١٩٨٨، چیرۆکەکان بە بروسکە نێردراون.

١٥- وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان "کـورتەی ڕاگەیاندنی ڕۆژانە"، ٢٣ی مارتی ١٩٨٨.

١٦- لە نووسـینێکی جـیم مـویرەوە وەرگیـراوە بە نـاوی "هێرشـەکانی گـازی عێـراق تـرس و تـۆقینی جەنگـی گەورە دینێتەوە یاد" ڕۆژنامەی *سەندەی تایمز*، ٢٧ی مارتی ١٩٨٨.

١٧- "بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لە جەنگـی ئێـران ـــ عێراقدا"، دەقی بەرنـامەی "نـایتلاین"، کە لە ٢٣ی مـارتی ١٩٨٨دا پیشان دراوە.

١٨- ڕۆژنـامەی *کریستیان ساینس مۆنیتەر*، ١٣ی نیسـانی ١٩٨٨.

١٩- "سـکرتێری گشـتی و خـاچی سـوور لەسـەر مەسـەلەی چەکـی کیمیـایی ڕاوتەگبیـر دەکەن"، ڕاگەیانـدنی نەتەوە یەکگرتووەکان س ج / س م / ٤١٠٣، ١٥ی مارتی ١٩٨٨.

٢٠- ئاژانسی دەنگوباسی عێراق، ٢٩ی مارتی ١٩٨٨.

٢١- نــامەیەک لە مەحمــوود مادەرشــاهییەوە، زنجیــرە / ١٩٧٤١، ٥ی نیسانی ١٩٨٨.

٢٢- لە ڕۆژنامەی *ئەلرەئیی (الرأی)* ئوردنییەوە وەرگیراوە، ٢٩ی مارتی ١٩٨٨، لە FBIS – NES – 88 - 060 p. 34

٢٣- نــامەیەک لە عیسـمەت کەتـانییەوە، زنجیـرە / ١٩٧٣٠، ٥ی نیسانی ١٩٨٨.

٢٤- "ســەرۆکی پەرلەمــان تــۆمەتی چەکــی کیمیــایی ڕەت دەکاتەوە"، ئاژانسی دەنگوباسی عێراق، ٥ی نی سانی ١٩٨٨، لە FBIS – NES – 88 - 067, p.17 و "تیمەکەی نەتەوە یەکگرتووەکـان دەڕواتەوە پـاش جێبەجێکردنـی ئەرکـی خـۆی لەســەر قوربانییــانی چەکــی کیمیــایی"، ئاژانســی دەنگوباســی عێراق، ١١ی نیسانی ١٩٨٨، لە FBIS – NES -88 - 072, p.32. جەختی لەسەر کراوە.

٢٥- پاتریــک ی. تــایلەر، "هەر دوو لا عێــراق و ئێــران لە جەنگــدا گازبــارانی کوردیــان کــردووە بەپێــی لێکــۆڵینەوەی ئەمەریکــا"، ڕۆژنــامەی *واشــنتۆن پۆســت*، ٣ی مایســی ١٩٩٠. دواتر تایلەر گواستیەوە بۆ ڕۆژنامەی نیویۆرک *تایمز*.

٢٦- نــامەیەک لە مادەرشــاهییەوە، زنجیــرە / ١٩٧٤١، ٥ی نیسانی ١٩٨٨.

٢٧- ئەنجـــوومەنی ئاسایشـــــی نەتەوە یەکگرتووەکـــــان "ڕاپـۆرتی نێـردراوی سـکرتێری گشـتی بـۆ لێکـۆڵینەوە لەســەر ئیـدیعاکانی بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لە شــەڕ و ململانێـی نێوان کۆمـاری ئیسـلامیی ئێران و عێراقدا"، زنجیرە / ١٩٨٢٣، ٢٥ی نیسانی ١٩٨٨.

٢٨- بەڕێــوەبەری موخــابەراتی مەرکەزی "کـــاریگەری و تێوەگلان لە بەکارهێنـانی چەکـی کیمیـایی لە جەنگی ئێران ــ

عێراقدا"، مێژووی لەسەر نییە، بەڵام کۆتایی ١٩٨٧ و سەرەتای ١٩٨٨ە، (FOIA - Gulflink).

٢٩- دێڤید ئیگناتیۆس "پەیوەندیکردن بە ئێرانەوە" ڕۆژنامەی *واشنتون پۆست*، ٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٦.

٣٠- گۆڤاری *تایم Time*، ١٩ی مارتی ١٩٨٤.

٣١- "عەزیز بەکارهێنانی 'گازی ژەهراوی' لە جەنگی کەنداودا دەسەلمێنێت"، هامبۆرگ DPA، لە (١ی تەمووزی ١٩٨٨) FBIS – NES – 88 - 127، ل١٧. نوێنەری عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان بە پەلە ڕەتکردنەوەیەکی ڕاگەیاند و ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە "ئەو تۆمەتانەی بە درۆوە دەدرێنە پاڵ کاربەدەستانی پایەبەرزی عێراق... بە تەواوی بێبنەمان". نامەی عیسمەت کەتانی، زنجیرە / ٢٠٠٧٦، ١ی ئابی ١٩٨٨.

٣٢- پاتریک ی. تایلەر "عێراقی پڕچەک بارێکی دەسدرێژیکارانە وەردەگرێت"، *واشنتون پۆست*، ١١ی مایسی ١٩٨٨.

٣٣- گۆردن م. بارک و چارلس سی. فلاوەری "*نامیلکەی نێودەوڵەتی لەسەر تەشەنەکردنی چەکی کیمیایی*" (نیویۆرک، چاپخانەی گرینوود، ١٩٩١) ل١١٧. ئەمە بە شێوەیەک لە شێوەکان سەرچاوەیەکی زۆر بەنرخە و وردەکارییەکی سوودبەخشی زۆری تێدایە.

٣٤- دەزگای موخابەراتی مەرکەزیی ئەمەریکا CIA "توانای چەکی کیمیایی و بایۆلۆجیی عێراق"، ئەیلوولی ١٩٩٠ (FOIA - Gulflink).

٣٥- ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان "*ڕاپۆرتی نێردراوی سکرتێری گشتی بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئیدیعای بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە شەڕ و ململانێی نێوان*

*کۆماری ئیسلامی ئێران و عێراقدا*، زنجیره / ١٨٨٥٢، (٢٦ی مایسی ١٩٨٧)، ل٢ و ٥ - ٦.

٣٦- وتاردانی بارودۆخی یەکگرتن، ٢٨ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٣.

٣٧- نامەیەک لە ئێدوارد فۆکسەوە، یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بۆ کاروباری یاسایی، بۆ دانتێ ب. فاسسێڵ، سەرۆکی کۆمیتەی کاروباری دەرەوە لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا، ١٣ی ئەیلوولی ١٩٨٨ (FOIA - NSA).

٣٨- لە جێمس بامفۆرد وەرگیراوە *دەستەی نهێنییەکان: تونێکارییەکی بان ـ نهێنیی دەزگای ئاسایشی نەتەوەیی لە جەنگی ساردەوە بۆ بەرەبەیانی سەدەی نوێ*، (نیویۆرک: دەبڵدەی، ٢٠٠١)، ل٥٤٤.

٣٩- "پێداچوونەوە بە یاخیبوونی کورددا"، بەڵگەنامەیەکی ئیمزانەکراوە و لە یاداشتێکی کاردا "سیاسەتی ئەمەریکا لە بەرامبەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراقدا"ی تێدایە، کە لە ج. ئالن هۆڵمز و پۆڵ هێرەوە بۆ جۆرج شووڵزی وەزیری دەرەوە نێردراوە، لە ١٣ی سێپتەمبەری ١٩٨٨دا (FOIA - NSA).

**بەشی یەکەم: پەڕینەوە لە دەروازەی کیمیایی**

١- ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان "بڕیارەکان"، ٢٣ی ئەیلوولی ١٩٨٠.

٢- کامیرۆن ر. هیوم *نەتەوە یەکگرتووەکان، ئێران و عێراق: چۆن ئاشتی دروستکردن گۆڕا* (بلومینگتن، ئیندیانا: بڵاوکردنەوەی زانکۆی ئیندیانا، ١٩٩٤)، ل٣٨.

٣- ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، بڕیاری ژمارە (٤٧٩)، ٢٨ی ئەیلوولی ١٩٨٠.

٤- ج. ئالن هۆلمز و پۆل هێر بۆ وەزیری دەرەوە، "سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە بەرانبەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراقدا"، ١٣ی ئەیلوولی ١٩٨٨ ( FOIA - NSA).

٥- ڤیکتۆر ل. وۆلف، تۆماس سی. دی ئیسیپۆ، ولیەم ی. مایەر "توانای چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی لە ولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا"، یەکەی تایبەتی دەزگای هەواڵگریی بەرگری DIA Task Unit PT-1600 - 04 - 77 (١٠ی ئابی ١٩٨٦) ل١٣٢ و ل١٣٦ (FOIA - NSA).

٦- دەبلیو ئەندرو تێریل "چەکی کیمیایی لە جەنگی کەنداودا"، گۆڤاری *ستراتیجیک ڕیڤیو* (بەهاری ١٩٨٦)، ل٥٣.

٧- بێجگە لە وەلامدانەوەی خێرای پرسیارەکان، دکتۆر فروتان هەندێ بڕگەی پەیوەندیداری خوێندەوە لە دەسنووسێک کە لەسەر بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراق ئامادەی کردبوو. دواتر ئەوە بە کتێبێک چاپ بوو بە ناونیشانی "*ئەزموونی پزیشکی لە جەنگی کیمیایی عێراقدا*"، (تاران ـ ٢٠٠٣، بە فارسی).

٨- ج. پ. پێری ڕۆبنسن "شەڕی کیمیایی و بایۆلۆجی و پەرەسەندنەکانی لە ساڵی ١٩٨٤دا" لە کتێبی "*چەکداری و چەکداماڵینی نێودەوڵەتی: کتێبی ساڵانەی SIPRI*"، ١٩٨٥ (لەندەن و فیلادلفیا: تایلۆر و فرانسیس، ١٩٨٥)، پاشکۆی ٦ ئە، ل٢٠٧-٢٠٨.

٩- تێریل: "چەکی کیمیایی"، ل٥٣.

١٠- ئەنتۆنی کوردسمان و ئەبراهام واگنەر "*پەندەکانی جەنگی مۆدێرن: بەرگی دووەم*"، (بۆڵدەر: وێستڤیو پرێس، ١٩٩٠)، ل١٦٦.

١١- عەباس فروتـان "چەند سـەرنجێکی پزیشـکی لەسـەر شـەڕی کیمیـایی"، *گۆڤاری کەوسەری پزیشکی*، پـایزی ١٣٧٢ هەتاوی (١٩٩٦)، بەرگی ١، ل٩٤.

١٢- ڕۆژنامەی ئەلعێراق (بەغدا)، ١٣ی ئەیلوولی ١٩٨٣.

١٣- ڕووداوەکە لە هیومـــان رایـــتس ووچ، "*تـــاوانی جینۆسایدی عێراق: پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد*" (نیوهـاڤن و لەندەن، چاپی زانکۆی یاڵ، ١٩٩٥) ل٢٥-٢٧.

١٤- کۆردسـمان و واگـنەر: "*پەنـدەکانی جەنگـی مـۆدێرن*"، ل١٧٦.

١٥- پێری ڕۆبنسن، "جەنگی کیمیایی و بـایۆلۆجی"، ل٢٠٨-٢٠٩.

١٦- جولیـان پێری ڕۆبنسـن و جۆزیـف گۆڵدبلات، "چەکـی کیمیـایی عێـراق ـ ئێـران" (فاکـت شـیتی SIPRI، ئینسـتیتیوتی نێودەوڵەتیی ستۆکهۆڵم بۆ لێکۆڵینەوەی ئاشتی، مایسـی ١٩٨٤)، ل٤.

## بەشـی دووەم: کـاردانەوەی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان و دانانی ڤۆلیوم کۆنترۆڵ

١- "پرسـیاری گشـتی لەسـەر شـەڕی زۆنگاوەکـان و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی"، خزمەتگوزاریی *بەخشـی زانیاریی دەرەوە (FBIS)، ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئەفریقیا*، ٧ی مـارتی ١٩٨٤.

٢- دۆن ئـۆبەردۆرفەر "ئێـران پێنجسـەد هەزار سـەرباز دەخـاتە بەرەوە، گەورەتـرین هێرشـی جەنـگ لەگەڵ عێراقـدا دەستی پێ کردەوە". *واشنتۆن پۆست*، ٣ی مارتی ١٩٨٤.

٣- لە کـاتی چـاوپێکەوتنەکەدا، نـۆڤەمبەری ٢٠٠٠، ڕێکیـاردۆنی ڕێکـخەری تـایبەتی مـادلین ئـۆڵبرایتی وەزیـری

دەرەوە بوو، بۆ گۆڕانی عێراق، لە ساڵی ٢٠٠٦یشدا باڵیۆزی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو لە میسر.

٤- نیویۆرک تایمز، ٦ی مارتی ١٩٨٤.

٥- گۆڤاری تایم، ١٩ی مارتی ١٩٨٤.

٦- بروسکەیەک لە بەشی بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە لە بەغدا، بۆ وەزیری دەرەوە، BAGHDA 00879، ٤ی نیسانی ١٩٨١ (FOIA - NSA).

٧- بروسکەیەک لە وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە بۆ بەشی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە بەغدا، SECTO 02076، ٨ی نیسانی ١٩٨١ ( FOIA - NSA).

٨- بروسکەیەک لە بەشی بەژەوەندییەکانی ئەمەریکا و لەبەغدا بۆ وەزیری دەرەوە، بەغدا ٠٠٩٧٢، ١٢ی نیسانی ١٩٨١ (FOIA - NSA).

٩- وەفیق ئەلسامەڕایی: *حطام البوابة الشرقية*، (*کەلاوەی دەروازەی ڕۆژهەلات*)، بە عەرەبی، (لەندەن: بنکەی بلاوکردنەوە و ساڵەکەی نەنووسراوە)، ل٨٢-٨٣.

١٠- جۆرج پ. شوولز: *پشێوی و خۆشیی سەرکەوتن: ساڵەکانم وەک وەزیری دەرەوە*، نیویۆرک: چارڵ سکریبنەر سۆنس، ١٩٩٣) ل٢٣٦.

١١- بروسکەیەک لە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکاوە بۆ باڵیۆزخانەکانی ئەمەریکا، STATE 042566، ١٥ی شوباتی ١٩٨٣ (FOIA - NSA).

١٢- شوولز *پشێوی و خۆشیی سەرکەوتن*، ل٢٣٧.

١٣- بروسکەیەک لە بەشی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و لە بەغدا بۆ وەزیری دەرەوە. -BAGHDA (کۆدی نامەکە ناخوێنرێتەوە)، ١٣ی حوزەیرانی ١٩٨٣، (FOIA - NSA).

١٤- بروسکەیەک لە بەشی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکاوە لە بەغدا بۆ وەزیری دەرەوە، BAGHDA 01836، ١ی ئابی ١٩٨٣ (FOIA - NSA).

١٥- نیکۆلاس ئە. ڤێلیۆتس "جەنگی ئێران ــ عێراق: شیکردنەوەی ئەگەری گۆڕانی ئەمەریکا لە هەڵوێستی بێلایەنی توندی"، یاداشتێکی زانیاری، وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان (٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٣) ل٧ (FOIA - NSA).

١٦- شوولز: "*پشێوی و خۆشیی سەرکەوتن*" ل٢٣٨.

١٧- جوناسان ت. هۆ "عێراق چەکی کیمیایی بە کار دێنێت" یاداشتی زانیاری، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، ١ی نۆڤەمبەری ١٩٨٣، (FOIA - NSA)، تەئکیدی خراوەتە سەر.

١٨- جوناسان ت. هۆ و ڕیچارد دەبلیو مێرفی "عێراق چەکی کیمیایی بە کار دێنێت"، یاداشتی کار، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، ٢١ی نۆڤەمبەری ١٩٨٣، ( FOIA - NSA).

١٩- فرانسیس ج. ڕیکیاردۆنی "ڕێگرتن لە بەکارهێنانی عێراق بۆ چەکی کیمیایی" وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، ١٠ی نۆڤەمبەری ١٩٨٣ (FOIA - NSA).

٢٠- فرانسیس ج. ڕیکیاردۆنی "باکگراوندی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە"، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، ١٠ی نۆڤەمبەری ١٩٨٣ (FOIA - NSA).

٢١- کۆشکی سپی "سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە مەسەلەی جەنگی ئێران ــ عێراق"، ڕاسپاردەی بڕیاری ئاسایشی نەتەوەیی ژمارە (١١٤)، ٢٦ی نۆڤەمبەری ١٩٨٣، (FOIA - NSA).

٢٢- وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا "بەکارهێنانی نایاسایی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە"، کورتەباسێک، ١٦ی نۆڤەمبەری ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٢٣- بروسکەیەک لە بەشی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکاوە لە بەغدا بۆ باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە عەممان BAGHDA 03101، ١٤ی دیسەمبەری ١٩٨٣ (FOIA - NSA).

٢٤- گۆڤاری *هارپەر*، ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣، ل١٣، لە تایمزی لەندەنییەوە وەرگیراوە.

٢٥- بروسکەیەک لە باڵیۆزخانەی ئەمەریکاوە لە لەندەن بۆ وەزیری دەرەوە، 27572 LONDON، ٢١ی دیسەمبەری ١٩٨٣ (FOIA - NSA).

٢٦- برووسکەیەک لە باڵیۆزخانەی ئەمەریکاوە لە لەندەن بۆ وەزیری دەرەوە، LONDON 27592، ٢١ی دیسەمبەری ١٩٨٣ (FOIA - NSA).

٢٧- لە میشێل دۆبس وەرگیراوە "ئەمەریکا ڕۆڵی سەرەکیی هەیە لە بونیادنانی عێراقدا"، *واشنتۆن پۆست*، ٣٠ دیسەمبەری ٢٠٠٢.

٢٨- بروسکەیەک لە بەشی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکاوە لە بەغدا بۆ باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە عەممان، BAGHDA 03163، ٢٦ی دیسەمبەری ١٩٨٣ (FOIA - NSA).

٢٩- بروسکەیەک لە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا و بۆ قونسوڵیەتی ئەمەریکا لە ئۆرشەلیم (تیمەکەی ڕامسفیلد)، STATE 012251، ١٤ی کانوونی دووەمی ١٩٨٤، (FOIA - NSA).

٣٠- بروسکەیەک لە بەشی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە بەغدا بۆ باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە عەممان، BAGHDA 00392، ٢٢ی شوباتی ١٩٨٤، (FOIA - NSA).

٣١- ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەنووسی، دووبارە ناردنەوەی بە بروسکەیەک لە وەزیری دەرەوە بۆ نوێنەرایەتی ئەمەریکا لە جنێف، STATE 074411، ١٤ی مارتی ١٩٨٤ ( - FOIA NSA).

٣٢- بروسکەیەک لە بەشی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە بەغدا بۆ باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە عەممان، BAGHDA 00461، ٧ی مارتی ١٩٨٤، (FOIA - NSA).

٣٣- بروسکەیەک لە بەشی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە بەغدا بۆ باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە عەممان، BAGHDA 00525، ٧ی مارتی ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٣٤- فرانسیس ج. ڕیکیاردۆنی "کورتەتێبینی لە بارەی سەردانەکەی ڕامسفیلدەوە بۆ بەغدا"، وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، ٢٤ی مارتی ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٣٥- کۆپییەک لە گوێگرتنی کۆمیتەی خزمەتگوزاریی چەکی سەر بە سەناتی ئەمەریکا، ١٩ی ئەیلوولی ٢٠٠٢.

٣٦- بروسکەیەک لە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بۆ نوێنەرایەتیی ئەمەریکا لە جنێف، STATE 074411، ١٤ی مارتی ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٣٧- کۆشکی سپی "ئیجرائاتی چاکسازیی پێگەی ئەمەریکا و ئامادەیی وەڵامدانەوەی بۆ پەرەسەندنی جەنگی ئێران ـ عێراق"، ڕاسپاردەکانی بڕیاری ئاسایشی نەتەوەیی ژمارە (١٣٩)، ٥ی نیسانی ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٣٨- بروسکەیەک لە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا و بۆ باڵوێزخانەکانی ئەمەریکا، STATE 093714، ٣١ی مارتی ١٩٨٤، (FOIA - NSA).

٣٩- ئەنتۆنی کۆردسمان "*جەنگی عێراق ـ ئێران و پەیوەندییەکانی ئەمەریکا ـ عێراق: دیدێکی عێراقی ـ*

*چاوپێکەوتنێک لەگەڵ تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوەی عێراق*" (واشنتۆن دی سی: ئەنجوومەنی نەتەوەیی لە بارەی پەیوەندییەکانی ئەمەریکا ـ عەرەبەوە، ئابی ١٩٨٤)، ل٣٩.

٤٠- سەیمور هێرش "یاریدەدەرانی ئەمەریکا دەڵێن کەوا عێراقییەکان دەمارەگازیان بە کار هێناوە"، *نیویۆرک تایمز*، ٣٠ مارتی ١٩٨٤.

٤١- شووڵز، "*پشێوی و خۆشیی سەرکەوتن*"، ل٢٤٠.

٤٢- هەمان سەرچاوە.

٤٣- بروسکەیەک لە وەزیری دەرەوەی ئەمەریکاوە بۆ باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە بەغدا، STATE 352124، ٢٩ی نۆڤەمبەری ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٤٤- بروسکەیەک لە باڵیۆزخانەی ئەمەریکاوە لە دیمەشق بۆ وەزیری دەرەوە، DAMASC 02601، ٢٣ی نیسانی ١٩٨٥ (FOIA - NSA).

٤٥- ئەمە لە *ئینتەرناشناڵ ریڤیوی خاچی سووردا* هاتووە، مایس ـ حوزێرانی ١٩٨٤، ل١٦٨.

٤٦- لە کاتێکدا کە پرۆتۆکۆڵی جنێڤ میکانیزمێکی نییە بۆ لێکۆڵینەوە لە ئیدیعای بەکارهێنان، ئەوە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ٣٧ / ٩٨ی ١٣ی دیسەمبەری ١٩٨٢، بە دوای پڕکردنەوەی بۆشاییدا دەگەڕێت بەوەی کە داوا لە سکرتێری گشتی دەکات بۆ لێکۆڵینەوە لەم جۆرە ئیدیعا و سکاڵایانە، بە یارمەتیی شارەزایان.

٤٧- ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان "*راپۆرتی ئەو پسپۆڕانەی لە لایەن سکرتێری گشتییەوە دانراون بۆ لێکۆڵینەوە لە ئیدیعاکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران سەبارەت بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی*"، زنجیرە / ١٦٤٣٣، ٢٦ی مارتی ١٩٨٤.

٤٨- بروسـكەیەک لە نـوێنەرایەتیی ئەمەریکـاوە لە نەتەوە یەکگرتووەکـان، نیویـۆرک، 00626 USUNN، ٢٨ی مـارتی ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٤٩- هەمان سەرچاوە.

٥٠- بروسـكەیەک لە وەزیـری دەرەوەی ئەمەریکـاوە بـۆ باڵیۆزخـانەی ئەمەریکا لە عەممـان، 094420 STATE، ٦ی نیسانی ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٥١- ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، زنجیرە / ١٦٤٥٤، ٣٠ مارتی ١٩٨٤.

٥٢- گیانـدۆمینیکۆ پیکـۆ *پیاوی بێچەک* (نیویـۆرک: کتێبـی تایمز، ١٩٩٩)، ل٦١.

٥٣- دەبلیـو ئەنـدرو تێرپیـل "چەکـی کیمیـایی لە جەنگـی کەنداودا"، *ستراتیجیک ریڤیو* (بەهاری ١٩٨٦)، ل٥٦.

٥٤- شوولّز "*پشێوی و خۆشیی سەرکەوتن*"، ل٢٣٨ - ٢٤١ و چەنـد چاوپێکەوتنێـک لەگەڵ کاربەدەسـتانی وەزارەتـی دەرەوەی ئەمەریکادا.

٥٥- یاسـاکانی دادگـا بە ئینگلیـزی لەم سـایتەدا هەن: www.reclestproak.nl/ljn.asp.

٥٦- وەزارەتـی دەرەوەی ئەمەریکا "بەکارهێنـانی نایاسـایی چەکی کیمیایی لە لایەن عێراقەوە" کورتەیەک، ١٦ی نۆڤەمبەری ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٥٧- تێرپیل "چەکی کیمیایی" ل٥٦.

٥٨- بروسکەیەک لە نێردەی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە لە نیویـۆرک بـۆ وەزیـری دەرەوە، 01615 USUNN، ٦ی تەمووزی ١٩٨٤، (FOIA - NSA).

٥٩- ئاژانسی موخابەراتی بەرگری "لە چاوەڕوانیی عێراقدا"، کورتەی خەملاندنی بەرگری، ٢٥ی ئەیلوولی ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

٦٠- جولیان پێری ڕۆبنسۆن و جۆزێف گۆڵدبلات، "شەڕی کیمیایی لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا" (ئینستیتیوتی نێودەوڵەتیی ستۆکهۆڵم بۆ لێکۆڵینەوەی ئاشتی، SIPRI فاکت شیت، مایسی ١٩٨٤)، ل٤ - ٥.

**بەشی سێهەم: ناوبڕی کیمیایی**

١- *گۆڤاری پزیشکیی کەوسەر*، بەهاری ١٣٧٦ی هەتاوی ١٩٩٧، بەرگی یەکەم و دووەم.

٢- گۆردن م. بارک و چارلس سی. فلاوەری "*نامیلکەیەکی نێودەوڵەتی لەسەر تەشەنەکردنی چەکی کیمیایی*" (نیویۆرک: گرینوود پرێس، ١٩٩١)، ل١٠٥ و نامەیەک لە سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، زنجیرە / ١٧١٢٧ (٢٤ی نیسانی ١٩٨٥)، ل٤.

٣- نامەیەک لە سەعید ڕەجائی خۆراسانییەوە، زنجیرە / ١٧٠٤٦، ٢١ی مارتی ١٩٨٥.

٤- نامەیەک لە خۆراسانییەوە، زنجیرە / ١٧٠٨٨، ٢١ی مارتی ١٩٨٥.

٥- "ڕاپۆرتی سکرتێری گشتی لە بارەی سەردانەکەیەوە بۆ ئێران و عێراق"، زنجیرە / ١٧٠٩٧، ١٢ی نیسانی ١٩٨٥.

٦- نامەیەک لە سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، زنجیرە / ١٧١٢٧، ٢٤ی نیسانی ١٩٨٥.

٧- "سەرنجی سەرۆک لە بارەی ئەنجوومەنی ئاسایشەوە"، زنجیرە /١٧١٣٠، ٢٥ی نیسانی ١٩٨٥.

٨- نــامەیەک لە خۆراســانییەوە، زنجیــرە /١٧٨٦٤، ٢٥ی شوباتی ١٩٨٦.

٩- ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان "*ڕاپۆرتی نێــردەی ســکرتێری گشــتی بــۆ لێکــۆڵینەوە لە ئیــدیعاکانی بەکارهێنــانی کیمیــایی لە شــەڕ و ململانێــی نێــوان کۆمــاری ئیســلامی ئێـران و عێراقـدا*"، زنجیـرە / ١٧٩١١، ١٢ی مــارتی ١٩٨٦.

١٠- "*تێبینیـی ســەرۆکی ئەنجـوومەنی ئاسـایش*"، زنجیـرە / ١٧٩٣٢، ٢١ی مارتی ١٩٨٦، تەئکیدی لەسەر کراوە.

١١- نـامەیەک لە فەرەیـدون کەمـالییەوە، زنجیـرە / ١٧٩٢٥، ١٨ی مارتی ١٩٨٦.

١٢- نــامەیەک لە عیســمەت کەتــانییەوە، زنجیــرە / ١٧٩٣، ٢٣ی مارتی ١٩٨٦.

١٣- دەزگای هەواڵگریی بەرگریی ویلایەتە یەکگرتووەکـان "لە چاوەڕوانیی عێراقدا" کورتەی خەمڵێنراوی بەرگری DEB 84 - 85 –، ٢٥ی ئەیلوولی ١٩٨٤ (FOIA - NSA).

١٤- ولــیەم مــایەرزو ڕیچــارد ویلســن "بەرفراوانکردنــی تواناکــانی چەکــی کیمیــایی: کێشــەیەکی بایەخــدار"، دەزگــای هەواڵگریــی بەرگریــی ولایەتە یەکگرتووەکــان، *بڵاوکــراوەی زانســتیی ســوپای ئەمەریکــی و زانیـاریی تەکنیکــی*، -AST 86 - 074 – 2660R (دیسـەمبەر ١٩٨٦) ل٢٥، ( - FOIA NSA).

١٥- "جڵەوگیریــی تەشــەنەکردنی چەکــی کیمیــایی"، ١٩ی حوزێرانی ١٩٨٥ (FOIA - NSA).

١٦- دەزگای موخابەراتی مەرکەزی "ئێران ـ عێراق: شەڕی کیمیایی بەردەوامە"، هەڵسەنگاندنێکی موخـابەراتی، نۆڤەمبەری ١٩٨٦، (FOIA - NSA).

١٧- ڕیچـاردن دەبلیـو مێرفـی، "عێـراق: کۆبـوونەوەی چوارشـەممەی CPPG، ٢٣ی تەمـووز" کـورتە یاداشـتنامە، وەزارەتـی دەرەوەی ویـلایەتە یەککگرتووەکـان، ٢٣ی تەمـووزی ١٩٨٦، (FOIA - NSA).

١٨- "حـاڵەتی ئێسـتای ژیـری و هۆشـمەندی سـەبارەت بە خسـتنەگەڕی مووشـەکی تـاو"، یاداشـتێک بـۆ دەزگـا ناوخۆییەکان، ٢٥ی کانوونی دووەمی ١٩٨٦ (FOIA - NSA).

١٩- ڕیچـارد دەبلیـو مێرفـی "پەیوەنـدییەکانی عێـراق — ئەمەریکـا: کـۆکردنەوەی پارچەکـان" یاداشـتی کـارکردنن، ٥ی دیسەمبەری ١٩٨٦، (FOIA - NSA).

٢٠- میشـێل ئارماکۆسـت "نامەیەک بۆ دکتـۆر ئـاڵتۆن کیل (جێگـری یاریـدەدەری سـەرۆک بـۆ کاروبـاری ئاسایشـی نیشتمانی): مۆڵەتی بازرگـانی بۆ عێـراق"، وەزارەتـی دەرەوەی ئەمەریکـا، یاداشـتی کـار، ١٢ی دیسـەمبەری ١٩٨٦، ( FOIA - NSA).

٢١- لە ئە. پ. بـارلی وەرگیـراوە، "زانیـاریی هەواڵگریـی ویـلایەتە یەککگرتووەکـان بـۆ عێـراق"، وەزارەتـی دەرەوەی ئەمەریکا، ١٥ی دیسەمبەری ١٩٨٦ (FOIA - NSA).

٢٢- ئەنتۆنی کۆردسمان و ئەبراهـام ر. واگنەر "پەندەکانی جەنگـی مـۆدێرن، بەرگـی دووەم (بۆڵـدەر: ویسـتڤیو پـرێس، ١٩٩٠) ل ٢٥٠.

**بەشی چوارەم: شەڕ لە کوردستاندا**

١- ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککگرتووەکان، "*نێردراو بۆ پشکنینی ناوچە مەدەنییەکان لە ئێران و عێراقدا، کەوا بەر هێرشـی سـەربازی کەوتـوون*"، زنجیـرە / ١٥٨٣٤، ٢٠ی حوزێرانی ١٩٨٣.

٢- لە نامەیەکی خۆراسانی وەرگیراوە، زنجیرە / ١٨٨٠٠، ١٣ی نیسانی ١٩٨٧.

٣- نامە لە خۆراسانییەوە، زنجیرە / ١٨٨١٩، ٢١ی نیسانی ١٩٨٧.

٤- ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان "*ڕاپۆرتی نێردراوی سکرتێری گشتی بۆ لێکۆڵینەوە لە ئیدیعاکانی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە شەڕ و ململانێی نێوان کۆماری ئیسلامی ئێران و عێراقدا*"، زنجیرە / ١٨٨٥٢، (٢٦ی مایسی ١٩٨٧)، ل٥.

٥- تێبینی لە لایەن سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایشەوە، زنجیرە / ١٨٨٦٣، ١٤ی مایسی ١٩٨٧. تیمەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان سەرنجی ئەوەی دابوو کە هێزەکانی عێراقیش گرفتاری برینی کیمیایی بوون.

٦- دەلفین مینووی، کە خانمە ڕۆژنامەنووسێکی سەربەخۆیە لە ٢٦ی حوزەیراندا چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردوون، لە سەردەشت.

٧- مستەفا غەنی، س. خاتەری، ئە. جەلالی، ج. ئەسلانی: "دەرەنجامی (ئاوها) دانیشتوانی مەدەنیی شاری سەردەشت لە پاش بۆمبارانی کیمیایی"، لە مایسی ٢٠٠٢دا، لە کۆنفرانسێکی پزیشکیدا لە سویسرا نمایش کرا (بە فارسی و کورتەیەکی بە ئینگلیزی). بڕوانە فەرنووش هاشمیان "نیگەرانی، خەمۆکی، فشاری پاش تراوما لای ڕزگاربووە ئێرانییەکانی چەکی کیمیایی"، *گۆڤاری کۆمەڵەی پزیشکیی ئەمەریکی*، ژمارە / ٢٩٦ (٢٠٠٦)، ل٥٦٠ - ٥٦٦.

٨- لە نامەیەکی خۆراسانی وەرگیراوە، زنجیرە / ١٩٠٢٩، ١٠ی ئابی ١٩٨٧.

٩- خەڵکی سەردەشت بەپەرۆشن بۆ بەزیندوو هێشتنەوەی یادەوەریی هێرشەکە. بێجگە لە یادکردنەوەی ساڵانە، هەندێک لە دەربازبووەکان کتێبیان لەسەر نووسیوە. بۆ نموونە، بڕوانە حسێن موحەمەدیان، *بۆن ئاشنا (واتە بۆنێکی نامۆ)* (تاران: ئابد، ٢٠٠١، بە فارسی). موحەمەدیان، دەربازبوویەکە لە ئیسپانیا چارەسەرکراوە، هەروەها سەرۆکی ڕێکخراوی داکۆکیکردنە لە قوربانییانی چەکی کیمیایی لە سەردەشت.

١٠- ئەرکانی هاوبەشی سوپا و شۆڕشی ئیسلامی، بەشی ئۆپەراسیۆنەکان "*أطلس جنک إیران و عیراق*"، بە فارسی *(ئەتڵەسی جەنگی ئێران و عێراق)* (تاران: سەنتەری لێکۆڵینەوەی جەنگ، ٢٠٠١) ل٩٢.

١١- ڕۆژنامەی لۆمۆند، ١٩ی مارتی ١٩٨٨.

١٢- هیومان رایتس ووچ "*تاوانی جینۆسایدی عێراق: پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد*" (نیوهاڤن و لەندەن: چاپی زانکۆی یال، ١٩٩٥). ل٣٩.

١٣- هەمان سەرچاوە، ل٢٥٤.

١٤- هەمان سەرچاوە.

١٥- هەمان سەرچاوە، ل٤٠.

١٦- هەمان سەرچاوە، ل٥٢ - ٥٦.

١٧- گیاندۆمینیکۆ پیکۆ، "پیاوی بێ چەک" (نیویۆرک، کتێبەکانی تایمز، ١٩٩٩)، ل٧٣.

١٨- یاداشتی ژمارە Z 040918 R بۆ لقەکانی موخابەرات، ٤ی ئابی ١٩٨٧ (NSA - FOIA) جەختکردن لەسەر دەقە بنەڕەتییەکەی.

١٩- بەڕێوەبەری موخابەراتی مەرکەزی، "کاریگەری و تێوەگلان لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە جەنگی ئێران ـ

عێراقدا"، مێژووی لەسەر نییە، بەڵام لە دوادوایی ساڵی ١٩٨٧ و سەرەتای ساڵی ١٩٨٨دایە (FOIA - Gulflink).

٢٠- هەمان سەرچاوە.

٢١- هەیوود ڕانکین، "گەشتکردن لەگەڵ گاڵبرەیس ـ مەرگ لە بەسرە و وێرانکاری لە کوردستاندا"، یاداشتی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان (٢٧ی ئەیلوولی ١٩٨٧)، لاپەڕەکانی ١١، ١٥، ١٩و ٢٢.

٢٢- وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان "*ڕاپۆرتی وڵاتان لەسەر پیادەکردنی مافی مرۆڤ بۆ ساڵی ١٩٨٧*"، (واشنتۆن دی سی، ١٩٨٨).

٢٣- ڕۆیتەر، ١٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٧. بڕوانە بەشی حەوتەم بۆ شیکارییەکی ئەو ئیدیعایانەی کە ئێران لە کاتی جەنگدا چەکی کیمیایی بە کار هێناوە.

**بەشی پێنجەم: هەڵەبجە**

١- شەوکەت حاجی موشیر "کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە لە بەهاری ١٩٨٨دا"، بە کوردی، (سلێمانی، ١٩٩٨). شەوکەت لە شوباتی ٢٠٠٣دا لە لایەن جەنگاوەرانی گرووپی ڕادیکاڵی ئیسلامیی ئەنسار ئیسلامەوە کوژرا.

٢- بەڕێوەبەری "ناشناڵ ئینتیلیجانس دەیلی (ڕۆژانەی هەواڵگریی نەتەوەیی)، ژمارەی شەممە ١٢ی مارتی ١٩٨٨"ی لەمەڕ موخابەراتی مەرکەزی، ل١٥ (نووسەر ـ FOIA).

٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، شەممە ١ی مارتی ١٩٨٨، ل١١ (نووسەر ـ FOIA).

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، دووشەممە ٢٨ی مارتی ١٩٨٨، ل٣ (نووسەر ـ FOIA ).

٥- هەروەها بڕوانە برووسکەی باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە بەغدا بۆ وەزیری دەرەوە، ١٩٨٨ 01888 BAGHDA (نووسەر ـ FOIA).

٦- خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی دەرەوە، FBIS – NES – 88 – 058 (٢٥ی مارتی ١٩٨٨) ل٦٤.

٧- خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی دەرەوە ٠٥٧ (٢٤ی مارتی ١٩٨٨)، ل٦٩ - ٧١.

٨- خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی دەرەوە ٠٤٩ (١٤ی مارتی ١٩٨٨)، ل٦٣ - ٦٨.

٩- خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی دەرەوە ٠٥١ (١٦ی مارتی ١٩٨٨)، ل٦٤ - ٦٥.

١٠- خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی دەرەوە ٠٥٢ (١٧ی مارتی ١٩٨٨)، ل٥٦ - ٥٩.

١١- خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی دەرەوە ٠٥٣ (١٨ی مارتی ١٩٨٨)، ل٥٢.

١٢- خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی دەرەوە ٠٥٨ (٢٥ی مارتی ١٩٨٨)، ل٦٤.

١٣- خزمەتگوزاریی پەخشی زانیاریی دەرەوە ٠٥٢ (١٧ ی مارتی ١٩٨٨)، ل٥٩.

١٤- هیومان ڕایتس ووچ *'تاوانی جینۆسایدی عێراق: پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد'*، (نیوهاڤن و لەندەن: چاپی زانکۆی یاڵ، ١٩٩٥) ل٧٠.

١٥- (March 30 1988) p. 49، FBIS – NES – 88 – 061

